# تەمەنێک



## گۆرانی، ئاواز، مۆسیقا و خۆشخوانی

بەشی دووەم

لە بیرەوەرییەکانی باکووری

سالی ۱۹۵۷ تاکو مانگی نیسانی سالی ۱۹۷۰

## گۆرانی، ئاواز، مۆسیقا و خۆشخوانی

بەشی دووەم

**لە بیرەوەرییەکانی باکووری**

ساڵی ١٩٥٧ تاکو مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٠

ناو کتێب: تەمەنێک - گۆرانی، ئاواز، مۆسیقا و خۆشخوانی - بەشی دووەم
نووسینی: باکووری
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٩٧
پیت لێدان: کانیاو خالید
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + کارزان کانەبی
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ١٣٨٠ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

بە شانازییەوە ئەم ڕەسمەی من، کە بەدەست و پەنجە و خامە ڕەنگین و نازدارەکەی هونەرمەندی ئازیزم (کاک فەیسەڵ عوسمان) کێشراوە، بێ ئاگای خۆم، لێرەی دادەنێم و بەشی دووەمی بیرەوەرییەکانمی پێی دەڕازێنمەوە و هەمیشە یادی کاکی هونەرمەندیش لە خەیاڵ و لە پێش چاومدایە و سوپاسی دەکەم. هەقایەتی ڕەسمەکەش ئەوها بوو: لە مێژووی ١١/١١/١٩٨٨، لە قەد و پاڵی چیای هەیبە سوڵتان، لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی، چەند گۆرانییەکمان بۆ (تصویر) کرا لە لایەن تیمێکی تەلەڤزیۆنی کەرکووک، بەسەرپەرشتیی هونەرمەند محەمەد عەلی ڕەمەزان کە گۆرانی (ئەی مەلەنگێنە)ی منیش یەکێکیان بوو. جا بۆ شەوێ، کاک سەردار ئەحمەد هونەرمەندی شمشاڵژەن، دەعوەتی کردین و لە ماڵە خنجیلانەکەی دانیشتین کاک فەیسەڵیشمان لەگەڵدا بوو. جا لە کاتی

گۆرانی گوتندا و بێ ئەوەی هەستی پێ بکەم، هێدی هێدی ئەو ڕەسمەی منی دەکرد. دەستت نەرزێن کاک فەیسەڵ.

نووسینەوەی یاداشت و بیرەوەری و ژیاننامە، بەشێکە لە ئەدەب و مێژوو... بەڵکو بەشێکی گرینگیشە، بەڕای من! هەر لە خوێندنەوەی ئەو زانیارییانەی کە لەو یاداشت و ژیاننامانەدا هەیە، ڕووداوی گرینگ و هەواڵی شەڕوشۆڕ و ناوی پیاوی مەزن و ئافرەتی ناودار و وەسفی شار و سروشتی وڵاتان و جۆری حوکمڕانی ناوچەی جیا جیای ئەم جیهانەوە... تاد، لەو ڕۆژەوە کە نووسین و خوێندن لەسەر ئەم عەردە پەیدابووە، چاخ لە دوای چاخ، بەئێمەی وەچە و دانیشتوانی ئەم زەمانەی تێیدا دەژین، گەیشتووە و دەیزانین! نووسینەوەی بیرەوەریش Autobioqraphy (السيرة الذاتية) دیارە، جۆرێکی (ئەدەب)یشە و زۆریش کۆنە. ڕەنگە کۆنترین جۆری نووسینی بابەتی مێژوویی، نووسینەکانی مێژوونووسی گریکی Greek (اغريقی) ناودار و بەناوبانگ هیرۆدۆتس Herodotus بێت. هیرۆدۆتس لە ساڵی ٤٨٤ی پێش زایینی، لە وڵاتی یۆنان Greek ی کۆن، لە شارێک بەناوی Halicarnassus لە دایک بووە. کابرایەکی گەڕیدە بووە و حەزی لە سەفەر و گەڕان و دیتنی شار و وڵاتانی نزیک و دوور بووە. لەو گەشتانەشیدا زانیاری وەرگرتووە و نووسیوەتەوە لە بابەت ناوچەکان و ڕووداوە گرینگەکانی لەوێ ڕوویان داوە، جا چ ئەوانەی خۆی بینویەتی یان ئەوانەی لە خەڵکەوە، بەگوێگرتن لێیان، وەری گرتوون و نووسیویەتی. گەشتی کردووە بۆ: مەکدۆنیا Macedon و بۆ Thrace و وڵاتی فارس و، فەلەستین... لە ساڵی ٤٤٧ پ. ز. چووەوە ئەسینا Athens و لە دەوروبەری ساڵی ٤٢٥ پ.ز مردووە.

دیسان، پێم وایە زۆربەی ڕۆشنبیران و خوێندەواری کورد، ئۆتۆبایۆگرافی: بیرەوەری کەسایەتیی خودی نووسەر و فەیلەسوفی فەرەنسی (جان جاک ڕۆسۆ)یان خوێندووە. باسی ئەو ئەدیب و نووسەر و سیاسەتمەدارانەی دیکەی جیهان ناکەم کە بیرەوەرییەکانیان نووسیوە چونکە مەرامی من ئەوە نییە، بەڵام لە کوردستان، لە کەسایەتییە کوردە مەزن و ڕۆشنبیر و ناودارەکان، کە یاداشتی خۆیان نووسیوەتەوە، زۆر بەتەفسیل و بەدرێژی دەبێ ناوی (مەسعوود مەلا محەمەدی جەلیزادە) بهێنمەوە، وەک نموونەیەکی ڕێکوپێک بەگوێرەی بۆچوونی خەڵکی خوێندەوار و ڕۆشنبیرانی لای خۆمان، وەک بۆم ساغ بووەتەوە، دوو جۆرە بۆچوون و تەفسیر دەرهەق بەنووسینی بیرەوەری هەیە:

یەکەمیان بایەخ نەدانێکی تەواو بەو بیرەوەرییانە و وەک کارێکی زۆر بێ سوود و بێ کەڵک و بێ مانای لە قەڵەم دەدەن، وەک ئەوەی زمانحاڵیان بڵێ: «... ئەو قسانەت...

چوویته فلانه جێ و دانیشتی لەگەڵ فلانه کەس و وا... و... واتان کرد و گوت، بەمن چی؟ یان: بەئێمەی خوێندەوار چی؟ من بۆ سەری خۆم بیەشێنم و کاتی خۆم بەفیرۆ بدەم، بەخوێندنەوەی مێژووی ژیانت... چیت کردووە و بۆ کوێ چوویت؟... (قسەی قۆڕ!!)».

دووەم ڕا و بۆچوون، بەپێچەوانەی ئەوەی پێشترە! خاوەنی ئەم بیر و بۆچوونە، ژمارەیان زۆرترە لەوانەی پێشەوە باسمانکردن! ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوێندنەوەی بیرەوەری و ژیاننامەی مرۆڤی ناسراو، لە سەرکردە و قوماندار و شاعیر و چیرۆکنووس و ئەدیب و هونەرمەند و دیکتاتۆر و تەنانەت تاوانبار و پیاوکوژ و دز و جەردە و ڕێگر و... ئەکتەر و سەماکەری ژن و فەلەکناس، گەڕیدە و دۆزەرەوەی جوگرافی و عیلمی و... و... تاد... ئەوانە دەخوێننەوە بۆ سوود لێ وەرگرتنیان... جا سوودی تایبەتی یان گشتی بێ... یاخود بۆ زیادکردنی زانیاریی گشتی و ڕۆشنبیریی گشتیی خۆیان بەمەبەستی بەهێزترکردنی کەسایەتی خۆیان لە ناو کۆمەڵەکەیان بۆ هەبوونی توانای گفتوگۆکردن و توانای وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی دێنە ئاراوە، کاتێ لە مەجلیسێک، یا کۆڕێک ئامادە دەبن و بتوانن لەو جۆرە شوێنانە، ئەوانیش بەشداری ڕا و بۆچوونەکان بن کە لەوێ باس دەکرێن و پێشنیازی خۆیان بخەنە سەر باس و بابەتەکان! واتا بەکورتی: وەڵامێکیان هەبێ لە هەگبەدا بۆ هەر پرسیارێک و، بە ڕووی سپی و سەرکەوتووانە، بەشداربیوونەکەی و ئامادەبوونەکەی بۆ خەڵکەکە ڕوون بێتەوە! هەموو جۆرە بیرەوەرییەک و ژیاننامەیەک، دەیەها ناو، ڕووداو، شوێن، چاک خراپیان تێدا هەیە... جا... بێگومان، کە تۆ ئەو باس و خواسانە دەخوێنیتەوە ئەو ناوانە دەناسیتەوە... ئەو شار و وڵات و شوێنانە بۆت ئاشکرا دەبن... دەیەها شتی تر ئاگەدار دەبیت و زۆر شتی وات لا ڕوون دەبێتەوە... زۆر وێنەی وەها دەبینی... کە ڕۆژێ لە ڕۆژان عەودالیان بووی و بەدوایاندا دەگەڕایت و ماندوو دەبوویت، کەچی چنگت نەدەکەوتن، جگە لە ئەزموون و تەجرەبەی ژیانی خودی نووسەر! زۆر زانیاری و وێنە و تەنانەت ڕای زۆر سادە و ڕەنگە لای هەندێ کەس، ئەو لایانە زۆر چرووک و بێ کەڵک بن، کەچی لەپڕ دێنە پێش چاوت و بەدرێژی باسیان دەکرێ، کە تۆ لەمێژ بوو دەتویست ئەو شتە، ئەو پیاوە، ئەو ژنە، ئەو ناوە... گوند... ڕێگەوبان... شاخ و داخ... شتێکیان لە بابەتەوە بزانیت! کاک مەسعوود محەمەد، لە بەشی یەکەمی (حاجی قادری کۆیی)دا -ل ١٣٨، دەفەرمووێ: «وەی حەیفە مێژوو بمرێ لەبەر کەمتەرخەمی زیندووان.» بۆ ئەوەش وەبیر هەندێ خوێندەواران بهێنمەوە دەڵێم کەوا خوێندنی بیرەوەری... ئی هەر کەسێک بێت، سوودی هەیە! زۆر یا کەم. من زۆرم سوود لە

خوێندنەوەی دەیەها یاداشت و ژیاننامەی کەسانێ کە بەقەڵەمی خۆیان نووسیویانە و باسی خۆیان کردووە... زۆر زۆرم سوود لێیان وەرگرتووە! هیوادارم ئەو شتانەی لێرەدا باسیان لێوە دەکەم و ئەزموونی خۆم لە ژیانمدا دەخەمە بەردەستی خوێندەوارانی ئازیز... هەر نەبێ، کاتێکی خۆشیان لەگەڵدا، لەگەڵ خوێندنەوەیاندا... بەسەر بەرن و ناوی دوو کەسیش کە خۆشیان دەوێن، لەو بیرەوەرییانەم ببینن و وێنەیان چاو پێ بکەوێ! خۆشترین کاتم بەسەر بردووە لە خوێندنەوەی بیرەوەری (مذکرات)ی هونەرمەندان: محەمەد عەبدولوەهاب، فەرید ئەترەش، عەلی مەردان، مەسعوود محەمەد، ژان ژاک ڕۆسۆ، هیرۆدۆتس گەریدە و گەشتیارەکانی لە کوردستان و عێراق گەڕاون و ڕۆژانەی خۆیان، چییان کردووە و لە کوێ شەویان بەسەر بردووە... هتد، وەک: (دەبلیو- ئار - ئەی) ئینگلیز لە کتێبەکەی: «دوو ساڵ لە کوردستان»، هەروەها بیرەوەرییەکانی (مێجەر سۆن) لە کتێبی: "گەشتێک بۆ وڵاتی نێوان دوو زێ و کوردستاندا"، کە خۆی گۆڕیبوو و جلی کوردی لەبەر دەکرد و ناوی خۆی لێ نابوو - میرزا غولام حوسێن شیرازی-، ئینجا بیرەوەرییەکانی- (هاملتون)-ی ڕۆژ بەڕۆژ، کاتێ ڕێگەی دەکردەوە... لە هەولێرەوە بۆ سەر سنووری ئێران و باسی ئەو تەنگوچەڵەمانە دەکات کە دەبوونە تەگەرە و هەواڵی کرێکارەکان و شەڕوشۆڕ لە نێوانیان... هتد، لە کتێبی (ڕێگەیەک لە کوردستان).

منیش هەر لە ساڵانی چلەکاندا، کە قوتابی قوتابخانەی (متوسطة)ی کۆیە بووم... ئەم خووە... یا ئەم هیوایەتەم گرت و هەموو سەری ساڵ، کاتێ کە (مفکرة) لە بەغدا چاپ دەکران و دەفرۆشران، بۆ ساڵی نوێ لاپەڕەکان شوێنی نووسینی چەند دێرێک دەبووەوە بۆ هەر ڕۆژێک، ئەو موفەکیرانەم دەکرین و لە نێوان لاپەڕەکانی، هەر ڕۆژە چیم دەکرد، لە قوتابخانە چیمان دەخوێند، مامۆستا فلان چی وت، فلان ڕۆژ چووین بۆ سەیران بۆ فلانە شوێن... ئیتر ئەوانەم دەنووسی، جا ناوە ناوە پێیاندا دەچوومەوە و دەمخوێندنەوە، زۆر تام و چێژم وەردەگرت و ئەو شتانەم دەهاتنەوە بیر کە نووسیبووم! وای لێ هات، پاشان بۆ هەر ساڵە دەفتەرێکی سەد، دوو سەد وەرەقەم دەکڕی چونکە وردە وردە ڕووداو و شتی زیاترم دەنووسییەوە... تا ئەمڕۆش هەر بەردەوام، ئەو ڕووداوەی کە بینیبێتم، یان لە خۆم ڕوویدابێ، کەمێک سیاسەت، هەندێ شتی چاک یا خراپ، وەک شایەدعەیانێکی ئەو زەمانە، نووسیمە بۆیە ئەم یادگار و بیرەوەری و وێنەکانم هەموو ڕاست و دروستن و بەبەڵگەوە، چونکە لە نووسینەکانی ناو ئەو موفەکیرە و دەفتەرانەم گواستوونەوە، کەوا ڕۆژ بەڕۆژ دەمنووسینەوە وەک (شاهد عیان) ڕێک باسەکانم دەنووسین. دەبوایە زۆر زووتر

ئەو کتێبەم چاپ کرابایە و بڵاوکرابایە تاکو ئەوانەی ناویان هاتووە بیان خوێندبایە و ئەو یاد و ڕۆژانەیان بهاتبایەوە بیر! بەداخەوە ڕەنگە زۆر لەو مامۆستا و کەسایەتی و هونەرمەندانە کۆچیان کردووە... بێ ئەوەی ئاگەدار بن کە یەکێک لە دۆستەکانیان، باسیان دەکات و ناویان دەهێنێ لە بیرەوەرییەکانی... بەڵام چیم بەدەستەوە نەبوو... پارەم نەبوو لەسەر ئەرکی خۆم لە چاپی بدەم! ببوورن ئەی ئازیزانی کۆچکردوو... خواتان لێ خۆشبێ و لە بەهەشتدا بن. ئامین.

وەک وتم دیسان شتێکی دیکەش دەمەوێ سەبارەت بەو بەشەی دووەمەی بیرەوەرییەکانەوە بڵێیم کەوا لەم بەشە، بەپێی بارودۆخی شار و وەزعی گشتی عێراق و، ڕووداوی سیاسی، تاو تاوە باسی ئەو ڕووداوە سیاسیانەشم کردووە کە هاتوونەتە پێشەوە، بمەوێ و نەمەوێ و گەرچی سیاسیش نەبووم، بەڵام پێویستی کردووە کە شتەکان وەک خۆیان، لێیان بدوێم.

باکووری

کوردستان- هەولێر- ٢٠٠٦

تێبینی: له بەشی یەکەمی ئەم بیرەوەرییانەمدا، باسی مێژووی له دایکبوونم کردووه که له شاری کۆیەدا، له ناو قشلەکه بووه، له ڕۆژی (٥)ی مانگی یازده (تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٨دا. ئینجا منداڵیم له قشله و خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی هەر له کۆیه، پاشان چووینمان بۆ هەولێر له ساڵی ١٩٤٦ و تەواوکردنی خوێندنم له پۆلی ٣ ناوەندی و هەروەها قۆناغی دواناوەندی، (سانەوی)م له تاکه قوتابخانه سانەوییەکەی هەولێر و تەواوکردنی له ساڵی ١٩٥٠و ئینجا دیسان گواستنەوەمان، بەماڵ و حاڵەوه، بۆ شاری کەرکووک. لەوێ ساڵێک له قوتابخانەی ئاسوورییەکان بووم بەمامۆستای سەرەتایی- پاشان له کۆمپانیای نەوتی عێراق، له کەرکووک (I. P. C.) دامەزرام وەک مووەزەفێک، تا له ساڵی ٥٣/١٩٥٢ چوومه بەغدا و له (دار المعلمین العالیة)، له بەشی زمانی ئینگلیزی وەرگیرام و چوار ساڵی تەواوم خوێند و بڕوانامەی (لێسانس)م وەرگرت و له ئاهەنگی دەرچوون (تخرج)مان، مەلیک فەیسەڵی دووەم، مەلیکی عێراق، بڕوانامەکانی بەدەستی خۆی پێ دەدایین، ئەمه کورتەی یاداشتەکانمه که له بەشی یەکەمی

(وێنەیەکی مێژوویی: خاوەن شکۆ، مەلیک فەیسەڵی دووەم،
شەهادەی دەرچوون (تخرج)م پێ دەبەخشێ ١٩٥٧/٧/١٥

ئەم نووسینەمدا باسم کردوون تاکو ساڵی ١٩٥٧. جا لێرە و پاش، لە بەشی دووەمدا، ژیاننامەم دوای تەواوکردنی خوێندنی باڵا- لە کۆلێژی (دار المعلمين العالية)، باس دەکەم.

دوای ئەو مەراسیمانەی (تخرج)، بەو پەڕی دڵخۆشی خۆمان و برادەرانمان و کەسوکارمان کە هەموو لە باخچەکانی هۆڵی فەیسەڵی دووەم، لە (باب المعظم) بەڕێوە چوون و وێنەی (مێژوویی)مان بۆ وەرگیرا، پیرۆزباییمان لێ کرا...

چەند ڕۆژێک لە بەغدا مامەوە و دەستم کرد بە موعامەلەی (تەعین)م و داوام کرد، لە فۆرمەکە، کەوا لە شاری خۆم (کۆیسنجاق) دامەزرێم وەک مامۆستای

وێنەی فۆتۆگرافیم، بەجلوبەرگ (ڕۆب)ی دەرچوون لە کۆلێژی (دار المعلمين العاليه)، لە بەغدا ساڵی ١٩٥٦/١٩٥٧

وێنەیەکی تر لە هەمان بۆنە: لە چەپەوە کوڕێکی خزمە ناوی حەننا نەمروودە، دووەم (منم)، سێیەم: یوئێل یوسف، چوارەم: یوئار داود بنیامینە...

زمانی ئینگلیزی. ئیتر نەچوومەوە ماڵەوە بۆ کەرکووک، بەڵکو لەسەر پێشنیازی ئامۆزای باوکم (ئیشایا) کە ئەو چەند شەوە لە لایان بووم، لە بەغدا، بەڕاشکاوی پێی وتم: بزانە کوڕم! پێم باش و خۆشە، سەردانێکی ماڵە ئامۆزاکانی باوکت بکەین، کە هەروەک ئامۆزای خۆتن: (مام نەمروود)ت، ماڵیان لە (دیوانیە)یە، دوایی ئەوانە، بچۆ بۆ (سەماوە)ش. لەوێش سەردانی ماڵی مامت (ئۆراهام) بکە و... ئینجا ئەو دوو ئامۆزایەت، چوار پێنج کچی جاحێڵ و جوانیان هەیە قوتابین بزانە کامیانت بەدڵ دەبێ، لە گەڕانەوەت، ئاگادارم کە من بۆتی دەخوازم و باوکیان قسەم ناشکێنن! حەز ناکەم تۆ بچیت بێگانەیەک بخوازیت مادام ئێمە کچمان هەیە! ئەوە بوو، شەوێک سواری شەمەندەفەری کردم و ناوونیشانی (دیوانیە)ی دامێ... ئەو شەوە گەیشتمە ماڵی (مام نەمروود - ئەبوحەنا) و هێشتا نەخەوتبوون و ئەبوحەنا پێکی عارەقی لە پێش بوو. خۆیان، ئەوانە هەردووک برانە، مام نەمردوو مەشروبفرۆشە لە (دیوانیە) و مام ئیبراهیم (یاخود ئۆراها)یش هەمان شت، مەشروبفرۆشە لە شاری (سەماوە). ئەوەی ڕاستی بێ، من ئەو (گەشتە)م بەدڵ بوو نەک لەبەر خاتری دیتنی کچە ئامۆزاکانم، بەڵکو لەبەرئەوەی من باشووری عێراقم نەدیتبوو تا ئەو ساڵە جا کەیفم بەپێشنیازەکەی مام ئیشایا هات و جێبەجێم کرد ئەوە بوو مام نەمروود و خێزانی و سێ کچەکەی لە دەورەم دانیشتن و

بەخێرهاتنیان کردم...

وابزانم سێ شەو لە لایان مامەوە و زۆریان خۆشویستم و لە دانیشتنەکانی شەو گۆرانیم بۆ دەگوتن و عوودم بۆ لێ دەدان و هەندێ جار ئەوانیش لەگەڵما گۆرانییەکانی (فرید الاطرش) و (صباح) و بەستەی بەغدایم بۆ دەگوتن. مام نەمروودیش داوای لاوکی لێ دەکردم.

لەم ڕۆژانەشدا، چەندین وێنەیان بۆ دەگرتم و منیش وێنەی ئەوانم دەگرت بۆ یادگاریی ئەو ڕۆژە خۆشانە...

دوای ئەو ڕۆژانەی لە دیوانییەم ڕابواردن، ئینجا مام نەمروود شەوێک منی گەیاندە

مام نەمروود (ئەبوحەنا)، دانیشتووە و من وەستاوم لە تەنیشتی.
دیوانیە هاوینی ١٩٥٧

مام نەمروود ئەو سێ کچەی هەبوو: گەورەکە – بەکراسی سپی – ناوی «لولی» بوو، ئەوی تەنیشتی، ناوەندییە، ناوی «ئیڤلین» بوو عوودەکەمی بەدەستەوەیە، ئەوی تر بچووکەکەیان بوو

دیسان وێنەیەکی دیکەی لولو و ئیڤلین.
ئەمەیان، واتە ئیڤلین جوانترینیان بوو.
ماڵی خۆیان- دیوانیە ١٩٥٧

(محطة)ی قطار. چاوەڕێمان کرد تا شەمەندەفەرەکە لە بەغداوە هات و سوار بووم و خواحافیزیم لە مامم کرد. لە ڕێگەمدا، لە ناو شەمەندەفەرە قەرەباڵغەکە، کە پڕ بوو لە عەرەبە بەدشداشە و عەگاڵ و ژنە ڕەشپۆشە شرۆپرەکان و بۆنی لەشی و جلوبەرگ و نەعلیان، ناو فارۆگۆنەکەی پڕ کردبوو... کاتیش تەواو نەدەبوو. ئەو شەمەندەفەرە لە بەغداوە بەشەو دەستی پێ دەکرد و بەرەو باشوور دەخزی تا بەیانی درەنگ دەگەیشتە (بەسرە). جا لەو ڕێگە دوورەی لە دەیان گوند و شار و شارۆچکە و وێستگەی چۆڵ، چەند دەقیقەیەک ڕادەوەستا و خەڵک دەهاتنە خوار و هەندێکی تر سەردەکەوتن. لەم ڕێگە دوورەی ئەم گەشتەمدا بیرم لەو دوو کچە دەکردەوە... جوان بوون، باوکیان پیاوێکی ڕووخۆش و قسەخۆش و خۆش مەشرەب بوو - دانیشتوانی دیوانیە و دەوروبەری زۆربان خۆش دەویست و مەعمیلی زۆر هەبوو لە ناویان... ناویان لێ نابوو (راعي الهوگە!) چونکە بەگوێرەی خواستی ئەوانی دەکرد. مەشروبی پێ دەفرۆشتن بەقەرز. مانگە و مانگ پارەیان دەدایێ! هەندێک فەلاح و کرێکار و جووتیار و دوکانچی بوون! ئەوانە بە (وەرز) قەرزەکانیان دەدایەوە!

کە گەیشتینە (سماوە)، گەنجێک هاتە پێشمەوە و پرسی تۆ (فلان)ی؟ یەکسەر منی ناسییەوە کە یەکەمجاریش بوو منی دیت! وتی (عمو ابراهيم دزني اخذك)- واتا مام ئیبراهیم من نارد بتبەم بۆ ماڵیان. مام ئیبراهیم (یان ئۆراهام) کوڕی نەبوو- سێ کچ بەتەنیا و لەگەڵ خێزانی، ناوی (ئیستر) بوو، لە خانوویێکی گەورە و خۆش کە موڵکی

خۆی بوو، دەژین! لە ویشەوە، لەسەر جادە سەرەکییەکە دوکانی بۆ خۆی کردبووەوە، مەشروباتی دەفرۆشت و دۆست و موشتەری زۆر هەبوو. ئەو کاتەی گەیشتمە مالّیان دوای نیوە شەویکی درەنگ بوو. تەنیا خۆی و ژنەکەی دانیشتبوون چاوەڕیی منیان دەکرد چونکە مام نەمروود تەلەفۆنی بۆ کردبوون کەوا ئەو شەوە، من دەچمە لایان. ئەوە بوو، دوای بەخێرهاتن و چاک و خۆشی، ئێمەش لە سەربان لێی نووستین و خەوێکی خۆشم کرد چونکە ماندوو بووم بەیانی کە لە سەربان هاتمە خوارەوە، باوکیان چووبووە دوکانی خۆی... کچەکان نان و چای بەیانیان دەخوارد... چاک و خۆشیم لەگەڵیاندا کرد و ئەوانیش بەپێکەنینەوە، بەقسەی شیرین، پێشوازی و بەخێرهێنانیان کردم... مام ئیبراهیم سێ کچی جوانی، سپی پێستەو چاوجوان و پرچ زەردی هەبوون... مارینە گەورەکەیان بوو... پێم وایە کۆلێژی یان تەواو کرد بوو یان هێشتا دەیخوێند. ناوەندییەکەیان ناوی شەمێران بوو... بچووکترینیان و جوانترینیان ناوی (قرنها پوک) بوو! وابزانم ئەم ناوە لە ئینجیل، یان لە تەوراتدا هەیە.

ئەم باوکەی ئەو کچانە، کابرایەکی مۆن و ڕووگرژ و هەمیشە تووڕە بوو. من پێشتریش،

من لە چەپەوە و دەستم بەرز کردووەتەوە، لە ناوەڕاست مام ئیبراهیم (ئۆراها) دەستم گرتووە، لە لای ڕاست: شەماشە وەردەی ئامۆزامان وێنەکەش لە ساڵانی حەفتاکان وەرگیراوە!

هەموو ئەندامانی خێزانی مام نەمروود و منیش لەگەڵیاندا.
مانگی تەمووزی ١٩٥٧ دیوانیە

کە ماڵیان لە بەغدا بۆو، منیش هێشتا قوتابیی (دارالمعلین العالیة) بووم، هەندێ شەوانی پێنجشەممە/ هەینی، دەچوومە سەردانیان وەک خزم و شەو لە لایان دەمامەوە... بەڵام هەر ئاوا بوو... هەر هاواری دەکرد جوێنی بە ژنە بەستەزمانەکەی دەدا لەگەڵ ئەو هەموو خزمەتەی کە دەیکرد و ژنەشی بەتەمەن بوو، بەڵام لێی قەبووڵ دەکرد و وەک کرێکارێکی خزمەتکار... ماڵەکەی ڕاگرتبوو. جا وابزانم هەر دوو شەو لە لایان مامەوە لەم سەفەرەم بۆ سەماوە، لەگەڵ ئەوەش کچەکانی حەزیان دەکرد بمێنمەوە... بەڵام من وەڕس بووم و زوو هەڵاتمەوە بۆ بەغدا، چونکە ئەوەی ڕاستیش بێ، سەبارەت بەخۆم، هیچ کامێک لەو چوار پێنج کچانەی ئامۆزاکانی باوکم، دڵم خورپەی نەکرد بۆیان و زۆر ئاسایی... وەک کیژی بێگانە... بەحەزەرەوە موعامەلەم دەکردن و نیشانم نەدان کە من حەز لە یەکێکیان دەکەم! ڕەنگە لەبەرئەوەش بێ، چونکە من دڵم پڕ بوو بوو لە خۆشەویستی (ئەمیرەکەم) و شوێنی یەکێکی تری تیادا نەمابوو! هەر خوا خوام بوو زوو بگەڕێمەوە کەرکووک، بۆ باوەشی گەرم و نەرمی دڵدارە خۆشەویستە جوانەکەم (ئەمیرە)... بەڵێ، بەڕاستی، شازادەی هەمووان بوو! لە بەغداش چوومە سەردانی ماڵی دۆست و برادەری دێرینم، برای خۆشەویست کاک زەعیم وەحید حوسێن بامەڕنی، کە هەر لە ساڵی ١٩٥٠وە، لە کەرکووک یەکترمان ناسی کاتێ هێشتا (ڕەئیس) بوو- سێ نەجمەی لە سەرشان بوو.

ئەم وێنەیە، لەوساوە، لە کەرکووک، پێشکێشی کردم، خۆی و خێزانی و خوشکی و برای گەورەی، هونەرمەند فەخری بامەڕنی (چاویلکەی ڕەشی لە چاوە) نابینا بوو- لەگەڵ هەرسێ مندالەکانی: زیرەک کوڕی گەورەی، ڕێبەر و گوهدار... پاشان گواسترابەوە بۆ بەغد و لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی سالی ١٩٥٨ کرایە بەڕێوەبەری ئێزگەکەی ڕادیۆی کوردی لە بەغدا و ڕوتبەکەشی بوو بە (زەعیم)... ئێستا خانەنشینە... دوو کوڕیشی ئەفسەرن...

ڕۆژی پاشتر بەشەمەندەفەری شەو بەرەو کەرکووک، سەفەرم کرد و بەیانی ڕۆژی دوایی گەیشتمە کەرکووک و دایکم و باوکم و خێزانی بوون و من پێیان شاد بووم. لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەم باسی (ئەمیرە)م کردووە کە یەکترمان خۆش دەویست!

سالی ١٩٥٧ لە حەوشەکەمان، لە ژووری ئێمە لە کەرکووک گیراوە:
لە چەپەوە دایکمە و لە ناوەڕاست: (ڕۆزە)ی دایکی ئەمیرەیە و
مندالەکە یووسفی برامە

ئەمەش ئەمیرە و دایکییەتی لە حەوشەکەی کەرکووک کە هەردوو خێزان، ئێمە و ئەوان پێکەوە خانووەکەمان بەکرێ گرتبوو.
ساڵی ١٩٥٥

لەم هاوینەدا نەخۆشی ئەنفلەوەنزایەکی مەترسیدار بڵاو بووەوە و لە هەموو جیهاندا خەڵک تووشی دەبوون زۆریش بەریان نەدەگرت و گیانیان لە دەست دەدا لە ڕادیۆ و ڕۆژنامەکانیش ئامۆژگاری بڵاو دەکرایەوە لە بابەت چۆنیەتی خۆپاراستن وەک: نزیک ئەو کەسە نەبنەوە کە تووشی ئەنفلەوەنزا بووە... نەخۆش لە ماڵەوە عەزل بکرێ (بەتەنیا بێ)- پاکی و خاوێنی لەش و لووت و دەموچاو و هەوای پاک وەرگرتن و ئا لەم جۆرە قسانە! بەڵام هەموو بەزەحمەت جێبەجێ دەکران! جا لەبەرئەوەش کە ناوەکەی، بۆ زۆربەی خەڵکی سادە و نەخوێندەوار و دێهاتەکان، بەزەحمەت دەیانتوانی بەچاکی بیڵێن، بۆیە، لە خۆیانەوە ناویان لێ نابوو (قەنزە وەنزە)... دەیانگوت، بۆ نموونە: فلانە کەس دیار نییە، یا فلان مووەزەف نەچوویتە دەوام... چونکە تووشی قەنزە وەنزە بووە!

لە لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانیش هەندێک وێنە و کاریکاتێر و تەعلیق لەسەر ئەم (ناوە)، بڵاو دەکرانەوە: ئەمەش یەکێک بوو لەو کاریکاتێرانەی لە هەفتەنامەی (الاسبوع) کە وەک گۆڤارێک بوو، بڵاو کرایەوە:

چەند ڕۆژێک بوو هاتبوومەوە و نەخۆشییەکەی ئەنفلەوەنزا لە دەرکەمانی دا و... ئیتر ماڵی ئەمیرە و ماڵی ئێمە ڕۆژانە یەک دووەکیان لە ناو جێ دەکەوتن. ئەمیرە تووشی بوو بەتووشییەوە! من هەڵاتم، سەفەرم کرد و چوومە سلێمانی، بۆ لای باوکم و فیلیپی برام، کە لەوێ، لە کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار، فیلیپ (ملاحظ) بوو. باوکم چێشتلێنەر (طباخ) بوو لە لای ئەو ئەندازیار و پسپۆڕە بیانییەکانی لەوێ کاریان دەکرد- لەو خانووەی درابوو پێیان، چێشتی بۆ لێ دەنان!

کچەکە دەڵێ: ئەوە بۆچی کە دێمە نزیکت، هەڵدێی؟ کوڕ: لە ڕاستیدا... کە دەتبینم ئەنفلەوەنزام دێتەوە بیر!

کچ (بەتەلەفۆن) دەڵێ: دەنگت زەعیفە گوێم لێی نییە! کوڕەکە: من تووشی قەنزە وەنزە بووم، لەبەر تۆ... لە دوورەوە قسە دەکەم.

ئەم چیرۆکە تەمسیلییە لە گۆڤاری (هەتاو)ی ژمارە ١٥١ کە لە ١٩٥٩/٣/١٥ دا بڵاو کراوەتەوە، پێم خۆش بوو بیکەم بەلاپەڕەیەک لەم بیرەوەریيانەم- باسی نەخۆشییەکەی قەنزە وەنزەیە دیسان.

قەنزە وەنزە

نووسەر: ع. قرگەیی- هەولێر

خاتوو پیرۆز: هەی بەخێر بێیت پلکە شاناز ئەوە چەن ڕۆژە بۆ دیار نیت؟ چەندم تاسە دەکردی هەر دەمگوت ئاخۆ پیرێژن چی بەسەر هاتووە وا دیار نییە.

پلکە شاناز: ئەی ئەی زۆرم لێ دەپرسنەوە ئەوە نزیکەی دە ڕۆژە من یەک تەختە کەوتووم جارێک نەتاننارد بزانن ماوم یا مردووم؟

خاتوو پیرۆز: نا نا خوا نەکات بمریت جارێ زۆرت بەبەرەوە ماوە ئینشاڵڵا بەم زووانە نامریت ئەوە ناساخییەکەت چی بوو وا دە ڕۆژە بۆی کەوتی؟

پلکە شاناز: کچێ چووزانم هەر کەسێ دەهاتە لام دەیگوت قەنزە وەنزەتە.

خاتوو پیرۆز: ئەدی بۆچی نەچوویتە دوختورخانە بەخوا منیش ئەو دەردە پیسەم گرت باوکی نازەنین بردمیە لای دوختەر هەندێک حەبی بۆ نووسیم و پارێزی بۆ

دانام بەسێ ڕۆژ نەجاتم بوو یاخوا کاری ئەو دوختەرە باشە ڕاست بێت.
پلکە شاناز: جا گیانەکەم بۆچی دوختەر بۆ هەموو کەسێک وەکو یەکە بەخوا هەژاری وەکو من بچێتە لایان هەر ڕووشی تێ ناکەن ئەمجا کەسێک زاتێکی موبارەکی وەکو مەلا شێخ ڕەسولی لێ نزیک بێت دوختەری بۆچییە! بەخوا هەر دەردێکت بێت بچیتە خزمەتی هەرکە سەیری کتێبەکەی کرد دەمودەست دەزانی دەردەکەت چییە نووشتەیەکت بۆ دەنووسی یەکاویەک وەکو تیغ دەیبڕێ.
نازەنین بەتوندی لە ژوورەکەی خۆی هاتەدەرێ ئەمە تۆی پلکە شاناز هێشتا هەرماوی دەمێک بوو گورت گوم بوو وامزانی پشتت کردوە لە ڕەشەبا.
پلکە شاناز: هەی پلکە شاناز بەقوربانی ئەو چاوە بەلەکانەت بیت ئەمە تۆ لە کوێی هەر چاوم لە دوت دەگیرا تاکو گلەییەکی داکو فرزەندیت لێ بکەم. ئەوە دایکت لەبەر فەرمانی ماڵی نایپەرژێ خۆ تو هەموو ڕۆژی بەبەر دەرگای کاولەکەی منا دەچیتە مەکتەب، بۆچی ڕۆژێک، هاتیت بپرسی پلکە شانازت ماوە یا مردووە؟!

یەک هەفتە لە لایان مامەوە موشتاقی دڵدارەکەم بووم و گەڕامەوە ماڵەوە، لە کەرکووک- ئەوان چاک بووبوونەوە، من یەکسەر هەر ئەو شەوە تووشی قەنزە وەنزەکە بووم لە ناو جێ کەوتم! جا ئەمیرە دەهاتە پشت سەرم و پێم پێ دەکەنی و دەیگوت: تۆ منت بەجێ هێشت و هەڵاتی- وەنییە؟ دە بیخۆ! قەنزە وەنزەکە چاوەڕێی دەکردی بێیتەوە و بەخێرهاتنت بکات! منیش پێ دەکەنیم بەڵام لە ژێر لێف و بە تا و لەرزەوە، وەڵامم دەدایەوە! دەمگوت: دەردت لە گیانم! سەبرێک بکە، بەس چاک ببمەوە، ئینجا دەبینی چیت لێ دەکەم!

مانگی ئاب ١٩٥٧ تەواو بوو، سەرەتای ئەیلوول، کاک هورمزی هاوڕێی عەزیز و برادەری دڵپاک و ڕاستەقینەم بۆم پەیدا بوو. ئەو کاتە ماڵیان چووبووە قەڵادزێ و لە کۆیە نەمابوون. باوکی- ئەسکەندەر- یانەی مووەزەفەکانی قەڵادزێی بە (متعهدی) وەرگرتبوو، و هورمزیش دوکانی خواردنەوە... عەرەق و بیرە و ویسکی دانا بوو لەسەر شەقامە سەرەکییەکەی نزیک یانەکە بوو! ئەوە بوو ئیقناعی کردم و منی لەگەڵ خۆیدا برد و چووینە قەڵادزە کە ئەوەش یەکەمجار بوو من ئەو شارۆکەیە ببینم، زۆرم پێ خۆش بوو... بەتایبەتی دیمەنی سروشتی شاخ و داخ و باغ و دۆڵی سەر ڕێگەمان و دەوروبەری قەڵادزەش. من هەر لە بیرم نەمابوو کەوا موعامەلەی تەعینم کردووە و بەدوای هەواڵدا بچم... ئایا

وێنەی ئەو، لە دوای نەخۆشیی
(قەنزە وەنزە) لاواز بووە

پێکەوە لە دوای نەخۆشیی قەنزە
وەنزە واتا ئەنفلەوەنزا

دەرچوو... دەرنەچوو؟ تەنیا ڕابواردنم لە بیر بوو. حەزم دەکرد لەگەڵ خۆشەویستان برادەران... دانیشم و بەخۆشی و بە عوود و گۆرانی و خۆشخوانی... ژیانمان بەسەر بەرین!

تەنانەت، کاتێ لە (میرزا ڕۆستەم) سواری قەیاغەکەش بووین، عوودم لێ دەدا عوودەکەم هەر لەگەڵ خۆما دەگێڕا بۆ کوێیەک بچووبام! وەک برادەرێکی گیانی بەگیانیم بوو... ئێستاکەش هەروەهایە! هەندێ جار... بەعزە ساڵ دوو عوودم هەبووە لە ماڵ سەیرت دەکرد، کە سایەتییەکی بەزەوق، عوودێکی بۆ دەکڕیم! دەیهێنا ماڵەوە... دەمگوت: ئاخر من عوودم هەیە!... دەیگوت: ئەوە تاکو منت لە بیر نەچێ! دواتر باسی ئەو عوودە دیارییانە دەکەم!

ئیتر لە قەڵادزە، لە ماڵی هورمزی دۆست و برادەری ئازیزم و لەگەڵ دایک و باوکی...

ماوەیەکی زۆر خۆشمان بەسەر برد... نەدەچووینە نادییەکە! هەر لە ماڵەوە، بەشەو دادەنیشتین و دایکی هەموو تەرتیبات و ئەوەی پێویست بوایە بۆی ئامادە دەکردین... ئینجا ئەویش لەگەڵماندا دادەنیشت و ئیتر باسی ماڵی ئێمە و هەواڵی دایکم و باوکم و ماڵە خزمەکانی دیکەی لێ دەپرسیم... و ڕۆژانی کە لە کۆیە بووین، هەموو ماڵە خزمەکانی دەهاتەوە بیر... هەندێ باس و خواسی بۆ دەگێڕاینەوە... تا کاک ئەسکەندەر، درەنگی شەو، نادییەکە چۆڵ دەبوو، ئەویش دەگەڕایەوە ماڵەوە و لەگەڵمانا دادەنیشت... تا کاتی نووستن. جا دەچووینە سەربان کە زۆر فێنک و خۆش و خامۆش بوو، خەوێکی خۆشم دەکرد... تا بەیانی ڕۆژ لێی دەدام... دەهاتمە خوارەوە.

قەڵادزەش، کە تێیدا، هەندێ ڕۆژ، پیاسەمان دەکرد، تێبینی ئەوەم کرد، شارێکی دواکەوتوو... لە هەموو لایەنێکەوە... خەڵکی سادە... کووچە و کۆڵانی بەردەڵان و خوار و خێچ... تەنیا یەک شەقامی سەرەکی هەبوو... لەوسەر تا ئەوسەری شار... ئەودیو

لەم دوو وێنانەدا، من و هورمزی هاوڕێم لە یانەی مووەزەفی قەڵادزێ لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٧، هورمز بەکامێرای خۆی، بۆمانی گرتووە

جادەکەش، دوکانی نزم و نارێک و پڕ لە هەموو جۆرە شتی خواردن... بێ سەروبەر، شتەکان دانرابوون هەروەک کۆیەی ساڵانی چلەکان...

ترومبێلەکان کەم و هەمووشیان جێب و پاس بوون. شارێکی کوردەواری تەواو و هێمن و خەڵکی هەژار... بەڵام قانع... ئەوانە بوون دانیشتوانی! خۆیان تەسلیمی خوای خۆیان کردبوو! نوێژیان نەدەچوو! مەغریب دادەهات، چۆلستان بوو! هەرکەسە دەچووەوە ماڵ و حاڵی خۆی! تەنیا ڕابواردنی مووەزەفەکانیش خواردنەوە بوو لە نادی و پاشان دەچوونە

دیمەنێکی گشتیی شاری قەڵادزە و قەڵاکەی

ماڵەوە و لێی دەنووستن... هەر ئەوەش بوو حاڵی کۆیە... ئەوەی دێتەوە بیرم! ئەمما ژن و منداڵ، ئەوانە هەر لە ماڵ دەمانەوە تا کاتی نوستن... دەخەوتن!

ڕۆژێک کاک هورمز گوتی بابچینە شوێنێکی خۆش! خواردنەوە و مەزە (مریشک و گۆشتی برژاو...)ی ئامادە کرد و جیبێکی گرت و ناوێکی بەسایقەکە گوت، جادەی خۆڵ و نارێک بوو... بەڵام بۆ (جیب)، هیچ زەحمەت نییە! گەیشتینە سەر چیایەکی بەرز... ئینجا دۆڵێکی زۆر قووڵ، کە لەبەر دار و دەرخت، بنی دیار نەبوو. لەوێ لێی دانیشتین و دەست کرا بە بەزمەکە! کاتێ مەست بووبووم و دەنگم بەرز دەکردەوە و دەنگی عوودەکەم لەو چیا و چۆڵ و دۆڵە دەنگی دەدایەوە! دۆڵێک بۆ سەرەوەتر هەوراز دەبووەوە، لەسەر لووتکەکە... هورمز وتی: ئەوێ سەر سنووری ئێرانە! پاشی دەمێک، کابرایەک هات و وتی: ئاغا فەرمووی با بفەرموونە دیوەخان! ئەوە بوو شتمان پێچایەوە و بەدوای کەوتین، زۆر دوور نەڕۆیشتین، دیوەخان و کەپرێکمان هاتە پێش و پیاوەکە ئاماژەی کرد... و چەند کەسێک هەڵسانە سەر پێ و بە پیرمانەوە هاتن! یەکێکیان، هورمز دەیناسی، وتی: ئەمە بابەکر ئاغای پشدەرە! من ناوم بیستبوو... ئیتر تۆقەمان کرد... لە سەرەوەی دیوەخانەکە دانیشتین. سەرلەنوێ دەستمان پێ کردەوە و ئەوانیش چەند کەسێکیان دەیانخواردەوە... کەپرەکەش پڕ بوو لە خەڵک و لەسەر سەکۆبەکان دانیشتبوون و سەیریان دەکردین... خواردنیش بۆ ئەوان هات و چای بەدواوە هات و گۆرانی وتن بەکوردی و عەرەبی، شەوێکی سارد و خۆش بوو دەنگی خۆم و عوودەکەم لەو چیا و دۆڵانە دەنگی دەدایەوە!

لە دوای چەندین ساڵ و، ڕاستتر لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤، کە بەڕێز بابەکر پشدەری تەعین کرا بەسەرۆکی (المجلس التشريعي لمنطقة الحكم الذاتي) و لە هەولێر نیشتەجێ بوو، شەوێکیان دەعوتێکی گەورەی لە ماڵەکەی، لە نزیک فولکەی

خۆم و عوودەکەم و
هورمز/ پشدەر ١٩٥٧

لە ڕاستەوە: ئیسماعیل
ڕەسووڵ، بابەکرئاغا پشدەری،
ئیحسان موفتی، لە یەکەم
دانیشتنی (مجلس التشریعی)
حوکمی زاتی ١/١٠/١٩٧٤

زەعیم کرد و، هونەرمەندانیش خوالێخۆشبووان تایەر تۆفیق و حەیدەر بەقاڵ (حەیدەرە کەچەڵ) و من دەعوەت کرابووین. جا لەو شەوەدا، بابەکر ئاغا یادی ئەو ڕۆژی بەبیرهێنامەوە کە لە گوندی (هێرۆ)ی خۆیان، لە دیوەخانە هاوینییەکە، من ئامادە بووم عوود و گۆرانیم دەگوت... منیش وتم: بەڵێ، ئەرێ وەڵڵا شەوێکی زۆر خۆش بوو... ئەویش چونکە هەندێ جار دەچووە نادی قەڵادزەی ئەو زەمانە، باوکی هورمز و هورمزی دەناسین! شەوێک مام ئەسکەندەر کە هاتەوە پێی وتم: کوڕە لە سلێمانییەوە تەلەفۆنیان بۆ کردم و دەڵێن با زوو بێتەوە و بڕواتەوە بۆ کۆیە چونکە تەعینی لەوێ دەرچووە وەک مامۆستا و دەبێ بچێت دەوام بکات... منیش زۆر دڵخۆش بووم بەم هەواڵە... شەوی دواتر دیسان باوکی هورمز کە هاتەوە درەنگی شەو و ئێمە هێشتا دانیشتبووین، وتی: ئەوا لە

کۆیەشەوە تەلەفۆنیان کرد. بەڕێوەبەری قوتابخانە لێت دەپرسێ و دەڵێ با بێتەوە (مباشرە)ی بۆ بنووسین، ئینجا با دیسان بچێت و بگەڕێ! بۆ خۆی باشە ڕۆژێک زووتر (موباشەرە) بکات، بۆ تەرفیع و خانەنشینی یەک ڕۆژ... زووتر دەوام بکات، سوودی هەیە.

چارە نەما... ڕۆژی پاشتر دوعاخوازیم لە هورمز و دایک و باوکی کرد و بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتم... چوومە لای فیلیپی برام... وتی کاکە دنیا لە دوات دەگەڕێن! مامۆستا شەفیق سابیر... مودیرتان چەند جارە تەلەفۆنی بۆمان کردووە و دەڵێ: هەر بێت و ڕۆژێک دەوام بکات و موباشەرەکەی بنێرم بۆ هەولێر، ئینجا با چەند ڕۆژێکی تر بڕواتەوە... بۆ کوێ دەچێت، زەرەری نییە، من ئیجازەی دەدەمێ بێ ڕەسمیات! ئینجا کاک فیلیپ قاتێ جلی ستره و پانتۆری بۆ کڕیبووم بەڕەنگێکی شەکەری جوان و ڕێک، دایمێ وەک دیاری یەکەم تەعینم... ڕۆژی دواتر چوومەوە کەرکووک... گرفتم هەبوو: نە بەخۆم و نە ئەمیرە... حەزمان نەدەکرد لێک جیابینەوە! منیش دەترسام نەوەک ئەو تەعینەم، دوورکەوتنەوەم بۆ ماوەیەکی زۆر... ئەمیرە سارد بکاتەوە یان من خۆم، بکەومە ناو مەسئوولیەتی مامۆستایەتی و واجب و ڕەسمیات... ئەوم لە بیر بچێتەوە، وردە... وردە! هەموو ڕۆژێک دەمگوت: کچێ با بڕۆم! ئەوە لە کۆیە قوتابخانە دەستی پێ کردووە و من مامۆستایانم دەبێ هەر بچم... سبەی دەڕۆم، باشە؟! دەیگوت باشە! بەڵام ئی دڵی نەبوو! خۆم ئامادە کرد و جانتا و جل و کتێب... ئامادە بووم... بەڵام پێیەکانم بەقسەیان نەدەکردم... تا لە پڕ دیسان کاک هورمز لە بۆم پەیدا بوو! ئەو کوڕە زۆر منی خۆش دەویست! برای نەبوو! من لە جیاتی برای بووم. نەیدەتوانی لە ماڵی خۆیان ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە و من نەبینێ! ئیتر ئەویش لەگەڵ ئەمیرەکەم مشتومڕی بوو... تا ئیقناعی کرد و ڕۆژی دواتر چووینە گەراج بەعەرەبانەیەک... لە گەراجی کۆیەش، جێبێک حازر بوو... سوار بووین و بەرەو کۆیە ڕێگەمان گرتەبەر.

ئەو مرۆڤە، هونەرمەندە، بەزەوق و هەستیارە، ئەوەندە عاشقی من و عوود و ئەخلاق و گۆرانیم نەبوایە من قەت ئەوەندە وێنەی فۆتۆگرافیم نەدەبوو... قەت ئەوەندە سەفەر و گەشتم پێ نەدەکرا، بەتەنیا! ئەو هەمیشە، بەخۆ و بەگڕ و تینی گەنجایەتی و کامێراکەی بەهەوەسی بۆ ژیان... بۆ ڕابواردنی برادەران و، بەتایبەتی لەگەڵ مندا ئەوپەڕی خۆش ڕابواردنی ئەو بوو. لە کۆیە، ئەو شەوە هەردووکمان لە ماڵی مام تۆماسی پۆلیسی خانەنشین و مێردی ڕۆمنی ئامۆزام، دایکی جان، دابەزین. بۆ بەیانی دوعاخوازیمان لە

هورمز ئەسکەندەر زەیا، هاورێی خۆشەویستم تا مرد.
هەزار سڵاو لە گیانی پاکی بێت

یەک کرد من و هورمز، ئەو چووەوە قەڵادزە و منیش چوومە دەوام لە قوتابخانەی ناوەندی کوڕان! کە دەکەوێتە سەر شەقامی سەرەکی، ئەوەی بۆ لای ئاشان و حەمامۆک دەچێت- لەوێ لەگەڵ مامۆستاکان یەکترناسینمان کرد: بەڕێوەبەر مامۆستا شەفیق سابیر مۆڵەتی ڕەسمی هەبوو چووبووە هەولێر- وەکیلی: مامۆستا سدیق عەبدولقادر بوو لەگەڵ باقی مامۆستایان، لە ژووری بەڕێوەبەر دانیشتین. میلاکی قوتابخانە، کە بەئەمری ئیداری وەزارەتی مەعاریف- بەڕێوەبەرایەتیی گشتی، ژمارە ٥٧١٦٣ لە بەرواری ڕۆژی ١٩٥٧/١٢/١١، بەم جۆرەی خوارەوە بوو؛

١- شفيق صابر المدير الاختصاص اجتماعيات: الراتب- ٥٧ دينار
٢- عبدالرحمن سيد علي مدرس العربية: الراتب- ٢٨دينار (موفد الى خرمشهر)
٣- عمر محمد درويش مدرس العربية: الراتب- ٢٨ دينار
٤- اندريوس اسرائيل خمو مدرس الانكليزية: الراتب- ٢٨ دينار
٥- جمال غفور مدرس الاجتماعيات: الراتب- ٣٢ دينار
٦- صديق عبدالقادر مدرس الطبيعيات: الراتب- ٣٦ دينار
٧- ساقي باقي مدرس الرياضيات: الراتب- ٣٥ دينار
٨- عبدالرحمن طاهر كاتب الكتابة: الراتب- ١٢ دينار

کەچی من تەعینم لە مێژووی ڕۆژی ١٩٥٧/٩/٧ دەرچووبوو بە(ئەمری وزاری) ژمارە: ٣٦٥٩٩ی ڕۆژی ١٩٥٧/٩/٧. بەڵام لەبەرئەوەی من درەنگ هاتم موباشەرەم کرد و نەمدەزانی کاریگەری ئەو دواکەوتنەی من چی بوو!! زەرەریشی هەبوو بۆم!

شاره خۆشەویستەکەم کۆیەی دێرین کاتێ کە گەڕامەوە باوەشییەوە ١٩٥٧، دوای دابڕانی نزیکی دە ساڵ چونکە لە ١٩٤٦ بەماڵەوە چووینە هەولێر

دیوی دەرەوەی قوتابخانەی ناوەندیی کۆیەی کوڕان و دەرگەکەی سەر جادەی، کە لە ساڵی ١٩٥٧ هاتمە ئامێزی وەک مامۆستا، ئێستاکە ساڵی ٢٠٠٥ بوویتە قوتابخانەی سەرەتایی

جا دوای ئیسراحەت و چای خواردنەوە... و لەبەرئەوەی جارێ قوتابیانیش دەوامیان ڕێکوپێک نەبوو... وەک عادەتی سەری ساڵی خوێندن... دوای دوو سێ مانگی پشووی هاوین، کە ڕۆژی دەوامکردن دێتەوە و قوتابی وا هەنە، وەک بڵێی هێشتا لە عوتڵەکە تێر نەبووبن، ئەگەر هەر نەبێ، دوو ڕۆژی دیکە، لە خۆیانەوە ناچنە مەکتەب... دەزانێ ماموستا و بەرنامە و خشتەی دەرسەکان هێشتان ڕێکوپێک نەبووە... بۆیە دوا دەکەون... ئینجا منیش بەماموستا سدیقی وەکیلی بەڕێوەبەرم گوت: ماموستا، بەخوا منیش هێشتا لە عوتڵەکە تێر نەبوویم. ئەگەر بفەرمووی، تاکو ماموستای بەڕێوەبەر دەگەڕێتەوە، یەک دوو ڕۆژ مۆڵەتم بدە... کەمێک لە شارەکەم و لە کووچە و کۆڵانەکانی بگەڕێم... ئینجا کە کاک شەفیق هاتەوە، منیش دێمەوە! ماموستاکانیش تەئیدیان کردم و ماموستا سدیق فەرمووی، بەئارەزووی خۆت، حەزت کرد وەرە... ڕۆژی سەرێک بدە و بڕۆوە! ئەگەریش هەر پێت خۆشە بگەڕێی... ئەوا تۆ مۆڵەت دراوی! سوپاسم کرد...

دوو ڕۆژ، لە بەیانییەوە لە ماڵی تۆماسی باوکی جان... مێردی کچە ئامۆزام (ڕۆمێ)... دەردەچووم، تاکو نیوەڕۆ، نەدەگەڕامەوە... بەناو کۆڵانەکاندا پیاسەی لەسەرەخۆم دەکرد... یەک یەک ئەو خانووانەی ساڵ لە دوای ساڵ، بەکرێ تێیاندا کرێچی دەبووین، سەرم لێ دەدان... هەموویان هەروەک خۆیان مابوون! هەمان کۆڵانە بەردەڵانە خواروخێچەکان... هەمان خانووە قوڕ و گێچەکان... بازاڕی گچکەی ناو گەڕەکان... مزگەوتەکان... ئینجا قوتابخانە سەرەتاییەکان و بازاڕ و دوکانەکان... لێرە و لەوێش، یەکێک دەهات و ڕووبەڕووم دەبووەوە و دەیناسیمەوە... چاک و خۆشییەکی گەرمی لەگەڵما دەکرد و هەواڵی باوکم و دایکمی دەپرسی... بەم جۆرە دوای دوو ڕۆژ بیستم ماموستای مودیر کاک شەفیق سابیر گەڕایتەوە، ئینجا منیش بەیانی دیکە چوومە دەوام و بینینی ماموستام... کە لە قوتابخانەی سەرەتاییی دووەمی کۆیسنجاق، لە ساڵی ١٩٤٠و ٤١ و ٤٢ لە پۆلی پێنجەم سروود و وەرزشی پێ دەگوتین!

ماموستا شەفیق بەگەرمی پێشوازی لێ کردم و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بەبوونم بە ماموستا لە لای ئەو هەروەها وتی ئێمە بەوە کەیفخۆشین کە خۆت داوات کردووە لە شارەکەت، کۆیە، دامەزرێی... لە کاتێ کە زۆر کۆیی هەنە، لێرەوە داوای گوازتنەوەیان دەکەن بۆ شارانی تر! منی بردە ئەو پۆلەی کە ئەو بەیانییە یەکەم دەرسم لە لایان هەبوو. قوتابییە بچووکەکانم زۆر کەیفیان هات و بەخێریان هێنام ئەو دەرسە هیچم نەگوتەوە... چونکە پۆلی یەکەم بوو! بۆیە هەندێ ئامۆژگاریم کردن و هانم دەدان کە بخوێنن و بۆ دواڕۆژ

دەرگای گومرگی کۆنی کۆیە کە پێیان دەگوت ئیدارە... شوێنی کۆکردنەوەی تووتن بوو، ئینجا بەلۆری دەهاتنە پێش ئەم دەرگایە و باریان دەکردن و دەیانبرد بۆ کەرکووک و بەغدا

تاقی حاجی عەبدوڵڵا بەگ، گەڕەکی قەڵات. پەنجەرە گەورەکەی پێشەوە... لەسەر تاقەکە ... ئەوە لە ساڵی ١٩٤٠/١٩٤١ ماڵی ئێمەی تێدا بوو، ئەو کاتە من پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم

مامۆستامان زەکی ئەحمەد هەناری خوای لێ خۆشبێ، بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتاییی دووەم لە کۆیە ساڵی ١٩٤٠

ببنە مرۆڤی بەکەڵک و سوودبەخش بۆ گەل و وڵاتیان...

ئەو ڕۆژە کە چوومەوەماڵی زاوامان، تۆماس، بە ڕۆمیێی ئامۆزام گوت ژوورێکم بۆ بدۆزێتەوە بەکرێ بۆم بگرن و بڕۆم لە لایان... چونکە ڕۆژێک و دوو و سێ ڕۆژ نییە نامەوێ ئەوان نارەحەت بن و منیش حەز دەکەم دەوروپشتم خامۆش و هێمن بێ... زیاتر ئیسراحەت دەکەم و باشتر ئەرک و کارەکانم ئەنجام ئەدەم! ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێکی تر، ڕۆمێ وتی ماڵی مامۆستا عاشوور ئەفەندی، دوو ژوورەکەی پێشەوە لای دەرگای حەوشە، بەکرێ دەدەن. چووم ژوورەکانم دین، پاک و خاوێن و شوێنەکەشی بۆ من باش بوو.

نزیکی قوتابخانەم بوو... بۆیە چوومە لای بەڕێز مامۆستا عاشوور ئەفەندی کە پیاوێکی تەمەنی نزیکی پەنجا ساڵێک دەبوو، ئاسووری بوو... بەخێرهاتنی کردم و هەواڵی باوکم و دایکمی لێم پرسی، چونکە یەکتریان دەناسی... ئینجا لەسەر کرێی ژوورەکانیش ڕێک کەوتین. ئەوەش کارێکی باش بوو بۆ من تاکو ژیانم تەئمین بکەم و دابمەزرێم و دەستکەم بەکارکردن لە قوتابخانە و ئامادەبم پیشەکەم بەجوانی هەزم بکەم.

ئینجا کاغەزێکم نارد بۆ کەرکووک بۆ دایکم کە ماری خوشکم و یووسفی برا بچووکمان، بێنە لام... یووسف با لێرە بخوێنێ و ماریش قوتابخانەی بەجێ هێشتبوو... تا پۆلی شەشی خوێند بوو! هەوەسیشی بۆ قوتابخانە نەمابوو! ئەوەبوو... ماری و یووسف هاتن. منیش لە بازاڕ هەندێ کەلوپەلی پێویست و زەخیرەم کڕی... مافوورێکی بچووک و

ئەمەش دەرگای حەوشەکەیە کە ساڵی ١٩٥٧ دوو ژوورەکەی پێشەوەیم لە عاشووره فەندی بەکرێ گرت. ئەم وێنەیەش ساڵی ١٩٩٥ یووسفی برام گرتی بۆ خۆی وەک یادگاریی ئەو ڕۆژانەی کە لەگەڵمان بوو

ئەمە خۆمم لەو ژوورەی کە بەکرێمان گرت... ساڵی یەکەمی مامۆستایەتیم

ڕادیۆ و قۆری و کتلی و... تاد. ماری کیژێکی کابان بوو. خۆی حەزی لە خواردنی خۆش دەکرد. قۆڵی لێ هەڵماڵی و دوو ژوورەکەی بۆ ڕێکخستین... ئەوی لای ڕاست بۆ دانیشتن و نووستن... ئەوەکەی بەرامبەری... بۆ زەخیرە و چێشتلێنان و کەلوپەلی کەوا هەردەم پێویست نەبوو. کە سەر و دڵم ڕەحەت بوو سەبارەت بەژیانی ڕۆژانەی و هەبوونی شوێنی تایبەتی خۆم، واتا ماڵ و حاڵی خۆم، خواردن و حەوانەوەم دابین بوو... یووسف لە قوتابخانە دامەزرا... ماری خوشکمان، وەک دایک کار و ئیشی ماڵەوە لە چێشتلێنان و پاک و خاوێنی و جل شووشتن و ئووتی و... تاد... زۆر بەجوان ئەنجام دەدا... ئینجا من خۆم تەرخان کرد بۆ مامۆستایەتی بۆ قوتابخانە و قوتابی... دەرسی ئینگلیزی هەر شەش پۆلەکانی قوتابخانە بەسەرمدا سەپێنران: چونکە هەر پۆلێک دوو شوعبە بوو: واتا پۆلی یەک دوو شوعبە بوو ا، ب پۆلی دووەمیش هەروا و سێیەمیش. هەفتەی ٣٠ دەرس. زۆری نەخاند بیرم کردەوە... هەستم کرد کەوا من پێویستە جموجووڵانەوەیەکی هونەریش لەو قوتابخانەیە دەست پێ بکەم، مادامەکی ئەزموونم هەیە و لە تواناشمدا هەیە! ئەگەر ئەوە بکەم، سوودی زۆرە بۆ شارەکە و قوتابخانەکە و بۆ خۆشم! چونکە هێشتا لە چوونە یانەی ئێواران و یاریکردنی کاغەز، کۆنکان و قومار و ئەو شتانە ڕانەهاتبووم. کاتی خۆمم هەر لە ماڵەوە بەسەر دەبرد، بەگوێگرتن لە ڕادیۆ، خوێندن و تاو تاوەش لەگەڵ عوودەکە خەریک دەبووم!

ڕابردووی ژیانی تەنیاییم لە سەرەتای تەعین بوونم وەک مامۆستا لە کۆیە، بەژەنینی عوود یا جومبووش و دانانی ئاواز. پاییزی ساڵی١٩٥٧

ژیانی زگورتیاتی و تەنیایی، لە ژوورەکەمدا. گوێگرتن لە ڕادیۆ و بەرنامەکانی کوردی و عەرەبی لە زستانی ١٩٥٧ لە کۆیە

## دەستکردن بەچالاکییەکان لە قوتابخانەی ناوەندی کۆیسنجاق

لە یەکەم کۆبوونەوەی مامۆستا و بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان، ناوەندی کۆیە، کە نۆرە هاتە سەر من و لێمیان پرسی: من چیم لە هەگبەدایە؟ لە وەڵامدا پێم ڕاگەیاندن کە هەندێ بیرۆکەم لایە... حەز دەکەم ئەنجامیان بدەم بەکورتی، ئەوانەی خوارەوە بوون:

١- دامەزراندنی تیپێکی سروود و مۆسیقا لە قوتابییە بەهرەدارە دەنگخۆشەکان بۆ قوتابخانەکەمان.

٢- پێکهێنانی کۆمەڵەیەک (جمعیة) لەو قوتابیانەی لە زمانی ئینگلیزی زیرەکن ... لە خوێندن و قسەکردن و، کۆبوونەوەیان پێ بکەین هەفتەی ڕۆژێک بۆ فێربوونی قسەکردن (دایەلۆگ) و خوێندنی باشتر... چونکە ئەوسا، پرۆگرامی فێرکردنی ئینگلیزی لە هەموو قوتابخانەکانی عێراق، هەموو قۆناغەکان، هەر لە سەرەتاییەوە، جەخت دەکرا تەنیا لەسەر خوێندن و نووسین (ئیملا)... و گرامەر، هەروەها ئەو جەمعیەی کە پێکی دەنێین، هەوڵ بدەن نەشرەیەکی هەفتانە، لە نووسین و بەرهەمی قوتابیان بڵاو بکەینەوە ئەگەر بکرێ لە چاپیشی بدەین.

٣- ڕێکخستنی ئاهەنگێکی گۆرانی و سروود و مۆسیقا، بەبۆنەی سەرەتای ساڵی نوێی خوێندن و ناساندنی قوتابییە نوێیەکان بە مامۆستا و قوتابیانی ساڵانی پێشتر و ڕوونکردنەوەی هەندێ زانیاری دەربارەی سیستەمی ئەو مەرحەلە تازەیە، مەرحەلەی ناوەندی کە جیاوازە لەگەڵ سەرەتایی، ئەوەش بکرێتە عادەتێک، هەموو سەری ساڵێک.

٤- پێکهێنانی تیپێکی تەمسیلیش... بۆ پێشکەشکردنی هەندێ شانۆگەری. مامۆستا و بەڕێوەبەر زۆریان پێ خۆش بوو... قسەکانمیان نرخاند وەک خزمەتێکی باش بۆ شارەکە! مامۆستا شەفیق سابیری بەڕێوەبەر وتی: کەوا ئەمادەیە بۆ هەر جۆرە یارمەتییەکی پێویست بێ. ئیتر قۆڵم لێ هەڵماڵی و چەند قوتابییەکم هەڵبژاردن دوای تاقیکردنەوەیان، سەبارەت بەوەی ئەگەر گوێی مۆسیقایان باشە و دەنگیان ناساز نییە و بەجورئەتن بۆ وتنی سروود و گۆرانی و نواندن... هەروەها ڕۆژانە لە کاتی وانەی

ئینگلیزی، چاک ورد دەبوومەوە لە خوێندن و قسەکردنی قوتابیان لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانم بە ئینگلیزی... دوای ماوەیەک نزیکی ٢٠ قوتابییەکم ناونووسکردن... بەکورتی: دەستمان بەڕاهێنان کرد... هەفتەی جارێک لەگەڵ قوتابیانی زمانی ئیگلیزی، لە ژوورێک کۆ دەبوومەوە دوای دەوام و مەشق و ڕاهێنانم لەگەڵیاندا دەکرد... خوێندن... نووسین و قسەکردن... داواشم کرد بابەت بنووسن بۆ ڕۆژنامەیەکی سەردیوار (نشرة)... قوتابیی وێنەکێش و خەتخۆشیشمان هەبوو بۆ ڕەسمکردن و نووسینی...

لە لایەکی دیکەشەوە... چەند ئامێرێکی مۆسیقای خۆم، کە هەمبوو لە ماڵەوە، جومبووش- عوود- کەمان- یەک دوو شمشاڵ- دەف و دومبک... دەمبردنە قوتابخانە، دوای نیوەڕۆی دووشەموان و پێنجشەممە... دیسان لەگەڵیان خەریک بووم، هەندێ زانیاری کۆنی خۆمم هەبوو لە بابەت نووسینی نۆتە و خوێندنەوەی... لەگەڵیان خەریک دەبووم، وردە وردە... ئەوانیش چاک گوێیان دەدامێ و بەعیشقەوە حەزیان دەکرد فێربن ئەو ئامێرانە بەکاربهێنن!

لە قوتابییە باشەکانی کۆمەڵەکەی ئینگلیزی ئەوانە بوون:

١- فریاد شەفیق ئاغا

٢- ئەنوەر تاهیر (مەلا ئەنوەر)

٣- ئیبراهیم فەرەجوڵڵا

لە ڕەسمکردن و خەت نووسین، خۆشنووس قوتابی: کەریم حەمەد بوو.

ئەو قوتابیانە هەوەسی شانۆیان هەبوو

١- زرار فەتحوڵڵا

٢- شمۆئیل گۆریل

٣-تەها خورشید بەگ

٤- ڕەفیق عەبدولڕەحمان

٥- خورشید مستەفا

قوتابییەکانی بەشی مۆسیقا، زۆربەیان لە پۆلی یەکەمم هەڵبژاردن بۆ ئەوەی ماوەی ٣ سێ ساڵ لە گەڵمانا بن و سوودیان لێ وەرگرین، ئەوانەی خوارەوە بوون:

١- زاهیر محەمەد - کەمان، (تەنیا ئەوەیان پۆلی دووەم بوو)

٢- ئیبراهیم فەرەجوڵڵا- کەمان
٣- حەمید ئیسماعیل- کەمان
٤- ئەکرەم باقی - عوود
٥- کاکە مەم قادر- عوود
٦- سەردار ئەحمەد - شمشاڵ- نەی
٧- عەونی عەلی مەولوود- تەپڵ
٨- نەشئەت حەمید- دەف- تەپڵ
٩- ئەنوەر تاهیر- کۆرس- گۆرانی
١٠- ئەکرەم ئەنوەر- کورس- گۆرانی
١١- وریا قادر حەسەن- کۆرس و گۆرانی

ئەمانە و لە دەرەوەی قوتابخانەش لە قوتابخانەکانی سەرەتایی هەندێ کچ و کوڕمان بۆ کۆرس و هەڵپەڕکێ ڕاهێنا و لە ئاهەنگ و بۆنەکان ئامادە دەبوون و بەشدارییان دەکرد وەکو:

قوتابی
ئەنوەر تاهیر- مەلا ئەنوەر

١- مامۆستا بیلال بەهائەدین- کەمانچەی دەژەنی
٢- جەمال کەریم حەمە مەلا- کۆرس و گۆرانی و تەمسیل
٣- گەلاوێژ قاسم چیچو- قوتابیی سەرەتایی بوو
٤- نەسرین سالح مەولوود (یان مەولوود سالح)
٥- پەیمان عەبدوڵڵا تەها- قوتابیی سەرەتایی بوو
٦- گەلاوێژ سالح مەولوود قوتابیی سەرەتایی بوو
٧- ماری خوشکم- نواندن و گۆرانی
٨- یووسف باکووری- گۆرانی و عوود و کۆرس
٩- سەلاح محەمەد - گۆرانی- کۆرس
١٠- عەدنان جەمال- گۆرانی - کۆرس
١١- جان تۆماس- دەف و ڕزم...

دایک و باوکانی قوتابییەکان ئەو هەواڵانەیان پێخۆش بوو و دەستخۆشیان لێ دەکردین... بۆیە گەنجانی دڵگەرمی کۆیی و خاوەن چێژ وەرگرتن لە هونەری ئەدەب... بڕیاریان دا کۆمەڵەی هونەرد جوانەکان لە کۆیە دامەزرێنن و مۆڵەتی ڕەسمی وەربگرن.

سەلاح محەمەد (منداڵەکەیە) لەگەڵ تیپی باواجی ١٩٥٨، مەلا ئەنوەر لەگەڵ کۆرسە

هونەرمەند جان تۆماس، لە تەمەنی گەنجایەتیدا

تەنانەت هەندێک لە باوکانی پیاوی ئاینی بوون، بەڵام ڕۆشنبیر بوون و پێیان خۆش بوو، مامۆستا مەلا محەمەد، باوکی قوتابی زاهیر و سەلاح مەلا محەمەد. ئیتر چالاکیی زۆرمان جێبەجێ کرد و هەمیشە کۆبوونەوە و دانیشتن و ڕا و تەگبیر دەکرا- خەڵکی شار و ڕۆشنبیران ئامۆژگارییان دەکردم و هانیان دەدام کە ئەو بزووتنەوەیە بەردەوام بێ و پەرەبسێنێ! جارێ بۆ ئەوەی قوتابییەکانمان ڕاستەوخۆ چێژ لە هونەر وەرگرن و لە پێش چاویان ببینن، لەگەڵ مامۆستای بەڕێوەبەر ڕێککەوتین، ڕۆژێک دوای دەوام، ئاهەنگێکی

خنجیلانە پێشکێش بکەین هەر لە قوتابخانەکەمان و تەنیا بۆ قوتابییەکان- ئەوە بوو لە هەمان پاییزی ١٩٥٧، لە هۆڵی قوتابخانە، کۆسپێکم وەک شانۆ لە ڕەحلە و مێز و ئەوەی دەشیا و، بەهاریکاری قوتابیان، دروستمان کرد... ڕایەخم لە ماڵەوە برد و هەندێ گۆرانیمان لە لایەن دوو سێ قوتابیی دەنگخۆش ئامادە کرد، بەڵام هێشتا ئامێری مۆسیقای تەواومان نەبوو و قوتابییەکانیش هێشتا دەرفەتیان هەندە نەبوو بۆ مەشقکردن بۆیە من بە عوود و قوتابیی شمشاڵژەن: سەردار ئەحمەد بە شمشاڵێکی ئاسن و قوتابی عەونی عەلی مەولوود بە تەپڵ و یەکێکی تریش بە دەف، چووینە سەر شانۆ و دەستمان کرد بە پێشکێشکردنی برگەکان: گۆرانی و سروود و پارچە مۆسیقا و لە دواییشدا شانۆگەرییەکی کۆمیدی بەناوی (حوکمی قەرەقۆش)، کە تیایدا من دەوری حاکم قەرەقۆشم وەرگرتبوو لەگەڵ هەندێ قوتابی بەتوانا لە تەمسیل وەک زرار فەتحوڵڵا و شمۆیل و ڕەفیق عەبدولڕەحمان و کوڕێکمان کردبووە ژن چیرۆکەکەش خۆم ئامادەم کردبوو و دەرهێنانیش خۆم و جێبەجێم کرد، کە بەڕاستی ئەو شتەمان کرد هەر بەبێ نووسین - بەزمانی عەرەبیش پێشکێشمان کرد و زۆریش سەرکەوتوو بوو. مامۆستاکان، ئاگام لێیان بوو لە کاتی نمایشکردن، خۆیان پێ ڕانەگیرا لەبەر پێکەنین.

ئەم هەواڵانەش دواتر، مامۆستا شەفیق ناردبووی بۆ ڕۆژنامەی (الحریة)- ئەوە بوو لە ژمارەی (١١٢٩)ی کە لە ڕۆژی ١٩٥٨/٣/١٠ دەرچوو، زۆر جوان هەموو چالاکییەکانیان بڵاو کردبووەوە. بەڵام هەڵەیان لە ناوی قوتابخانەکە کردبوو، ناوی بە(متوسطة دهوک)یان بڵاو کردبووەوە- کەچی چالاکییەکان و ناوەکان و مامۆستاکان هەموویان ئی ناوەندیی کۆیسنجق بوو: هەروەها هەندێ هەواڵی دیکەی چالاکییەکانمان لە گۆڤاری (المعلم الجدید) ساڵی ١٩٥٨ بڵاو کرایەوە...

**فعاليات متوسطة كويسنجق**

تشكلت في متوسطة كويسنجق جمعية للغة العربية بارشاد المدرس السيد عمر درويش ، فأصدرت نشرة مدرسية أسهم الطلاب في تحرير الجزءين الاولين منها . كما تشكلت فيها جمعية للغة الانكليزية بارشاد المدرس السيد أندريوس خمو فأصدرت نشرة انكليزية باسم "School Times" واقامت حفلة سمر مدرسية مثلت في نهايتها رواية هزلية بعنوان « حكم قرقوش » . والى جانب هاتين الجمعيتين تألفت جمعية الفنون الجميلة التي يؤمل ان تقدم شيئا من نتاجها بعد عطلة نصف السنة حين يتم تدريبها على الآلات الموسيقية التي اهدتها مديرية معارف لواء اربيل الى المدرسة [illegible] .

ڕۆژێک، مامۆستا نەشئەتی بەڕێوەبەری مەعاریفی لیوای هەولێر، هاتە کۆیە بۆ سەردانی قوتابخانەکان. جا کە هاتە لامان، لە ناوەندیی کۆیە و کاک شەفیق سابیر

متوسطة

من ادارة المدرسة

تشكلت جمعية اللغة العربيـــة باشراف السيد عمر درويش . وجمعية اللغة الانكليزية باشراف السيد اندريوس خمو مدرس اللغة الانكليزية وقد افتتحت الجمعية موسمها بحفلة شيقة وقدمت فيها شتى الفعاليات من موسيقى واناشيـد ونكات ثم تمثيلية هزلية بعنوان – حكم قرقوش – نالت اعجاب الحاضرين . وتصدر الجمعية نشرة خاصة باللغـة الانكليزية يحررها الطلبة

– يقوم المدرس جمال غفور بنشاط ملحوظ لتدريب الطلبة على شتى الفعاليات الرياضية تمهيدا للاستعراض العام للمدارس

– يتبارى بين حين واخر فريـق مدرستنا الرياضي مع بقية الفرق الاهلية على ملعب المدينة

– وقد تشكلت جمعية للموسيقـى والفنون الجميلة ويقوم المدرس اندريوس خمو بتعليم الموسيقى للطلبة بغية تشكيل فرقة موسيقية خاصة بالمدرسة لاقامة الحفلات والمهرجانات المختلفة

– تنوي جمعية الفنون الجميلة اقامـة حفلة كبرى في الشهر الجاري بعـد استحصال الموافقة وستكون حفلة مسلية والاولى من نوعها في هذه المدينة وستقدم فيها بعض التمثيليات الشعبية والهزلية مع الموسيقى والاغاني .

ڕۆژنامەی –الحرية . ژ ١١٢٩. ١٩٥٨/٣/١٠

بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان، کاک نەشئەتی هێنایە ئەو ژوورەی ئێمە پرۆڤەمان تێیدا دەکرد. مامۆستا نەشئەت تۆقەی لەگەڵمان کرد و زۆر کەیفخۆش بوو بەو شتەی دەمانکرد مامۆستا شەفیق پێشنیازی کرد بۆ کاک نەشئەت کە هەندێ پارەمان بۆ دابین بکەن تاکو چەند ئالەتێکی مۆسیقایان پێ بکڕین! مامۆستا نەشئەت یەکسەر وتی:

من دەزانم لە (مخزني ابتدائي) لە هەولێر زۆرمان بۆ هاتووە لەو ئامێرانە و کەسێ نییە بزانێ بەکاریان بێنێ و داوایان بکەین- هەر چوومەوە هەولێر، بۆتان دەنێرم! وەڵلا ئیتر دوای هەفتەیەک، ڕۆژێک سەیرمان کرد، تاکسییەک، پڕ بوو لە ئامێری عوود و کەمان و شتی تر... لە هەولێرەوە بۆیان ناردبووین! هەر مەپرسە چەند خەنی بووم! وەخت بوو بفڕم لە خۆشیانا بۆ ڕۆژی دوایی، قوتابییەکانم کۆکردنەوە و ئامێرەکانم بەسەریاندا، دابەش کرد. هەندێکیان بەدوو کەس ئالەتێکم دانێ و پێم وتن: بەنۆرە مەشق بکەن... یا پێکەوە! ئیتر تیپێکی باشمان بوو... لە نزیکی ١٠ قوتابی پێک دەهات... ڕاهێنان، هەمیشە دوو ڕۆژ دوو شەموان و پێنجشەموان دوای نیوەڕۆ دەگەڕاینەوە قوتابخانەی و لەوێ پرۆڤەمان دەکرد. هەندێ ڕۆژیش، ئەگەر بەپێویستم زانیبا، داوام لێیان دەکرد بێنە ماڵمان... لە ژوورەکەی من تەمرینمان دەکرد. دوای چەند مانگێک بەمامۆستایان و گەنجانی هونەر دۆستم ڕاگەیاند کە ئێمە ئامادەین بۆ گێڕانی ئاهەنگێکی باشی ڕێک و خۆش، بۆ ساڵی نوێی ١٩٥٨... یەکەم جار دەرچوونمان لە بەردەم جەماوەری کۆیە. لەسەر شانۆی قوتابخانەکەمان بوو... شانۆیەکە سروشتی بوو... واتا ئێمە دروستمان نەکرد. خۆی حەوشەکە قووڵ بوو نزیکی مەترێک بگرە زیاتریش، سەکۆیەک یان هەیوانەکەی بەردەم ژوورەکان، لە دوو لای دەورەی حەوشەکەی دابڕو بەرزتر بوو لە حەوشەکە ئیتر هەیوانەکەی

لای سەرەوەی حەوشەکە، بەشێکمان بەپەردەی قوماش دەورەدا و چەسپاندمان و وەک شانۆیەکی ڕێکوپێکی لێ هات- ئەمە لە دوای پشووی نیوەی ساڵی ١٩٥٨ ئەو ئاهەنگەمان ساز دا، دوای خۆ ئامادەکردنێکی باش و ڕاهێنانی بەردەوام، لەسەر ئەو شانۆگەرییە کۆمیدیانەی خۆم نووسین و خۆم دەوری سەرەکیم تیایاندا بینی دەرهێنانیشیان خۆم ئەنجامم دا ئەم ئاهەنگەمان بۆ دوو ڕۆژ، دوای نیوەڕۆ سازدا، بەبۆنەی جەژنی نەورۆز کە چەند ڕۆژێک لە دوای نەورۆز کردمان. ڕۆژی یەکەم بۆ پیاوماقووڵانی شار و پیاوی حکوومەت و مامۆستا و قوتابیان... تاد، حەوشەکە جمەی دەهات و بەگەرمی و چەپڵەڕێزان پێشوازییان لە هەموو بڕگەکان دەکرد. ڕۆژی دووەمیش بۆ ئافرەتان بوو... کە ئەوان زۆر مەحرووم بوون، ساڵەهای ساڵ، لەم جۆرە چالاکییە هونەریانە و... بەتایبەتی کە کوڕ و کچی خۆیانیان دەبینی لەسەر شانۆ، مۆسیقا دەژەنن و سروود و گۆرانی دەڵێن... بۆیە دڵسۆزانە چەپڵە و هەلهەلەیان بۆ لێ دەدا... بەرنامەی ئاهەنگەکەش، بڕگەی جۆراوجۆری لە خۆوە گرتبوو... ئەم هەواڵەش لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو کاتە... وەک گۆڤاری هەتاو کە لە هەولێر دەردەچوو و گۆڤاری (شەفەق) کە لە کەرکووک دەردەچوو- بڵاو کرانەوە.

تیپی باواجی کۆیە، لە سەرەتاکانی دامەزرانییەوە: لە راستەوە: ١- قوتابی زاهیر محەمەد- کەمان
٢-ئیبراهیم فەرەجوڵڵا- کەمان ٣- سەردار ئەحمەد- نای ٤- مامۆستا باکووری -جومبووش
٥- قوتابی: عەونی عەلی مەولوود (عوودی بەدەستەوەیە، بەڵام خۆی تەپڵ- ڕزمی لێ دەدا.
٦- قوتابی: نەشئەت حەمید -تەپڵ. ٧- کورسییە بەتاڵەکە بۆ قوتابی: ئەکرەم باقی دانراوە... بەڵام خۆی ونکردبوو لەو کاتەدا. بەهاری ساڵی ١٩٥٨

له مـاڵەوە زۆر بەختـيـار و كـامـەران بووم بەئەنجامـەكـان، كـە دەگـەڕامـەوە مـاڵەوە بيـرم دەكـردەوە بەيانى چى بكەين؟ ئەو خـەڵكە ئەوەندە منيـان خـۆش دەوێ و ڕێزم لێ دەگـرن ستـايشى جمـوجـۆڵەكـانم دەكـەن ئەدى ئەمن چيتريان بۆ بكەم؟ ئينجا بيرۆكەيەكم بۆ دەهات و هەڵم دەسەنگاند... ئەگەر ئەنجامـەكەى باش بوايە... ئەوە هەر زوو، بەيانى داهاتوو نەخشەم بۆ پرۆژەكـە دادەنا و هەنگاو بەهەنگاو دەسـتم بەجێبـەجێكردنى دەكـرد! مـوشكيلەيەكى (يووسف)ى برام هاتە پێشـەوە: يووسف لە كـەركووك ژياوە و منالّى لەوێ بەسەر بردووە و لە قـوتابخانەش بەعـەرەبى دەرسەكانى دەخوێند. يەک وشـە چيـيـە لە كـوردى نەدەزانى! نە بەقسەكردن و بەخـوێندن! مـامۆسـتـا سـابير ئيسمـاعيل بەڕێوەبەر بوو خواى لێى خۆش بێ و جێگەى بەهەشتـە ئينشـاڵڵا! مـامـۆسـتـايەكى بەڕاستى پەروەدەكار بوو: دەيگوتە من فيكرت بە (يووسف) مەشغوول مەكە... وا لەگەڵ قوتابييەكان ئينسيجامى كردووە... هەوڵ دەدا كوردى فێر بێ!

ئاهەنگی کۆمەڵەی

هونەرە جوانەکانی قوتابخانەی ناوەندی کۆیە

کۆمەڵەی ناوبراو ئاهەنگێکی شایانیان لە مەیدانی [موسیقاو تمثیل]ی خۆماڵی لە کۆڵانی قوتابخانەی زانستدا ڕۆژی ٣/٢٧/ ١٩٥٨ بۆ مامۆستاو قوتابخانەکانی کۆیە گێڕا ئاهەنگەکە بەم جۆرە بوو

١ - گردنەوەی ئاهەنگ بەوتاری بەخێرهاتن لە لایەن مامۆستا شفیق ... قوتابخانەی ناوەندی ... کۆمەڵە قوتابی خورشید مصطفی وتارێکی پێشکەش کرد

٢ - ئاوازی بەهاری نەورۆز لە موسیقاکانی مامۆستا باکوری لەلایەن تیپی باولچی ... موسیقای سەمبا پێشکەشکرا

٣ - گۆرانی [شاری کۆیە] لە هەڵبەستی کریم مصطفی شارەزاو ئاوازی مامۆستا باکوری لەلایەن تیپی گۆرانییەوە گوترا ... پێشکەشکردنی گۆرانی ... شارەکەی کۆیە ... هەڵبەستی ... حاجی قادری کۆیی

٤ - تیپی ... تمثیل ... دوو جۆرێک پێشکەشکرد ... [پیشەزانی بێ بەخت] بەزمانی کوردی و عارەبی ... هەر دوو جۆرەکە مامۆستا باکوری بوو

٥ - پێشبڕکێی خوێندنەوەی هەڵبەستی کوردی ... قوتابیانەوە

٦ - گۆرانی لەلایەن مامۆستا باکورییەوە ... تیپی موسیقای ... ئەم گۆرانیانەش پێشکەشکران : - [...] ... [هەرە لەیلێ] و [هاتم هاتم] ...

... بەرنامەکان لە لایەن هەموو تەماشاکاران پەسەند کران ... شاری کۆیە مایەی شانازییە ... تەماشاکارێک

٢٥

گۆڤاری (هەتاو) لە ١٩٥٨/٤/٢٠ دەرچووە

کۆڤاری هەتاو

له ١٩٥٨/٤/٢٠ دەرچووە

***

يووسف بە ئەكۆرديۆنەوە چياى هەيبە سوڵتانيش لە دواوەی دیارە

كۆيە ١٩٥٩

یووسفیش، هەر لە منداڵییەوە، حەزی لە ژەنینی ئامێری مۆسیقای دەکرد منیش هانم دەدا و ڕێگەی ڕاستم نیشاندەدا. ئەویش، لە ماڵەوە هەموو ئامێرەکانی تاقی دەکردەوە. ئەکۆردیۆنێکی بچووکم بۆی کڕی! ئینجا دەستی دەکردە عوودیشی تاقی دەکردەوە و جومبووش هەروەتر، ئەگەرچی ئەو ئالەتانە، دەسکەیان لە باسکی

قوتابیانی کۆیە، کە لە بەغدا دەیانخوێند دواتر بوونە
مامۆستا: کەمال ڕەشید یەکەم کەسە لە پێشەوە

یووسف درێژتربوون، ئەوسا... یووسف ١٠ ساڵان بوو، ئەم باسەش ساڵی **١٩٥٨/١٩٥٩** بوو. جا لەولاوە... دیسان مامۆستای ماتماتیک خوالێخۆشبوو، هاوڕێی ئازیزم، کاک کەمال ڕەشید بوو. مامۆستا کەمال، کە چاوی پێم دەکەوێت، پێدەکەنی! ئینجا دەیگوتە من: کوڕە باکووری، وەڵڵاهی یووسف قەت تێم ناگا! ئەوەندە بۆی ڕوون دەکەمەوە بەقسەی خۆش، هەوڵی لەگەڵ دەدەم... بەڵام سفر... سفرە! ئینجا منیش، لاسای هەندێ باوکی نەخوێندەوار و سادەم دەکردەوە و دەمگوت: کاک کەمال، لێی دە... بیکوژە! گۆشتەکەی بۆ تۆ! ئێسکەکانیم بۆ بنێرەوە! ئەویش، هەزارەها سڵاو لە گیانی پاک و بێگەرد و خەباتکەی بێ، دەکەوتە سەر پشت لەبەر پێکەنین! دەیگوت! کوڕە یووسف، ئەوەندە ناسک و بەئەخلاقە: چما دڵم دێ قسەیەکی ناخۆشی پێ بڵێم؟ ئینجا لێدان؟ بەڵام من لە ماڵەوە، بەشەو تاوێک لەگەڵیا خۆم خەریک دەکرد و دەفتەرەکەی حساب... و هەندەسەی دەهێنا و سەیرم مەسائیلەکانم دەکرد و چۆن لە دەفتەرەکەی حەل کراوە... ئیتر بۆم شەرح دەکرد... یارمەتیم دەدا بەڵام دەشمزانی ئەو هەر خواخوای بوو

یووسفی برا بچووکم بەکەمانچەوە.
کۆیە ١٩٥٩

بێژەر نازم پترس

لە کۆڵی ببمەوە و دەرفەتەکان هەڵگرێ و ئینجا ئامێرێکی مۆسیقا بەدەستەوە بگرێ... ئەوەی ڕاستیش بێ بەهرەیەکی چاکی پێوە دیار بوو... هەر ئامێرەکی دەستی دابایە، دەیژەنی بەوپەڕی چاکی و زۆر بەباشی و بێ نشاز.

پاشـان تاوێک گـوێم دەدایە ڕادیۆ.. هەندێ بەرنامـەی خـۆشی هەبـوون وەک بەرنامـەکـەی بێـژەری بەغـدای عـەرەبی نازم پتـرس بەناوی (سـیـر الزمن)، کـەوا باسـی هەندێ ڕووداوی گـرینگی ئەم جیهانە و مێژووەکانیان دەکرد و هەمووم دەنووسیبیەوە.

لە بازاڕ، هەندێ برادەری کۆنی قوتابخانەم، ئێستا بووبوون بەبازرگان... و قوتابخانەیان بەجێ هێشتبوو و هەندێکیان دوکانیان کردبووەوە بۆ نموونە:

١- کـاک شوان...! دوکـانی یا ستـۆدیۆی وێنەگـرتنی فۆتۆگـرافی هەبوو لە بەرامبەر دەرگـای سەرای کۆن.

٢- کاک کەیفی ئیسماعیل- لەولاتر، لە هەمان ساید و سەرەتای چایخانە و دوکانەکانی بەرامبەر مزگەوتی گەورە، دوکانی قوماش فرۆشتنی هەبوو.

٣- لەولاتر، کـەمێک چایخانەی حەمە گـەمـحان بـوو ئەمە برادەری قـوتابخـانەم نەبوو- بەڵکو بەهۆی کاک هورمز ئەسکەندەری هاوڕێ و خزمم، ناسیاویم لەگەڵ کاکە حەمە پەیدا کرد لە هاوینی ساڵی ١٩٥٥دوە.

٤- کەمێک لە خوار چایخانەکە... ئینجا مەحەلی کاک تایەر عەزیز، برادەری قوتابخانەی سەرەتاییم، شتی کارەبا و ڕادیۆ و و تەنانەت بەقاڵیشی هەبوو.

٥- لە بەرامبـەر دوکـانی تایەر عـەزیز، دوکـانی کـاک بابەکە بوو... بابەکە نـاوی ئەسڵی، وەک لە قـوتـابخـانەی سـەرەتایی دەمناسی، مـسـتـەفـا قـادر بوو. بـابەکـە دوکـانێکی گەورەی کردبووەوە بۆ کەلوپەلی ناومـاڵ کە بۆ پاککردنەوە و شووشتن و ئاوێنە و هەموو جۆرە سابوون و مەعجوونی ددان و مووسی ڕدێین تراشین و مەکینەکانی و ئینجا شتی خواردن، لە مـوعـەلەبات و غـەیری مـوعـەلەبات، وەک تەنەکەی ڕۆن و کـیسـەی برنج و نیسک و نۆک و شەکر و چا و خوێ و... پێی ئاوی: چیت پێویست بوایە، لە دوکـانی بابـەکـە دەست دەکـەوت. نـەک هەر ئەوە: دوکـانەکـەی وەک شـوێنێکی کـۆبـوونەوە و ڕابواردنی هەندێ مـامـۆسـتـا و پیـاوی مـاقـوول و ناودارانی شار وەکو مـامـۆسـتـا تـاهیر

وێنەی دانەر

تاريخ کويسنجق

تأليف

احمد الحويزي

عزيز رسول

ئەحمەد حەوێزی دانەری کتێبی (مێژووی کۆیە) و کتێبی (شەوچەرە)، هەروەها مامۆستا زەکی ئەحمەد هەناری، مامۆستا کەریم شارەزا، هەندێ جار مەلا حەوێز ئاغا، مامۆستا سابیر ئیسماعیل مامۆستا جەلال حەوێز و... تاد، جا منیش بۆ ڕابواردن و چاوپێکەوتنی ئەو بەڕێزانە، سەردانیشم دەکرد- واتا بۆ کاک بابەکە و دوکانەکەی، هەروەها مەعمیلی مانگانەی بووم. لەسەری مانگەوە هەموو ئەرزاق و شتی پێویستم لێی وەردەگرت و دەیکردە

لە ۱۹۵۹/۱۰/۲۳ من تووشی هەڵامەت و ئەنفلەوەنزا بووبووم و دوو سێ ڕۆژ لە ناو جێ کەوتم... تا و لەرز و کۆخەیەکی خراپ تووشم بووبوو. هەر ئەوەندە بوو ئەم هەواڵە لە لای دۆست و برادەران و خەڵک بڵاو بووەوە. هەموو سەردانیان دەکردم بەدرێژاییی ئەو سێ ڕۆژە! ماڵمان بەتاڵ نەدەبوو... دوو دوو، سێ سێ، چوار چوار... ئەو خەڵکە دەهاتنە سەردان و هەواڵ پرسینم! دایکم و باوکم و خاووخێزان سەریان سوڕمابوو! دەیانگوت: «ئەوە ئەو عالەمە ئەوەندە تۆیان خۆش دەوێ؟ خۆزگەم بەخۆمان». جا لە وێنەکەدا ئەوە بابەکەیە لەو موناسەبەتەدا سەردانی کردم و تاوێک لە لام دانیشت! ئەوانی دیکەش ئاوایان دەکرد

لیستە لە ناو سجلێکی گەورە... جا سەری مانگ کە مووچەم وەردەگرت، قەرزی کۆنم بۆی دەبرد و سەرلەنوێ، بۆ مانگی داهاتوو، لیستەیەکی تر شت و پێویستی خواردن و ئەملاو ئەولام دەبردەوە!

بەم بۆنەشەوە، دایکم لە کەرکووکەوە هات و سەردانی کردین. هەندێ ڕایەخ و نوینی نووستن و کەلوپەلی دیکەشی بۆ هێنابووین- ئیتر کە چاک بوومەوە، دەچووینە سەیران و کۆلآنە کۆنەکانی ناو شارۆچکەکە و دایکم زیارەتی جیرانەکانی دەکرد و پێک شاد دەبوونەوە... ئەوانیش هەموو دایکمیان خۆش دەویست و خەنی دەبوون کە دەچووە سەردانیان. مامۆستاکانم سەیران و گەشتیان دەکرد، یا لە شوێنێک دادەنیشتن، یەکسەر، یەکەم کەس منیان لە ناو لیستە دەعوتکراوەکان دادەنا و دەیانناردە بەشوێنمدا.

مامۆستام زۆر شانازیم پێوەی دەکرد و زۆر حەزی لە گۆرانی و عوودەکەم دەکرد و گۆرانی لێ داوا دەکردم... گۆرانییە کۆنەکانی کۆیە، خۆی مرۆڤێکی خۆش مەشرەب و خاوەن زەوق و ڕابواردنی خۆش بوو هەمیشە لەگەڵ مەحموود ئاغای کاکە زیاد و لە دیوەخانە و گەشت و سەیرانەکان ئامادە دەبوو وجوودیشی لەو شوێنانە، مەجلیسەکەی زۆر خۆشتر و بەزەوقتر دەکرد. بەبۆنەی سەردانەکەی دایکمان کە لە کەرکووکەوە هات و هەندێ شتی پێویستی بۆ هێنابوو و لە ڕابواردنی ژیانیشمان دڵنیابوو، چەند سەیرانێکمان کرد.

وەک نموونە، ئەم پارچە کاغەزەی کە مامۆستام و گەورەم، زەکی ئەحمەد هەناری بۆی ناردم و داوام لێ دەکا لەگەڵیاندا بچمە چنارۆک

سەیرانێک بۆ ئۆمەرخوچان... دنیا پاییزە و درەختەکانی گەڵایان پێوە نییە ١٩٥٧/١١/٧

لەسەر ڕووباری ئۆمەرخوچان، دایکم و من و ماری ١٩٥٧/١١/٧

دایکم و ماری، یووسف و جان تۆماس، برادەری من و یووسف

دایکم و من و ماری، لە ژوورەکەماندا لە حەوشەکەی مامۆستا عاشوور ئەفەندی لە کۆیە. ١٩٥٧/١١/٧

من و دایکمان و ماری و یووسف و جان لە بەردەم مەحکەمەی کۆیە

لەو وێنانەش، ئەو گەڕان و پیاسانەی کە بۆ دایکمان ڕێکخستبوو، نیشان دەدەن. چونکە هەر ڕۆژە. لە عەسرێکی خۆشی فێنکدا دەمبردە شوێنێکی تازە، کە کاتی خۆی لە چلەکان لە کۆیە ئەو بینایە یان ئەو باخچانە نەبوون یا نەیدیتبوون وەک بینایە تازەکەی محکمەی کۆیە، کە باڵەخانەکی جوان و بەشێوەی شارستانی دروست کرابوو، لە گەڕەکی ناوچەی سەر شووران و نەخۆشخانەکە...

**عەبد جاسم**

لە کۆیە، نەک هەر شاعیر و نووسەر و گۆرانیبێژ و ناوداران و ئاغای دڵسۆز هەڵکەوتوون و ناسراون، بەڵکو کەسایەتی دیکەی خاوەن بەهرەی جۆراوجۆری جوانی کۆمەڵایەتی وەک مرۆڤی خاوەن قسەی خۆش و نوکتەباز و گاڵتەچی و مەجلیس خۆشکەر، هەمیشە هەبووین و خەڵکی شار تێکڕا ئەو کەسانەیان خۆش دەویستن و ڕێزیان لێ دەنان و ئەوانیش خۆیان بەکوڕی دڵپاک و دڵسۆزی هەموو ماڵێک دەژمارد. یەکێک لەو جۆرە مرۆڤانە، خوالێخۆشبوو عەبد جاسم بوو، خەڵکی گوندی تەق تەق بوو.

جا لە ناو حەوشەکە، لە بەردەم ماڵ و خێزانەکان، مێزیان بۆ خۆیان دادەنا و مەشرووب،

خوالێخۆشبوو عەبد جاسم ئەو پیاوە جوانە و جوان ڕەوشتە، لە ساڵی ١٩٢٨ لەگەڵ باوکم و مامم (دەرمان) و گەوریل پۆلیس (سوارە- خیّالة) بوو، لە قشڵەی کۆیە. ئەو زەمان هەموو ژوورەکانی لای دەستە ڕاست، خێزانی پۆلیسە ئاشوورییەکان تیایاندا نیشتەجێ بوون -- عەبد جاسم لەگەڵ باوکم و ئەوانی تر. بەشەو دەرگای قشڵەیان دادەخست و ئیتر کەس هاتوچۆی نەدەکرد. تەنها عەبد، لە پۆلیسە موسڵمانەکان، کە ژمارەشیان زۆر کەم بوون، لەگەڵ ئەو مەسیحیانە دۆست بوو! دۆستایەتییەکی زۆر قووڵ و پڕ لە خۆشەویستی ڕاستەقینە.. بەدڵێکی زۆر پاک و بەسۆز

کە هەمیشە عارەقی قاچاغی هەرمۆتە یان ئی جوولەکانی شاری کۆیە بوو و، پەرداغ و مەزەیان بۆ خۆیان دەکرد و لێی دادەنیشتن سندووقی قەوان (گرامافۆن)یشمان هەبوو... ئیتر تاوێک گوێمان لەو قەوانانە ڕادەگرت... ئینجا کە باوکم و عەبد جاسم مەست دەبوون، باوکم لاوکی کاوێس ئاغای دەگوت و عەبد جاسمیش بەستەی عەرەبی ئەو زەمانی دەگوت، هەر بەگاڵتەجاڕی و چەقەوانەی بەپەنجەکانی لێ دەدا و سەمای دەکرد! دایکانمان و ئێمەی منداڵەکانیش سەیرمان دەکردن و پێدەکەنین! عەبد گۆرانییەکی ئاسووریش فێر بووبوو کە گوایە ئەوانەی کە لە حەبانییە عەسکەری لیڤی ئینگلیز بوون، دەیانگوت و بەحەماسەتەوە. من دێرێکم. لە مێشک دەزرنگێتەوە و باوکم هەمووی دەزانی و ئەویش لەگەڵ عەبد دەیگوت،... سروودەکە دەڵێ: ئەخنەخ سوورایی قەطلەخ قوردایی بشمۆن مەرشمون بازەخ لیلاشە.

ماناکەی دەڵێ: ئێمەی ئاسووری (مەسیحی) دەڕۆین بۆ شەڕ، بەناوت مارشمعون...

مارشمعون ئەو کاتە لەگەڵیاندا، لە تورکیاوە هەڵاتبوون و بەیارمەتی ئینگلیز هێنایانە عێراق و لە بەعقووبە کەمپێکیان بۆ دامەزراندن و زیاتر لە پەنجا هەزار کەسیان لەوێ حەواندنەوە... جا مار شمعون بەسەرۆکی ئاینیش و دنیاییش دەژمێردرێ... ئەمڕۆ، چەندساڵێک، ناوی گۆڕاوە و یەکێکی تر بەناوی (مار دنخا) وەک میراتگری کەنیسەی ئاسووریە!!

جا عەبد جاسم، کاتێ کە ئێمە وەک تیپی مۆسیقای باواجی، دوای دەوام لە قوتابخانەکەمان لە ژوورێکا مەشقمان دەکرد و پرۆڤەی مۆسیقا و گۆرانیمان دەکرد، هەندێ جار عەبد جاسم، لەسەر جادەکەوە کە بەرەو ماڵ دەچوو، یان لە ماڵەوە بەرەو شار دەچوو، گوێی لێمان دەبوو. دەهات قوتابخانە و بۆ ناو ژوورەکە... زۆر هەوەسی بەمەقام گوتن دەهات و زۆر چاک هەندێ مەقامی عێراقی ئەدا دەکرد، وەستایانە و بێ نشاز- ئێمەش مۆسیقایەکەمان بۆ لێ دەدا، مەپرسە چەند کەیفی دەهات و هانی قوتابییەکانی دەدا و ئێمەش زۆرمان لە لاخۆش بوو کە لەگەڵ مەقام و بەستەکانی بۆمان دەگێرایەوە و عەرەبییەکی بەغدایی پاک و جوان قسەی دەکرد... هەزار سڵاو لە گیانی پاکی بێت. یەک لە نەوەکانی عەبد جاسم ناوی سەباح عومەرە و دختۆری بەیتەرەیە لە کۆیە. با بگەڕێمەوە بۆ باسکردنی چالاکییە گرینگەکانی تری تیپی مۆسیقای باواجی.

بۆ جاری دووەم کە ڕووبەڕوو لەگەڵ دانیشتوانی شاری کۆیەی خۆشەویستمان بووینەوە بەڵکو هەر لە ناوەندیان دانیشتین، ڕۆژی ٨/مایس ١٩٥٨بوو، کە لەو ڕۆژەدا بڕیار

درابوو هەمـوو قـوتابخـانەکـانی کـۆیە بەشـدار بن و یاریکەرەکـانیـان ئامـادەبن لەگـەڵ مـامـۆسـتـایانی وەرزشـیـان، لە گـۆڕەپانی (یاریگەی) شـار و یاریـیـەکـان و پێـشـبرکـێی جۆراوجۆر نمایش بکەن.

ئێمەش(تیپی مۆسیقای باواجی) کە ئەمە یەکەم جار بوو ئەو ناوەم بۆ تیپەکە دۆزیبیەوە ئەندامـەکـانم ئاگـادارکـردنەوە کە هەر یەکەیان، لەسەر پارچە قوماشێکی سپی بچووک، نیـشـانەی مـۆسـیـقـای تایبـەت بەکلیلی تۆتەی (صـۆڵ)، کـە لە کـاتی موحـازەراتەکـانی مۆسیقادا فێرم کردبوون لەسەر قـوماشەکە، بە داوی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگی نەقش بکەن و لە خوارەوەی ئەو عـەلامەتەش سێ پیتی (ت. م. ب.) کە هەریەکەیان پێکدێ لە یەکەم پیـتی نـاوی تیـپی مـۆسـیـقـای باواجی و لەسـەر لای چەپی کـراسـەکـەیان بە سنجـاق، یا دەمبـوس بیـچـەسـپـێنن و لە قـوتابخـانەکـەمـان کـۆ دەبینەوە و پێکـەوە بەرەو یاریگا دەڕۆین. من بۆ خـۆشم ئەو ئـامـاژەیەم لە سـینگی کـراسـەکـەم دا. لە ناوەندی سـاحـەکـە، لە شـوێنێـکی کـەوا هەمـوو سـەیرکـەرەکـان چـاک تیـپەکە ببـینن، کورسیمـان بۆ دانرابوو لەگـەڵ مـایکرۆفـۆن. لە سـەعـاتی دەسـتنیـشـانکراو، ئیـسـتیـعـرازەکە دەستی پێ کرد، قـوتابی عـەونی عـەلی مەولوود، دەهـۆڵـێکی گـەورەمـان لە پێشی دانابوو، ڕزمی مـۆسـیقـای مـارشی کە بۆ ڕۆیشـتنەکە خـۆم دامنابوو، دەسـتی پێ کـرد و ئیـتر قـوتابیـان تیـپ لە دوای تیـپ، لەسـەر ئـاوازی دەهـۆڵـەکە و مـۆسیقـایەکە هەنگاویان دەنا و دەڕۆیشتن زۆر بەڕێکوپێکی.

پێی ناوێ من بەدرێژی وەسفـتان بۆ بکەم، چونکە مـامـۆستـا گـیـوی مـوکـریانی، لە گـۆڤـارە ڕەنگینەکـەی بەنـاوی (هەتاو) کـە لە هەولێـر دەری دەکـرد، وەسـفی ئەو مـیـهـرەجـانەی جـوان کـردووە لە وتارێکی کـە تەمـاشـاکـارێک بۆی ناردووە لە کـۆیەوە- جـا مـامـۆسـتـا گـیـوی زۆر جـاران، لە خۆیەوە زاراوەیەکی بـۆ چالاکییەک: سیـاسی یان کـۆمەلایەتی یا زۆر شتی تری بۆ دەدۆزیـیـەوە. بۆ ئەو نمایشـەی وەرزشی کـۆیە، وەسـفـەکـەی لە ژێر ئەم عـینوانەدا بلاو کردووەتەوە: [ڕانواندن (نمایش)ی وەرزینەوەی گشتیی قوتابخانەکانی کۆیە].

(تێبینی: ئەو وتارەش لە گۆڤاری (هەتاو)ی ژمارە ۳۱ی ساڵی پێنجەم- سێشەممە ۲۰ی مایسی ۱۹۵۸ بلاو کراوەتەوە).

جگە لەو چالاکیـیـانەی باس کـراون، حەز دەکەم ئەوەش بڵـێم کە لە هەولێـرەوە، هەردوو مـامـۆسـتـای وەرزش مـامـۆسـتـا عـەزیز مەولوود و مـامـۆسـتـا نوری ئەمین هاتبـوونە کـۆیە بۆ سەرپەرشتی موناسەبەتەکە.

دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشەری ئەو ڕۆژە، ئەوەبوو سەمایەکی ئەم کیژۆڵە بچووکەی
باخچەی ساوایانی کۆیە، لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی پێشکێشی کرد و مامۆستا
نووری ئەمین بەسەرسامییەوە لێی ڕاماوە. ١٩٥٨/٥/٨

بۆ وەبیرهێناوەی ئەو ڕۆژە دێرینە گەشە و ڕووناکەی لەو زەمەنە دوورەی پێش ئەمڕۆ کە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئێستا (ساڵی ٢٠٠٥)کە ئەم بیرەوەریانەم (ناڵێم دەنووسمەوە چونکە لە کات و ساتی خۆیان نووسراون و بەوێنە ڕووداوەکان تەعبیریان لێ کراوە) بەڵام دەڵێم لەو سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمەکە لێرەدا دەیانگوازمەوە و لە نوێ، لەو دەفتەرە بەتەمای چاپکردن و بڵاوکردنەوەیانم- دەڵێم ئەو چالاکییە هونەرییانەمان ئەو کاتە وەک چرایەک بوون لە شەوێکی تاریک ڕێگەی دوارۆژێکی پرشنگداریان نیشانی خەڵکەکە دەدا... بۆ ئەم مەبەستەش ... بۆ وەبیرهێنانەوەی ئەو کەسانەی لەو وێنانەدا لەو بیرەوەرییانەدا وێنە یان ناویان یاخود ناو و وێنەیان هەیە و، ئەمڕۆ پیاوی ئەمەن هەوراز ٦٠ ساڵ و زیاتریشن و ڕەنگە وەختێک مووەزەف، مامۆستا، بەڕێوەبەر، ئەفسەر، مودیر عام... لەوانەیە ئەمڕۆ هەیە تیایاندا ئەندام وەزارەتە لە کوردستان یا لە حکوومەتی بەغدا، یان ئەندامی پەرلەمانە، یان پێشمەرگەیەکی ناودارە... یان و یان یان..هتد. با خۆیان و ناویان ببینن کە چ زەمانێک بوو ئێمە، پێکەوە... ئەو

شتانەمان دەکرد بێ ئەوەی کەس پێمان بڵێ... خۆمان بیرمان دەکردەوە و نەخشەمان دادەنا و کاری باش و بەسوودمان، لە ئەنجامدا، جێبەجێ دەکرد و دەمانهێنا کایەوە... بۆیە چەند وێنەیەک لەو ڕۆژانە لەو ساڵانە دوورانەدا... دەگوازمەوە ئەو یەک دوو لاپەڕەی دادێ... لەگەڵ پێناسەیەکی کورتی هەر وێنەیەک... هیوادارم ئەوەیە هەمیشە ڕۆڵە دڵسۆزەکانی ئەم چاخەی ک چاخ و زەمانی تەکنۆلۆجیا پێشکەوتووە... هەرکەسەو بەگوێرەی دیراسات و بیر و فیکری خۆی، شتێ بکات... کارێکی خێر و بەکەڵک... لە هەر بوارێک بێ، بۆ وڵات و میللەتەکەی بکات و بێ کار و تەمبەڵ نەبێ! دروستکردنی داهاتووی میللەت وەک دروستکردنی دیواری باڵەخانەیەکە و دەبێ هەر کەسە بەگوێرەی بەهرەی کەرپوچێک لەسەر دیوارەکە دانێ و بڵندتری بکات!

ئەمە وێنەی مامۆستای بەڕێز وەرزشوان و پسۆڕ و ڕابەری بزووتنەوەی وەرزش لە کوردستان مامۆستا عەزیز مەولوودە کە تەشریفی هێنا بوو و لەگەڵ مامۆستای وەرزش کاک نووری ئەمین بۆ کۆیە و سەرپەرشتی ڕۆژی وەرزش و ئیستعرازەکەی کۆیەیان کرد لە ١٩٥٨/٥/٨ دا. لەم وێنەیەدا، کیژێک بەناوی نەجلە عەلی مەولوود کە کچی معاونی پۆلیسی کۆیە، بەڕێز عەلی مەولوود بوو، خوشکی هونەرمەند کاک عەونی عەلی مەولوود بوو، لێرەدا نمایشێک دەکات، ڕۆڵی مارێک دەبینێت کە دەیەوێ خۆی لەو دارە بئاڵێنێ- مامۆستا عەزیز مەولوود یارمەتی داوە و دارەکەی بۆ گرتووە تاکو بەرنەبێتەوە و بکەوێت و نمایشەکە

فاشل بێت. کچەکەش بەژن و باڵاکەی کە باریک و ڕێکە و لە دەمیا وەک زمانی مار یاریبیەکی کاغەزی مناڵانەی لە دەم گرتووە و فووی تێ دەکات... وەک زمانی مار دەچێتە پێشەوە و دەگەڕێتەوە ناو زاری کچەکە- ئەو یاریبیەش مامۆستای وەرزشیان ئەوسا کە ناوی سوهام حەننا ناصر بوو، ئەو فێری کردبوو. یاریبیەکە جێگەی پەسندی مامۆستاکانی وەرزش و زۆربەی سەیرکەران بوو- شایانی گوتنە، منیش بەکەمانچە و بەژێیی ئەستووری سەرەوە (صۆڵ) مۆسیقای (تصویری)م بۆ لێ دەدا... تەعبیری لە دەنگە دەنگی لق و درەخت و فیکە فیکی ناو دارستان دەکرد.

ئەمەش، دیسان، وێنەیەکی دیکەیە کە چەند قوتابییەکی کچ، سەمایەکی بیانی بەناوی سامبا پێشکێش دەکەن و لە ناویان کچە چالاکەکە و وەرزشوانەکەی لە وێنەی پێش ئەمەدا، باسیمان کرد کە ناوی نەجلە عەلی مەولوودە، ئەو کچەیە کە لێرەدا لە لای ڕاستەوە بەتەنیا سەما دەکا و سەیری کچەکان دەکات و دەموچاوی جوانە و باش دیارە و پرچێکی درێژی هەیە و لە حاڵەتی سەماکەیا وا سەیری هاوڕێکانی دەکات... پێم وایە ئەو، هەنگاوەکانی سەماکەی نیشان دەدات و ئەوان لاسای ئەویان دەکردەوە- دیسان شایانی وتنە کە مۆسیقای ئەم سەمایە، ئێمەی تیپی مۆسیقای باواجی، بۆمان لێ دەدان لە ١٩٥٨/٥/٨

تیپی مۆسیقای باواجی لە ڕۆژی نمایشی وەرزشی قوتابخانەکان لە یاریکای شار، لە ٨/٥/١٩٥٨دا کۆیە لە ڕاستەوە: ١- زاهیر محەمەد ٢- ئیبراهیم فەرەجوڵڵا ٣- سەردار ئەحمەد- شمشاڵ ٤-مامۆستا باکووری ٥- عەونی عەلی مەولوود/ تەپڵ.

یووسفی برای بچکۆلەشم، لەگەڵ قوتابیانی قوتابخانەکەی خۆی قوتابخانەی زانستیی سەرەتاییی کوڕان بەشداری کرد لە ڕۆیشتنی مەسیرەکە دا، بەجلی کەشافە و لەگەڵ تیپی سرووديشی بەشداری دەکرد. منیش بەدەرفەتم زانی لەو ڕۆژە مێژووییەدا ئەم وێنەی لەگەڵدا بگرم، بۆ یادکاری لە لای هەردووکمان بمێنێ، سەرنجی ئەوەش بدەن لەسەر سینگی کراسەکەم بەلای چەپەوە، (ئارم) یا نیشانەکەی (ت. م. ب) تیپی مۆسیقای باواجی، دیارە و لە دواوەشمان، هاوڕێیانی یووسف بەجلی کەشافە دیارن. کە لە ڕۆژی ئیستیعرازی قوتابخانەکانی کۆیە، ئەو نمایشە کرا، لە ٨/ئایار/ ساڵی ١٩٥٨ لە ساحەی یاریی وەرزشی کۆیە

وێنەیەکی تر لەو نمایشە وەرزشییەی ڕۆژی ١٩٥٨/٥/٨ ئەو وێنەیە کە (مورشیدات) لە قوتابییە کچە جوان و قشتیلەکانی کۆیێ پێک هاتووە کە لە سەرەتای دەست پێکردنی ئیستیعرازەکان، ئەوانە لە پێشەوە دەڕۆیشتن لەسەر مۆسیقای (مارش)ی باواجی. لەم وێنەدا، کچێکی دۆستی زۆر نزیکمان، بە سەهم نیشانم داوە، کە (باسیمە دنحا) بوو، کچی کاترین خان- نەوەی برای گەورەمان (خواجە ئیبراهیم)ە، باوکی بەهنام و مامۆستا ئیسحاق خوایان لێ خۆشبێ. باسمە زۆر دۆستی ماری و ئەجلە و ئەجوا بوو.

ئەوانە هەموو لەو خێزانە بەڕێزانە بوون کە لەگەڵیاندا وەک خوشک و برا، تێکەڵی خێزانیمان هەبوو، سەردانما دەکردن و بەخاو و خێزانەوە... سەردانیان دەکردین... سەیرانمان پێکەوە دەکرد بۆ دەوروپشتی شارە خۆشەکەمان، کۆیە.

لەوانەی کە بەماڵ و خێزانەوە... دۆست بوون و زوو زوو، لە موناسەباتی جەژن، یا سەیرانی بەهارانی دەوروپشتی شاری کۆیەمان دەکرد، بۆ سەیران بەسەربردنی تاوێک لە ژیان و ڕاحەتی جەستە و مێشک دەچووین بۆ دێی هەرمۆتە و باخچەکانی زەیتوون و ڕووبار و کارێزە قەشەنگەکەی، یا خود بۆ سەر مەزاری مەربێنە قەدیشەی نزیک گوندی تۆبزاوای شەفیق ئاغا و باخچە دڵگیرەکان و ئاوی ڕووبارە سازگارەکەی، یان بۆ سەر ڕووبار و باخچەو دار و درەختەکانی حەمامۆک و کانی سۆرک و ئۆمەرخوچان شاخی مشکە و ماڵی شاعیران: شارەزا و دڵزار و ... شوێنانی دیکەی دڵگیری وەک هەیبەت سوڵتان و چنارۆک و...تاد، دەڵێم لەو خێزانانەی زیاتر تێکەڵی هەبوو لە نێوانمانان.

گۆڤاری هەتاو

KOVARÎ HETAW

گۆڤارێکی ڕازاوەی [ئەدەبی] هەفتەیی کوردییە جاری هەر لەشە
ڕۆژاندا چەلێکی ە هەولێر لەچاپخانەی کوردستاندا بەخش دەکرێت

Jimare 131 s 5 20 GULAN 2570 Kurdî « Madî »

ژمارە : ١٣١ سالی ٥ سێشەممە ٣٠ گوڵان [ ٢٠ مایس ] ١٩٥٨

Nawerok

١ – [illegible] ف . ع . هەلۆ – سلێمانی

٣ – [illegible] لطیف [illegible] سەرسام ڕەواندز

٦ – مالاریا [illegible]

٩ – باخچەی بولبولان

١٣ – زمان فێر کردن وەرگێڕ میرزا سعید موکریانی

١٦ – بۆ پێشەوە بەغدا : ڕووناک جلال

١٨ – [illegible]

١٩ – [illegible] شهاب‌الدین [illegible]

٢١ – هەتاو و سالی پێنجەمی – چاپخانەی کوردستانی [illegible]

بەرگی گۆڤاری هەتاو ژ ٣١ کە لە ٢٠مایسی ١٩٥٨ دەرچووە و هەواڵی ئەو چالاکییەی تێدا بڵاو کراوەتەوە... خاوەن و سەرنووسەری، خوالێخۆشبوو مامۆستای گەورەی چاپ و چاپەمەنی و نووسەر گیوی موکریانی بوو.

مامۆستای گەورەی بوێژ و نووسەر... خاوەن چاپخانەی کوردستان... سەرنووسەری گۆڤاری هەتاو بەڕێز عەبدولڕەحمان گیو موکریانی

رانواندن (نمایش)ی وەرزیشەوەیی

گشتی قوتابخانەکانی کۆیە

لە ٨-٥-٩٥٨ دا لە ژێر چاودێری و کۆمەکی مدیری قضا ... گشتی دەست پێ کرا لە پێشەوە تیپی ڕاهێنان [ مرشدات ]ی کچان و تیپی پشکنەر [ کشافە]ی کوڕان دوا بەدوای ئەوان تیپی وەرزیشەوەی هەموو قوتابخانەکانی قضا، کە هەموویان لەسەر ئاوازی [ مارشی ڕۆیشتن ] کانی باکووری دەرۆیشتن کە لە لایەن تیپی موسیقای باواجی کۆیەوە لێ ئەدرا بەسەر کردەیی مامۆستا باکووری.

ئەمساڵ گەلێ پێشبڕکێ و یاری و هەڵپەڕکێی کوردی و ڕۆژئاوایی پێشکەش و زۆر پەسەند کران بەتایبەتی جوڵانەوەکانی [ فعالیات ]ی قوتابخانەی ئامینەی کچان کە بە جارێ دڵی هەموو تەماشاکەرانیان هێنایە جۆش، ئاو بە ئاوریش ئاوازە خۆشەکانی موسیقای باواجی کەوردی حەموو حەفتانی لەسەر پەردەی دڵان دەشۆشتەوە جوڵانەوەی پێشبڕکەکانیان بەو جەشنە بوو.

١ ـ پەنجەی سەوایان: کوڕانی کیشەگێڕ، ئەسپاردن و سەماکردن بەرولەرەکان.
٢ ـ قوتابخانەی آمینەی کچان یاری سویدی، ڕەشبەڵەکی کوردی و رەقس
٣ ـ ، کوڕەی کچان یاری سویدی، جوانی ئیمە جوانی وەتەن
٤ ـ ، قاربە، بالەخانە بەخوێندنەوەی شیعری نەورۆزی پیرەمێرد
٥ ـ ، زانست، ، ئولیوڵ ٦ ـ قوتابخانەی یەکەی کوڕ سروودی شاری کۆیە لە شیعری شارەزا بە بارمەتی تیپی موسیقای باواجی بەوە
٧ ـ قوتابخانەی ناوەندی شایی کوردی بە آوازی [ نەشمیل کچە کورد ]یان پێشکەشکرد ڕانواندنی ئەمساڵ بەهۆی آوازە بەرزەکانی تیپی موسیقای باواجی بەرەو زۆر خۆشبوو لیکەلیکدا موسیقای نەورۆزی مامۆستا باکووری، مەولەوی لە موسیقاکانی قادر دیلان، جوانی ئیمە جوانی شاڵ صاحب وەهەرە ئەیلی و گەلێک بەستەو گۆرانی تریش پێشکەش کران

تەماشا کەرێک

ئەمەش وێنەی ئەو لاپەڕەیەکە لە گۆڤاری هەتاوی باس کرا و، وەک ڕیپۆرتاژێک لەسەر چالاکییەکانی نمایشی وەرزشیی ڕۆژی ١٩٥٨/٥/٨ لە کۆیە نووسراوە

هەردوو برای شاعیری بەرز و نووسەری قەڵەمڕەنگین: دڵزار و شارەزا کۆیە.

جگە لە خواجە ئەبرەھەش کە پێشتر باسمکردن، ماڵی وەستا ئارتینی خەیات. کە ئەو پیاوە ئەوەندە خۆش مەشرەب و قسەخۆش و زەرفانی بوو، خەڵکی کۆیە هەموو خۆشیان دەویست. ئارتین قاتی ئەفەندیانی بۆ هەموو مامۆستا و موەزەفەکانی شار و شارۆچکەکانی دوور و نزیکی کۆیەی دەدوورری، بەقەرز و بە قیستی موریح... واتا مانگانە چەندی (قەرزار) لە توانای دابوو، بیدابایە وەستا ئارتین، ئەگەر دنیاریشکیش بوایە، (نیعمە الله) و ئارتین ڕازی بوو. دوکانەکەشی، لە نزیک سەرا کۆنەکە بوو... لە تەنیشت ستۆدیۆی وێنەگری کۆیی عەلی ڕابی ڕەش، لە قولکەی ناوەندی شار بوو. دوکانەکە وەک دوکانی بابەکە بوو کە پێشتر باسم کرد... مەبەستم هەر کاتێک بچووبایتە دوکانەکەی وەستا ئارتین، چەند کەسێک لە مامۆستا و پیاوماقووڵی شار و دۆستی ڕابواردن و سەیرانی ئارتین... کە بەردەوام بوو، ئەوانەت چاو پێ دەکەوت... وا وەستا مەقەسەکەی بەدەستەوەیە جگەرەکەشی لە نێوان لێوبەوە و... نوکتەش دەگێڕێتەوە و سەیرت دەکرد وا مەلا حەوێز ئاغا لەسەر کورسییەک دانیشتووە و لە قوژبنەکەی تر مامۆستا زەکی هەنارییە... یان ڕۆژێکی تر، یاخود جەمێکی تر، ئەوانە دەڕۆیشتن، سەیرت دەکرد وا مامۆستا ئیسحاق خواجە ئیبراهیم لەوێیە. کاک ئیسحاق بەزمی زۆر خۆش بوو لەگەڵ ئارتین! ئیسحاق ئەفەندی هەمیشە لەڕ و لاواز... لەبەر نەخۆشیی دیزانتری (مزمن) کە تووشی بووبوو. ئیتر لە خواردن

مامۆستا سابیر ئیسماعیل بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئوولای سەرەتایی کوڕان لە کۆیە لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکان، لەگەڵ باکووری شوبانی ١٩٥٩ لە برادەرە هەمیشەییەکانی وەستا ئارتینی خەیاتی ئەرمەنی لە کۆیە

زۆر پارێزی دەکرد! کەچی ئارتین لە خوارن و خواردنەوە دریغی نەدەکرد و هەموو و هەوڵ و کۆششی بۆ زگەکەی بوو! جا ئیسحاق دەیگوت: «هەتیم ئارتین ئەو زگە ئەستوورەت کوو وا گەورە و پەروەردە کردووە؟ ئارتین پشتی تێ دەکرد و عەیب نەبێ قوونی نیشانی ئیسحاق و ئەوانی لەوێن، دەدا و بەدەمیش دەیگوت: «الحسود لایسود» ئینجا دەبووە پێکەنین! هەروەها لە دوکانەکەی وەستا ئارتین ئەو ناوانە و ئەو کەسانە زۆر سەردانیان دەکرد و ئاشنای بوون و برادەری خۆشەویستی یەکتر بوون: کاک زاهیر و عەبدولڕەحمان هەناریی برای، مامۆستا زەکی هەتاری و بەهنام خواجە ئیبراهیم، کاک ڕەقیبی مفەوەز ئەمنی کۆیە، هەروەها عەبدولقادر قەواس موحاسبی (الشرکة العربیة للاعمار) کە کۆمپانیایەکی سووری بوو، شەقامی نێوان کۆیە و تەق تەقیان قیرتاو دەکرد، بەڕاستی هەموو کۆییە ڕۆشنبیر و دوکانچی و خەڵکی ڕەسەنی کۆیە، شارەزای وەستا ئارتین بوون و بەپێی کات و دەرفەت، ئەو دەچووە لایان، یان ئەوان سەردانیان دەکرد و قاتیان لە لای بەدروومان دەدا ئارتین بەماڵەوە لە کۆیە بوو-

ڕەقیب و باکووری و عەبدولقادر لە بەردەم
دوکانی ئارتین خەیات
زستانی ١٩٥٩ کۆیە

دوو کوڕ و سێ کچی هەبوو... خێزانەکەی (خوشکە ماری) زۆر بەڕێز و موحتەرەم بوو- لەگەڵ دایکم و ماری خوشکم بەینیان خۆش بوو و زوو زوو سەردانیان دەکردین و ئارتین دەهات... دەیگوت یاڵلا باکووری بابچینە سەیران...

ئەمڕۆ بەهارێکی خۆشە و عوتلەیە... خواردنیشمان کردووە بەس ماوە هەستن و بابڕۆین! بەڵێ: ئاوا ئەو ئەرمەنییە زەوقی هەڵدەستاندین و ئەگەر هەوەسیشم نەبوایە، بەدایکم و خوشکەکانم دەگوت:

یاڵلا هەستە... وا ئارتین هەموو شتێکی ئامادە کردووە. با بچین لە چۆڵێک، خواردنەکە بخۆین.

دکتۆر فەخری دەباغ، تاکە دختۆری

نەخۆشخانەی کۆیە بوو ئەو ساڵانی پەنجاکان... خێزانەکەشی مامۆستا بوو گەنجێکی، وەک عــەرەب دەڵێن "أریحی: ئەریەحی" بوو ...و'تا ڕووخــۆش و خــاوەن زەوق بوو جگە لە پسپۆڕییەکەی لە نەخۆشی. زۆر جاران، دختۆر فەخری ئامادەی کۆڕ و مەجلیسەکانمان دەبوو، یان ئەو خۆی، لە ماڵەوەیان، کە نزیک نەخۆشخانە بوو. دەعوەتی دەکردین... شەوێکی خۆشمان لەگەڵ ئارتین و دختۆر و عوزەدەکەم... جارو بار تایەر تۆفیقیش مەوجوود دەبوو، بەتەسادوف، ئەویش تەشریفی دەهێنا و... ئینجا کە جەماعەت مەست دەبوون، هەموویان بەقسە و فشقیات و کەڵەکبازی، بەوەستا ئارتین نەدەوێران و لەگەڵ هەموویان دەکەوتە چەنەبازی!

شارۆچکەی کۆیە - ١٩٣٠

الدكتور
فخري الدباغ
DR. F. AL-DABBAGH

حضرة الأخ (باكوري) المحترم

صباح الخير..

أرجو أن تشرفنا بالحضور مساء هذا اليوم إلى بيتنا لقضاء السهرة مع بعض الإخوان، هذا مع العلم بأن المناضل أرشد شكور من الكاظمية وهو من عازفي العود فلا تنسى أن تجلب معك العود والكمنجة والأمل قوي أن يحضر طاهر توفيق كذلك وبحضورك يتم السرور..

المخلص

٢٢/٢/٥٢

د. فەخری دەباغ
پزیشکی نەخۆشخانەی
کۆیە- ١٩٥٨

هەروەها لەگەڵ ماڵی جۆزیف فرجۆ کارمەندی دائیرەی مەساحە بوو... ناوی وەزیفەی مەساح بوو، ئاشنایەتیمان پەیدا کرد وا ڕێک کەوت ئەو خانوویێکی بەکرێ گرتبوو، خانووی عەزیز عەبدولڕەحمان چەلەبی بوو، کە نەوەی حاجی ئەسعەد بوو- خانووەکە، کەمێک لە خوارتری ماڵی عاشوور ئەفەندی بوو گەورە بوو- هەیوانێک و چوار پێنج ژووری تیادا هەبوو لەگەڵ حەوشێکی گەورەی لە دواوە هەبوو! جوزێف پێی گوتم: حەوشەکە بۆ من زۆر گەورەیە... ئێمە (واتە ئەوان) خۆی و ژنی و دوو مناڵ بوون! جا وتی: ئەگەر حەز دەکەن ئێوەش وەرن پێکەوە، دوو ژوور بۆ ئێوە و دوو ژوور بۆ ئێمە... وەکو خوشک و برا و یەک خێزان... دەژین. منیش ناردبووم ماڵمان لە کەرکووکەوە... دایکم و وەردییەی خوشکم و ئەگەر براکەشم (تیماتیوس) ئیشی نییە، بێنەوە کۆیە! جا ئەوانە ڕازی بووبوون و دایکم حەزی دەکرد بێتەوە کۆیە و پێکەوە بین- ئەوە بوو، کە هاتن و کەلوپەل و ماڵیان هێنا، یەکسەر لە حەوشەکەی عەزیز چەلەبی دابەزین و لەگەڵ ماڵی کاک جوزێف ئاشنا بووین جوزێف خۆی و ژنەکەشی، بەئەسڵ خەڵکی شاری ماردینی تورکیا بوون- عەرەبییەکەیان بەعەرەبی ماردین دەچوو... گۆرانی و ئاوازی میللی ماردینیان و داوونەریت ئەوێیان زۆر دەزانی. ئیتر لەگەڵ ماڵی وەستا ئارتین خەیاتیش یەکتریان ناسی و جوزیف و ئارتین دیسان بەگاڵتەکردن بەیەکتر، لە سەیران و دانیشتن لە ماڵ، بەزمیان زۆر خۆش بوو.

***

ئەو منداڵە جو نەی وا لە پێشەوەدیە،
جەمال-ە کوڕی جۆزێفە. کچەکەش،
وەردییەی خوشکمە، لە سەیرانێک لە
هەیبە سوڵتان ١٩٥٨ - کۆیە

# کۆچی دوایی مام تۆفیقی باوکی هونەرمەند تایەر تۆفیق

لەو ڕۆژانە کاک تایەر تۆفیق پەیدابوو لە کۆیە، کە دیتم، باوەشم پێدا گرت و ماچم کرد-

ئەویش زۆری پێ خـــۆش بوو بەبزووتنەوە هونەرییـەکـانی ئەنجـامیـان دەدەم. گـوتـی لە هەولێریش باسی تۆیان دەکرد و لێرەش زیاتر، هەر کـێـوە دەچم، باس هەر باسی تۆ دەکـەن و لێت ڕازین. کـە پرسیم چۆنە ڕێی ون کـردووە وتی: «ئەندۆ، بەخوا باوکم زۆر نەساغە و ڕەنگە بمرێ! وتم: نا ئینشـاڵڵا چاک دەبێتەوە! ئینجا وتم حەز دەکـەم ئەمشـەو لە مـاڵمـان، بەبۆنەی هاتنت، دانیشین و برادەران و مـامۆسـتـاکـان دەعـوت دەکـەم و سێـوەش هەرودتر وتی: کـوڕە ئەندۆ، عـەفـووم کـە چونکە من دەزانم باوکم تەواو بووە! بەکـورتی ئیـقناعم کـرد. ئەوە بوو جـەمـاعـەتێکی خـۆش مـەشـرەب و بەزەوقم دەعـوتکردن: ئەوانی لە بیرمن: مـامۆسـتـایان زەکی ئەحـمـەد هەناری و هەردوو براکـانی مـامۆسـتـا شەفـیق سابیر، مـامۆسـتا سابیر ئیـسـماعیل، سێوە و عـەبدولقادر قەواس... بەڕاستی خۆشترین شەو بوو لەگەڵ ئەو دوو گەورە مەقـامبێژە ڕەسەنانە... مەقام لە دوای مـەقـام... جـارێک سێـوە جـارێک تاهیـر... تا درەنـگانێکی شـەو! هەمـوومـان مـەست و سەرخۆش و دڵخۆش ئەو هونەرە بەرزەی ئەو شەوە، لەو دوو کەڵەمەقـامبێژەمـان گـوێ لێ بوو، کە ئەوەش شەوێکی ساردی ساڵی ١٩٥٨ بوو بەداخەوە، بۆ بەیانی، هەواڵی کۆچی دوایی باوکی بەڕێز تایەرم پێ گەیشت و زوو خۆمان گۆڕی و گەیشتمە ماڵی مام تۆفیق، سەیرم کرد خەڵکێکی زۆر لە ژوورەوە و دەرەوە وەستابوون. برادەرەکانی دوێنێ شەو لە لام بوون، ئەمڕۆ وا هاتوون بۆ مـەراسیـمی ناشـتنی مام تۆفـیـقی باوکی تایەر تۆفیق. بەیتە

شیعرەکەی (أمروء القیس)م هاتەوە بیر، کە هەواڵی کوشتنی باوکیان بۆ هێنا و ئەویش لەسەر خواردنەوەی شەراب بوو، وتی: «... الیوم خمر و غدا أمر».

بەڵێ، ئەمە ژیانی بەنیئادەمە لەسەر ئەم زەوییە و هەر کەسە لە ڕۆژی خۆی کە نووسراوە بۆی، ڕێگەی کۆتایی لە پێشەوە دەبێ فرمان بەجێ بێنێ!

کە من هاتمە کۆیە وەک مامۆستا، کۆمپانیایەکی پسپۆڕ لە دروستکردنی جادە - شەقامی نێوان شاران و وڵاتان - بەناوی (الشرکة العربیة للاعمار) کە خاوەن و شەریکەکان هەموو خەڵکی سووریا بوون، بە عەقد (گرێبەست) لە چەندین شوێن لە عێراق، دروستکردنی جادە لە نێوان شارەکانیان بە عەقد لە حکوومەتی عێراق وەرگرتبوو کە ئەوان ئەو کارانە ئەنجام بدەن... جا یەک لە کارە فەرعییەکانیان گرتنی موقاوەلەی دروستکردنی جادەی سەرەکی نێوان کۆیە و تەق تەق بوو بەدرێژایی ۱۳ کیلۆمەتر- بنکەکەشیان لە کۆیە دانابوو کۆشکێکیان بەکرێ گرتبوو لەسەر دوکانەکانی لای ڕاستی شەقامە سەرەکییەکەی شار کە لەسەر دوکانەکانی (نەزیف)ی کچی عەیشێ قادری خوالێخۆشبوو و دوکانەکانی دیکە سەرەوەتر و خوارتری دوکانی یا نەزیف!

جا ژمێریار (موحاسیب)ی ئەو کۆمپانیایە، پیاوێکی ئەفەندی مەیلەو بەژن کورتیلە بوو، چاویلکەی سپی ئی دووری و خوێندنی هەمیشە لە چاو بوو، ڕوومەتی سوور و سپی و قژی سەری زەرد و بەڵام کورت و بەلوول وەک، قژی ئافرەت و پیاوەکانی دانیشتوانی ئەفریقیا بوو ناوی عەبدولقادر قەواس بوو، خەڵکی سووریا بوو. بەماڵ و خێزان و

لە ڕاستەوە: یەکەم کەس بەچاویلکە وەستا ئارتینی بەرگدرووی کۆیەیە. ئەوەی تەنیشتی تیمەی برامە- بەرامبەریان منم (باکووری) لە ناو غاباتی هەولێر دانیشتووین ۱۹٦٦

له ڕاستەوە: ماری خوشکم ئەوی تر باسیمە دنحای دەستە خوشکی و برادەری ماریە. کۆیە ١٩٥٨

منالّەوە هاتیووە کۆیە... ئەو شارە کوردییەی سەدەها کیلۆمەتر دوور لە شار و وڵات و هەوارگەی عەرەبی خۆیان. بەڵام تا بلّێی بەخۆی و ژنەکەی، ڕووخۆش و بەزەوق و ئیجتیماعی بوون لەگەڵ دراوسێیەکانیان بەچاکی تێکەڵ بووبوون و کچە گەورەکەی لە قوتابخانەی سەرەتایی پاشان بۆ (مدرسة الفنون المنزلية) کە تازە کرابووەوە لە کۆیە، ساڵی یەکەم بوو، ساڵی ١٩٥٨/١٩٥٩ی خوێندن، پۆلی یەکەم کرایەوە... نزیکی ٣٠ کچە کۆیی لەو قوتابخانەیە دەوامیان کرد. ئەوانە حەزیان دەکرد لە ناوەندی- متوسطة- دەوام بکەن و بەردەوام بن تاکو ئەعدادییەش تەواو بکەن بچن بۆ خوێندنی باڵاتر، جا ساڵی دواتر، لە هەولێر، قوتابخانەی (الفنون المنزلية) کرابووەوە بۆ کچان و ئەوەکەی کۆیە کرایە (متوسطة) هەندێ لە کچەکان مانەوە و دەوامیان لە قوتابخانەی ناوەندی کۆیەی کچان کرد. ئەوانی تر، ژمارەیان کەم بوون (نەجوا) کەی من یەکێکیان بوو- چوونە هەولێر بۆ ساڵی خوێندنی، ١٩٥٩/ ١٩٦٠- باوکی نەجوا ڕازی نەبوو ساڵێک بەفیرۆ بڕوا و خوێندنی ناوەندیش گرانتر بوو... واتا زەحمەت بوو بۆ کچەکەی.

نەجوای کچی عەبدولقادر قەواسی سووری کۆیە ١٩٥٨

جا ئێمە، ئەو چەند ماڵە کە برادەرایەتییەکی گەرموگوڕ و ڕاستەقینە و پڕ خۆشەویستی بۆ یەکتری، لە بۆنە و ڕۆژانی پشوو و جەژن... هتد، بەهاندانی وەستا ئارتین، یان (من) یان جوزێف... یاخود عەبدولقادری سووری ڕێک

دەکەوتین و بەرەو یەکێک لەو باغ و باخچە و سەر ڕووبار و ژێر دار و درەختەکانی کۆیە و دەوروبەری، بەڕێ دەکەوتین... یا بەترومبێلە فریشقەکەی کۆمپانیای عەرەبی... کە بەدەست عەبدولقادرەوە بوو، ئەو دەیهاژۆشت... یان بە (پێ)... ئەگەر سەیرانگەکە نزیک بوایە... ئیتر لەوێ تا ئێوارە، ئەو خێزان و ماڵ و منداڵ و ژنەکان خەریکی دروستکردن و دامەزراندنی سفرە و خواردن بوون و، ئێمەی پیاوەکان، لە لا پەرگەیەک، کەمێک دوور لە هەرا و قەرەباڵغی ژنەکان و منداڵەکان بۆی دادەنیشتین و تا کاتی خواردن دەهات... ئیتر پێکەوە هەموو، بەقسە و نوکتە و تەعلیق و پێکەنین (بێی ئێوە ناخۆش) ئەوەی هەبوو لەسەر سفرەکەی خواردن... وشکمان دەکردەوە! - من هەمیشە عوودەکەم دەبرد و چەند فەسڵێک، هەموو پێکەوە، بەمناڵ و ژنەکانیشەوە، دەبووە چەپڵە و گۆرانی...

***

یەکێک لەو سەیرانانەمانە بەکۆمەڵ بۆ تۆبزاوە؛ چوار خێزان پێکەوە لەو سەیرانەدا بەشدارییان کردووە: لە لای چەپەوە: ژنی عەبدولقادری سووری، ژنی وەستا ئارتین، کاترین خانی دایکی باسیمە، ماری خوشکم، خێزانی بەهنام ئیبراهیم و منداڵەکەی لە باوەشە... لە ناو دانیشتووەکان: وەردییەی خوشکم و کچەکانی وەستا ئارتین.. تاد
بەهاری کۆیە ١٩٥٩

سەیرانێکی دیکە، لە هاویندا، بۆ ناو ڕەزەکانی گوندی هەرمۆتە مانگی تەمموزی ١٩٥٩ لە هەرە پێشەوە: نەجوا عەبدولقادری سوورییە، لە دواوەی لە لای چەپی وێنەکە دایکمە لە لای ڕاستی، نەجوایە، یووسفی برام و ئینجا عەبدولقادر باوکی نەجوا و کچە بچکۆلەکەی سەمیرەی لەباوەش گرتووە، ئەوا بەرەو خوار، بۆ ناو ڕەزەکانی گوندەکە هەنگاو دەنێین.

ئەو کۆڵانەی ماڵی وەستا ئارتینی لێ بوو– کە ئەو دەرگایەی لە لای چەپی وێنەکەیە پێش ئەوەی بگەیتە (تاقە)کە– ئەوە ماڵیان بوو تا لە کۆیە بوون، واتا تا ساڵی ١٩٦٢ - ١٩٦٣

یەک لە شەریکەکانی کۆمپانیای (العربیة للإعمار) کە فەرعێکی لە کۆیە بوو وەک باسم کرد، پیاوێکی بەتەمەن و کەشخە و پۆشتە و دیار بوو بەئەسڵ لە سووریا کەسایەتییەکی ناسراو بوو! ناوی تەواویم لە بیر نەماوە، بەڵام بە ئەبو عزیز ناسرا بوو... ئەو کابرایەمان بەو ناوە گاز دەکرد، کە ئەندامی (مجلس الادارة)ی ئەو شەریکەیە بوو لە سووریاوە مانگی جارێک دەهاتە کۆیە، بۆ پشکنین و مووچەی کرێکار و کارمەندەکانیشی دەهێنا- چونکە مەکینەی قیرتاوکردنیان هەبوو، شۆفڵ و گرێدەر و قەڵابە و کرێکارەیان بەکرێ دەگرت لە کۆیییەکان وەک محەمەدی مەلا سابیر هەروەها ئەندازیارێک، ناوی ئەدوەر بوو خەڵکی کەرکووک بوو لە ئاسوورییەکانی ئەوێ، جا ئەویش هەر لەو کۆشکە دەژیا و دەنووست و هەموو کاری سەرپەرشتیکردنی رێگەوبان و قیرتاوکردنەکە... ئەدوەری موهەندیس پێی هەڵدەستا- جگە لەویش، لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە، ئەندازیارێکی کۆیی ناوی مەجید عومەر بوو، لە هاورێیەکانی ئێمە بوو کاتی خۆی لە قوتابخانەی ناوەندی کۆیە، لە چلەکانا... جا ئەو بەرێزە سەرپەرشتی گشتی (مشرف عام)ی ئیشوکارەکانی ئەو کۆمپانیایە بوو- ئەو کارەی عەقلی نەیگرتبایە و بزانیبا نوقسانی تێدایە، قەبووڵی نەدەکرد. زۆر دڵپاکانە

ئەندازیار مەجید عومەر

بۆ شارەکەی خۆی تێدەکۆشی و حەزی دەکرد رێگەکە وا نەبێ دوو سێ ساڵ و تێک بچێ و کەڵکی نەمێنێ. جا کە ئەو ئەبوو عەزیزە دەهات، ئیتر هەموو شەو دانیشتنێکیان بۆ رێک دەخست هەر لە ناو کۆشکەکەی خۆیان.. چەند کەسێک کە بووبوونە دۆستی ئەبوو عەزیز دەعوەت دەکران بۆ ئاهەنگەکە و منیش کە بەهۆی عەبدولقادر، یەکترمان ناسی ئیتر دەبوایە لە دانیشتنەکان خۆم و عوودەکەم، خۆشخوانی دانیشتنەکە بامایە. میوانەکان، خۆیان و ئەبو عەزیز هەموو جار ئەوەی دووپات دەکردەوە- من مەجلیسەکەم خۆش دەکرد بەگۆرانی عەرەبی عەبدولوەهاب بۆ ئەبوو عەزیز و عەبدولقادر و جوزێف و بەکوردیش بۆ

مامۆستا زەکی هەناری، کە ئەو هەمیشە (میوانی شانازی: ضيف الشرف)ی مەجلیسەکە بوو. ئەبو عەزیز زۆر ڕێزی لە مامۆستا زەکی دەناو لەبەری هەڵدەستا. یەکێک لە میوانەکانیش کە عەنتیکە بوو... قسەی نەوعێک بوو! خۆی هەولێری بوو، جا هەوڵی دەدا (قۆریات)مان بۆ بڵێ. ناوی کاک سەعدوڵڵا بوو ئەویش وەک کاک جوزێف، مەساح لە دائیرەی مەساحەی کۆیە وەزیفەی هەبوو و دەوامی دەکرد. ئەویش بەهۆی کاک مەجید عومەری موهەندیس، جار جارە دەیهێنا بۆ دانیشتنەکانی شەریکەی عەرەبی. لە بیرمە شەوێکیان، دیسان هەموومان ئەوا دانیشتووین و ئیتر خواردنەوە و گۆرانی و عوود، تا درەنگ دەماینەوە... جا ئەو شەوە، کاک مەجید ئەندازیار، داوای لە کاک سەعدوڵڵا کرد، قۆریاتێکمان بۆ بڵێ: کاک سەعدوڵڵاش، بۆ خاتری میوانان و هەر حەزیشی دەکرد شتێک بڵێ چونکە هەستم کرد چاک مەست بووبوو... جا دەنگی هەڵبڕی و دەستی بەقۆریات کرد و شتێکی وت بەتورکی وەک مەوال یا مەقام و لە ئاخری کۆپلێ کە وەک عادەتی لە قۆریات، بەوشەی ئیمانم کۆتایی پێ دێنێ.کە ئەو وتی: ئیمانم... کاک مەجیدیش بەپێکەنینەوە، بەهەمان نەغمە وتی: وەی ئیمانوو سکیم! ئیتر ئەوە بوو بۆ گاڵتە و برادەرایەتی و خۆشکردنی دانیشتنەکە لە دەمی دەرچوو هەڵبەتە بووە پێکەنین بە سەعدوڵڵاشەوە! لەگەڵ ئەبوو عەزیز و عەبدولقادر و ئەدوەر... هەندێک شەو لە ماڵی کاک عەبدولقادر دادەنیشتین، ئەو دەعوەتی دەکرد... چونکە ئەوانە: واتا ئەبوو عەزیز و ماڵی عەبدولقادری... لە سووریاوە تێکەڵاوی خێزانییان هەبوو... جا کە ئەبوو عەزیز دەهات، هەر حەزیشی دەکرد ماڵ و منالی عەبدولقادریش: واتا خێزانی و منالەکانی ببینێ و هەواڵیان بزانێ، پێش ئەوەی بڕواتەوە شام. هەروەها چەند جارێکیش دەچووینە سەیران، تەنیا کۆمپانیا و من: واتا: ئەبوو عەزیز، عەبدولقادر، ئەدوەر و من... بۆ لای ڕانیە و دەشتی بیتوێن کە

گۆرانیبێژی میسری بەناوبانگ محەمەد عەبدولوەهاب و شاعیری گەورەی عەرەب ئەحمەد شەوقی

سەیرانێک بۆ دەشتەکەی بیتوێن لەگەڵ بەڕێزان ئەبوو عەزیز ئەندامی مەجلیسی ئیدارەی کۆمپانیای سووری بەناوی (الشرکة العربیة للاعمار) کە لە کۆیە، کاری ڕێگەوبانیان ئەنجام دەدا-- ئینجا من خەریکی خۆ ڕێکخستنم پێش دانیشتن، ئینجا کاک عەبدولقادر، ڕایەخێکی بەدەستەوەیە. لە لای ڕاستەوەش ئەبوو عەزیز وەستاوە. بەهاری ١٩٥٩

دانیشتووین لە دەشتەکەی ڕانیە لە ڕاستەوە: من، ئەدوەر-- ئەندازیاری کۆمپانیای (العربیة) ئینجا لێپرسراوی کۆمپانیا: ئەبوو عەزیز، لە لای چەپیشەوە، ژمێریار (محاسب)ی شەریکە: عەبدولقادر قەواس.
بەهاری ١٩٥٩

بەهاران زۆر خۆشە و بۆ لای دوکانیش لە ناو گیاوگوڵەکانی دەشت لێی دادەنیشتین تا ئێوارەیەکی درەنگ.

لەگەڵ مامۆستاکانی قوتابخانەکانی کۆیە بەگشتی، سەراپایان بووبووینە هاوڕێ و خۆشەویستی یەکدی. ئەوانەی (متوسطة)ش بەتایبەتی. سەیران و گەشت و دانیشتنەکانی هەفتانەی شەوانی هەینی کە بەزۆری لەو خانووە دادەنیشتین کە بەڕێزان: مامۆستا سدیق عەبدولقادر و مامۆستا مەجید سێگردکانی و حازم ئەحمەد عەبدوڵلای موسلاوی و عەبدولڕەحمان تاهیری کاتبی مەکتەبەکەمان و کاک فەیسەڵ مەساحی هەولێری... ئەوانە خانووێکی گەورەیان گرتبوو بەکرێ هەموویان پێکەوە دەژین و دەنوستن چونکە هەر پێنجیان زگوورتی بوون، واتا عازەب بوون بەخۆیان شتومەکیان دەکڕی و بەشێوەی (ئیشتراکی) هەموومان لە مەسرەفەکە بەشدار دەبووین وەکو یەک، پارەمان دەدایە یەکێکیان... ئەوەی پێویست بوایە بۆ دانیشتنەکە ئامادەی دەکرد... ئەوجا وەرە بزانە ئەو شەوەمان چەند خۆش ڕادەبوارد... لەگەڵ مامۆستا شەفیق سابیری بەڕێوەبەریش کە هەمیشە میوانی (شەرەف)مان بوو. کاک شەفیق، دانیشتن لەگەڵیدا تامێکی تری هەبوو! وەک بەهارات یا خوێی ناو زەلاتە و چێشت بوو! بێی ئەو... دانیشتن تامی نەبوو.

هەروەها پایزەکەیساڵی ١٩٥٧، هێشتان پرۆژەی سەددەکەی دۆکان، لە هەنگاوە سەرەکییەکانی بوو... لەمێژ نەبوو دەست کرابوو بەدروستکردنی. جا ڕۆژێک بڕیارمان دا بۆ سەیران بچینە ئەوێ و پرۆژەکەش لە نزیکەوە و لە سەرەتاوە ببینین. ئەوەبوو: کاک شەفیق سابیر بەڕێوەبەری قوتابخانەمان و کاک سدیق عەبدولقادر و کاک جەمال غەفوور و مامۆستا عەبدوڵلا کاکە (باوکی باوەزیر) و مامۆستا بیلال بەهائەدین و مامۆستا عومەر دەرویش بەرەو دۆکان، بە هەیبەت سوڵتان و چنارۆکدا و بۆ ڕێگەی میرزا ڕۆستەم و بەقەیاغەکەش پەڕینەوە ئەوبەر و بۆ ڕێگەی قەڵادزە و بۆ دوکان... بەسەر پردە کاتییەکەدا کە لەسەر زێی دۆکان دروست کرابوو بۆ پەڕینەوەی ترومبێل و کاروان و خەڵک، لەم بەرەی کۆیە و ڕانییەوە بۆ ئەو بەری زێیەکە تاکو بچن بۆ سلێمانی. ئەو پردەش کە لە گوریسی (تێل)ی ئاسن و تەختە دار دروست کرابوو، کە بەسەریدا دەڕۆیشتی وەک (حندرحۆ) لە ژێر پێ دەجووڵایەوە... خەڵک زۆر دەترسان، بەڵام وا دروست کرابوو... قەت ڕۆژێ تێک نەچوو یاخود قەدەرێکی لەسەر ڕوو نەدا و کەس ئەزیەتی پێ نەگەیشت تا پرۆژەکە تەواو بوو. لەم وێنانەی خوارەوە... هەندێ دیمەنی ئەو گەشتەمان دەبینن:

وێنەیەکی ئەو گەشتەمان کە لە پایزی ساڵی ١٩٥٧ لەگەڵ مامۆستاکانی قوتابخانەکەمان و یەک دوو دۆستی خۆشەویستی دیکەش لە مامۆستاکانی قوتابخانەی سەرەتایی، بەرەو دۆکان، بۆ سەیران ڕۆیشتین: جا ئەو کەسانە لەم وێنەدا ڕاوەستاوین لەسەر زێیەکەی (میرزا ڕۆستەم، کە ئەوسا دەبوایە بە قەیاغ- پێیان دەگوت دوبە) خەڵک بپەڕنەوە ئەو دیو! کە سەدەی دوکان تەواو، ئێرە کەوتە ژێر ئاوی بەحرەکە! کەسەکان لە ڕاستەوە ١- مامۆستا سدیق عەبدولقادر ٢- مامۆستا عبدالله کاکە ٣- مامۆستا عومەر دەروێش ٤- مامۆستا شەفیق سابیر ٥- باکووری ٦- مامۆستا جەمال غەفوور ٧- مامۆستا بیلال بەهائەدین).

وێنەیەکی تر لەو گەشتەمان بۆ ڕانیە و قەڵادزە و میرزا ڕۆستەم و دۆکان، لە پایزی ساڵی ١٩٥٧: دانیشتووەکان: تەنیا سێیەمیان، لە ڕاستەوەم ناسیەوە کە مامۆستا بیلال بەهائەدینە مامۆستای قوتابخانەیەکی سەرەتایی بوو- هونەردۆست بوو. ڕاوەستاوەکان لە ڕاستەوە:

١-..........؟! نەمناسییەوە

٢- مامۆستا جەمال غەفوور- خەڵکی سلێمانی بوو- لە قوتابخانەی (متوسطە)ی کۆیە... لە پێش هاتنی منیش لەوێ بوو، دەرسی (اجتماعیات- جوغرافیە و تاریخ)ی دەگوتەوە.

٣- مامۆستا عومەر دەروێش- لە متوسطە بوو) عەرەبی دەگوتەوە- وابزانم خەڵکی کەرکووک بوو.
٤- مامۆستا شەفیق سابیر- بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی
٥- مامۆستا عەبدوڵلا کاکە- باوکی باوەزیر- مامۆستای سەرەتایی بوو. بەڵام زۆر بەزەوق و قسەخۆش بوو- زیاتر کاتی لەگەڵ ئێمە ڕادەبوارد و حەزی لە گۆرانی کوردی و عەرەبی بوو- زۆربەیانی بۆ خۆی، لە ڕادیۆوە، تۆمار دەکردن.
٦- من!! باکووری - نووسەری ئەم بیرەوەرییانە.
٧- مامۆستا سدیق عەبدولقادر- دەرسی (طبیعیات)ی دەگوتەوە. مامۆستایەکی بەشەخسیەت و بەئەخلاقی بەرز و بەڕێز بوو. لە دانیشتنان مەجلیسەکەمانی بەبیرەوری و قسەی خۆش و پێکەنینە تایبەتییەکەی، دەڕازاندەوە.

ئەگەر سەیری دواوەش لە دیمەنەکەدا بکەیت، ئەوا بەشی سەرەوەی (قەیاغ)ەکەی سەر زێی میرزا ڕۆستەم دیارە وەستاوە و چاوەڕێمان دەکات، بمانپەڕێنێتەوە ئەو بەر ئەم شوێنەش، هەموو، ئێستا لە ژێر ئاوی دەریاچەکەی (دوکان)ە.

ئەمەش وێنەیەکی دیکەیە (وێنەی سێیەم)ە لەو گەشتەمان بۆ ڕانیە و میرزا ڕۆستەم و دوکان، لە کۆیەوە چووین لە پایزی سالّی ١٩٥٧، بەمەبەستی دیتنی پرۆژەکەی بەربەست یاخود (سدە)کەی دوکان کە لەمێژ نەبوو دەست کرابوو بەهەنگاوە سەرەتاکانی دروستکردنی).

جا بۆ ئەوەی ڕێگە سەفەری ترومبێل و خەڵک لە کۆیە و ڕانیەوە بۆ سلێمانی و بەپێچەوانەشەوە بەردەوام بێ، پێویستی بەدروستکردنی پردێکی کاتیی (مووەقەت) هەبوو. ئەندازیارە بیانییەکانیش کە پسپۆڕ بوون لەم جۆرە کارە بیناسازی و دروستکردنی ڕێگەوبان و بەربەست... تاد. ئەم پردەیان دروست کرد، کە پێک هاتبوو لە درێژکردنی ٤ گوریسی (سیم= واتا وایەر)ی ئاسنی ئەستوور، لەمبەرەی چیاکەوە بۆ ئەوبەری-

بەپانایی گەلییەکەی کەوا ئاوی زێیەکەی بەناودا دەڕۆیشت چوار گوریسی ئاسن، دوو لە سەرەوە، دووش لە خوارەوە، کە مەسافەی بەینیان، هەندی پانایی سەیارەکی گەورە دەبوو- لەسەر گوریسەکانی بەشی خوارەوە، تەختەداری ئەستوور ڕێکخرابوون و بەسترابوون بەیەکەوە و بەگوریسەکان بەبورغی ئاسنی گەورە و وەک پردی لێ هاتوو- ئینجا ئەو پردە تەختەدارەش، بەدوو گوریسەکەی بەشی سەرەوەی، لەملا و لەولای، دیسان بەسترا بوون بە وایەر و تێلی ئاسن- جا پردەکە لە دوورەوە وەک پردێکی (هەڵواسراو- معلق)دیار بوو، دیمەنەکەی زۆر جوان بەڵام مەترسیدار بوو- کە ترومبێل بەسەریدا دەڕۆیشت، هەڵدەزەقیەوە... جا ئێمەش ئەوا لەسەر ئەو پردە وەستاوین: مامۆستایان: شەفیق سابیر ومن و مامۆستا سدیق عەبدولقادر و مامۆستا عەبدوڵڵا کاکە و سایقەکەمان. جا شەوەکەی ئەو گەشتەمان، هەندێک لە برادەر و خزم و ناسیاوانی مامۆستایان شەفیق سابیر و سدیق عەبدولقادر عەبدوڵڵا کاکە و... دەعوەتیان کردین، لە ماڵێک لە بیرم نییە ماڵی کێ بوو، چونکە من خۆم، جارێ کەسم نەدەناسی لەو شارۆچکەیە و ئەمە یەکەم جارم بوو، لەو پایزەیساڵی ١٩٥٧ کە هاتم لەگەڵ ئەو دەستە پیرۆزە لە مامۆستایانی کۆیە.

ئەم وێنەیەی لێرەدایە، عەسرەکەی، لە یانەی فەرمانبەرانی ڕانیە گیراوە- دانیشتووەکان لە ڕاستەوە:

١- من- باکووری

٢- .........؟! نەمناسییەوە

٣- مامۆستا عومەر دەروێش- قوتابخانەی ناوەندیی کۆیە.

٤- .........؟!

٥- مامۆستا سدیق عەبدولقادر، قوتابخانەی ناوەندیی کۆیە.

٦-مامۆستا عەبدوڵڵا کاکە- مامۆستای سەرەتایی لە کۆیە

ڕاوەستاوەکان لە چەپەوە:

١- مامۆستا بیلال بەهائەدین- مامۆستای سەرەتایی لە کۆیە

٢- مامۆستا جەمال غەفوور- قوتابخانەی ناوەندیی کۆیە.

بەداخەوە کەسایەتییەکانی دیکەم نەناسینەوە، بەلام هەموویان برادەر و دۆستی خۆشەویستمان بوون، لە مامۆستا و خەلکی رانیە.

***

من، لە سەرەتای دامەزرانم وەک مامۆستا لە قوتابخانە، زۆر کەم دەچوومە یانەی فەرمانبەرن... کاتی خۆم بۆ فێرکردنی مۆسیقا تەرخان کردبوو بۆ قوتابییە ژیکەلەکانم و دەمویست ببنە (نواة: ناوک)ێکی پیرۆز و بەردی بناغەی بزووتنەوەی مۆسیقا و بایەخدان بەئاواز و گۆرانی رەسەنی کوردی بەگشتی، بەرهەمە خۆش و بەجۆشەکانی ناوچەی کۆیە و دەوروبەری... کە ئەو هەوا و ئاوازانە دڵگیر و بەتام و نەمرن... جا کە جار ناجارێک دەچوومە (یانە) کە ئەوە دیسان هەر لەگەڵ برادەرە هونەرمەند و شاعیر و مرۆڤە رۆشنبیرەکان دادەنیشتم و پێوەندیم لەگەڵیاندا پتەوتر بوو.

لەم وێنەیەدا لە ناو باخچە بێنازەکەی یانەی فەرمانبەرانی کۆیە- ئێمەی سێ گەنجی نازداری خوێنگەرم و پر هیوای رۆژێکی باشتر و چاکتر بۆ ئەدەب و شیعر و رۆشنبیری و هونەری کورد، لەسەر گیایەکی زەرد و وشک (لە رستەوە: کەریم شارەزا، باکووری و کەمال سادق)، وێنەی کەمان گرتووە... یانەکە لە ژێر گرد و تەلانەکەی لای (قولله)ی قشلەی رۆژئاوای بوو وەک لە سەرەوەی وێنەکە دیارە...)

ئێرە، کە سالانی سییەکان و چلەکان گۆمەئاوێکی پیس بوو... ئاوی بارانی گردەکەی قشلە و قەبرستانەکەی دەورەی قشلە و ئاوی سەر جادەکەی بەرامبەری کە لە کەرکووک و هەولێرەوە دەهات، لێرە رەت دەبوو بۆ شار، جا ئەو ئاوە دەبووە گۆمێکی گەورەی پان و بەرین و درێژ.. ئاوەکەش تا سەرەتای هاوین هەر تێیدا دەمایەوە... جا سەگ و پشیلە و ئاژەڵی دیکەی لە شار بتۆپیبایە، کەنناسی بەلەدیە، یا هەر کەسێک بوایە... ئەو لاشە مردووانەیان دەهێنا ئێرە و فرێیان دەدانە ناو گۆمە ئاوەکە... هەر دەمایەوە... ئەگەرچی

شەوانە چەقەڵ و ڕێوی و ڕەنگە گورگیش، لە دوای بۆنی لاشە بۆگەنییەکان دەهاتن و دەیان خواردن و تەیر و تواریش وەک سیسارکە کەچەڵ و قەلەڕەش و...تاد، تا ئێسکەکان دەمان و تا لاشەی ئاژەڵی تریان دەهێنا! جا گۆمەکەیان ناو لێنابوو گۆمی سەیان... چونکە زیاتری لاشەکان، ئی سەگ بوون. لە پەنجاکان، گۆمەکە پڕکرایەوە و بینایەی (یانە)ی فەرمانبەران و لە تەنیشتی لای ڕاستی یانەکەش (دار الاستراحة) دروست کران! ئیشێکی چاکیان کرد، بەڕاستی! بەڵام بەمن، یانە کۆنەکەی جاران، تەنیشت سەرای کۆیە، لە ناوەڕاستی شار، زۆر خۆشتر و فەراح و لێوەشاوەتر بوو! ئەو یانە کۆنە، کاتی خۆی، وەک لە بیرمە و گوێم لێ بوو، لە ساڵی ١٩٤٠/١٩٤١ کرایەوە پێم وابێ بەهیمەت و چالاکیی هەندێ ڕۆشنبیر و مامۆستا و یارمەتی خەڵکی دەوڵەمەندی شار و یارمەتی (مادی) هەموویان ئەو نادیەیان کردەوە بەتەرخانکردنی بەشێکی (سەرای) لە لای دەستە چەپییەوە و بڕییان و دیوارێکیان لە نێواندا هەبوو، دەرگایەکی بچووکیش لە ناوەڕاستی دیوارەکە بوو کە دەتوانر لە سەراوە یەکسەر بۆ نادی، یان بەپێچەوانەوە بچیت! یەکێک لەو مامۆستایانەی پێوەی ماندوو بوو و هەڵیان بژارد وەک ئەندامێکی دەستەی بەڕێوەبردنی یانەکە، مامۆستای ڕۆشنبیر و کەسایەتی نیشتمانی ناسراو و ئەدیب: مامۆستا تاهیر سادق بوو، مامۆستامان بوو لە قوتابخانەی خوارێ، دەرسی (الاشیاء والصحة)ی پێ دەگوتین.

مامۆستا تاهیر سادق

ئەو و لەگەڵ چەند مامۆستایەکی دیکە دەستێکی باڵایان هەبوو لە دامەزراندنی ئەو یانەیە مووەزەفەکانی کۆیە حەوانەوە بۆ خۆیان... هەر لە عەسرەوە فریز و گوڵ و شتڵە درەختەکان دەرشێندران و کورسیەکان ڕێک دەخران... ئیتر پەیتا پەیتا مووەزەف و مامۆستا و کەسایەتی ناسراوی شار ڕوویان تێ دەکرد... بۆ ڕابواردنێکی سادە و خۆش... لە کەشوهەوایەکی فێنکدا بەهاوین... کەشوهەوا بەگشتی، لە هەموو جیهان، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە تا دوا ساڵانی شەستەکانیش کەوا من دێتەوە یادم، زۆر سازگار و فێنک و خۆش بوو. زستان هەمیشە، لە کۆیە- وەک نموونە- بەفر و باران دەباری و سارد بوو- هاوینی خۆش بوو. بەو شێوە و بەو پلەیەی ئێستای (ساڵی ٢٠٠٥)، گەرم نەبوو. یانی بەچلەی هاوین لە مانگی تەمووز ئەگەر بچووبایتە ناو باغ و باخچەکان و سەر ڕووبارەکەی حەمامۆک کە

سێ دەورەی شاری دابوو... دەتوانرا زۆر بەخۆش و بەبێ هەستکردن بەگەرما- لە ژێر درەختەکان تا ئێوارە... ڕۆژەکەتان بەسەر دەبرد... ئاوی بەفراویشت پێویست نەبوو... چونکە ئاوی کانیاوەکەی حەمامۆک و ڕووبارەکەش زۆر سارد و فێنک بوو- ئاوی بەللووعە لە مالان، بەهاوینان بەدرێژاییی ڕۆژ خێزان و ماڵ و مناڵ لێیان دەخواردەوە.

لێرەدا دوو وێنەی ڕۆژێکی بەفراوییە واتا کە بەفری تێدا باری لە ١٩٥٨/١/٣١ئەوەی لای ڕاست: من و یووسفی برام لە ناو بەفر دانیشتووین لەسەر گردی قشلە. ئەوەی لای چەپیش هەمان ڕۆژ لە شوێنێکی تر من لە ناو بەفرام.

لێرەش، دیسان، زستانی ساڵی دواتر، واتا ١٩٥٩چەند جارێک بەفر دەباری- لەم وێنەیە، لە حەوشەی خۆمان، پەیکەری کیژۆڵەیەکمان دروست کردووە بە بەفر

ئەم وێنەیەش، لە بەردەم یانەی مووەزەفانی کۆیە، لە زستانا، لە ڕۆژێکی بەفراوی ساڵی ١٩٥٩ بەفرێکی زۆر، بۆ چەند ڕۆژێک دەباری، جا ئەو مامۆستایانە بەم بۆنەیەوە ئەم وێنەیان حەز لێبوو بۆیان وەرگیرێ لە ڕاستەوە:

١- مامۆستا مەجید سێگردکانی (متوسطة)

٢- کاک سەعدوڵلا عبدوڵلا (مساح) لە کۆیە

٣- مامۆستا عبدولخالق علائەدین (سەرەتایی)

٤- مامۆستا سدیق عبدولقادر (متوسطة)

٥- جەمال عبدولکەریم حەمە مەلا (کاتبی بلدیە)ی کۆیە.

٦- مامۆستا کەریم مستەفا (شارەزا)

٧- مامۆستا موعتەسەم عەبدولمەجید (سەرەتایی)ی کۆیە

دانیشتووەکان، لە ڕاستەوە:

١- مامۆستا عبدولڕەحمان سەید علی (متوسطة)

٢- مامۆستا بیلال بەهائەدین (خۆی و ساقۆکەی پێچاوە)

٣- جوزێف فەرجۆ- (مساح) لە کۆیە.

٤- زاهیر ئەحمەد هەناری- سەرەتایی.

باکووری لە کۆیە لەناو بەفر لە ١٩٥٨/١/٣١

ئەمە بەزستان، جا بەهاوینان، زۆر لە خێزانان یەکتر دەگرنەوە: ئەگەر خزم بن یان دۆست و برادەر بن، یان خەڵکی یەک گەڕەک بن، یان چەند برادەرێک کە هاوزەوق و هاومەشرەب و سەیران و بەزمیان خۆش بێ لە لایان، ڕێک دەکەون و بەرەو ناو

ئەو باغ و دەو ڕووبار و سەر کانی و گوندەکانی دەوروبەری شار و سەردانی مەزارەکانی لێرە و لەوێ هەنە... بەڕێ دەکەون و بۆ ئەو شوێنەی بڕیاریان داوە بچن، بەپێیان ئەگەر دوور نەبێ وەکو ئاشان و سەرچاوەی حەمامۆک و کانی سۆرک و شیوی ڕەزان و ئۆمەر خوچان و تەنانەت ئێمە بۆ هەرمۆتە و تۆبزاواش بەپێیان دەچووین ئەگەر چیش، بۆ ئەو سالانەی چل و پەنجاکانیش، دوور بوون لە کۆبە! ڕێگەکانیش هیچیان قیرتاو نەبوون. هەموویان ڕێگە کاروان و کەر و ولاغ و پیادە بوون، پەناوپێچ، دڕک و دار، بەرد و خۆڵ... لێرە و لەوێش جۆگە ئاو دەبوایە بەسەر بەردان بپەڕیتەوە! من نازانم ئەو هەموو جۆگە ئاوانەی لە سەر ڕێی هەرمۆتە... یا لە تۆبزاوە... یا بۆ حەمامۆک چییان لێ هات؟! ئەگەر شوێنی سەیرانەکەش دوور بوایە، وەک چیاکەی هەیبەت سوڵتان و سەیرانگای چنارۆک... تاد ئەوە دەبوایە بەجێبێک بچووبان. بەڵام هەر بگەیشتیایە شوێنەکە و کەلوپەلەکانت دانابایە سەر عەرد و لە ژێر درەختەکان لە ڕۆخ جۆگە ئاوێک دانیشتبای و پێت لە ناو ئاوەکە دابنابایە... یەکسەر هەستت بەراحەتی و ئیسراحەتی لەشی و لاق و دەست و مێشکت دەکرد... چاکترین بەڵگەش، هەڵبەتە، بۆ قسەکانم، هەندێ وێنە و ڕەسمی ئەو حالاتانە لێرە پێشانیان دەدەم کە هەموویان ئی سەیران و ڕابواردنی خێزانی، یا زگورتییانی ئەو زەمانەن... چونکە هەر لە سالانی قوتابیانی و لاوێتی خۆی کامێرای (بۆکس)م هەبووە و حەزم لە وێنەگرتن بوو وێنەی برادەران... سەفرە و گەشت و خزمان...

لەسەر جۆگە ئاوەکەی و خوار گردەکەی کە مەزاری مەربێنە قەدیشەی لەسەرە.
چەند خێزانێکی پۆلیسە ئاشوورییەکان کۆ بووینەوە لەو سەیرانە. من لە
ناوەڕاستیانم بەعوودەوە گۆرانیان بۆ دەڵێم. لە ساڵی ١٩٥٥

وێنەیەکی تری هەمان ئەو خێزانە ئاشوورییانەی ماڵە پۆلیسەکانی کۆیە ئەمجارە لە بۆ ناو باخچە و سەر ئاوەکانی سەرچاوەی حەمامۆک و رووبارەکانی، لە مانگی گەرمی تەمووزی ١٩٥٥ سەیرکە چەند (مورتاحن) لە بەر هەتاوەکە وێنە دەگرن.

دوای ئەو گەنجەی منالێکی لە باوەشە، منم بەکراسی سپی و پانتۆلی ڕەش و عوودەکەم هەر لەگەڵمایە- ئینجا کاک مەتی دەرمانی ئامۆزام- ئێستا لە هەولێرە، مامۆستای خانەنشینە. ئەوەی لە پشت کاک مەتی، ڕاوەستاوە و سەماوەرەکەی وەک (کامێرای تەلەفزیۆنی) بەرز کردووەتەوە - ئەوسا هێشتا تەلەڤزیۆن هەر باسی نەبوو، نە لە عێراق و نە لە هەموو (شرق الاوسط و ادنی)- ئەوە ئیمەی برامە- دوای ئەو، ئافرەتی یەکەم بەکراسە گوڵگوڵییەکە، وەجیهەی کچی مام گۆریلی پۆلیسە، ئافرەتەکەی تەنیشتی بەکراسی سپی، بەسێ خانە، خێزانی یۆخەننای برادەرم، کوڕی گەورەی مام گۆریل، پۆلیسی سوارە. ئینجا لە تەنیشتی بەسێ. مێردیتی! یۆخەننا گۆریل، ئینجا ماری خوشکم و دوا کەس: پۆلیسی سواری: مام ئیبراهیم ئسحاقە کە بە (ئیچۆ) ناسرابوو لە ناومان. خوا عافوویان بکات ئەوانەی مردوون! لە بەهەشتی خودادان ئینشائەڵلا.

ئەم وێنەیە، ڕەنگە کەسێکی تر بیری لێ نەکردبێتەوە، لەو شوێنە گرینگە... ڕەسمی خۆی و برادەران یا خزمان بگرێ بەڵام من و هەوەسی ڕەسم گرتن لە کەللەمدا بووە هەمیشە لەو سەیرانە کە کردمان بۆ حەمامۆک، لە مانگی حوزێرانی ساڵی ١٩٥٥، ئەو چەند خزمەم بردنە ئەو جێیە لە ناو جەرگەی باغەکانی حەمامۆکە، کە لە سەرچاوەی کانییەکەی حەمامۆک، کە بەبەرد و گێچ دیواری لە دەورەدا کراوە، بەڵام بەشێکی ئاوەکە، لەم شوێنە، لە ژێر دیوارەکەوە دێتە دەرەوە دەڕوا بۆ خوارەوە و تێکەڵ بەڕووبارەکەی لەولاترەوە، دەبێت. جا ئەم وێنەیە مێژووییەمان گرت و ئەو گەنجە کوڕ و کچانەش، کە هەموو خزمی یەکن، ئەوانەی خوارەوەن:

وەستاوەکان سێ کەسن لە ژێر دیواری سەرچاوەکەی حەمامۆک، لە ڕاستەوە: مەتی دەرمان، یۆخەننا گۆریل، ئەننا دەرمان (خوشکی مەتی). ماری خوشکم لە پێش (ئەننا) لە ناو ئاوەکە ڕاوەستاوە، لە تەنیشتی لای دەستە ڕاستی خۆی (واتا چەپی وێنەکە)، هەریەک کەس هەیە کە تیمەی برامانە- ئەوانەی تر لە لای دەستە چەپی ماری: هورمز و من دەستمان لە ناو ئاوەکەیە... ئینجا لە تەنیشت من (شموئیل گۆریل) برای (یۆخەننا گۆریل)ە.

هەڵبەتە، کۆییەکان بەهەمان شێوەی دەچوونە سەیران لە ناو باغان... بەڵام وەک من وێنەیان نەگرتووە و ئەگەر وێنەی خۆیان گرتبێ، ئەوا پاش ماوەیەک لێرە و لەوێ لە ماڵەوەیان فڕێ دەدرێ و گرینگی بەو مێژووە خۆشە نادەن، بیانپارێزن... کەسیشیان وەک من بیرەوەری خۆی نەنووسیوە... و نانووسێت... بۆ مێژووی خۆی و شارەکە! ئا لێرەدا باسی هەواڵی ماڵی باوکی (ئەمیرەکەم) پێ گەیشت کەوا دەرچووینە لە حەوشەکەی ماڵی ئێمە کە ئێمە و ئەوان پێکەوە تێیدا بووین چونکە (I. P. C.) خانوویان دایتە (مام ناسر)ی باوکی ئەمیرە لە ناوچەی (عەرەفە). ئەم هەواڵەم زۆر پێ ناخۆش بوو- ئەو ڕۆژە هەر بیرم لەوە دەکردەوە! بەڵام لەبەر خەریک بوونم لە بیر خۆمم دەبردەوە.

ئەم وێنەی یەکەم(١) لەسەرەوە، ڕێگەکەی نێوان کۆیە و گوندی تۆبزاوە نیشان دەدات کە چەند ناخۆش و پڕ لە بەرد و دڕک و پووش و دار بوو. وەردەی خوشکم لە پێشەوەیە و تیمەی برام لە دواوەی، ئێمەش بۆ سەیران، بۆ سەر مەزارەکەی (مەربێنە قەدیشە) و بۆ ناو باخچەکانی سەر ڕووبارەکەی تۆبزاوە، هەر بەپێیان دەچووین، منالّ و کوڕ و کچ و گەورە و بچووک گێمان لێ نەبوو! گرینگ ئەوەبوو کە دەگەیشتینە شوێنەکە، ئیتر ئیسراحەتمان دەکرد. بەخواردن و گۆرانی و هەلّپەڕکێ ڕۆژەکەمان بەسەر دەبرد.

وێنەکەی دیکەش (ژمارە٢) هەر هەمان ڕێگەکەیە بۆ گوندی تۆبزاوە- ئەو خانووەی لەسەرەوە، لە دوور دیارە، مالّی خوالێخۆشبوو (شەفیق ئاغا)یە ئاغای گوندەکە بوو منی زۆر خۆش دەویست بەڕەحمەت بێ. ئەگەر لە گوند بوایە و ئێمە لە ناو باخچەکانی بواین، دەهاتە خوارەوە و تاوێک لە لامان دادەنیشت، هەروەها خێزانەکەی (دایکی کاک جەواد و فریاد..) دەهات لە لای دایکم و مالّەوە دادەنیشت.

هەردوو وێنەکان لە ڕۆژێکن لە سەیرانێکی هاوین ١٩٥٩دا.

## لافاوی جەرگبڕی شاری سلێمانی... لە پایزی شوومی ساڵی ١٩٥٧

لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەکان و دامەزراندنی تیپی مۆسیقای باواجی و چالاکییەکانمان، کە ناوبانگی تیپەکە بڵاو بووەوە و لە یەک دوو بۆنە ئاهەنگی خۆشمان گێڕا... لە سلێمانییەوە فیلیپی برام لەوێ، لە کارگەری سەرچنار (ملاحظ) بوو... چەند جارێک کاغەزی بۆ دەناردم و تیایدا دەیگوت لێرە جەماعەتی مەولەوی کاک قادر دیلان و کاک ولیەم و ئەوانی تر باست دەکەن و ستایشی هەوڵ و کۆششەکانت دەکەن لە هەموو دانیشتنێک و کۆڕێک و دەستخۆشیت لێ دەکەن! من سوپاسم بۆ دەناردن لەگەڵ وەڵامی کاغەزەکانی کاک فیلیپ و دەمگوت: ئینشائەڵڵا بۆ پشووی نیوەی ساڵ، واتا لە مانگی شوباتی ساڵی دادێ... ١٩٥٨ هاتم سەریان لێ دەدەم! بەڵام، سروشت و موقەددەر وای کرد، ئەوان- واتا جەماعەتی مەولەوی- زووتر بێنە کۆیە، بەڵام بەبۆنە و موقەددەر و دەرفەتێکی ناخۆش! نەک زیارەتێک و سەردانێکی موناسەبەتێکی پڕ شادی و کامەرانی!

لەو پایزەدا کە دنیا فێنک بووبووەوە، سەیرانی خۆشمان دەکرد لە کۆیە و خۆشمان ڕادەبوارد، لەناکاو، لە ڕادیۆی کوردی بەغدا هەواڵێکی ناخۆشیان بڵاو کردەوە و دووبارە و سێ بارە و هەموو سەعاتێک هەواڵەکەیان بڵاو دەکردەوە کە تێدا بێژەر بەدەنگێکی خەماوی ڕای دەگەیاند کە ئەم ئێوارەیەی ڕۆژی ٨ی تشرینی یەکەمی ئەو ساڵە، ساڵی ١٩٥٧، لەپڕ هەوری ڕەش ئاسمانی سلێمانی داگیر کرد و ڕەشەبایەکی توند هەڵی کرد و ئینجا ئاسمان کرایەوە و وەک ڕووبار و زێ، تەرزە و باران بەسەر شاخی گۆیژەدا دەڕژا و زۆری نەبرد ئاوی لافاوێکی بێ وێنە لە مێژووی ئەو شارە، هاتە خوار و ڕژایە ناو کووچە و کۆڵانەکان و شەقامەکانی شارە خامۆشەکە و لە هەموو لایەک گوێت لە بانگ و هەرا و گریان و زیرەی منالان و هاوار هاواری پیاوان و ژنان دەبوو- ئیتر هەر ترومبێل بوو غلۆر دەبووەوە و لەگەڵ شەپۆلی ئاوەکە، خێرا دەڕۆیشت و ئەوەی لە پێش بووایە ڕای دەماڵی... ئنجا عارەبانە و لانک بەمناڵەوە و کورسی و لاشەی پیاو و ئافرەت، کەلوپەلی دوکانەکان و میوە و خواردنی بازاڕ... و هەموو شت... هەموو شت لەگەڵ شەپۆلە بەرزەکان ڕایان دەکرد

بەرەو خـواری شـار... بەرەو باشـوور و دەشـتـایی نەدەزانرا بەرەو کـوێ ... ئەم لاشـانە... ئەو ترومبێلە بچووک و گەورانە... لە چ دۆڵێک لەسەر چ گردێک دەوەستن... یا لە ناو چ قوڕ و قوڕاوێک نقووم دەبن. ولحاسل کارەساتێک بوو! شاعیران... نووسەران... بەشیعر و بەوتار و نووسین، هەسـتـی خـۆیان و نارەحـەتـی و خـەم و پەژارەیان دادەڕشت و بۆ ڕۆژانی داهاتـووش... تا مـاوەیەکی زۆر لە ڕادیـۆی کـوردی بەغـدا بڵاو دەکرانەوە... لە ڕۆژنامـە و گۆڤارەکان دەخوێندرانەوە لە خوارەوەد نموونەی هەندێ لەو نووسینانە و شیعـرەکانی، پێم باشە، هەر بۆ وەبیرهێنانەوە، بیانگوازمەوە ئەم لاپەڕانە:

هیوا

گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستییە مانگی جارێک دەرئەچی

ژمارە ـ ٥ ـ ساڵ ـ ١ ـ کەوبەر ـ تشرینی دووەم ـ ١٩٥٧

لەم ژمارەیەدا

١ ـ پێشەکی
٢ ـ لافاو : کامەران
٣ ـ لافاوی مەرگ : خالد رشید زیوەر
٤ ـ لافاو : کامل ژیر
٥ ـ مێژووی ژیانی کامل جوانە مەرگ
٦ ـ کۆچی دوایی : بەحاڵەی کمال غفوری
٧ ـ بەھۆی لافاوەکەی سلیمانیەوە : قادر قەزاز
٨ ـ حقوقی ئافرەت : پ. ننگ
٩ ـ هەستی ئافرەت خوێنکە : ب
١٠ـ هەڵگرتنی یاسای ( دعوی عشائری ) بەغداد [illegible]
١١ـ جۆرەکانی خۆشی مرۆڤ : فوئاد [illegible]
١٢ـ سوەی کوردی بەتی : نووسینی مصطفی کوردی
١٣ـ چیرۆک : کوا کورە کە : نووسینی مصطفی صالح کریم

١- لە گۆڤاری (هیوا)ی ژمارەی (٥)ی ساڵی (١)- لە (تشرینی دووەم)ی هەمان سـاڵ... سـاڵی ١٩٥٧ دەرچووە، ژمـارەیەک وتار و شـیـعـر بۆ ئەو ڕووداوە ناخـۆش و دڵتـەزێنە بڵاو کـراونەتەوە، وەک شـیـعـری (لافـاو)ی شـاعـیـر کـامـەران مـوکـری، کـە ڕۆژی چەند جـارێک لە ئێـزگـەی ڕادیۆی کـوردی بەغـدا، دەخـوێندرایەوە. هەروەها شیعرێک بەناوی (لافاوی مەرگ)ی خالید ڕەشید (زێوەر)، و شـیعـرەکەی (لافـاو)ی شاعیر کامیل ژیر... تاد.

شاعیر کامل ژیر، دواتر، لە ناوەڕاستی مـانگی کـانوونی یەکـەمی هەمـان ئەو سـاڵە... سـاڵی ١٩٥٧، کـۆمـەڵە هەڵبـەسـتـێکی جـوان و نـاسک، لە نامیلکەیەکدا بەناوی (نازەنین)ی بۆ بڵاو کر یەوە لە بڵاوکراوەکانی نامەخانەی (زێوەر-سلێمانی) کە خاوەنەکەی: محەمەد عارف مەعروف بوو...، لەم (نازەنینە)ش شیعرەکەی (لافـاو)ی خۆی بڵاو کـردەوە، لەگەڵ باقی هەڵبەستەکانی ناسکی تر وەکو شیعـرەکە (گڵـپەی دەروون) کە دواتر لە لایەن کۆرسی تیپی مۆسیقای مەولەوی و سەرپەرشتیی مامۆستای هونەرمەندی مۆسیقاژەنی ناسراوی کورد، خوالێخۆشبوو (قادر دیلان) کرایە گۆرانییەکی زۆر خۆش و بەسۆز.

# لافاو

کامل ژیر ـ بغداد

دیمەنیکی لافاو کە ئوتوموبیل‌و لوری
بە بارە چیمنتوە گیژو لوولی
ئەداو رای ئەرفینی

لـــە ناکـــاو ، لـــەپر ...
دای‌چـــلە کانم خوریەبەکـــی تر !
خوریە دەنـــگی بوو بە گریانـــەوە
لەدوور لەهەر گەی بیشـــــما نەوە

- ١٩ -

# لافـاو

کامـــەران

منالی ناوبیشکەی بەدەم لافاوەوە

ئەی فرمیســـــکی لیل بلەرزە
لـــە عەزرەت بارانو تـــەرزە
دیســـان هەستی هونراوەی دل
وەکـــو مەنجەل هـــاتوتە کول
ئەم جـــارە دلوپی ئەســـرین
ئەکەویتـــــە هەلبەست چنـــین
ئیوارە بوو ، پرشـــــنگی خور
دوور کەوتەوە لەشـــار بەزور

- ٦ -

# بە هوی لافاوەکەی سلیمانی یەوە

عبدالقادر قەزاز

ئەم جارەش شاری سلیمانی • بووکە جوانوو نەتـــــیلەکەی کوردستان ، سەرتاپا ئارای رەشی پوشی وە دەسە ئەزنو دانیشت •

بووکە نامرادوو بە ئاوات نەگەیشتووەکە ! سال نی‌یە گوستـــن نەکەوی ، لـــە نەقەومی وە بەرگی رەش نەیوشیت وەک ئەم بەرگە رەشە بە بالات بررابی‌وە ئەبی لەگەل عومرتا بیتە خواری • هەر کـــە نەختیک دەست بەجوتا ئەهیبیت وە خەریکی گەشە ئەکەی وە تامی ژیانی هیمن وە پڕ ئاسوودە بچیژیت ، ئەبرر چەپوکیک بەسەرا ئەدەی وە بە مەرەبەکت ئەدا کە هیری راست بوونەوەت نەمینی تا دەســـــت ئەدریتەوەدالی وە ئەکەویتەوە سەرخوت • لەبەر ئەمەیە کە هەمیشە رەنگت زەردوو بی‌ئاموو لاواز ماویتەوە •

خانمە نازدارەکەی ولاتی کوردستان ! ئەوەی بەسەر تودا هاتووە بەسەر هەر شاریکی‌ترا بهاتایە لە دمیکەوە بوو ناوی نشانی نەئەما هەر جارجار دالک بو منالانی وە مامؤســـــتا بوقوونانی‌یانی بەسەرهاتی ئەو شارەی بو نگیرا نابەوە • هەر توی ئاراو نەبەزوو بچوقاییە کە بەرگەی ئەم هەموو سزاو مەینەتە بگریت وە دوای هەموو قەوماویک شــــرانە راست بیتەوە •

سلیمانی ! شارە نازداروو خوشەویستەکەمان ! هەرجارە چەشتە چەکیک بەکار ئەهیری بو ژیانی ئەبناو وە بەنگە بو تەمینان وە دوو کردنی ئاوونیشانت ، بەلام قرشتەی بەخت یارە وە ئەســـتیرەی ئالت هەر بەرزەو ئەدرەوشیتەوە وە ئاخەرەوە دووژمنت چاوبان لە

- ٣٠ -

# لافاوي مەرگ !!!

خالد رشید ( زیوەر )
قوتابخانەی مامؤستایان
پولی دووەم

دیمەنی لافاو لە ناو سەقامو کولانەکانی شاری سلیمانی‌دا

تشرینی یەکەمی سالی پەنجاو حەوت !!
ئەی مانگی شومو نالەبارو حەوت !!
ژمارە هەژدەی مانـــــگی ناسکراو !!
ئەی روژی جمعەی هەیسە تراو !!

دیمه‌نێکی لافاوی شاری سلێمانی. وێنه‌ی به‌رگی گۆڤاری هیوا ژ-٥ ساڵی١- تشرینی دووه‌می١٩٥٧

# لافاو

ئـا گاو [illegible] له [illegible] بڕ
دای چپله‌کانم خوڕه‌یه‌کی تر

خوڕه‌ی ده‌نگی ڕوو [illegible] به گریانه‌وه
له‌دوور له‌جه‌رگه‌ی ئیشتانه‌وه

له سلێمانی شپرزه‌ی وێران
ئه‌و ده‌نگه هاتو هه‌ستی شله‌قان

له‌کاتێکا [illegible] بڕ بوو پشێمان
که‌وتبوو چه‌رخه‌و بو ئه‌نجام گه‌ران

ئه‌م وت چونا بو ئاغاکی کوردستان
وته شوێنه‌گای هه‌رزه‌شه پیلان

هه‌ر پارچه‌یه‌کی له‌ژێر دانێکا
له‌چوورو زامی ئێشه‌و زان ئه‌کا

هه‌ڵبه‌سته‌که‌ی شاعیری به‌ڕێز کامل ژیر به‌بۆنه‌ی لافاوه‌که‌ی سلێمانی ساڵی ١٩٥٧ که له نامیلکه‌ی (نازه‌نین)ی بڵاو کردووه‌ته‌وه

خوالێخۆشبوو مامۆستای بوێژ و نووسه‌ر و خاوه‌ن چاپخانه‌ی کوردستان و خاوه‌نی گۆڤاری (هه‌تاو) مامۆستا گیوی موکریانی، به‌بۆنه‌ی (لافاو)ه‌که له چه‌ند ژماره‌یه‌کی دوای کاره‌ساته دڵته‌زێنه‌که، وتار و شیعر و په‌خشانی نووسه‌ر و شاعیرانی بڵاو کردووه‌ته‌وه جگه له ده‌ربڕینی هه‌ستی خۆی و خانه‌واده‌ی (هه‌تاو)... چ له گۆڤاره‌که یا له وتاری دیکه و له شوێنی تر... جا بۆ نموونه ئه‌و نووسراوانه‌ی که ده‌ستم که‌وتوون، له گۆڤاری (هه‌تاو)، له‌و ساڵه‌دا بڵاو کراونه‌ته‌وه و... به‌بۆنه‌ی ئه‌و لافاوه، لێره دووباره کۆپییه‌کانیان بڵاو ده‌که‌مه‌وه وه‌ک نموونه‌ی هه‌ستی هه‌موو دانیشتوانی شاری هه‌ولێری دێرین که هه‌میشه به‌شداری خۆشی و ناخۆشی گه‌لی کوردیان کردووه... له هه‌موو کات و ساتێکدا:

هەروەها، شاعیری هەولێری ئەدەب و ئاینی و مەقاماتی بەسۆز... شاعیری سێ زەمان، خوالێخۆشبوو مامۆستا پیربال مەحمودی نەمر، لە نامیلکەیەکیدا کە بەبۆنەی (لافاو)ە شوومەکەی سلێمانی، پایزی ساڵی ١٩٥٨دا، شیعرێکی (یاخود بڵێین قەسیدەیەکی) لە ژێر عینوانی (لافاو) لە چاپ دا و بڵاوی کردەوە کە لەو شیعرە هەستی خۆی... ئەو هەستە کوردەوارییە دڵپاکە دەردەبڕێ بەوشەی وا ڕێک لەگەڵ دڵسۆزییە پاکەکەی، کە مرۆڤ تێیدەگا چۆن شیعری ڕاست کە هەڵقووڵابێ لەد ڵێکی ڕاست... دەبێتە وێنەیەکی ساف و ڕوون کە (تصویر)ی تەواوی ڕووداوەکە دەکات، وەک ئەوەی خوێنەری حازر بووبێ و لەبەر دەموچاوی، ئەو شتە ڕوویداوە!

لە سلێمانی، تیپی مۆسیقای مەولەوی بڕیاریان دا کە شتێک بکەن لە هەولێر و کۆیە، بۆ کۆکردنەوەی پیتاک بۆ لێقەوماوانی ئەو لافاوە. ئەوەبوو چوونە هەولێر لە سەرەتای گەشتەکەیاندا پێنج ئاهەنگیان گێڕا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بۆ خەڵکی شار بەجیا و بۆ مووەزەف و مامۆستایان و بۆ ژنان... هەر چینە و بەجیا... جگە لە گۆرانیبێژانی خۆیان کە لەگەڵ خۆیان هێنا بوویانن، هونەرمەندان: حەمە سالح دیلان، ڕەشۆڵ عەبدوڵڵا، عوسمان سابوونچی، لە هونەرمەندانی هەولێریش: حەیدەر و مشکۆ و ڕەسووڵ گەردی بەشدارییان لە ئاهەنگەکان کردبوو.

کە هێشتا لە هەولێر بوون، کاک قادر خەبەری بۆ ناردین، بۆ کۆیە کەوا پاش دوو ڕۆژ دێنە لامان و دوو ڕۆژ دەمێنن- ئاهەنگی تێدا دەگێڕن، بۆ هەمان مەبەست. ئێمەش، وەک گەنج و لاوی کۆییی ڕۆشنبیر و بەشەرەف بۆ یارمەتیدان، خۆمان ئامادە کرد... ڕێوشوێن دانرا لە کوێ ئاهەنگەکان بەڕێوە بچن- من سروودێکم لە شیعری مامۆستا کەریم شارەزا، بەناوی (لە خەو ڕاپەڕە) ئامادە کرد ئاوازم بۆ دانا و لەگەڵ باواجی پڕۆڤەمان کرد.

ڕۆژی ١٩٥٧/١١/١٥ تیپی مەولەوی گەیشتنە (کۆیە) و پێشوازیمان لێ کردن بۆ ئیسراحەتێکی کورت، هاتنە لام، کە دوو ژوورم گرتبوو لە حەوشەکەی (عاشوور ئەفەندی) تێدا بوو، لەسەر شەقامەکەی دامێن گردی قشڵە... بەرامبەر ئاشی ئاگری مەجیدی حاجی کاکەمین- ماری خوشکم چای و کێک و شتی عەسری ئامادە کردبوو- ئینجا هەڵسایین چووینە قاعەکەی قوتابخانەی زانستی سەرەتایی، بەرامبەر حەوزی بەلەدیە نزیک

تیپی مۆسیقای مەولەوی لە کاتی پرۆڤەکردن، لە سلێمانی- ئەو تیپەی کە لە کاتی تەنگانە و ناخۆشی، زوو بەهانای میللەتەوە دێن و بەهەموو جۆرێک یارمەتی هەژارانیان دەدا بەکۆکردنەوەی (تبرعات)- ئەندامەکان کە لەم وێنەیەدا دیارن لە ڕاستەوە:-
١-- نەجاتی عەبدە (شمشاڵژەن)، ٢- هادی عەنبەر (عوودژەن)، ٣-ئومێد مەدحەت (کەمانچەژەن) ٤- حاتەم سەعید (تەپڵژەن) ٥- بەهجەت ڕەشید سەعاتچی (کەمانچەژەن) ٦- سەرۆکی تیپ (قادر دیلان) کەمانچەژەن ٧- کاک ولیەم دانیشتووە.

محەمەد ساڵح دیلان

محەمەد ساڵح دیلان کاتی پێشکێشکردنی ئاهەنگەکەی هەولێر بۆ لێقەوماوانی لافاوی سلێمانی - لەگەڵ تیپی مۆسیقای مەولەوی پایزی ساڵی ١٩٥٧

هونەرمەند
عوسمان سابوونچی

هونەرمەند
مشکۆ هەولێری

هونەرمەند
حەیدەرە کەچەڵ

(ئاشان) لەوێ رەحلەی پۆلی یەک کە لەسەر کورسی دادەنیشن و ئەو مێزانەیان لە پێش دەبێ بۆ نووسین، ئا لەم رەحـــلانە شـــانۆیەک دروست کـــرابوو... هەندێ پەردەش هەڵواسرابوون... ئاهەنگ دەستی پێ کـرد... من لە دوو لاوە بەشداریم کـرد، یەک وەک عوودژەن لەگەڵیان دانیشتم... دوو وەک گۆرانیبێژ، سروودی (لە خەو ڕاپەڕە)م گوت.

بۆ شـەوەکـەشی، لە (دار الاسـتـراحـة) دانیـشـتین و وەک ڕێزلێنان بۆ پیـاوماقـووڵ و کەسایەتییە بەناوبانگەکانی کۆیە، میوانداری کـران... و ئاهەنگێکی تایبـەتی پڕ جـۆش و خرۆش کـرا تا نیـوە شـەو...! کـۆییـیـەکـانیش بەهەمـوو چینەکانیانەوە، بەسەخاوەت پارەیان کۆکردەوە و یارمەتییەکی چاکیان پێشکێش هەژار و لێـقـەومـاوان کـرد- خـوا لە هەمـوو لایەک ڕازی بێ و خێریان بنووسێ.

کـــــاک قــــادر دیلان، هەوالـی ئەو ئاهەنگانەی، زۆر جوان، لە ڕۆژنامەی (ژین) ژمـارە (١٣٧٢) ئەو سـالـە- مـانگی ١١ی ١٩٥٧بلاو کـردووەتەوە، خـوای لێ خـۆشـبێ لەگەڵ کارە پیرۆز و خزمەتەکانی کە کردی بۆ کورد و کوردستان!

ژین ژمارە (١٣٧٢) لاپەڕە ٧

ریبورتاجی لەسەر آهەنگەکانی

ڕەشۆڵ عەبدوڵڵا هونەرمەندی دەنگ و چریکە خۆشی بولبول ئاسا و مەقامبێژی ڕەسەنی کوردی لە ئاهەنگی (کۆیە) لە ۱۹٥۷/۱۱/۱٥ لەگەڵ تیپی مۆسیقای مەولەوی.
مۆسیقاژەنەکانی لێرە دیارن، لە ڕاستەوە: ۱- حاتەم سەعید- تەپل و ڕزم. ۲- عەباس دەفژەن. ۳-نەجاتی عەبدە- نەی (شمشاڵژەن). ٤- باکووری عوودژەن. ٥- لەپشت گۆرانیبێژ (ڕەشۆڵ)، کاک قادر دیلانە بەکەمانچەوە.

خۆم (باکووری) لە کاتی پێشکێشکردنی سروودی (لەخەو ڕاپەڕە) لەگەڵ تیپی مۆسیقای مەولەوی- لە کۆیە بۆ یارمەتیدانی لێقەوماوانی لافاوی سلێمانی- ئاهەنگەکە ڕۆژی ۱۹٥۷/۱۱/۱٥ بوو

مامۆستا شەفیق سابیر و کاک سدیق عبدولقادر، داوایان لێم کرد... لەسەرخۆ، ناوە ناوە، عوودیان بدەمە دەست و فێریان بکەم... عوودلێدانیان فێرکەم. جا مامۆستا سدیق لە خانووێکی بچووک کە بەکرێی گرتبوو، بەرامبەر مزگەوتە کۆنەکەی (سەرشوران)... ژوورێکی زۆر بچووک بوو، لەوێ بەتەنیا دەژیا. هەفتەی دوو یا سێ شەو، من و کاک شەفیق دەچووینە لای... عوودێکم دابوو پێی لە لای بێ، بۆ خۆی نیسودرۆیان، لە کاتی بێ ئیشی، پرۆڤە و مەشق بکات... (مامۆستا شەفیق)یش عوودێکم دابوو پێ... جا لەو ژوورەی مامۆستا سدیق عبدولقادر، دادەنیشتین بە سێ قۆڵی و هەم بەخواردن و خواردنەوە و هەم بەعوود لێدان و گۆرانی سووکەڵە و ئاسان... فێرم دەکردن. لە مانگی ئادار... بۆ نەورۆز و کاتی سەیرانان، سەیرانێکمان رێکخست لەگەڵ قوتابیان، چووینە ناو باخچەکانی (هەرمۆتە) لەوێ، ئیتر قوتابییەکان بۆ خۆیان بڵاو بوونەوە، هەر کەسە لەگەڵ هاورێ و خزمی خەریکی چا لێنان و خواردنەوە بوون- ئێمەش مامۆستاکان، دوور لەوانە، لە ژێر هەندێ درەختی زەیتوون، لێی دانیشتین، خەریکی مۆسیقا و بەزمی خۆمان بووین سەیرانەکەمان لە ١٩٥٨/٣/١٨ دابوو.

کاتێــک کە وێنە مێــژوومان

بـــــۆ ئەگێرێتـــــەوە

لە کۆتایی ئەم هەواڵ و وێنە و زانیاریانەی لە بابەت ئەو لافاوە، جێی خۆیەتی ئەم وێنە مێژووییەش و هەواڵەکەی بڵاو بکرێتەوە

دوای ئەوەی تیپی مۆسیقای باواجی، پاش چەند مانگێک

لە دوای دامەزراندنەکەیەوە کە لە سەرەتای ساڵی دیراسی ١٩٥٧ بوو- شوێنی خۆی کردەوە لە ناو دڵی دانیشتوانی شارەکە و باوەشیان بۆ کردنەوە و ئەندامەکانی تیپەکە زۆر بەرێزەوە و بەگەرمی، باوکان و دایکان و خزمانیان باسیان دەکردن و ناویان دەهێنان و شانازییان بەرۆڵەکانیان دەکرد- ئینجا کار گەیشتە ئەوەی لە دەرەوەی شاری کۆیە ناوی (باواجی) بڵاو ببێتەوە... لە سلێمانی و هەولێر و ڕانیە...

بەڵام پێش ئەوەی گەشتەکانمان... گەشتە هونەرییەکان... بۆ ئەو شارانە باس بکەم بەدرێژی و بەوێنە، جارێ حەز دەکەم، هەر لە شارەکەم، کۆیەی ڕۆحم و گیانم... نموونە بهێنمەوە کە تا چەند، دانیشتوانی شارەکەم و بەتایبەتی هونەردۆستەکان و ئەوانەی بەدوای گۆرانی و ئاوازی ڕەسەنی کوردی دەگەڕێن... و چۆن ڕاویان دەکەن و دەیانقۆزنەوە... لێرەدا جارێ باسی نموونەیەک دەکەم... کە شانازی بەو (متمانە)یە دەکەم، کۆیییەکان چەند هونەر و ئەدەب و هونەرمەند و ئەدیبانیان لە لا گەورەیە و خۆشەویستە!

محەمەد عەبدوڵڵای چایچی، خاوەن چایخانەی خۆی لە ناوەڕاستی شار، بەرامبەر مزگەوتی گەورە... ناوی لێنابوو چایخانەی (لاوان) ماوەیەک. ئەو کاکەیە، بە حەمە گەمحان مەشهوور بوو- ئەم لەقەبەش، نازانم مانای چییە و چۆنی بۆ دۆزراوەتەوە... بەڵام لەو ڕۆژانەدا، (مانگی ئابی ٢٠٠٥) لە چنارۆک دەعوەت کرابووم لەگەڵ ژمارەیەک هونەرمەند و گۆرانیبێژی کۆیە: زاهیر محەمەد، وریا ئەحمەد، جان تۆماس، سەردار ئەحمەد، بەکر مستەفا،

وەستا حەمەد عەبدوڵڵای چایچی
کۆیی (حەمە گەمحان)

ئازاد-ی کوڕی حەمە گەمحان

سەلاح محەمەد، غەریب پشدەری، عەدنان کەریم و چەند گەنجێکی تر... لە دانیشتنێکی بێ وێنە... پڕ ئاواز و مۆسیقا و گۆرانی... بەتک و بەکۆمەڵ، لە پشوویەکدا، گەنجێک هات لە دواوەم، لە پشت کورسییەکەمەوە چاک و خۆشی لەگەڵمان کرد و وتی من (فلان)م - (ناوەکەیم لە بیر نەماوە) من کوڕی شەهید ئازادی کوڕی حەمە گەمحانم! واتە نەوەی کاک حەمە بوو هەزار سڵاو لە گیانی پاکی بێت!

جا ئەم کوڕە گەنجە لێی پرسیم وتی: "مامۆستا لە زۆر کەسم پرسیوە ئەو ناوە (گەمحان) کەی و چۆن بەناوی باپیرەمەوە لکاوە و لە کوێوە هاتووە! خەڵک وتیان ڕەنگە مامۆستا باکووری ئاگاداری بێ و وەڵامت بداتەوە... ئەو زۆر لەگەڵیا و لەگەڵ تایەر تۆفیقی نەمر دانیشتوون...". جا من، بەڕاستی، ئەو کاتەی وای وت، ڕاچەنیم، وەک لە خەوێک بامە و ئەو پرسیارە وەئاگای هێنامەوە!! بۆ یەک دوو چرکە بێدەنگیی تەواو لە منەوە و تێفکرینێکی قووڵ... هاتمەوە سەر خۆم و بە خۆمم وت: وەڵڵاهی دەبوایە وابێ و من بزانم! کوڕە باکووری... تۆ ئەوەندە ساڵە، تا هەردووک برادەرانت خوا عافوویان بکات، کۆچی دواییان کرد، ڕۆژێک نەتپرسی لە حەمە یا لە تاهیر- کە ئەو، واتا تاهیر وای

محەمەد عەبدوڵڵا چایچی یان
حەمە گەمحان

هونەرمەندی گەلی کورد
تایەر تۆفیق

بانگ دەکرد و من هەر لە خاڵە تایەر ناوەکە فێربووم! باشە بۆچ ڕۆژێ نەهاتە بیرم بپرسم: ئەرێ (گەمحان) یەعنی چی؟

بەو سەراحەتە و ڕاشکاوییەوە بەکورەم گوت: بەخوا منیش نازانم و دەبوایە زانیاریم هەبێ لەو شتە... بەڵام بەداخەوە!! چونکە من کاتی خۆی لە خەڵک و بەتایبەتی لە ڕەحمەتی تایەر تۆفیق، لە دانیشتنەکانمان، کە کاکە حەمەی لێ بوایە و ئامادە بوایە... تایەر هەر وای بانگ دەکرد و ئیتر منیش هەروام بانگ دەکرد!.

کاک حەمە ئامێرێکی تۆمارکەر (مسجلة)ی گەورەی جۆری (گرۆندیک)ی هەبوو. بەو موسەجیلەیە هەمیشە خەریکی تۆمارکردنی دەنگی گۆرانیبێژانی عەرەب و کورد بوو، بەتایبەتی شەیدای مەقامبێژە گەورە ڕەسەنەکان بوو وەک سێوە و مەلا ئەسعەد و وەستا حەمەدەمین کەبابچی و حەمەدەمین عەباس و مەلا (یان فەقێ) ئەحمەدە کۆرە ...!! بۆیە هەر کاتێ دەرفەت ڕەخسابایە، خۆی و موسەجیلە قورسەکەی هەڵدەگرت و بەرەو ئەو شوێنەی ئاهەنگەکە یان دانیشتنەکەی لێبە و هەرچی بگوترابا لەوێ تۆماری دەکرد، ڕۆژی دواتر لە چایخانەکەی خۆی گوێت لەو ئاهەنگانە دەبوو. پێشتر باسم کردووە کە چەند جارێ دەهاتە لام، کاتێ هێشتا لە بەغدا بووم و قوتابی بووم... بەڵام کە سەردانی کۆیەم کردبا... لە ماڵی کاک هورمز ئەسکەندەر دادەبەزیم، حەمە دەهاتە ماڵیان و هەندێ گۆرانیم بە عوودەوە بۆ دەگوت و ئەویش تۆماری دەکردن بۆ چایخانەکەی... تەنانەت کە ساڵی

١٩٥٧ له کۆیه دامەزرام وەک مامۆستا و هێشتا عازەب و زگوورتی بووم... دوو ژوورم بەکرێ گرتبوو لەگەڵ ماڵی خوالێخۆشبوو (مامۆستا عاشوور ئەفەندی)... کاکه حەمه چەند جارێ، بەشەو دەهاته لامان، لەو خانووه که یووسف و ماری براو خوشکیشم لەگەڵم بوون، دەهات و موسەجیلەکەی دەهێنا گۆرانی من و ماری تەسجیل دەکرد بەڵام له هەموو ئەوانه گرینگتر، ڕۆژێک وتی ئەمشەو له ماڵمان، واتا ماڵی خۆی دادەنیشن و گوتیشی: کاکه سێوه و مەلا ئەسعەد حەمەدەمینی کەبابچی و حەمەدەمین عەباس و ئیدیش ئامادە دەبن. ئەوه له، شەوێکی زستاندا بوو، پێم وایه دوامانگی ساڵی ١٩٥٧ بوو. جا من عوود و کەمانچەم برد (ئەگەر چی له کەمان ژەنین- سئر بووم بەڵام وتم هەر بۆ (مێژوو)... با تۆزێ دەنگی کەمانچەکەی خۆمم گوێ لێ بێ لەگەڵ ئەو عیملاقانەی هونەرمەند و مەقامبێژانی کۆیه بەشێکی ئەو مەقامانه و گۆرانییانەم له لایه... بەتایبەتی چەند مەقامێکی مەلا ئەسعەد و سێوه و بەستەکانی بەکۆمەڵ دەیانگوتن، بەتایبەتی (ئامینێم تاقانەی دایێ...)

جگه لەوانه... حەمه گەمحانی هونەردۆست هەموو ئاهەنگەکانی تیپی مۆسیقای باواجی و بۆنەکانی پیرۆزی وەک جەژنی نەورۆز... تاد، ئەو سەبارەت به میکرۆفۆن و لاقیته و دەنگ و هەر شتێکی تر... ئامادەی دەکرد... پەخشی دەکرد و تۆماریش دەکرد. بەڕاستی ئەو مرۆڤه، هەر بەبێ موقابیل، بەبێ تەنانەت وشەیەکی (سوپاس)یش خزمەتی شاری

سێوەی هونەرمەند
له ساڵی ١٩٦٢

دەنگخۆش و نوکتەباز و
هونەردۆست: وەستا حەمەدەمین
کەبابچی

کۆبەی دەکرد و ئەو نەبوایە... چالاکیی ئێمە قەت و قەت دیار نەدەبوون و نەدەناسران... و کارەکانمان هەموو فاشیل و بێ کەس دەبوون: بەڵام ئەو... هەردەم، بەهانامان دەهات و ماندوو بوون و ئەنجامی باشی بۆ ئامانجی (خزمەت) جێبەجێ دەکرد... بەنیسبەت تیپی مۆسیقای باواجی، بەتوانا و بەهێزتر بوو و بەمتمانە بەخۆوەکردن و بەوپەڕی خۆبەختکردن و ماندوو بوون...

چووینە ناو ساڵی ١٩٥٨و چەندین چالاکی و ئاهەنگی گەورەمان ئەنجام دا... کە یەکێکیان بەشداریمان لە ئیستیعرازی ساڵانەی قوتابخانەکان بوو کە لە ١٩٥٨/٥/٨ لە یاریگەی شار پێشکێش کرا و لە سەدا ٨٠ی دانیشتوانی شار لە دەوروپشتی ساحەکە و لەسەر گردەکەی قەبرستانی غەریبان، کە وەک شوێنێکی سروشتی بوو بۆ سەیرکەرەکان... خەڵک ئامادە بوون بۆ دیتنی وەرزشوانەکانیان و یارییەکان و بەتایبەتی (تیپی مۆسیقای باواجی) چونکە یەکەم جار بوو لە مێژووی ئەو شارە نەجیبە، لەگەڵ تیپێکی مۆسیقای ڕێک و جوان و خۆش ئاواز، یاریکەرەکان و مامۆستاکانیان و خەڵکەکە... ئیستیعرازێکی لەم جۆرە ببینن! پیرۆز بێ لێیان، میللەتی بەرەوشت و پاک شایستەی هەموو شتێکی جوانە! هەروەها، دیسان کەمێک پێش ئەو (واتا پێش ئاهەنگی وەرزشەکە باسی ئاهەنگە گەورەکەی ڕۆژی ١٩٥٨/٣/١٧م کردووە و لە ڕۆژنامەش بڵاو کراوەتەوە... جا ئێستاش باسی چالاکییەکی دیکەی گەورەی تیپەکە دەکەم... باسی ئەو ئاهەنگەی گەورەیەی، لە ڕۆژانی (یان بڵێین شەوانی) ٢٠ و ٢١ و ٢٢ ی ئابی ئەو ساڵە... (ساڵی ١٩٥٨) کە بەناوی کۆمەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکانی کۆیە، نمایش کرا لەسەر شانۆی قوتابخانەکەی خۆمان... (متوسطة)ی کۆیە- جا چونکە وەسفی ئەو ئاهەنگە بەدرێژی باس کراوە و بڕگەکانی جوان بڵاو کراونەتەوە لە گۆڤاری (پێشکەوتن) کە ئەوسا دەردەچوو لە کەرکووک لە ڕۆژی ١٩٥٨/٩/٦دا بۆیە کۆپی ئەو وتارە لێرە بڵاو دەکەمەوە بەسە بۆ هەموو زانیارییەک و وێنەی چەند هونەرمەند و کەسانێک کە ناویان هاتووە چالاکیی جۆراوجۆر بەشدارییان لە ئاهەنگەکان کردووە:

شایانی وتنیشە، لە هەموو ئاهەنگەکان، ئەگەر ئاهەنگی تایبەت بە (ژنان) هەبوایە، چەند مامۆستا و کچانی قوتابخانەی گەورە و بەتەمەن و زیرەک، کە لەگەڵ هونەر و ئەدەب و بزووتنەوەی ڕۆشنبیری دۆست بوون و حەزیان لە خزمەت دەکرد، بەدەنگمانەوە دەهاتن و لە ڕۆژی ئاهەنگی (ژنان) کاری ڕێکخستن و دانیشتن و ڕێز لێگرتن و بەخێرهاتن و دابینکردنی هەر پێداویستییەکی هەبوایە... جێبەجێیان دەکرد.

مامۆستا بلال بەهائەدین

شاعیر ئەحمەد دڵزار

خوشکە وەجیهە گۆریل-ی
ئەمڕۆ (ساڵی ٢٠٠٢) لە
عەنکاوە، مامۆستایە و
نیشتەجێیە

ڕۆستەم حەوێزی-
شاعیری کوردی کۆیی

بارزانی نەمر، پێشوازی لە ژمارەیەک هونەرمەندانی
کورد، بەسەرۆکایەتیی قادر دیلان لە سلێمانی دەکات
لە ١٩٥٨

لە ڕاستەوە ماری و ئینجا مامۆستا سوهام-ی برادەری، بەجلوبەرگی کۆیی.

وەجیهە گۆریل قوتابی، لەگەڵ ماڵی باوکی و برا و خوشکەکانی- کۆیە

(ستار ئاغا)ی کۆیی- کە بە (ستارە شێت) ناسرابوو. دەڵێن زەمانێک ئاغا بوو بەڕاستی، بەڵام بۆ شێت بوو؟ نازانم. ئەوە بەدرێژیی ڕۆژ لە بازاڕ دەگەڕا و دەسووڕا و خەڵکیش یارمەتییان دەدا.

٦/٨/٥٩

ژیانەوەی کورد / بەشی هونەر

# ئاهەنگی کومەڵەی بوژانەوەی هونەرە جوانەکان لە کویەدا

کومەڵەی بوژانەوەی هونەرە جوانەکانی کویە ئاهەنگێکی موسیقی، گورانی و تەمسیلی گێرا لەسەر شانوی دواناوەندی ناوەندە لە شەوانی ٢٠ ، ٢١ ، ٢٢ ی ئاب بەسەروکایەتی مامۆستا تاکوری و بەشی زوری دانیشتوانی کویە لەم ئاهەنگانەدا بەشدار بوون کە تەمیز ئەدەسێتی هونەرمەندی بەرزیان ئەکا. وە پروگرامەکانی بەم جورە بوون:

١ — وتاری بەخیر هاتن لەلایەن مامۆستا تاکوریەوە ٢ — وتاری خوشکە وجیهە گوریل ٣ — سروودی (شورش) شعری مامۆستای تیکوشەر (وردی) وئاوازی مامۆستا تاکوری ٤ — موسیقای مارش ئازادی ٥ — سروودی (لەشا ئازادی ..) لەشعری دلزار وئاوازی مامۆستا بلال بهاء الدین ٦ — شعرێک لەلایەن شارەزاوە ٧ — شعری دلزار لەلایەن خوشکە نسرین قادرەوە ٨ — سروودی (شاری کویە) شعری شارەزا وئاوازی تاکوری ٩ — شعرێک لەلایەن دلزارەوە ١٠ — سروودی هێزی گەل شعری شارەزاو ئاوازی مامۆستا بلال بهاء الدین ١١ — شعرێکی هەژار لەلایەن خیریە عبدالرحمانەوە ١٢ — موسیقای (مەولەوی – دیلان) و (تەرزەوزی – تاکوری) ١٣ — شعری جیلە لەلایەن سعادة أسعدەوە ١٤ — چیروک، نوێکەنین تەلقینی نوری سەعیدەوە – لەلایەن مامۆستا بلال بهاء الدین ١٥ — شعر لەلایەن خالد سەعیدەوە ١٦ — موسیقای (یوم سەعید) و (شیش کەباب) لەلایەن نبیی موسیقای باواجییەوە ١٧ — شعرێک بەتەمسیلەوە لەلایەن روستەمەوە ١٨ — ئاهەنگی گورانی سیوە ١٩ — چیروکی (ئاوای ئاشتی) دانانی: اسماعیل حمد ، اکرم عبد جاسم ، کەمال غەمبار ، لەلایەن تیپی تەمسیلی کومەڵەوە پیش کەش کرا. ئەوجا بە ئاهەنگی گورانی مامۆستا تاکوری کوتایی بەئاهەنگەکە هێنرا.

* سەرکەرێک *
سکرتیر بلال بهاء الدین

## قسەی ئەستەق

کوکەرەوەی — شەپول
لەسلێمانییەوە

* هەموو ژنێک یادی ئەو پیاوە ... ئەکاتەوە کە ویستی بیبێ بەڵام هەموو پیاوێک یادی ئەو ژنە ئەکاتەوە کە شوی پێنەکرد
فیولا پەدرس شور

* ئەی نوسەرینە ئەر لەوەی لەئامت ژیانەوە بتوسن ئەبێ دەست بکەین ژیان

بەلزاک

* خراپان وەک سیبەرمانە ، ئاهەر رین کەمتر ئەبینری بەڵام گەرومان کردە پەستی و نزم بوەوە ئەم حەسەلە ئەم سیبەرەمان زلو ناقولا ئەبێ

* لەهەر شوێنێک چریە چرپ هەبێ خراپەیەکی لەدوایە.

* هەوای ژنان بەکردەوەو ایشە وەک آسنگەر ، ناقایشتر پیاوێک بوشەی ایشەکەی جوانترو ورد تر ئەبێ.

ئاهەنگی کۆمەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکان لە کۆیەدا

## دامەزراندنی کۆمەڵەی بووژاندنەوەی هونەرە جوانەکان

لە کۆیە و تیپی مۆسیقای باواجی، مامۆستا کەریم مستەفا شارەزا، لە چەند لاپەڕەدا، لە گۆڤاری- بەیان- بەدرێژی باسیان دەکات... ئەو سکرتێر بوو شارەزاییی زیاتری هەبوو، بۆیە بەچاکم زانی، نووسینەکەی بەڕێزی، لێرەدا، وەک خۆی، دابەزێنم.

***

کۆیە بۆ من، ئەوسا، وا لە ژیانما بۆم ڕێک کەوت کە ببێ بەقۆناغێک کە بتوانم، لەو قۆناغەدا، لەسەر دوو هێما- خەت-ی گرینگی ژیاندا... ببزووم و هەر یەکێک لەو دوو ڕێگەیەش، بەگوێرەی توانام و زانیاریم و پێویست، زۆر چاک جێبەجێیان بکەم. ئەو دوو ڕێگەیە... یان هێمایانە یەکێکیان ڕێگەی خزمەتی دانیشوان و شار و بزووتنەوەی ڕۆشنبیری و هونەری مۆسیقا لە شارەکەمدا. ڕێگەی دووەمیش کە تایبەت بوو بەژیانی تایبەتی خۆم، لە ماڵەوە... یا لە دەرەوەی، لەگەڵ دۆست و برادەران و سەیران و ڕابواردنی خۆش و گەشت و سەفەرکردن و بەخشینی خۆشی و خۆشەویستی بۆ ئەوانەی تێکەڵیان دەبووم هەروەها ئەو خێزانە بەڕێز و حورمەت و ناودارانەی لەگەڵ خێزانەکەی ئێمە، دایک و باوک و خوشک و براکانم، خزمانم کە دەهاتنە سەردانمان لە دەرەوەی شاری کۆیەوە... و دەربڕینی هەستی دڵپاکی و خۆشەویستیم بۆیان.

سەبارەت بەبزووتنەوەم و گەیاندنی خزمەتم لەسەر خەتی یەکەم... ئەوە بەشێکم لە پێشەوە باس کرد و بەوێنە و وەسف و نووسین، پێم وایە ڕوونم کردەوە... هەڵبەتە ڕێگەیەکی درێژە و زۆرم ماوە!

دەمەوێ بەکورتیش کەمێک لەسەر لایەنی دووەمی ئەو قۆناغەی ژیانم... لە کۆیە، کە هەندێ پێوەندیی تایبەتی، ئەوانیش بخەمە سەر لاپەڕەکانی ئەو بیرەوەرییانەم.

شارە خنجیلانەکەی کۆیە ، لەو چەند سەدەیەی رابووردوودا ، لەبواری جوولانەوەی ئابووریو ئالوگۆڕیی بازرگانی شوێنێکی دیاری بووەو ، هەردەم قۆناغێکی گرینگی سەرەڕێی کاروانی ئەو جوولانەوەیە بووە ، لە هەموو لایێکەوە بازرگانان بۆ مامڵەتو گواستنەوەی کەلوپەلو کوتاڵی بازرگانیانو ، فەقێیان ـ کە نموونەی رۆشنبیری ئەوسای کورد بوون ـ بۆ تەواوکردنی خوێندن رویان تێکردووەو ، هەریەکە زانیاریی پێویستی لە زاناکانی ئەو هەژدە مزگەوتەکەی لە شارەکەدا بووە وەرگرتووەو ، لە هەمان کاتیشدا هەریەکە لەلای خۆیەوە جۆرە زانیاریو شارەزاییێکی بە دانیشتوانی داوەو ، ئەو موتربەکردنە رۆشنبیرییە بووەتە هۆی خولقانو پێگەیشتنی جۆرە هونەرێکی ئاوازو مەقامو گۆرانیی کوردی لەناو خەڵکەکەی ئەو شارەدا .

ئەمین ئاغای ( ئەختەر )ی شاعیری هونەرمەند ( ١٨٣٩ ـ ١٨٨٨ ز ) ئالای ئەو جوولانەوەیەی هەڵگرتووەو ، دەستێکی باڵای بووە لە بەرەوپێشبردنی ئەو هونەرە جوانە بە کۆکردنەوەی دەستەیێک لە مەقام بێژی هونەرمەندی کورد لە دەورەی خۆیدا ؛ لە ئەنجامی ئەو هاندانەی ئاغایێکی دەستەڵاتدار بۆ گۆرانی بێژە هونەرمەندەکان . گەلێ مەقام بێژی ناوداری وەك [ مەربێن دەنگ خۆش ] و [ ئەشنەتی رەشید ئاغا ] و [ حەننا تۆما ـ حەنیل ـ(١) ]و [ حاجی بە گەورە ] لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی

کۆمەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکان لە کۆیە

کەریم شارەزا

بەیان ژ ـ ٥٣ : ١٩٧٩

بەیان ـ ٥٥

بیستەمدا سەریان هەڵداوە و پێشکەوتوون و گۆی هونەری مەقام و ئاوازی کوردییان بردۆتەوە ، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمیشدا دەستەیێکی تری وەك [ سیوەی هونەرمەند ١٨٩١ – ١٩٦٤ ] و [ مەلا ئەسعەد ] و [ ئەحمەدی حەمە مەلا ١٩١٣ – ١٩٦٩ (٢)] و [ شەعبەی مەریێن ] و [ فەقێ ئەحمەد ] و [ تاهیر تۆفیق ] و [ حەمە رەشید ] و لە پەنجاکانیشدا [ محەمەد ئەمین عەبباس ] و [ باقی سەرتاش ] و [ شەفیق خەلەف ] و [ مەجیدی سمایلە خرەو ] لە دوایشدا ( باکووری ) و ( خالید دلێر ) بوون بە سوارچاکی مەیدانی هونەری گۆرانی کوردی لەو شارە جوانەدا .

دەتوانم بڵێم جوانی سروشت و زۆری سەیرانگاکانی ئەو شارە خۆشە هۆیەکی هاندەری خولقانی ئەو جووڵانەوە هونەرییە بوون ، چونکە ئەو کەسەی لە بەهاراندا بەشداریی لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شارەدا کردبێ لە سەیران و ئاهەنگەکانی نەورۆزیدا ، ئەوا بینیویە بە دەیان سەیرانگای وەك [ هەرمۆتەو کەندەکۆخ و شاخی مشکەو تۆمەرخوجان و تانووکان و لوولەی زابەر و دەرمانئاوی بنەر هەیبە – سوڵتان و مەلەك مراد و مەلەك رەیحان و ئەسحابان . ] جمەیان هاتوە لە سەیرانکەر و ئاهەنگ گێران و لە هەموو لایێکدا دەنگ و ئاوازی گۆرانی و مەقامی کوردی و بەندو بەستەی شایی رەشبەڵەکی ( سێ پێیی و چەپەیی و زۆبەند ) دڵ و دەروونی مرۆڤیان هێناوەتە جۆش و خرۆشەوە .

جگە لەم هۆیانەش ، چایخانەی شوێنە گشتییەکانی ئەو شارە ، دەوری خۆیان گێڕاوە لەبەردو پێش بردنی ئەو جووڵانەوە هونەرییە . بەتایبەتی لە شەوانی رەمەزانان ، چونکە لە هەمو چایخانەیەکدا تیپێکی سینی و زەرفانی و گۆرانی گوتن و میرمیرانی پێك دەهات و هەریەکە بەرهەمی رەسەن و خۆش خۆشیان پێشکەش دەکردو چێژێکی هونەرییان لە دڵ و دەروونی خەڵکەکەدا ئەخۆڵقاند .

لەگەڵ برانەوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بارێکی سیاسی لەسەرتاپای عیراقدا خولقاو جووڵانەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز پەرەی سەندو ، بیر لەوە کرایەوە هونەر بۆ سوودی جووڵانەوەی نیشتمانی بەکاربێ و گۆرانی نەتەوەیی و شانۆگەریی سیاسی ئەو شارەدا سەری هەڵداو هەرچەندە هونەری کوردی لەو کاتەدا هیچ رێکخراوێکی تایبەتی نەبوو تا بیگرێتە باوەش و بەرەو پێشی ببات ، بەڵا لەرێگەی رێکخراوە سیاسییەکانەوە سەرپەرشتی دەکراو بۆ سوودی بیرو باوەڕو ئامانجەکانیان و بۆ خزمەتگوزاریی ئەلیان بەکار دەهێنان .

ئەو هەوڵ و لەباوەش گرتنەش بە ئاشکرا لەدوای راپەڕینە نیشتمانیەکەی تشرینی دووەمی ١٩٥٢دا هاتەدی و ، ئاو هەوایێکی سازگار لە بار خولقاو بۆ هەناسە هەڵکێشانی هەڵکەکەو دەربڕینی ئیشێژانەکانی لە ئاسێکی هونەریدا ، ئاوای لێ هات ئەوەدترین گازینۆی کۆیە(٢) ، بە درێژایی هاوینی ١٩٥٣ بوو بە شانۆیەکی میللیی بەردەوام بۆ دانیشتوانی ئەو شارەو هەر شەوە جیرژێکی تەمسیلی نۆبەڵایەتی یا سیاسی و چەنکێك لە مەقام و گۆرانی رەسەنی کوردی و سروودی نیشتمانی لەلایەن ئەکتەرە هونەرمەندو گۆرانی بێژە لاوەکانەوە لەسەر ئەو شانۆیەوە پێشکەش دەکران .

لە ئەندامە چالاکەکانی ئەو تیپە میللییە برایان [ عەبدولواحید حەمەدو ، عەبدورەززاق بیمارو ، ئەکرەم عەبد جاسم و ، کەمال عەمبارو ، مستەفا خەیات و ، تۆفیق ئەحمەد ] بوون و ، ئەو شانۆگەرییە میللییانەی پێشکەشیان دەکردن ، کاوەی ئاسنگەر و ، شیربایی و ، ژن بە ژنە و ، کەشف و کەرامەتی شێخ ... هتد .

**لە راستیدا ئەو شانۆ میللییەی کۆیە دەورێکی کاریگەری گێڕا لە هێنانەدەری هونەری گۆرانی و شانۆگەریی کوردی لە چوارچێوەی شەرم و عەیبەوە بۆ دنیایێکی فراوان و کردارێکی پڕ لە خزمەتگوزاری و شانازییەوە .**

بۆیە لەوساوە ئەلێ لە هونەرمەندو نووسەرانی ئەو شارە ، بیریان لە دامەزراندنی رێکخراوێکی هونەریی دەکردەوە ، بەڵام لەبەر ئاڵۆز بوونەوەی باری سیاسی عێراق بەگرێدانی پەیمانی بەغدا لە ١٩٥٥دا ، ئەو ئاواتەیان نەهاتە دی و ماوەی ئەو جووڵانەوە هونەرییەی سەری هەڵدابوو لەو شارەدا زۆر تەسك کرایەوەو شانۆو گازینۆکە داخران و بواری هونەری خزایە ناو حەوش و هۆڵی قوتابخانەکان و تا رادەیەك مامۆستاو قوتابیە هونەرمەندە تازە هەڵچووەکان ئەو جووڵانەوەیان گرتە باوەش و لە نەمان رزگاریان کرد ، بە دانانی تیپی مۆسیقاو سروودو گۆرانی و نواندن و ، پێشکەش کردنی بەرهەمی یەکەك لەو بوارە پڕ خزمەتەدا .

## تیپی مۆسیقای باواجی

هەرچەندە کۆیە ، لە کۆنەوە ئاشنایەتیێکی باشی لەگەڵ ساز و ئاوازی کوردیدا بووە و ، گەلێ هونەرمەندی میللی لەو هونەرەدا تیا هەڵکەوتووە ، لە هەموو ئاهەنگ و موناسەبەتێکدا

لەسەر ئاوازەکانی [ دەهۆڵو زورنـاو لوێرو شمشاڵو دووزەلە ] شـایی ئێرازەو . بە ئـاوازی دەفـو دمبکو تەپڵ حەلقەی زیکری سۆفیایەتی گەرم داهێناوە . بەڵام هەرگیز تیپێکـی مۆسیقای نوێی ڕێکوپێکی بە خۆیەوە نەدیوەو . هەندە ئاگاداری [ عـوودو کەمانچەو جـومبشو ئۆکـۆردیۆنو کلارنێتو چەلۆو گیتار ] نـەبوردو ، لەسەرەتای پەنجاکانەوە ئاواتە خـواز بوو ، ڕۆژێك لە ڕۆژان تیپێکی ئاوای بۆ دابمەزرێو شان بە شـانی شـارە پێشکەوتووەکان ، دەستێکی باڵای لەو هونەرە جوانەدا بێ . تا لە سـاڵی ١٩٥٦ ـ ١٩٥٧ کاك ئەندریۆس خەمەۆ ( باکووری )(٤) لە قوتابخانەی ناوەندی کۆیە بە مامۆستا دامەزراو بەو بۆنەیەوە کە مۆسیقاژەنێکی بـاشو ڕۆڵـەی دلسۆزی ئەو شارە خوشەویستەی بوو چاوی پشکووتووی چیاکانی باواجـیو هەیبە سـوڵتان بوو ، میزاجێکـی کوردەواری بێگەردی هەبوو ، بۆیـە یەکەم هەوڵی لەو بوارەدا پێکـەوەنانی ( تیپێکی مۆسیقا ) بوو لە قوتابیەکانی ئەو قوتابخانەیە ، بە نـاوی [ تیپـی مۆسیقای باواجی ] ، بەمە قوتابیانـی کۆیە ، بۆ یەکەم جار ئالەتی مۆسیقای نوێیان گرتە دەستو بە ماوەی چەند مانگێك ئاشنایەتێکی باشیان لەگـەڵ ئاوازەکانی ( عودو کەمانچەو جومبشو نایو دەفو ئۆکوردیۆن)دا پەیداکردو ، ئەو تیپە یەکەم چالاکی خۆی لەبەهاری ١٩٥٧دا پێشکەش کردو ، بۆ پـاییزی هەر ئەو ساڵەیش ئاهەنگێکی هاوبەشی لە سەر شانۆی قوتابخانەی ناوەندی کۆیە لەگەڵ ( تیپی مۆسیقای مەولەوی ) کە لە سلێمانیەوە هاتبوون بۆ ئاهەنـگ گێران بۆ سـوودی لێقـەوماوانی لافاوەکەی ساڵی ١٩٥٧ی شـاری سلێمانی پێشکەش کرد

تیپی مەولەوی چـەند پارچـە مۆسیقایێکی ئاوایی هـونەرمەندان [ قادر دیلانو نەجاتی عەبدەو وتیـەم یوحنا ]و چەند گۆرانیەکی دەسـتـی کـوردی لە لایەك هـونەرمەندە ناودارەکانی کورد [ڕەشۆل عەبدوڵلا]و [ صالح دیلان ] لەگەڵ شانۆگەریـێك بەناونیشانی ( لافاو ) پێشکەش کرد .

**تیپی مۆسیقای باواجیش چەند پارچە مۆسـیقاییێکی باکـووریو سروودێکی نیشـتمانیی نـوێی بەناونیشانی ( لەخـەو ڕاپـەڕە(٥) ) پێشکەش کرد .**

لەدوای ئەو ئاهەنگەوە ناوبانگـی ( تیپی باواجی ) شان بە شانی ( تیپی مەولەوی ) بەناو جەماوەری شـاری کۆیەو دەوروپشتیدا بـڵاوبووەوە و دووبارە مەسەلەی دامەزرانـدنی ڕێکخراوێکی هونەری لەو شـارەدا کەوتەوە ئاراو بوو بە ویردی سـەر زارو زمانی ئەدیبو هونەر پەروەرەکانی ئەو شـارە ، بـە تایبـەتی دوای دامەزراندنی [ کۆمەڵەی هـونەرە جوانەکان لە سلێمانی ] .

## کۆمەڵەی بووژاندنەوەی هونەرە جوانەکان لە کۆیە

لە سەرەتای سـاڵی ١٩٥٨دا ، دەستەیێك لە هونەرمەندو نووسەرانی کۆیە ، یەکیان گرتو پەیڕەوێکی نـاو خۆیان بۆ ڕێکخراوێکی هونەری کوردی داناو ، ناویان نا [ کۆمەڵەی هـونەرە جوانەکان لە کـۆیە ] و ، لەگـەڵ داواکاریەکی ڕەسـمی بـەرێگای قایمەقامیەتی کۆیەوە پێشکەش بـە وەزارەتی ناوخۆکراو ، ئەم هونەرمەندو نووسەرانەی خوارەوە داواکەیان ئیمزا کردبوو ، بووبوون بە دەسـتەی دامەزرێنەری کۆمەڵەکە : ـ

[ ئەندریۆس باکووری ، کەریـم شارەزا ، **بیلال بەهائەددین(٦) ، جەمال عەبدولکەریم ، کەمال صادق ، خالیـد سەعید ، عەبدوڕەحمان هەنار ، تاهیر ئەحمەد تەیب(٧) ، صەلاح محەمـەد سەعید ، عەبدولواحید حەمەد ، زاهیر هەنار ، محەمەد عەلی نورەددین ، مەجید عومەر حەسـەن ، موعتەسـەم عـەبدولمەجیدو ، حەبیب فـەتتاح ( ساکار ) ] .**

دوای ماوەیەك وەزارەتی ناوخـۆ ئیعتیرازی لەو ناوەی یەکێتی گـرتت دەیگوت ، لە سلێمانی کۆمەڵەیەکی تر بەو ناوە هەیە ، یا دەبێ ناوێکی تـری لێ بنێن یاخود ببن بە لقی کۆمەڵـەی سلێمانی . دەسـتەی دامەمەزرێنەر کۆبونەوەو زۆربەی ئەندامانی لـەوە ڕایەدابوون ، کۆمەڵەیێکی سەربەخۆیان ببێ نەك لقێك بن سەر بە کۆمەڵەیێکی دیکە . جا بۆیە بڕیاریاندا وشـەی ( بووژاندنەوە ) بۆ ناونیشانەکـەی زیاد بکەنو ببێت بە [ کـۆمەڵەی بووژاندنەوەی هـونەرە جـوانەکان لەکۆیە . ] . وەڵامی وەزارەتی ناوخۆ درایەوەو دوای مانگێك بڕیاری لەسەر دامەزراندنی ئەو کـۆمەڵەیەدا ، بە مەرجێ ئەم دوو ئەندامەی خـوارەوە لە دەستەی دامەزرێنەر دەربهێنرێن ، ئەمانەش برایان [ تاهیر ئەحمەد تەیبو عەبدوڕەحمان هەنار ] بوون ! بەبێ ئەوە هۆی ئەو دەرهێنانەمان پێ بڵێن ! !

دەستەی دامەزرێنەر کـۆبووەوەو هەندێ ئەندامی تازەی وەرگرت یەك لەوانە ( سێوە )ی مەقام بێژی ناودار بوو ، بە ئەندامی فەخـری وەرگیراو هەروەها ڕۆژی ١٧ـ٦ـ١٩٥٨ی دیاری کرد بۆ هەڵبژاردنی یەکەم دەسـتەی بەرێوەبەری کـۆمەڵەو ئەنجـامی هەڵبژاردنەکەش بەم جۆرە بوو(٨) : ـ

**١ ـ کاك ئەندریۆس خەمەۆ (باکووری ) سـەرۆك**

**٢ ـ کاك کەریم مستەفا شارەزا نائبی سەرۆك**

**٣ ـ کاك بیلال بەهائەددین ئەمینداری سر**

**٤ ـ کاك جەمال عەبدولکەریم ئەمینداری سندووق**

وە برایان خالید سەعیدو کەمـال صادقو صەلاح محەمەد سەعید بوون بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر .

ئەم دەستەی بەڕێوەبەرە ، توانی لە ماوەی ئیش‌کردنی‌دا گەلێ کاری هونەری ڕێك‌وپێك پێشکەش بە جەماوەری گەلی کورد بکات ، بەتایبەتی لە بواری نواندن‌و مۆسیقاو گۆرانی‌دا .

لە بواری مۆسیقادا ، توانی چەند ئامێرێکی نوێ بکڕێت‌و [ تیپی مۆسیقای باواجی ] بە هەموو ئەندامەکانیەوە بگرێتە باوەش‌و بیکات بە تیپێکی سەر بە کۆمەڵە . ••

بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە ، دەستەی بەڕێوەبەر چەند لیژنەیێکی کارای دامەزراند وەکو ئەمانەی خوارەوە : ـ

**١ ـ لیژنەی مۆسیقا : ـ**

پێك‌هاتبوو لە ( تیپی مۆسیقای باواجی ) بە سەرۆکایەتی ( باکووری )و چەند ئەندامێکی نوێیان کەوتەپاڵ وەك بلال بەهائەددین .

**٢ ـ لیژنەی ئەدەب : ـ**

کەریم شارەزا سەرۆکی بوو ، ڕاسپێردرا کە ڕاپۆرتێکی فراوان لەسەر جووڵانەوەی ئەدەبی کوردی لەناوچەی کۆیە لە کۆنەوە تا ئەوسا بنووسێ‌و ، لە ئەنجامدا لە ماوەی ساڵێك ( کۆیەو شاعیرانی ) ئامادەکرد بۆ چاپ ، کەچی لەبەر بێدارایی ئەو ڕێکخراوە ، نووسەر ناچار بوو لە ساڵی ١٩٦١دا لەسەر ئەرکی خۆی بەشی یەکەمی بە چاپ ڕابگەیێنێ .

**٣ ـ لیژنەی نواندن : ـ**

ئەم لیژنەیەش هەر بە سەرۆکایەتی ( باکووری ) بوو ، چونکە جگە لە مۆسیقا ، خاوەنی بەهرەیەکی نواندنی کۆمیدی بەهێزبوو ، لە ئەکتەرە دیارەکانی ئەو تیپە کە لیژنەکە پێکەوەی‌نا ، جگە لە ، باکووری [ عەبدولمەجید سێگردکانی‌و حەسیب ئەتاح‌و صابیر عەبدوللاو ماری باکووری‌و مەجید عومەرو جەمال عەبدولکەریم‌و عەبدولواحید حەمەدو مەجید ئیسماعیل‌و بیلال بەهائەددین‌و کەمال صادق ] بوون .

لە سەردەمی دەستەی بەڕێوەبەری یەکەمدا ، کۆمەڵەگەلێ چالاکی هونەری لە شارەکانی کۆیەو ڕانیەو سلێمانی‌و هەولێر نواند . لە مانگی ئابی ١٩٥٨دا سەرکەوتووترین ئاهەنگی گۆرانی‌و مۆسیقاو شیعرو نواندنی پێشکەش بە جەماوەری کۆیەکردو ، لەو ئاهەنگەدا باکووری‌و بیلال بەهائەددین‌و یوسف باکووری‌و خۆشکە وصفیە مستەفا ( کە یەکەم ئافرەت بووە لە کۆیە لە سەر شانۆ گۆرانی سیاسی گوتووە ) ، هەر یەکە گۆرانیەکی بە یارمەتی ئاوازەکانی تیپی مۆسیقای باواجی‌و کۆرسی کچ‌و کوڕ پێشکەش‌کرد ، هەروەها شانۆگەرێکی وەرگێردراو لە عەرەبیەوە لەلایەن برایان [ ئەکرەم عەبد جاسم‌و ئیسماعیل حەمە سلیمان ]ەوە لەسەر شانۆی قوتابخانەی ڕانیست لەلایەن [ بیلال بەهائەددین‌و مەجید ئیسماعیل‌و عەبدولواحید حەمەد ]ەوە پێشکەش‌کرا .

لە هەمان مانگدا کۆمەڵە چالاکی‌یەکانی خۆی بردە شاری ڕانیەو بۆ چەند شەوێك ئاهەنگی مۆسیقاو گۆرانی‌و نواندنی لە سەر شانۆی قوتابخانەی ڕانیە پێشکەش‌کردو بەناوی کۆمەڵەوەش ( سێوە )ی مەقامبێژو ( باکووری )ی سەرۆکی تیپی مۆسیقا چوون بۆ سلێمانی لەوێ گەلێ چالاکی هونەری‌یان نواند .

تیپی مۆسیقای کۆمەڵە ( باواجی ) بانگ کرا بۆ بەشداری کردن لە کردنەوەی پێشانگای [ پیشەسازی‌و کشتوکاڵی ]ی لیوای هەولێر لە ڕۆژی ١ـ١٠ـ١٩٥٨داو(٩) ، بۆ ماوەی هەفتەیەك مایەوە بۆ پێشکەش‌کردنی ئاوازی خۆش‌و سروودو گۆرانی ... بە ڕۆژانی پێشانگاکە ، بەو بۆنەیەی کە بە توانارین تیپی هونەری بوو لە لیوای هەولێرداو جاری تیپی هونەری هەولێری پێ ئەشکێنرد .

لەسەر ئەم ئەرکەی کە سەرۆکو ئەندامانی تیپەکەی کۆمەڵە نواندیان ، لە لایەن سەرۆکی شارەوانی ئەوسای هەولێرەوە سوپاس‌و ڕێز لێنانێکی بێ پایانیان پێشکەش بە تیپەکەو کۆمەڵەکەی کرا .(١٠)

لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی هەر ئەو ساڵەدا ، کۆمەڵە شانۆگەریەکی تری لەسەر شانۆی قوتابخانەی سانەوی کۆیە پێشکەش‌کرد ، بە ناونیشانی [ پیلانەکانی ئیمپریالیزم لە تەمووزدا گۆڕ کران ] لە نووسینی کەریم شارەزا ، ئەکتەرە سەرەکی‌یەکانی ئەو شانۆگەری‌یە ئەمانەبوون : [ باکووری‌و مەجید عومەرو کەریم شارەزاو کەمال صادق‌و بلال بەهائەددین‌و عەبدولمەجید سێگردکانی‌و خالید سەعید . ]

لە پاڵ ئەو شانۆگەری‌یەشەوە ، چەند گۆرانیەکی باکووری‌و سێوەی هونەرمەندو ماری باکووری‌و عەدنان جەمال‌و [ ئۆپەرێتی دڵداری‌و خەبات ] لە نووسینی کەریم شارەزاو نواندن‌و گوتنی [ بیلال بەهائەددین‌و جەمال عەبدولکەریم ] پێشکەش‌کران .

لەگەڵ داهاتنی ساڵی ١٩٥٩دا کۆمەڵە داوای هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری تازەی لە کاربەدەستان کردو ڕۆژی ٩ـ١ـ١٩٥٩یان دەست نیشان کرد بۆ ئەم کارەو ئەنجامی هەڵبژاردنەکەش بەم جۆرەی خوارەوە بوو(١١)

**١ ـ کاك باکووری سەرۆك .**

**٢ ـ کاك کەریم شارەزا جێگری سەرۆك**

**٣ ـ کاك عەبدولمەجید سێگردکانی سکرتێر**

**٤ ـ کاك جەمال عەبدولکەریم موحاسب**

وە برایان بیلال بەهائەددین‌و کەمال صادق‌و عەبدولخالق عەلائەددین بوون بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر .

لە کردەوە دیارەکانی ئەو دەستەیە ، ئەمانەی خوارەوە بوون : ـ

١ ـ کردنەوەی دەورەیەکی مۆسیقا فێرکردن بۆ ئەندامانی

مەڵەو ، کاك باکووری
مۆستای موحازری ئەو
ووردیە بـ و ، لەسەن
چینەییکی زانستیو بەنوتە
سیقای فێری ئەندامەکان
کردو ، هەریەکە
سەرەتاییکی باش لە
چێنەی مۆسیقاو
وازی کوردی فێربوو .

ـ پێشکەش کردنی شانۆ
ری‌یەکی مامۆستا [ یوسف
انی ] بە ناونیشانی [ ئەمر
کەی بەگد ](۱۳) وەرگێرانی
ریم شارەزاو نواندنی
باکووری‌و صابیر عەبدوڵلا
ەڕاح‌و ماری باکووری [ کە
کەم ئافرەت بوو لە کۆیە لە
ەر شانۆ دەوری ئافرەتی
ستەقینەی نواندووە ] و
بیب فەتتاح‌و یوسف
ووری ـ ]

ـ تیپی ( مۆسیقای
راجی ایش کە تێکەڵاو بە
مەڵەبوو بوو ، ئەندامەکانی
ەر لە زیادبووندا بوون‌و
شداری لە هەموو
ەنگێکی میللی‌و رەسمی‌دا
کرد کە بەبۆنەی بیرەوەری
شتیمانی‌و نەتەوایەتی‌یەوە
گێردران‌و ، بەم جۆرە
لك‌هاتبوو [ کاك باکووری
عوودو کەمان‌و جومبش ،
هیر محەمەد بە کەمان ،
براهیم فەرەجوڵلا بە
مان ، بیلال بەهائەددین
کەمان ، ئەکرەم باقی
عوود ، سەردار ئەحمەد بە
ی ، جان تۆماس بە دەف ،
شئەت حەمید بە دەف ،
ەونی عەلی مەونود بە
پڵ . ] لە دواییشدا ئەم
ندامە نوێیانەی خوارەوەش
وتنە پاڵ تیپەکە :

[ کاکە مەم قادر(۱۳) بە عوود ،
عەبدولحەمید ئیسماعیل بە کەمان ،
یوسف باکووری بە ئۆکۆردیۆن . ]

ئەم تیپە کورسێکی ڕێکوپێکی
تیکەڵاوی لە کچ‌و کوڕ هەبوو ، بەشداری
لە هەموو چالاکی‌یەکانی ئەو تیپەدا
دەکردو لە سەرەتای سالی ۱۹۵۹دا لە
مانەی خوارەوە پێك هاتبوو : ـ
[ ئەنوەر تاهیر ، ئەکرەم ئەنوەر ، تەها
خورشید تەها ، عەدنان جەمال ،
گەلاوێژ قاسم چیچو ، نەسرین صالح
مەولوود ، پەیمان مەبدوڵلا تەها ،
گەلاوێژ صالح مەولوود ، ووریا قادر
حەسەن . ]

سەبارەت بە چالاکی‌یەکانی ئەم تیپە
لەناو جەماوەری گەلدا لە ئاهەنگەکانی
نەورۆزو یادکردنەوەی شۆڕشی ١٤ی
تەممووزو ئاهەنگی ڕێکخراوە
دیموکراتیەکان‌و نمایشی وەرزشی
قوتابخانەکاندا ، ناوی کۆمەڵەی
بوژاندنەوەی هونەرە جوانەکان‌و تیپی
مۆسیقای باواجی هەردەم بەسەر زمانی
خەڵکەکەوە بوو ، بەمەڕا دەزانرا کە
جووڵانەوەی هونەری کوردی لەو
شارەدا بە تەواوی جێگیربوودو
لەناو دڵ‌و دەروونی خەڵکەکەدا
چەسپاوە .

دەستەی بەڕێوەبەری سێیەم
بەپێی ڕەزامەندی کاربەدەستان لە
ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ٥ـ٢ـ١٩٦٠دا
هەڵبژێردراو ئەنجامەکەی بەم جۆرە
بوو(١٤) : ـ

**١ ـ کاك صەلاح محەمەد سەرۆك**

**٢ ـ کاك ئەندریۆس خەممۆ ( باکووری ) جێگری سەرۆك**

**٣ ـ کاك محەمەد عەلی نوورەددین سکرتێر**

**٤ ـ عەبدولواحید حەمەد موحاسیب**

وە برایان [ کەریم شارەزاو
موعتەسەم عەبدولمەجیدو کەمال
صادق ] بوون بە ئەندامی دەستەی
بەڕێوەبەرو کاك [ حەبیب فەتتاح
ساکار ]یش بوو بە ئەندامی ئیحتیات .
لە کارە گرنگەکانی ئەو دەستە
نوێ‌یە ، پێشکەش‌کردنی شانۆگەرێیك
بوو لەسەر شۆڕشی جەزائیر بەناوی
[ جەنگاوەران = المقاتلون ] لە
وەرگێڕانی کاك عەبدوڕەزاق بیمارو
نواندنی هونەرمەندان [ صابیر
عەبدوڵلا جەڕاح‌و بیلال بەهائەددین‌و
جەبار صابیر ] و هەندێ کەسی‌تر .

لە پایزی سالی ١٩٦٠دا باکووری
سەرۆك‌و چالاکترین ئەندامی ئەو
کۆمەڵەیە بۆ هەولێر گوێزرایەوەو لە
سالی ١٩٦١یشدا گەلێ لە ئەندامانی
تری کۆمەڵەیان گیران یان دوور
خرانەوە بۆ خوارووی وولات وەك [ بیلال
بەهائەددین‌و کەریم شارەزاو خالید
سەعیدو مەبدولخالق عەلائەددین‌و
جەبار صابیر ] کە زۆربەیان ئەندامی
دەستەی بەڕێوەبەر بوون . بۆیە کۆمەڵە
بەرەو کزی‌و نەمان دەڕۆیشت تا لە دوا
دوای سالی ١٩٦١دا ئەم کۆمەڵەیە
هەڵوەشایەوەو دەست بەسەر کەل‌و
پەل‌و ئالەتەکانی‌دا گیرا ، دوای ئەوەی
کە جوڵانەوەیەکی هونەریی ڕێك‌و پێکی
کوردی لەو ناوچەیەدا خوڵقاندو ،
کردی بە بەردی بناغەو سەرەتاییکی
پتەو بۆ بنیات‌نانی تەلاری هونەری
نوێی کورد لەدوا ڕۆژێکی نزیکدا .

**پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم باسە :**

١ ـ نەشئەتی ڕەشید ئاغاو حەنیل
مامۆستای خواجە سێوەی مەقام
بێژی کورد بوون

٢ ـ خوا لێ‌خۆش‌بوو ئەحمەدی
حەمە مەلا ( ١٩١٣ ـ ١٩٦٩ )
گۆرانی بێژێکی هونەرمەند بوو ،
تەنها لە کۆڕی تایبەتی دۆست‌و
برادەرانی گۆرانی دەگوت ،
تابلێی دەنگی خۆش‌بوو تاهیر
تۆفیق زۆر لە مەقام‌و بەستەکانی
لەو هونەرمەندە فێربووە ..

٣ گازینۆی سەعیدی مەلا ئەحمەد ، کە
لە بەرامبەر سەرای نوێی کۆیە
بوو .

٤ ـ باکووری نازناوی هونەری
[ئەندریۆس ئیسرائیل خەممۆ]یە،
باوکی لە سالی ١٩٢٧دا لەگەڵ

(خان)ێک یاخود کاروان سەرا لە مەیدانی سەرێ لە کۆیە لە سەرەتای سەدەی بیستەم هەبووە- بۆ گەڕیدەکان وەک هۆتێل بوو

## خۆشەویستی و دڵدارییەکی لەپڕ و سەیر بەڵام...!
## گرفت و تەگەرەی زل و ڕێگریی ناساز و هیوابڕ!

کە لە دوو ژوورەکەی ناو حەوشەکەی مامۆستا عاشوور ئەفەندی بووین، لە بەرامبەر ئەو حەوشەمان، کەمێک لە خوارترمان، لە حەوشەکەی عەزیز چەلەبی (ڕەحمەتی)دا ماڵی بەڕێز، معاونی پۆلیسی کۆیە (کاک عەلی مەولوود)ی تێدابوو. ئەو زەمانە، هێزی پۆلیس لە هەموو قەزاکانی عێراق بریتی دەبوو لە بەڕێوەبەرایەتییەک (معاونی پۆلیس) لەگەڵ یەک دوو مفەوەزکە، پێیان دەگوت (مەئمور مرکز) و چەند پۆلیسێکی سوارە و پیادە (مشاة). بۆیە کاک عەلی مەولوود لە ڕوتبەدا و لە بەڕێوەبردنی کاری ئەمن و ئاسایشی شارەکە وەک کاری مودیری پۆلیس بوو، کە (مدیر شرطه)یان پێ دەگوت. جا کاک عەلی مەولوود کوڕێکی لە قوتابخانەی متوسطەی کۆیە هەبوو، واتا لە قوتابخانەکەی ئێمە بوو، هەڵم بژاردبوو بۆ ئەندامیەتی تیپی مۆسیقای باواجی، وەک (عازف ایقاع)، چونکە زۆر بەئەدەب و ڕەوشت پاک و جوان بوو، هەروەها بەهرەی هونەریی مۆسیقاشی پێوە دیار بوو، ناوی (عەونی) بوو. هەروەها کچێکیشی لە قوتابخانەکەمان، بۆ هەندێ وانە و موحازەرات، دەوامی دەکرد لەگەڵ براکەی، ناوی (عەونیە) بوو جگە لەوانەش، کچێکی بچووکتری هەبوو لە قوتابخانەی سەرەتاییی کچان بوو، ناوی (نەجلە) بوو. جا ئەو (نەجلە)یە لەگەڵ یووسف و ماری، کە لەگەڵما بوون، هێشتا ماڵمان هەموویان نەهاتبوونە کۆیە، نەجلە خان دۆستایەتی لەگەڵ برا و خوشکم پەیدا کردبوو، بەتایبەتی لەگەڵ ماری، بووبوونە دەستەخوشک- لەبەرئەوەش کە جیران بووین، زۆر دەهاتە لامان و دادەنیشت و هەندێ جار دەرسم بۆی شەرح دەکرد ئەگەر بابەتێک زەحمەت بوایە و لە قوتابخانە چاک تێیان نەگەیاندبا، ئەوە لە منی دەپرسی و بۆم ڕوون دەکردەوە- ئەوە لە ساڵی ١٩٥٧ بوو- لە سەرەتای ساڵی داهاتوو- ساڵی ١٩٥٨، دوای پشوو (عطلە)ی نیوەی ساڵ کە بەعادەتی لە مانگی شوبات دەبوو- ئەو جا قوتابخانەکە قوتابیانی چوست و چالاک لە بواری وەرزش و یاری و سروود و هەڵپەڕکێ هەڵدەبژێرن و مامۆستای (وەرزش) ڕۆژانە لە کاتی دەوام و دوای دەوامیش، قوتابییەکان دەهێننەوە قوتابخانە بۆ

فێرکردن و مەشقکردنی یارییە وەرزشییەکان و هەڵپەڕکێ و سروود و ڕۆیشتن!... ناوی من و چۆنیەتی دامەزراندنی تیپی مۆسیقا و ڕاهێنانی قوتابییەکانم...لە دوای دەوام، ناسرابووین و مامۆستاکان بەتایبەتی بۆ سروود فێرکردن، گەلێ جاران داوایان لێ دەکرین... من و تیپەکە، بچینە قوتابخانەکانیان و تیپی سروودیان بۆ هەڵبژێرین و فێری سروودیان بکەین یان لەگەڵ مۆسیقا ڕایان بهێنین.

ئێوارەیەک، کە گەڕامەوە ماڵەوە، نەجلە لەوێ بوو لەگەڵ ماری و یووسف، دیار بوو قسەی خۆشیان کردبوو، بۆیە هەموویان پێدەکەنین! چای عەسر حازر بوو، ماری چای بۆ تێکردم... یەک دوو قسە و گاڵتەشم لەگەڵ نەجلە کرد و ئەو هەر بەپێکەنینەوە وەڵامی دەدامەوە! دوایی نەجلە وتی مامۆستا باکووری... ئەوە... ئێ... ست سوهام وتی، مادام ئێوە دراوسێی ماڵی باکوورین داوای لێ بکە با (سەما)یەکی (غەربیت) فێر بکا، تاکو لەگەڵ یارییەکانی دیکەی خۆمان، لە ساحە نمایشی بکەیت!

من پێکەنیم و وتم ئەو مامۆستا سوهامە کێندەرییە و چیتان فێر دەکات؟ وتی: موسڵاوییە... وەرزش و هەڵپەڕکێ و یاریمان فێر دەکات... ئەوجا پێم وت: بەخوا نەجلەخان، من هیچ یاری و سەما نازانم فێرت بکەم! وای پێ بڵێ!!

سەمایەکی بیانی بەناوی سامبا کە ڕزمێکی تایبەتی هەیە، لە مۆسیقای ڕۆژئاوادا- قوتابیانی سەرەتایی لە کۆیە، لە ڕۆژی وەرزش ئەنجامی دەدەن بەسەرپەریشتیی مامۆستایان ست سوهام. قوتابی نەجلە کە لە لای ڕاستەوە بە تەنیایە، وەک ڕابەری سەمایەکەیە

ئیتر ڕۆژان هاتن و ڕۆژان چوون... ڕۆژی وەرزشی قوتابخانەکان چەسپێنرا کە لە ١٩٥٨/٥/٨... دەبێ و لە هەولێریشەوە دوو مامۆستای موشریف دێن ئیستیعرازەکە ببینن و هەڵی سەنگێنن و ئەوانە (حەکەم) دەبن و قوتابخانە سەرکەوتووەکان نیشان دەکەن و پاداشت و کاس و مەدالیە بەسەر یاریکەرەکان دابەش دەکەن. ئەو دوو مامۆستایەش کە هاتن و یەکترمان ناسی، دەرکەوت یەکیان مۆستا عەزیز مەولوود بوو، ئەو تر مامۆستا نووری ئەمین بوو. جا بەدرێژی باسی وەرزشەکەم

کردووه لەم بیرەوەرییانە و وێنەی هەندێ چالاکییەکانیشم بڵاو کردیتەوە کە تیپی مۆسیقای باواجی مۆسیقای لەو ڕۆژە خۆشە، لە ناوەندی ساحەکەوە، پێشکێش جەماوەری سەیرکەری دەکرد. بۆیە، چەند ڕۆژێ پێش ئەو مێژووەی چەسپێنرابوو بۆ نمایشە وەرزشییەکە...، ئەو مامۆستایە، دوای نیوەڕۆی هەموو ڕۆژێ قوتابییەکانی دەهێناوە مەکتەب و ئەو یاری و هەڵپەڕکێیانەی فێری کردبوون، لە پێش چاوی، دووبارەیان ددکردنەوە و ئەویش تێبینی خۆی و هەر شتێکی ناڕێک یا هەڵەی بدیبا، پێی دەگوتن و بۆی ڕاست دەکردنەوە! جا سەبارەت بە منەوە، دوو سێ جار، لەگەڵ نەجلە خەبەری بۆ دەناردم کە تیپەکە و خۆم بچینە لایان و لەگەڵ بزووتنەوەکانی قوتابییان و هەڵپەڕکێ و یارییەکانی تر، مۆسیقایان بۆ ڕێک بخەین و بۆیان لێ دەین. منیش، ئەوەی ڕاستی بێ پێم خۆش بوو! یەک: چونکە ئەو مامۆستایە دەبینم و بزانم چۆنە و چییە؟ هەروەها ئەو یاری و هەڵپەڕکێیانە چین، تاکو مۆسیقایان بۆ ئامادە بکەم. هۆی دووەمیش: ئەگەر هەموو ڕۆژێ قوتابییەکانم ببەم و سەیری هەڵپەڕکێ و یاری کیژەکان بکەین و مۆسیقایان بۆ لێ دەن، شەرمیان دەشکێ و لەگەڵ کچ و ئافرەت، لەمەودوا، توانای گفتوگۆ و هاتوچۆ و پێوەندی پاک و ڕەوشتی جوان دەنوێنن و ئینجا لە ڕۆژی وەرزشەکە، ماندووبوونەکەمان بەفیڕۆ ناڕوات و مۆسیقایەکەیان چاک دەژەنن چونکە لە کاتی (مەشق) کردنەکە! هەموو گەورە و بچووک و ڕستە موسیقییەکان و ئاوازەکان و ڕزم و ئیقاعەکان زۆر باش لێ ڕادێن و دەیانژەنن!.

ئیتر، سەری خۆم و تۆش نایەشێنم: ئەو مامۆستا سوهامە، دوای وەرزشیش، زیاتر تێکەڵاوی لەگەڵ ماری خوشکم و هەروەها دایکم و باوکم بوو لێیان ڕاهات! ئەو زمانی عەرەبی مووسڵاوی قسەی دەکرد، کە هەندێک وشە و زاراوەی تایبەتییان هەیە، باوکم و دایکم باش تێی نەدەگەیشتن و وەڵامەکانیان شتێکی تری لێوە دەهاتەوە و دەبووە پێکەنین. سوهام لەگەڵ مامۆستایەکی دیکەی ئافرەتی خەڵکی هەولێر، کە ناوی (حەمدیە بابان) بوو، لە قوتابخانەی (روضە)ی کۆیە... مامۆستا بوو! جا لەگەڵ سوهام ڕێک کەوتبوو کە ئەویش لە لای، لە ژوورێکی قوتابخانە، پێکەوە بن و بمێنێتەوە... ئیتر وەک (خوشک) ڕۆژانیان بەسەر دەبرد و خواردنیان بەیەکەوە بوو هەردووکیان بەشدارییان دەکرد لە خەرجی و مەسرەفی خواردن. لەماڵەوەشیان، لە هەولێر و مووسڵ، زوو زوو دایک و برا و خوشکانیان، دەهاتن و زەخیرە و پێداویستییان بۆ دەهێنان! مامۆستایەکی دیکەش بووبووە دۆستی سوهام ناوی (ست بتول) بوو. ئەوانە (بتول و سهام) هەردووک، هەندێ

شەو دەهاتنە ماڵمان و دەیانگوت: "بێ تاقەت بووین، بەتەنیایی و دوور لە دایک و باوک و برا و خوشکان... ڕۆژ تەواو نابێ و ژیان لێرە... لەو گوندە وەرس بوونە و وەک یەکە و بێ تامە! مرۆڤ بەدەست خۆی نییە، وەرس دەبێ!" بۆیە میواندارییی باش دەکرا و دایکم و ماری و هەموومان بەقسەی خۆش و پێکەنین وامان دەکرد (وەڕس بوونەکەیان) نەمێنێ و شەوەکە بەخۆشی بەسەر بەرن- سەبارەت بەخۆمەوە، هەرگیز بیرێکی ئەوتۆم نەکردووە کە، جگە لە هاوڕێیەتی خێزانی سادە، هەست بە (خورپەی دڵ) یان خۆشەویستی، لە تەک ئەو مامۆستایە هەست پێ بکەم. ئەگەرچیش ڕۆژانە دەمبینی کە لە ماڵی خۆیانەوە بۆ قوتابخانە دەچوو، چونکە ماڵمان لەسەر ڕێگەی بوو ئەبوایە لەبەر دەرگاماندا ڕەت بێ. نەک هەر ئەوە، بەڵکو قوتابخانەکەش کە ناوی (قوتابخانەی ئامینەی کچان) بوو، بەرامبەر قوتابخانەی من بوو- من لە (قوتابخانەی کوڕان) بووم، لەوبەری جادەکە.

بەم جۆرە، ئەو کچە بووە برادەری خێزانی و بەس. گەلێ جار کە دەهاتە لامان، من لە لایەک دەعوەت دەکرام، یان پرۆڤەمان دەبوو لەگەڵ قوتابییەکانم... لە تیپی باواجی... بۆیە دەچوومە دەرەوە. قەت بەتەنیا ڕووی نەدا ڕۆژێ پێکەوە بین. بەڵام بۆ سەری ساڵ، چەند خێزانێکمان دەعوەت کردنە ماڵمان بۆ ڕابواردنی شەوی سەری ساڵ وەک ماڵی وەستا ئارتین و مامۆستا ئیسحاقی خواجە ئیبراهیم و ماڵی دکتۆر فەخری دەبباغ و هەروەها

قوتابخانەی ئامینەی کچان لە کۆیە، لە ساڵانی پەنجاکان
ئێستا (ساڵی ٢٠٠٥) چۆڵە و تێک چووە

سوهام و برادەرەکەی، مامۆستا بەتتول و ماڵی عەبدولقادری سووری... تەنیا دکتۆر فەخری و خێزانی نەهاتن، داوای لێبوردنی کرد و بەچەند دێڕێک وتی کەوا ئیشێکی ڕەسمی پێ سپێردراوە دەبێ بڕواتە دەرەوەی شار. بەڵام لێرەدا دەبێ بڵێم و دەری ببڕم کە من دڵم بۆ (نەجوا)ی کچە سوورییەکە لێی دەدا و خۆشم دەویست... بەڵام جارێ کاتی ئەوەم نەبوو پێی بڵێم!! هەروەها من وای بۆ چووبووم کە جارێ منالە و لەوانەیە لە مەسەلەی خۆشەویستیدا هەستی وای نییە و عەقڵی پێ ناشکێ! بەڵام زۆر چووبووە قووڵاییی دڵ و هەستمەوە! کەچی بۆ سوهام هیچ هەستێکی غەیری ئەوەی کە لەگەڵ خێزانەکەمان ئاشنا بووە و بوویتە برادەرێکی نزیکمان، درکم بەهەستێکی تر نەکرد لەو شەوە هەموومان گۆرانیمان گوت: من بەعوودەوە بۆ خۆم و بۆ ئەوانیشم لێ دەدا. لە بیرمە (نەجوا) گۆرانییەکەی (عبدالحليم حافظ)ی گوت، کە دەڵێ: «بَحْلَمْ بكْ أنا بَحْلَمْ بكْ» (من خەونت پێوە دەبینم)! «من بەخۆمم گوت: دەبێ لەگەڵ منی بێ؟» شەوانی دیکەش زۆرجار لەگەڵ پیاوماقووڵ و مامۆستا و بازرگانەکان و حاکم و دکتۆر و معاونی پۆلیس... شەومان بەخۆشی و خۆشخوانی بەسەر دەبرد... هەندێ جار سێوەم دەعوە دەکرد... هەندێ شەو میوانەکان، دوای مەست بوون و ڕابواردنی خۆش بەگۆرانی، ئینجا ڕێک دەکەوتین یاری (کاغەز- واتا بەیاز)، وەک یاری (بیست و یەک و کۆنکان... تاد) بکەین... من ئەو یارییانەم نەدەزانی واتا ئەمڕۆش نەمکردوون گەرچی لە کۆیە، لە ماڵمان، یان لە یانەی فەرمانبەران جاروبار دادەنیشتم... هەروەها کە هاتمە هەولێر، لە یانە گەورە و خۆشە کۆنەکەی فەرمانبەران لەگەڵ هەندێ مامۆستا و مووەزەفی بەڕێز دادەنیشتم، لەسەر چارێگە دینارێک (واتا ٢٥٠ فلس)، کۆنکانم دەکرد، بێ ئەوەی باشی لێ بزانم. نیوە ساڵی دیراسی و ئیمتیحان نزیک دەبووەوە... کچەکەی (عبدالقادر القواص) (نەجوا) لە ئینگلیزی زۆر تەمبەڵ بوو... هیچی لێ نەدەزانی! مامۆستاشیان (ست سوهام)بوو! سوهام لەگەڵ ماڵەوەشیان هاموشۆی هەبوو... هێشتا لە مووسڵەوە، پێش ئەوەی ببێ بە مامۆستا لە کۆیە، ئەوانی دەناسی لە مووسڵ بوون و لەگەڵ (نەجوا) ئاشنایەتی هەبوو. جا دەیویست (من) یارمەتی بدەم و نەختێ موحازەراتی بدەمێ! شتە گرینگەکان... گرامەر و مانای هەندێ وشەی گرینگی فێر کەم. ئەوەبوو ڕۆژێک، عەبدولقادری باوکی پێی وتم کە دەبێ هەندێ یارمەتی (نەجوا) بدەم لە ئینگلیزی چونکە مامۆستاکەی گوتوویەتی ئەگەر لە ماڵەوە نەخوێنی، بەم موستەوایە نزمە، ناجیح نابێت! وتم باشە جا سەیرکە!! هەندێ جار قەدەر لەگەڵ بنیادەم کۆک دەبێ! تۆ شتێک حەزی لێ دەکەی هەتبێ، بەڵام بە

ست سوهام بەجلوبەرگی کوردی
لە ماڵمان سەری ساڵی ١٩٥٨–
کۆیە

کاترین، ماری، باسمە لە سەیرانێکدا. کۆیە ١٩٥٨

الدكتور
فخري الدباغ
Dr. F. El-Dabbagh. (M. B., Ch. B.)

Pt's name ............ اسم المريض

حضرة الاخ باكوري المحترم :
مساء الخير ..
كان يسرني جداً ان احضر مع العائلة بهذه
المناسبة السعيدة ، ولكن لسوء الحظ وصلتني
برقية من رئاسة صحة اربيل في هذه اللحظة التي حملت
فيها رسالتك ، ويجب ان اسافر غداً الى احدى
القرى للتحري عن مرض الحصبة والقرية بعيدة
ومن المحتمل جداً انني سأضطر الى المبيت ليلة
هناك .. فارجو قبول معذرتي واتمنى ان
يجمعنا بمناسبات سعيدة اخرى
وشكراً جزيلاً
المخلص

من لە پێشەوە، لە ڕاستەوە: وەستا ئارتین بوتڵی بەدەستەوەیە. بهنام و قادر قەواس بەعەینەکەوە لە پێشەوەن و خێزانەکان لە دواوە دیارن لە باخچەکانی گوندی تۆبزاوە– کۆیە ١٩٥٨

(موستەحیلی) دەبینی! کەچی، کاتێک سەیر دەکەی ئەو گوزارشتەت بووە واقیع و بۆت ڕێک کەوت!

ئەوە بوو وەک وتم باوکەکەی پێی وتم: کەمێک دەرسی ئینگلیزی بە نەجوا بڵێوە و فێری بکە، وتم: باشە. با لە دوای دەوام، نیوەڕۆیان بێت... هەوڵێکی لەگەڵ دەدەم. ئیتر هەموو ڕۆژێ، دوای دەوامی خۆی، دەهاتە ماڵمان کە زۆر نزیک بوو لە قوتابخانەکەیان- ئێمە لە تەنیشت ماڵی قایمقام بووین، لەسەر جادە، لە ژێر گردی قشڵە، بەرامبەر دائیرەی گومرگی کۆیە- قوتابخانەی ئەوانیش لەو خانووە بوون کە پارساڵ ئێمە و ماڵی عاشوور ئەفەندی تێیدا بووین... ڕەنگە ١٠٠ مەترێک دوور بوو لێمان- تەنیا لە جادەکە دەپەڕیبیەوە... دەرگای ماڵمان لەوبەر بوو- خانووی ڕەفیقی تایەر چەلەبی بوو- منیش لە دەوامی خۆم دەهاتمەوە و نانی نیوەڕۆمان دەخوارد و دەچووینە ژوورەکەی من. مەکتەبە و مێز و قەنەفەی لێ بوو دادەنیشتین بەرامبەر یەک، مێزێکی بچووکمان لە بەینا بوو من لەسەر قەنەفەکە دادەنیشتم، ئەو لەسەر کورسی- چەند ڕۆژێ، زۆر ئاسایی بوو، دەرسەکەم دەدا پێی و واجیبم دەدایێ بۆ ڕۆژی پاشتر دەبوایە وەڵامی پرسیار و واتای وشەکان و ... تاد، هەمووی جوان ئامادە بکا بۆم. ئینجا ئەگەر بەڕاستیش تەعبیر لە هەست و نەست و بیر و هۆشی خۆم بکەم... ئەوا لەو کاتانە من مامۆستایەکی عاشق بەو قوتابییەم. کە بەرامبەر یەک دادەنیشتین، چاوم بە چاوە سەوز و شینەکانی دەکەوت... بۆ ماوەیەک خۆم لە بیر دەچووەوە و هەر سەیری ناو چاوانیم دەکرد! ئەویش تێم ڕادەما و بەزەردەخەنەیەکی سەر لێوە سوورە ناسکەکانی بەهێواشی دەیگوت: شبیک استاذ؟ ئینجا وە ئاگا دەهاتمەوە و بێ ئەوەی بڵێم من چیمە، لە لاپەڕەکەدا ڕستەیەکی ئینگلیزیم بۆی دەخوێندەوە و...ئا بەم جۆرە! ئەمە زۆر جار ڕووی دەدا. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «تۆ بڵێی... ئەو کیژە تێم بگا من چیمە؟ تۆ بڵێی ئەو هەستەی من هەمە بەرامبەر بەو، ئەویش هەستێکی وای هەبێ بەرامبەر بەمن؟ ئەگەر پێی بڵێم: «من تۆم خۆش دەوێ: ئەزانێت یانی چی؟... چونکە، بە بۆچوونم، ئەوسا، وام لێک دەدایەوە کە نەجوا هێشتا بچووکە و لەو تەمەنەدا نابێ بزانێت خۆشەویستی کوڕ و کچ چییە و چۆنە و...! من خوێندبوومەوە کەوا (کچ) لە تەمەنێکی بچووکتر لە (کوڕان) دەگەنە تەمەنی (بالغی- واتا دەوری موراهەق)... هەندێک هێشتا لە پۆلی پێنج و شەشی سەرەتایی دەبن کە ئەو هەستەی باڵغ بوون و موراهەقە (هەرزەکاری)یە هەست پێ دەکەن لەو سات و کاتەوە کە دەستم بە دەرس گوتنەوەی نەجوا کرد- ڕۆژ و شەوم هەر لە بیر هۆش و عەقڵم لەگەڵیا بووم- لە قوتابخانە، مامۆستاکان...

قوتابیان لە گەڵمان دەدوان... یا پرسیاریان لە بابەت شتێکەوە لێم دەپرسی، من هەر بیرم لای ئەو کچە بوو! شەو دەچوومە ژوورەکەم... سەیری کورسییەکەم دەکرد و قسەم لەگەڵیا دەکرد وەک ئەوەی نەجوای لەسەر دانیشتووە! دەچوومە ناو جێ بخەوم، ڕوومەتی سەیری دەکردم... تا خەوم لێ دەکەوت! وام لێ هاتبوو خۆم گلەییم لە خۆم دەکرد کە ئەوەندە من بیری لێ دەکەمەوە... زۆر شتی گرینگ: خوێندنەوە... سەردانی برادەران... دانانی ئاوازێک بۆ شیعرێک... ئەوانەم هەموو بایەخ پێ نەدەدان کەچی زۆرجاریش بەخۆمم دەگوت «واز لەم شتە بێنە! ئاخر ئەو...»

ڕۆژێک وەک عادەتی: دانیشتین بەرامبەر یەک و قەڵەمەکەی بەدەستەوە گرت و من وشە و ڕستەم دەخوێندەوە... ئەو دەینووسین، وەک (ئیملا: Dictation) وشەیەکم لێی پرسی مانای چییە؟ سەیری کردم و وەستا وەڵامی نەدامەوە: دووبارەم کردەوە: هیچ قسەی نەکرد. منیش، ئەو دەستەی قەڵەمەکەی پێوە گرتبوو، گرتم و لە مێزەکەم دا. ئەو بەئاهێکی خێرا هاواری کرد: «ئاخ» و سەیری دەستی خۆی کرد. تومەس پشتی یەک دوو پەنجەکانی بەرۆخی مێزەکە کەوتبوون و یەکێکیان داڕووشابوو و کەمێک خوێن لە برینە داڕووشاوەکە دەرچووبوو! کە ئەو خوێنەکەی دیت، یەکسەر هەڵساوە لەسەر کورسییەکەی و هێرشی کردە سەرم و پاڵێکی توندی پێوەنام و من لەسەر پشت، لەسەر قەنەفەکە کەوتم. ئینجا بەهەموو هێزیەوە خۆی فرێدایە سەر سینگم و (ئاخ)ێکم کرد... ئینجا دەستی کردە لێدانم بە مستان، واتە بە (بۆکسان!)- من پێکەنین گرتمی و هەر دەمگوت: «ئێ بەسە... بەسە! تۆبە، بە ئەنقەست نەبووم! مەبەستم بوو تێت بگەیەنم ئەوە...» کەچی ئەو گوێی نەدەدامێ و بە زەردەخەنە و بەمست لێدانم هەر دەیگوت: «لێش؟...ها؟ لێش؟» ئەوجا من لە پڕ هاتمە سەر ڕێگەچارەی ڕاستی عیلاجەکە... زانیشم ئەو، ئەوەی من بیرم لێ کردەوە، ئەوەی مەبەست بوو بیکەم! هەردوو دەستەکانم هاویشتە پشت ملیەوە و دەموچاویم ڕاکێشا بۆ خوارەوە! لافاوی هەستی خۆشەویستی و کەبت و شاردنەوەی هەستەکانمان- هەردووکمان- بۆ ئەو هەموو ماوە درێژە... لەبەر شەرم یان ترسی یا نەبوونی جورئەت...! ئەو حەزانە یەکجار تەقینەوە... دەرس نەما! ئینگلیزیم لە بیر چووەوە! یەکەم دەرسی دڵداری دەستی پێ کرد

قوتابی نەجوا
١٩٥٩

لەگەڵ ئەو کیژۆڵە ناسکە... ئەو (مەل)ە غەریبەی لە دووری هەزارەها کیلۆمەتر، (کیوبیدی) دڵداری! پشتیوانی غەریب و دڵداران و لێقەوماوان ناردی بۆ ئەوەی ببێتە ئاوازێکی نازدار بۆ شاری عاشقان!!

ئەو مانگەش سەرمایەکی سەخت بوو: بەفر و باران زۆر بوو سەرما بوو... نەجوا بەردەوام دەهات لە دوای دەوامی، لە نێو قاپووتێکی تازەی قاوەیی، کە لەگەڵ ڕەنگی پێستی و دەموچاوی و قژە ڕەنگ (بەڕووبییەکەی) وا جوان ڕێک دەکەوت و دەسازا... ئینجا جۆتێ جزمەی هەمان ڕەنگ تا خوار چۆکی، لە پێ دەکرد... بەڵام چۆکی، لە سەرما سوور هەڵدەگەڕا چونکە گۆرەوییەکانی لە ناو جزمەکەیدا، لە خوار چۆکی بوون تەنها لچکی قاپووتەکەی، لە ڕۆیشتنا، دەهاتن و دەچوون و دایان دەپۆشین تاو تاوێک! بەڵام باکی بەسەرما نەبوو- ملەوانەیەکی فەرووی سپی لە ملی دەپێچا... خوایە، چەند جوان و نازدار قشتیلە بوو: عەقل و هۆشی ئەوەی مابووم لێی سەندم! ئاخر من هەر هۆشم نەبوو، جارێ! هۆش و عەقلم و جەستەم بۆ مۆسیقا و گۆرانی و خۆشخوانی و هونەر، بەخت و تەرخان کردبوو، جارێ بیرم بۆ لای ئافرەت نەدەچوو! ڕاستە جوانی کچ و ژنم لە لا (جوان) بوو... وەکو گوڵی جوان حەزم دەکرد هەمیشە پێیانەوە دەوره درابم و بەس! بۆنیان بۆم بێ... و قسەی خۆشم لەگەڵا بکەن و بەس! بەڵام قەت و قەت هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو ئەو کچە جوانە، بکەومە داویەوە منی خۆش بووێ و ببین بە دوو تەیرۆکەی باڵداری ئێسک سووک و خۆشەویست! کە من ئەمیرە جوانەکەی پەنجاکانم لە دەست دا... بەخۆم بەخۆمم کرد! جەرگم سووتا بۆی، کە لێی دوور کەوتمەوە لەیەک ترازاین بەڵام تا ئەو کاتەی تووشی ئەو (زێرینە)ی دووەم بووم (زێرینی) کوێیە، ئەمجارە، نەک زێرینەکەی (تۆبزاوە)!!

نەجوا بەجلی کوردییەوە

یەڵێ... ئەمیرەی کەرکووک، تا ئەو ڕۆژە کە تووشی ئەم کچە، ئەشمیل و جوانەی تر بووم ئەوم هەر دەهاتەوە بیر و خەیاڵم دەرنەدەچوو، بەتایبەتی کە بەتەنیا بام! زۆرم بیر دەکردەوە و ڕۆژە خۆشە پڕ کامەرانییەکانم دەهاتنە پێش چاو وەک شریتێکی سینەما کە چیرۆکی خۆشەویستی من و ئەمیرەی نیشان دەدام لەو زەمانەی لە کەرکووک بووین!

***

چەند گەنجێک، کە بینییان ئێمە لەگەڵ عەبدولقادر و ماڵیان تێکەڵین و دێنە لامان و دەچینە لایان! داوایان لێم دەکرد بە باوکی کچە بڵێم، ئەگەر ڕازی بێ، بچن بە خاوخێزانەوە، لێی بخوازن... بەڵام من خۆم بۆی سووتابووم و بڕیارمان دابوو هەر چۆنێک بێ دەبێ لە دواڕۆژ بۆ یەکتربین! هەموو تەگەرە و کۆسپەکان دەبێ تەخت کەین و ڕێگەمان خۆش کەین تا ببین بەدوو ئادەمیزادی کامەران و ژیانێکی خۆش، تا مردن، لەگەڵ یەک بەسەر بەرین! جا سەیرکە، کاکەبرا، کچەم بۆ خۆم حیجز کردبوو کەچی دەمکەن بە (واسیتە) تا بەباوکی بڵێم و ڕازی بکەم... بچن بیخوازن!! توخوا ئەم حەکایەتە لە کوێ و کەی ڕووی داوە! یەک لەوانەی ئەو تەکلیفەیان لێ کردم، مامۆستا حازم ئەحمەد عەبدوڵلا بوو، مامۆستای وەرزشی خۆمان بوو. خۆی خەڵکی مووسڵ بوو، بەڵام لە کۆیە دامەزرابوو. گەنجێکی شیک و پۆشتە و قاتی جوان و قەرەوێتەی بەنرخی لە مل دەبەست و سەروسیما و پرچی ڕەش و توالیتی جوان... بەهەموو نەوعێک لێوەشاوە بوو کە کچێکی جوانیش شووی پێ بکات.

گەنجە مووسڵاوییەکە مامۆستا حازم ئەحمەد چاویلکەی لە چاوە لە ناوەڕاستدا پێدەکەنێ

جا، کە ئەوانە منیان ڕادەسپارد بەباوکی بڵێم، جارێ بە(خۆی)م دەگوت! مامۆستا دەیەوێ بە باوکت بڵێم و ڕازی بکەم... تا دایک و باوک و عەشیرەتی بنێرێتە ماڵتان و بتخوازن و زێڕی دنیات بۆ دەکەن! من دڵنیا بووم کە منی بەهیچ گەنجێکی تر ناگۆڕێتەوە! بۆیە کە پێم دەگوت نەجوا دەکەوتە سەر پشت لە پێکەنینا... دەیگوت: «خۆ، من شوو بە چەند کەس بکەم؟ ئەوە نییە نسیبی خۆمم هەڵبژارد و بڕایەوە؟...» کەوای گوت، من وەک یەکێک خەوتبێ وەئاگای بێنن! بیرم

کـردەوە بە خـۆمم گـوت: «ئای کـوڕە ئەوە دەڵێی چی؟ ئەو دەربڕینە گـەورەیە... چۆن وا بەئاسانی و سادەیی، لەو لێوە ناسک و دەمە بچووکە هاتە دەرەوە؟ ئەمە فەلسەفەی ژیانە! ئەو تێی گەیشتووە، بەڵام من... نەخێر! ئەو ڕاست دەکات! ئەگەر من (مرۆڤ و ڕاستگۆ) بم، ئەو قسـە جـوان و شیـرینەی (نەجوا)ی دڵسـۆزم دەبێ (جێبەجێ)ی کەم! باوکی دەیگوت: کاکە- هەرچی ئەو داوایەت لێ بکات، لە جیاتی من پێی بڵێ، باوکی ڕازی نییە و کچەکەی دەبێ خوێندن تەواو بکات و لە عێراقیش بە مێردی نادەین. ئاوایان پێ بڵێ و بیبڕەوە لەگەڵیان. نەک هەر (حازم) چەند گەنجێکی کۆبەش هەمان دوایان لێ کردم، چونکە هاوڕێم بوون و خۆشم دەویستن نەمتوانی بەباوکی نەجوا نەڵێم و پێم گوت! یەکسـەر وتی: ئەی من فێرم نەکردی چییـان وەڵام بدەیتـەوە؟ ئازیزم... باکووری... ئەوە گاڵتە نییە! کچ بەسێردانە! بیرکردنەوەی دەوێ. ئەوە (موستەقبەلی) کچمە. ئێمە ئەمڕۆ یا سبەی دەگەڕێینەوە وڵاتمان- سووریا- چۆن لە دڵمان دێ پارچەیەک لە جەرگمان لێرە... لە غـەریبی جێ بهێڵێن؟ ئیتر، ئەوانی تر کە پێیان دەگوتم... یەکسـەر ئاوابوو وەڵامم. هەمـوو چرکـە و سـەعـات و ڕۆژانم، دوای ئەو هەڵکەوتە چاودڕوان نەکراوە، شیـرینی و خـۆشی ژیانم دەچێـژت! ئـاگـام لە دەوروبەرم نەبوو... چ دەبێ!؟ کێ هات، کێ چوو! لە بەیانییەوە، لە دەوامم، سەعاتەکانم دەژمارد: کەی دەچمەوە ماڵ تاکو خۆشەویستەکەم ببینم... بۆنی کەم... ماچی کەم... جەستە شۆخ و شەنگەکەی لە نێو دەست و باسکەکانمدا بئـاڵێنم و هەست بەنەرم و نیـانی ڕوومـەت و سـینگ و پرچی ئاوریشـمـینی بکەم- نەشـمـدەزانی، ئەوا (تەپکێک)... چاڵێک، خەریکە بکەومـە ناویەوە و ئەو چرکـە پڕ کامەرانییەمان بپسێندرێ!!

لە هەولێـر، قـوتابخـانەی (فنون المنزلیـة) بۆ کـچـان کـرایەوە! ئێ؟ بۆمن چی؟ جـا لەبەرئەوەش بەرنامـەی خـوێندنی (ناوەندی) گـران بوو بۆ نەجـوا و لە توانای دانەبوو بەردەوام بێ، باوکی و دایکی بەچاکیان زانی بچێتە ئەو (فنون منزلیـة)ی لە هەولێر و بەتایبەتیش کە بەشی ناوخۆیان هەبوو (القسم الداخلي) بۆ کیژەکان: نوستن و خواردن و شـووشتن هەمـوو دابین کـرابوو و دەرنەدەچوون. ئەوەبوو کـە دەوام دەستی پێ کـردەوە لە مـانگی تشـرینی یەکـەمی ۱۹۵۹ نەجـوامـان بەڕێ کـرد دوای ئەوەی هاوینەکـەمـان خۆشی ڕابوارد، جا یان لەگەڵ ماڵی باوکی و خێزانەکانی تر کە وەک یەک ماڵ بووین، یانیش، هەفـتـەی جارێک: من دەچوومـە مـاڵیـان و لەگەڵیاندا... لەگـەڵ باوکی دادەنیشـتین و ئەوانیش هەفـتـەی یەک دووجـار دەهاتنە لامـان... کـە بەتەنیـاش من و ئەو، بەڕێکەوت،

لەگەڵ یەکتر دەبووین، گلەییم لێی دەکرد و دەمگوت ئاخر تۆ بۆ من بەجێ دەهێڵی و دەڕۆی؟ تۆ لەوێ بی منیش لێرە، بێ تۆ؟» ئەو پێدەکەنی و دڵی دەدامەوە!! قسەی خۆشی بۆ دەکردم!! ئەو هاوینەی پێش ڕۆیشتنی نەجوا بۆ هەولێر، هەوڵمان دا، زۆرترین جار پێکەوەبین و لەگەڵ باقی خێزانە خۆش مەشرەب و بەزەوق و دڵپاک و ڕەوشتی جوان... سەیرانی خۆش بکەین. ئەم وێنانەش ئەو هەستەی هەموومان دەردەبڕێ کە فەلسەفەی ئەوەیە: «خۆش ڕابوێرە... برادەرت و خۆت و خێزانەکانتانیش با هەوای پاک و سەربەستی و ئازادی لەم سروشتە جوانەی وڵاتەکەتان... هەڵمژن و پێکەنین... ژیان کورتە، مەهێڵە گرژی و ڕووی ناشیرن زاڵ بێ... تاد».

بەڵام من، خۆم، زۆر بیرم لە بۆچوونە ڕاست و ڕەواکەی نەجوای شۆخ و شەنگ دەکردەوە! ڕێگەیەک بوو هاتە پێشم و کەوتمە گێژاوی فەلسەفەیەکی ژیان، کە ئەگەر لە وڵاتێکی ڕۆژئاوایی بوایە ئەم جۆرە گرفتانە، کەس بیریان لێ ناکەن و هەر (أصلا) گرفت نییە! لەوێ بامە کەواتە، بەو ئاسانییەی نەجوا دەڕی بڕی، مومارەسەی مافێکی خۆمان دەکرد و چ لە گۆڕێ نەبوو! کەچی ئێمە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم و لە وڵاتێکی دواکەوتوو دەژیاین! بۆیە گرفتەکەمان، کە جیاوازی وڵات بوو لەگەڵ نەتەوە. قەت و قەت چارەی نەبوو... تەنیا یەک چارە نەبێ!!...

وێنەیەک لە سەیرانێک بۆ باخچەکانی مەربێنە قەدیشەی تۆبزاوا. لە ڕاستەوە: منداڵەکە نەبیلە کوڕی خوشکە کاترینی خواجە ئیبراهیم، دووەم: دایکی نەبیل: خوشکە کاترین، سێیەم: سەباحی خوشکی نەجوا، کچی عەبدولقادر قواس و ئەوی تر ماری خوشکمە. ماری و کاترین یەکتریان زۆر خۆش دەویست و ماری زوو زوو زیارەتیانی دەکرد... کۆیە: ١٩٦٠

ئەگەر لەبەر بیروبۆچوونی خێزانی خۆم و خزم و کەس خۆی نەبوایە، مەسەلەکە لە لای من هیچ گرفت و مشکیلە نەبوو. چۆنیان ویستبا... من ئامادە بووم... جێبەجێم دەکردا بەڵام...

سێ چوار خێزان لێرەدا پێکەوە لە ژێر درەختەکانی باخچەکانی هەرمۆتە -- لە بەهاری ١٩٦٠ بەخۆشی و پێکەنین بەسەر دەبەن لە ڕاستەوە: من جگەرەم لەدەمایە-- وەستا ئارتین بەچاویلکەکانییەوە، ژنی عەبدولقادر واتا دایکی نەجوا ئینجا ماریە و ئینجا ژنی وەستا ئارتین و منداڵەکان

دایکی محەمەد-- خێزانی عەبدولقادر-- واتا دایکی نەجوا، لە سەیرانێکیان بۆ هەیبە سوڵتان بەهاری کۆیە ١٩٥٨یا ١٩٥٩ ئێمە-- پیاوەکان-- لە لایەکی تر دانیشتووین.

هێلین، کچە ئامۆزای دایکم (کچی نادر)، مامی دایکم هاتبوونە سەردانمان بۆ کۆیە، لەگەڵ نەجوا، لە سەیرانێکمان بۆ تۆبزاوا. هەردووکیان پێیەکانیان لە ناو ئاوی ڕووبارە سازگارەکەی تۆبزاوادا، سارد دەکەنەوە-- هاوینی ١٩٥٩

لە هەمان سەیراندا وەردییەی خوشکم و نەجوا، لەبەر سێبەری درەختان پاڵیان داوەتەوە-- تەمموزی ١٩٥٩

لە سەیرانان، دوای مەستی، من و باوکی نەجوا، لاسایی (هنود الحمر) دەکەینەوە، من بەتیخ و ئەو بە تیر و کەوان

لە مانگی ئادار سەیران و ڕابواردنی دەشت و کێو و سەر ڕووباران تامی تایبەتی دەدات بەژیان... لەم وێنەی سەرەوەدا، ئێمە و ماڵی مامۆستا سدیق عەبدولقادر و ماڵی عەبدولقادر قەواس، گەشتێکمان کرد بۆ سەر زێی (یان دەریاچەی) دوکان– یەکەم کەس لەوانەی ڕاوەستاون لە لای چەپ عەبدولقادر قەواسە، و لە تەنیشتی کاک سدیق عەبدولقادرە. دانیشتووەکان: لە چەپەوە: باکووری، سوهام، ئینجا خێزانی کاک سدیق، دوای ئەو: نەجوا و ماری و وەردییەن. لە دووردوەش: دایکی نەجوا و کیژە زۆر بچووکەکەیان: سەمیرە، دەستی دایکی گرتووە. ساڵی ١٩٦٠

له هەرمۆتە، لە سەیران
سێ کیژۆڵەی ناسک و جوان
هێلن، نەجوا و ماری گیان
مایەی ژین، هیوای ئاشقان
تاڵە ژین بێ نازداران
بێ خەندە و سیمای یاران

لە هەمان سەیرانەکەی هەرمۆتە، بەهاری ۱۹٦۰ من و باوکی نەجوا. ڕۆژنامەکانی لە لامان بوون، وەک شەبقەکەی ناپلیۆنمان لێ دروست کردوون و لە سەرمان ناون- لە دواوەشمان، سەباح کچی ناوەندی عەبدولقادر، سەیرمان دەکات

له ناو باغەکانی هەرمۆتە سەیرانێکماندا لەگەڵ ماڵی قەواس بۆ هەرمۆتەی سەیرانگای دڵگیر. لە ڕاستەوە: نەجوا، سوهام، باکووری، عەبدولقادر و خێزانی، لەسەر زەوییش سەباح و سەمیرە لێی دانیشتوون. ئاداری ١٩٦٠

سوهام و نەجوا لە باغەکانی هەرمۆتە - ئاداری ١٩٦٠

سەمیرە کچی بچووکی عەبدولقادر

ماریی خوشکم و ماریی خێزانی ئارتینی بەرگدروو و خێزانی عەبدولقادر دایکی
نەجواش ئەوا خەریکی ئامادەکردنی خواردنی نیوەڕۆن (چێشتی دۆڵمە- لە
سەیرانیک لە هەرمۆتە)

چەند ڕووداوێکی جۆراوجۆری کورت:-

١-سەرژمێری گشتیی دانیشتوانی عێراق (الاحصاء العام لسكان العراق) لە ڕۆژی ١/١٠/١٩٥٧ ئەو سەرژمێرە دەستی پێ کرد، لە بەیانییەوە هاتوچۆ قەدەغە بوو، منیش بەشداریم کرد و دوو سێ گەڕەکم بەرکەوت. جا، نفووسی هەموو عێراقیان، بەگشتی (٦,٥٣٨,١٠٩ شەش ملیۆن و پێنج سەد و سی و هەشت هەزار و سەد و نۆ) کەس بوو، واتا کەمێ زیاتر لە شەش ملیۆن و نیو کەس بوون (ئەمڕۆ کە ئەوە دەنووسم- پایزی ٢٠٠٥) نفووسی عێراق (٢٧,٥٠٠,٠٠٠ کەسە)!!

٢- لە ساڵی دیراسیی ١٩٥٨ دوای ساڵێک، لە هاتنی من بۆ کۆیە، مامۆستا مەجید عەبدولقادر سێگردکانی هات و ئەویش ل، قوتابخانەی ناوەندی تەعین کرا و دەوامی کرد. خۆی دەرچووی کۆلێژی (شەریعە)ی بەغدایە و زمانی عەرەبی زۆر چاک دەزانی وەختە بلێم چاکترین مامۆستای زمانی عەرەبی بوو.

***

٣- من و ماری و یووسف، بۆ ڕابواردنی سەری سالّی ١٩٥٨/١٩٥٧ چووینەوە کەرکووک - چونکە من دەعوەت کرابووم لە لایەن دۆستە هونەرمەندەکانم لە کەرکووک- بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگەکە و ئاگاداریشیان کردم کە دەبێ بەشێوەی (تنکری- واتا خۆگۆڕین) بێیت چونکە پێشبڕکێ دەکرێ بۆ جوانترین و چاکترین (جلوبەرگ)ی پێی نەناسرێی کە لە ناو خەڵکەکەدا، بە ژن و پیاو بەڕێوە دەچێ و پاداشت دەکرێ.

بەجلوبەرگی کوردی بەشداریی ئاهەنگی سەری سالّی ١٩٥٨/١٩٥٧ کرد

لەسەر شانۆی هۆڵی هیلالی سوور (قاعة الهلال الاحمر) لە کەرکووک سەری سالّی ١٩٥٧-١٩٥٨ ئاهەنگی سەری سالّمان کرد. من جلی کوردیم لەبەر کردبوو. ئەوانە بەشداربووەکانن هەریەک بەجۆرێک خۆی گۆڕیوە

ئەم خانمە ئاشوورییە، پاداشتی چاکترین خۆگۆڕین (تنکری) لە ئاهەنگی سەری
ساڵی ١٩٥٨/١٩٥٧ کە لەسەر شانۆی هۆڵی (الهلال الأحمر) ساز درا، لە
کەرکووک... دەداتە جەنابم. ماڵمان هێشتا لە کەرکووک بوو دایکم و وەردییە و
تیمە... وابزانم باوکیشم لەگەڵیان بوو. چەند ڕۆژێک ئێمەش جەژنی سەری ساڵمان
بەخۆش لەگەڵیاندا کرد و هەرسێکمان گەڕاینەوە کۆیە! واتا: یووسف و ماری و
خۆم.

من لەو ئاهەنگی جلوبەرگی کوردیم لەبەر کرد- و دوای خۆش ڕابواردن تا درەنگی شەو... پاداشتەکانی چاکترین جلوبەرگ دابەش کران و من بەچاکترین کەس دەرچووم کە (خۆی گۆڕیبێ! و پاداشتم وەرگرت لەو ئاهەنگە بەبۆنەی ئاهەنگی سەری ساڵی (١٩٥٨/١٩٥٧).

ئەو ماوەیەی تا کۆتایی ساڵی خوێندنمان ڕابوارد لەگەڵ هەڤاڵ و هونەرمەندان و خەڵکە ئەمەکدارەکەی کۆیە... سەیران و گەشت... ئاهەنگەکانی پێشتر باسمکردن و وێنەم گرتوون و لەم کتێبەدا دامناون بیرەوەری باش و خۆشن بۆ خۆم... هەروەها بۆ ئەو کەسانەی ناویان هاتووە و وێنەیان هەیە... پێم وایە مرۆڤ هەر چەند جارێ سەیریان بکات و باسیان بخوێنێتەوە گەش دەبێتەوە و پەردەیەکی شادی بەسەر دەموچاو و چارەی دادێ... سیمای خۆشییەکەی، دڵی بەهێزتر دەکات!

ئەم ساڵە، ساڵی ١٩٥٨دا، (فیلیپ)ی برای چوار ساڵ لە خۆم بچووکتر بەتەمەن،

بانگمان دەکرد (پلۆ)- ناوەکە وەک ناوی خۆم، گریکییە- یۆنانییە، ئەو ناوانە لە زەمانی (عیسا- مەسیح) هەبوون و لە قوتابیانی بوون و هەمیشە لەدەورەی بوون و ئەو فێری ڕێگەی ڕاست خۆی و بۆچوونی خۆی بۆ ڕوون دەکردنەوە! جا باوکم، کە کتێبی ئاینی و ئینجیلی دەخوێندەوە، ئەو ناوانەی لە کوڕ و کچەکانی دەنا. جا (پلۆ)ی برام هەوەسی ژنهێنانی هەڵسابوو... لەبەرئەوەی کە منیش (برا گەورە)ی بووم... بۆی باس کردم کە دەیەوێ خوشکی (کاک ولیەم)ی هونەرمەندی مۆسیقاژەنی بۆ بخوازین... خوشکی گەورەی کە ناوی (جوولیێت) بوو... ئەو باسەم پێشتریش کردووە، هەر لەو کتێبەدا و لە بەشی یەکەمیشدا.

ئەوە منم... لە نێو ئەو گیا و گوڵزارەدا... بیر لەو هەموو شتانە دەکەمەوە، لەگەڵ- ژنهێنان بۆ (پلۆ)ی برام ساڵی ١٩٥٧

فیلیپ ئەوسا، لە کارگەی چیمەنتۆی سلێمانی دامەزرابوو وەک (ملاحظ). مووچەی باش بوو. ئیتر (جوولیێت خان)مان بۆ کاک فیلیپ هێنا و لە کەرکووک، لە باخچە گەورە و خۆشەکەی (یانەی فەرمانبەرانی (I. P. C) کۆمپانیای نەوتی کەرکووک، لە نزیک یاریگەی تۆپانێی کۆمپانیا- ناوچەی عەرەفە، شەوی پێنجشەممەی ڕێکەوتی ١٩٥٨/٦/١٢، ئاهەنگێکی گەورە و خۆشمان بۆ گێڕا و هەموو خزمان و برادەرانی خۆی لە سلێمانی و ئێمەی لە کەرکووک و کۆیی هاتبوون و تا نزیک بەیانی، لەگەڵ ئاوازەکانی تیپی مۆسیقای ڕۆژئاوایی ئاسوورییەکان و بەشداری من بە عوودەوە لە گۆرانی

جوولێت یۆخەننا، خوشکی گەورەی ولیەم یۆخەننا کە خواستمان بۆ بەهاوسەری فیلیپی برام لە ١٩٥٨

کوردی و عەرەبی و ئاسووری... میوانان خۆشترین شەویان ڕابوارد. ئەوساش ماڵی باوکی ئەمیرە لە لامان نەمابوون و خانووەکە، بەهەموو ژوورەکانی بۆ ئێمە مابووەوە، چونکە کاک (ناسر یووسف)ی باوکی ئەمیرە، لە شەریکە خانووی وەرگرت و گوازتییەوە ئەوێ. ئیتر ژوورێکمان دایە کاک فیلیپ و جوولیێت!

یتشرف اسرائيل خمو بدعوة حضرتكم لحضور حفلة زفاف ولده فيليب على الانسة جوليت يوخنا وذلك في الساعة الثامنة من مساء يوم الخميس المصادف ٥٨/٦/١٢ في حديقة نادي موظفي الشركة في عرفة ـ كركوك. وبحضوركم تزداد الحفلة رونقاً وبهاء.

لەدوای ئەم قسانەشم، نوسخەیەکی کارتی دەعوەتنامەم لە لا مابوو، لێرە دا دای دەنێم، بۆ مێژووی خێزانمان- کە ئەمە یەکەم کوڕی مام ئیسرائیل بوو ژنیان بۆ هێنا، کە چوارساڵیش لە خۆم بچووکتر بوو! بەڵام من قەت بیرم لە ژنهێنان نەدەکردەوە، وەک کاک ولیەم، حەزم لە مۆسیقا بوو زیاتر لە (ژنهێنان)!

کاک فیلیپ لە ژیانیدا هەر وەک باسی خۆی دەکرد: زۆر بێ بەخت و بێ شانس بوو! بەخترەش بوو. لە ساڵی **١٩٦٣** لەگەڵ دەیەها پیاو و گەنجی سلێمانی گیرا و لە (تەوقیفی) سلێمانی ڕدێنی بەردابووەوە... جا برادەرەکانی ناویان لێنابوو (قەشە مەکاریۆس)- چونکە خۆی ناوی ئەصلی (فیلیپۆس- یان فیلیفۆس) بوو وەک لە ناو ئینجیلدایە تاوانەکەشی، کە لە مەحکەمەی (عورفی) کەرکووک، بەشاهیدی دوو عەمەلەی (سەرسەری) کە چاویان هەڵی نەدەهێنا، ئەوان (عەمەلە)بن و ئەو (دیانە) مولاحیزیان و لێپرسراوی کاریان بێ لە کارگەی چیمەنتۆ! بۆیە شەش مانگ حوکم درا بەتۆمەتی ئەوەی، «تۆ سیلاح و چەکت ناردووە بۆ (موتەئامیرەکان) و عەمەلەی کارگەی چیمەنتۆت هان داون- کە هەڵێن و بچنە چیا و (إلتحاق) بە (متمردین) بکەن. ئەوە بوو لەگەڵ چەند کەسێک، کە لە هەمان مەحکەمە حوکمی (سجن) دران ناردرانە (ڕومادی) لە ڕۆژئاوای عێراق.

جوولیێت لە ماڵی خۆیان لە سلێمانی، لە ڕۆژی خواستنی، ساڵی ١٩٥٨ گیراوە لە کاتی ئاهەنگی (نیشان) دانانی!

لە سەرفەرێکمان بۆ مووسڵ لە هاوینی ١٩٥٩ لەگەڵ ولیەم لە ڕاستەوە و
ماری و ڤکتۆریا و من

فیلیپی برام و ئەوانەی لە مەحکەمەی عورفی لە کەرکووک حوکم دران و ناردیانن بۆ (سجنی ڕومادی) لە ڕاستەوە: نائیب زابت محەمد عەلی سابیر (ئەوە زۆر برادەرم بوو بەهۆی ماڵی کاک وەحید بامەڕنی ناسیبووم لە ساڵانی پەنجاکاندا لە کەرکووک)، دووەم کەس: قاسم سەید مەجید، سێیەم- فیلیپ باکووری بەڕدینەکەیە- چوارەم خزمێکمانە و ناوی: (شلیمۆن ئەرموش)ە و جگە لە فیلیپ کە کۆچی دوایی کردووە- ئەوانی تر لە ژیاندا ماون- خوا بیانپارێزێ!

قەشە مەکاریۆس سەرۆک
کۆماری قوبرس لە شەستەکاندا

فیلیپی- برام- کاتێ لە
(تەوقیف) بوو لە سلێمانی،
برادەرە (مەوقووفەکانی)تر کە
لەهەمان حەپسخانە بوون،
ناویان لێنابوو (قەشە
مەکاریۆس) وێنەکە سالّی
١٩٦٣/١٩٦٤ گیراوە لە سجن.

فیلیپ تا بلّێی قسەخۆش و نوکتە زان بوو. خۆی نوکتەی دروست دەکرد. هەموو کەس لە سلێمانی خۆشیان دەویست. ئەویش زۆر حەزی لە مۆسیقا و گۆرانی و گالّتەوگەپ و سەیران بوو- کە لە سەرچنار خانوویان دایێ و دوای ژن گواستنەوەی، ئێمە لە هەولێرەوە، لە پشووی هاوینان و نیوەی سالّ دەچووینە سەردانیان و ئەوانیش دەهاتن، لە هاوینێکی تر.

بەلاّم فیلیپ کە لە گرتووخانە دەرکەوت و حوکمی تەواو کرد، سوێندی خوارد کە دەبێ ئەو ولاّتە بەجێ بهێلّێ و بروا ئەگەر بۆ (دۆزەخیش) بێ. بە منی وت: کاکە هەلّسە تۆش، خۆتان ئامادە بکەن و با پێکەوە برۆین! ئێرە بۆ ئێمە دەست نادات! عێراقی و عەرەب... هەرگیز مەسیحی و غەیری عەرەب کەسی تریان ناوێ!! وەک ئەوەی ولاّتی عێراق هەر دەبێ عەرەبی تێدا بێ چونکە خاکی عەرەبە!! ئەوە بوو لە سالّی ١٩٧٥، کە مەجالی

چوونه دەرەوە زەحمەت نەبوو و هەرچی دەرچووبایە (مانع) نەبوو- لە هەندەرانیش زوو (ئیقامە) دەدرایە بیانییەکان و هەروەها (جنسیە)شیان دەدانێ. فیلیپ و جوولێت و دوو کوڕی ئازاد و نیاز و کچێکی (هوەیدا) هەرچی کەلوپەلی هەیانبوو بەنرخی (کا) فرۆشتیان و هاتنە هەولێر- شەوێک لە لامان مانەوە ئاهەنگی (خواتان لەگەڵ)مان کرد- بۆ بەیانی ڕۆیشتین- ماوەیەک لە (لوبنان- لە بەیرووت) مانەوە و چوونە یۆنان و ئینجا یەکسەر بۆ ئەمەریکا. لە شیکاغۆ نیشتەجێ بوون- فیلیپ ئیشکەر بوو- هەروەها منالەکانی هەرزەکار بوون، و ژنیشی هەموو پێکەوە هەریەکە جۆرە ئیشێکی دۆزیبیەوە و مانگانە پارەی مووچەکەیان دەدایە باوکیان. خانووێکیان کری... ئینجا فیلیپ (ترێلە)یەکی کری، شەرق و غەربی پێ دەکرد، باری کەلوپەل و خانووی بار دەکرد. پارەیەکی باشی پاشەکەوت کرد- ئینجا لەسەر ڕێگەیەکی سەرەکی، (موتێل)ێکی کری ئیتر تا کۆچی دوایی کرد... خاوەن ئەو شوێنە بوو! بەم جۆرە ئیسراحەتی کرد و وەزعی باشتر بوو.

(فیلیپ- پلۆ)ی برام لە شیکاگۆوە بۆی ناردم. لە چەپەوە: فیلیپ، جوولێت (هاوسەری)، هوەیدای کچی، نیاز و ئازادی کوڕەکانی
ئاداری ١٩٨٢

فیلیپ، له ته‌نیش ترێله‌كه‌ی وه‌ستاوه. به‌و ترێله‌یه، بار و خانوو و كه‌لوپه‌لی ده‌گوازته‌وه و كرێی باشی وه‌رده‌گرت، به‌ڵام ده‌یگوت: شه‌و و ڕۆژ ئیسراحه‌تم نییه

دوای فیلیپ، یووسفی براشمان له ساڵی ١٩٧٩ عێراقی به‌جێ هێشت و چووه ئه‌مه‌ریكا– ئیتر له‌گه‌ڵ ماڵی فیلیپی برای سه‌ردانی یه‌كتریان ده‌كرد.
ئه‌م وێنه‌یه له ماڵی یووسف له ئه‌مه‌ریكا گیراوه له سه‌ردانێكی فیلیپ گۆرانی ده‌ڵێ! په‌هه‌ی په‌هه‌ی! ئه‌و ئامێرانه‌ش هه‌موو ئی یووسفن، له‌وێش خه‌ریكی مۆسیقا ده‌بێ له كاتی بێ ئیشی و هاتنی میوانان بۆ سه‌ردانیان.
به‌ڵام چی بكه‌م، من وا لێره ته‌نیام! چ خۆش ده‌بوو ئه‌گه‌ر منیش له‌و دانیشتن و به‌زمه‌یان له‌وێ بوومایه؟!

له ساڵی ١٩٧٨ جوولێت بەسەردان هاتەوە عێراق و سەردانی ماڵی باوکی کرد لە سلێمانی. ئینجا چەند ڕۆژێکیش هاتە لامان لە هەولێر- ئەم وێنەیەش لە دانیشتنێکی خێزانیی خۆمانەیە، لە هەولێر لە ڕاستەوە: دایکم، من (باکووری)، و جوولێت- لەسەر سفرەی خواردن- بێی ئێوە ناخۆش!

فیلیپ ئەو مۆتیلەی کڕی لەسەر ڕێگەی نێوان ولایەتەکانی ئەمەریکا و ئیشی زۆر باش بوو وەزعی مادی چاکتر بوو ئیسراحەتیشی کرد لە هاتوچۆی بە ترێلەکەی

بەم جۆرە ژیانێکی خۆشیان ڕادەبوارد، دوور لە پەستی و گرژی و دڕندایەتی ڕژێمی بەعسی فاشیست و تاوانبار و دیکتاتۆر- کوڕەکانی ژنیان هێنا و منالیان بوو و فیلیپ نەوەی خۆی بینی و کچەکەی هوەیدا شووی کرد- بەڵام بەداخەوە... فیلیپ تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی خوێن و سینگ بوو! دکتۆرەکان لێیان پرسیبوو: تۆ کارت چی بوو پێشتر؟ گوتبووی: من لە کارگەی چیمەنتۆ چەند ساڵێک کارم کردووە! دکتۆرەکان گوتبوویان: دە ئەم نەخۆشییەت لەو ساوە، لەبەر تۆزی چیمەنتۆکە زۆرت هەڵمژیوە... تووشت بووە! چارەش نەکرا... و کۆچی دوایی کرد لە پێش مردن بەیەک دوو شەو، لە نەخۆشخانە بوو، لە شیکاگۆوە قسەی لەگەڵ کردم، خواحافیزی لێ کردم، من دڵم دەدایەوە و: برام خوای گەورە ئینشائەڵڵا یارمەتیت دەدا... وتی کاکە من تەواو بووم، بەسۆندە و ئامێر... وەستاوم و قسەت لەگەڵدا دەکەم. قورگم پڕ گریان بوو، نەمتوانی چیتر قسەی لەگەڵدا بکەم.

برقية واردة

الرقم ..................

نوع البرقية ..................

وقت تسجيلها ..................

ختم الدائرة

وصلت في الساعة .................. الدقيقة ..................

من .................. استلمت من قبل ..................

الكلمات .................. التعليمات الادارية .................. التاريخ .................. دائرة الاصدار ..................

# ئاهەنگی گۆرانیی تیپی مۆسیقای مەولەوی ١٩٥٨

(هونەرمەند شەماڵ سائیب)، لە بەغداوە ئەم بروسکەی بۆ ناردم، بۆ کەرکووک، لە مانگی (٦) واتا حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٨ کە بەعەرەبییە، ئەوسا زمانی ڕەسمی هەموو عێراق (زمانی عەرەبی) بوو. لە بروسکەکەدا دەڵێ: (احضر في السليمانية حالا لإحياء حفلة، والمراجعة مع قادر ديلان/شمال). کوردیەکەی ئەمەی خوارەوەیە: ئامادە بە لە سلێمانی، زوو بۆ سازدانی ئاهەنگێک و پێوەندی لەگەڵ قادر دیلان بکە ئیمزا- شەماڵ).

لە سەرەوەی بروسکەکەی هەڵبەتە، عینوان و ئەدرێسی (ماڵەوەمان) نووسراوە، لە کەرکووک، کە ئاوهابوو: (کەرکووک، گەڕەکی بەگلەر- ژمارەی خانوو- ئەوەندە... بۆ ئەندریۆس خەمۆ).

ئیتر یەکسەر چووم و ماری و یووسف و هەموویانم بردن بۆ سلێمانی و لە ماڵی کاک وەلیەم دابەزین-

ئاهەنگەکەش، کە تیپی مۆسیقای سلێمانی، پێی هەڵدەستا و هەموو شتەکان ئامادەبوو، جا بۆ سێ ڕۆژان، ئەو ئاهەنگانە بەردەوام بوون کە بەبۆنەی (جەژنی قوربانی) بوون، و هەموو ئێوارەیەک هۆڵەکە پڕ دەبوو لە خەڵکانی عاشقی مۆسیقا و گۆرانی- شەماڵ لە بەغداوە هات و بەگۆرانییە بەسۆزەکانی بەشداری دەکرد و بەچەپڵە و هەلهەلە پێشوازی لێ دەکرا ماری خوشکم، ڕۆڵی ئەو کچەی کە لەسەر قەوانەکانی شەماڵ، بۆی دەگێڕایەوە... ماری لەگەڵ شەماڵ لەسەر

(ژین)
حوزەیرانی ١٩٥٨

ئاهەنگەکانی تیپی مەولەوی

حوزەیرانی ١٩٥٨ (ژین) ئاهەنگی تیپی مەولەوی

لەگەڵ تیپی مۆسیقای مەولەوی، بەبۆنەی ڕۆژانی جەژنی قوربانی ساڵی ١٩٥٨ لە سلێمانی- من ئەوسا خولیای ئامێر (جومبووش) بووم و لە ئاهەنگەکان لەگەڵ گۆرانییەکانی خۆمدا، دەمژەنی. لە لای چەپ کاک ولیەم بەژەنینی قیۆلۆنسێل (چەلۆ) و لە دواوە کاک قادر دیلانە بەکەمانچەوە... جێگەی خۆیەتی، بۆ مێژووی تیپی مەولەوی و هونەری شێوەکاری، بڵێم کەو ئەو وێنەی لەسەر دیوارە، لە دواوەی تیپەکە هەڵواسراوە وەک جوانکارییەکی باکگراوند، هونەرمەند (جەمال بەختیار) نیگارەکەی ڕەسم کرد بوو بۆ ئەو ئاهەنگە... کاک جەمال ئەندامی (مەولەوی) بوو- جا دوای تەواو بوونی ئاهەنگەکان، کاک قادر دیلان ئەو تابلۆیەی پێشکێش کردم، وتی: "دیاری بێ لە مەولەی بۆ باواجی". منیش لەگەڵ خۆم هێنامەوە کۆیە و لە چەند ئاهەنگێکی خۆمان، بەتایبەتی لە ڕانیە، بەکارمان هێنا

شەماڵ سائیب لە ساڵی ١٩٥٧

ئەو چەند ڕەسمانە بەشێکن لە وێنەکانمان لە ڕۆژانی جەژنی قوربانی ساڵی ١٩٥٨ لە ئاهەنگەکانی تیپی مۆسیقای مەولەوی، لە سلێمانی گیراون. لە ڕاستەوە: شەماڵ، باکووری، عومەر ڕەزا.

گۆرانیبێژی دەنگخۆش ماری بەبۆنەی بەشداریکردنی لەگەڵ هونەرمەند شەماڵ سائیب لە ئاهەنگەکانی تیپی مۆسیقای (مەولەوی) لە سلێمانی، بەبۆنەی ڕۆژانی جەژنی قوربان لە ساڵی ١٩٥٨دا

شانۆ دەوەستا و گۆرانییەکانی لەگەڵدا دەگێڕایەوە بەدەنگێکی زۆر خۆشتر لە دەنگی (گەلاوێژ)- کە لەسەر قەوان بەشداری کردووە. لە سلێمانیش هونەرمەندی تازە پێگەیشتووی ئەوسا عومەر ڕەزا، کە جەماوەرێکی زۆری هەبوو، بەشداری کرد- جا کاک قادر دیلان، وەک عادەتی خۆی، هەموو چالاکییەکانی تیپەکەیان، تیپی مەولەوی، لە ڕۆژنامەی ژین، لە مانگی حوزەیرانی ١٩٥٨دا بلاو کردووەتەوە، لە خوارەوە کۆپی ئەو ڕاپۆرتەی (قادر دیلان)تان بۆ بلاو دەکەمەوە، وەک بەڵگەکانی دیکەم، لەگەڵ چەند وێنەیەکی ئەو ئاهەنگە خۆش و سەرکەوتووە دا! کاکە قادر باسی (ماری) زۆر جوان کردووە کە لە ئاهەنگەکە بەشداری کرد.

ئەم باس و خواسانە... مێژوویکە، و لە هەندێکیان شتی سەیر و سەمەرە رووی داوە و تام و چێژێک دەبەخشێ، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی ئاگاداری ئەو هەڵسوکەوتەی هەندێ کەس بوون!

خوالێخۆشبوو (هادی رەشید چاوشلی) مرۆڤێکی دڵپاک بوو، مووەزەفێکی ئیداریی راستگۆ و دڵسۆز بوو بۆ وەزیفەکەی! کاتێ من لە کۆیە دامەزرام وەک مۆستای قوتابخانەی (ناوەندی کۆیسنجاق)، جەنابی کاک هادی، قایمقام بوو. لە یەکەم جەژن کە هاتە پێش، وەک عادەتە، ئێستاشی لەگەڵدا بێ، خەڵک، چین چین، دەچنە جەژنە پیرۆزەی لێپرسراوانی حکوومەت. مامۆستا شەفیق سابیری بەڕێوەبەرمان و یەک دوو مامۆستای دیکە، چووینە سەرا کۆنەکەی (کۆیە)، لە ژووری بەڕێز قایمقام، خەڵکانی تریش دانیشتبوون... ئێمەش چووین و تەوقەمان لەگەڵ جەنابی کرد و مامۆستا شەفیق بەو بۆنەشەوە، منی ناساد بە (قایمقام)... ئەوەش عادەتەن دوای جەژنە پیرۆزە و چوکلێت خواردن... هاتینە دەرەوە...! ئەمە شتێکی زۆر ئاساییە!

جا کە (من) دەستم بەجموجووڵانەوەی هونەری کرد و قوتابییانم هەڵبژاردن و تیپی مۆسیقام لێ دروستکردن... یەکەم ئاهەنگمان بۆ خۆمان، لە قوتابخانەی خۆمان گێڕا و من شانۆگەری (حوکمی قەرەقوش)م لەسەر شانۆ پێشکێش کرد لەگەڵ قوتابییانم... خەبەر گەیشتبووە جەنابی (هادی چاوشلی) قایمقام! من سادە و نەزان بووم جارێ! هێشتا نەم دەزانی کە دەبێ زۆر ئاگاداری بزووتنەوەم و هاتوچۆ و قسەکردنم و... تاد ببم، ئەگینا لە (قەزا)یەکی بچووکی وەک کۆیە، هەموو شتێ... هەموو هەنگاوێ، حیسابە لەسەر سلوک و رەوشتت!

مامۆستا هادی رەشید چاوشلی
قایمقامی کۆیە لە ١٩٥٦ تا شۆرشی ١٤ی تەمموز ١٩٥٨

ئەم قسانە، رۆژێک، مامۆستا شەفیق، لە ژوورەکەی خۆی، ژووری بەڕێوەبەر، من دەرسم نەبوو، لە لای دانیشتبووم و چایەمان دەخواردەوە، مامۆستا بەپێکەنینەوە وتی: «دەزانی تەمسیلەکەی- حوکمی قەرەقوش- خەبەرەکەی کە بیستوویەتی، کاک هادی قایمقام، پێی خۆش نەبووە؟» پرسیم بۆ؟ ئەمە چیرۆکێکی تەمسیلی کۆنە. من لە دارالمعلمین العالیە، لەسەر شانۆی کۆلێژەکەمان، بینیم لە بۆنەیەک، حاجی

ناجی الراوی، مامۆستای پەیمانگای هونەرە جوانەکان، بەشی شانۆ، لە بەغدا، بۆ ئێمەی قوتابییانی نمایش و عەرز کرد! من لەویەوە فێر بووم! جا کاک هادی بۆ تووڕە دەبێ؟ ئەمە کارێکی هونەرییە! کاک شەفیق، هەر بەپێکەنینەوە وتی: ئاخر قایمقام کاک هادی زۆر جدییە لە ئیشوکاری و جێبەجێکردنیان. لە ئیدارەکردن زۆر (ڕەسمیات)ی لە لا گرینگە. بیستوومە- ئەوە هەر قسەی کاک شەفیقە- وتی بیستوومە جارێک دردنگ دەچێتە دائیرە... هەڵدەستێ ئەمرێک دەردەهێنێ (عقووبە) دەداتە خۆی!! کتابی نووسیوە بۆ (موتەسەریفی هەولێر) کە «من- فلانم... قایمقامی کۆیسنجاقم... ڕۆژی فلان... لە دەوام دواکەوتم، بۆیە بڕیارم دا مووچەی ئەو ڕۆژەم لێ ببڕێ و بە(عقووبەت) بۆم بژمێرن.

(الحاج ناجی الراوی)
ئەکتەر و دەرهێنەری
شانۆ بەغدا ١٩٥٧

لەوەی بەدواش، زۆرم گوێ لێ دەبوو کە (چاوشلی) لە من و لە چالاکییەکانم ڕازی نییە! ئاگام لە خۆم بێ، دوور نییە لە کۆیە نەقلت بکا...!! من گوێم نەدایە ئەو شتانە و باوەڕم نەدەکرد هەندە دواکەوتوو بێت و جووڵانەوەی هونەری لە لای کاری ناپەسند بێ!

بەڵام، لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨، قایمقام گواسترایەوە بۆ هەولێر، لەوێ کرا بەسەرۆکی شارەوانی و پاش ماوەیەک کرایە (موتەسەریفی لیوای سلێمانی). تا ئێرەش، شتەکە هەر ئاساییە! بەڵام... ئێمە، وەک (کۆمەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکانی کۆیە) بڕیارمان دا بچینە (قەزای ڕانیە) و لەوێ دوو ڕۆژان، بمێنینەوە و لەسەر داوا و ڕەزامەندی خەڵکێکی زۆری شاری ڕانیە، یەک دوو ئاهەنگی گۆرانی بگێڕین... چونکە ناوبانگی تیپی مۆسیقای باواجییان بیستبوو و زۆریشیان لە هەندێک لە ئاهەنگەکانمان ئامادە بووبوون و بەرهەمەکانی تیپەکەیان دیتبوون و بەدڵیان بوون. لەگەڵ ئەوەش، پێشتر ڕەحمەتی کاک خالید سەعیدی برینپێچ و برادەرێکی تر، لە ئەندامانی کۆمەڵەکەمان، سەفەرێکیان کردبوو بۆ ئەوێ و لە قایمقامی ڕانیە و لە ناودارەکانی ئەوێ و مووەزەف و مامۆستایان پرسیبوو: ئەگەر تیپی باواجی بچێت لەوێ ئاهەنگیان بۆ بکات، نەجاحەت دەهێنێ بە (بلیت)؟ بۆ مەنفەعەتی قوتابییانی هەژار؟ وەڵامیان وەرگرتبوو کە هیچ مانیعێک نییە و بابێن!! کاک خالید و هەڤاڵەکەی گەڕانەوە کۆیە و پێیان ڕاگەیاندین کە خەڵکی ڕانیە حەز دەکەن پێشوازیمان لێ بکەن. ئەوەبوو تیپی مۆسیقا و

کۆرس و یەک دوو لێپرسراوی دەستەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەی بووژاندنەوە، پێکەوە بەرەو ڕانیە بەڕێ کەوتین، ڕۆژی ١٩٥٨/٨/٢٩ ز هەمان شەو لە گۆڕەپانێک، شانۆیەک دروست کرابوو و بەرنامەکەمان دەست پێ کرد بە وتارێکی کورت لە بابەت دامەزراندنی تیپەکەمان و هەندێک لە چالاکییەکانی ئینجا مۆسیقا و گۆرانی.

لەسەر شانۆ، لە شاری ڕانیە لەو ئاهەنگە پێشکێشمان کرد، وتاری (بەخێرهاتن) و باسێکی کورتی (تیپی باواجی)یان پێشکێش دەکەم، پێش ئەوەی برگەکان دەست پێ بکەین

ئەو کەسانەی چووین بۆ ڕانیە، وەک لە وێنەکەدا دیارە، ئەوانە بوون لە چەپەوە: یەکەم قوتابی، کە لە نزیک پێچکەکانی چارپایەکە دانیشتووە لە پێشەوەی وێنەکە خوالێخۆشبوو (ئەکرەم باقی) ناو بوو، عوودی دەژەنی. لەسەر چارپایەکە، دوو کەس دانیشتوون ئەوەی لای چەپ قوتابی خوالێخۆشبوو (ئەنوەر تاهیر)ە کە بە (مەلا ئەنوەر) ناسرابوو- ئەوەی تەنیشتی (منم- باکووری) پانتۆڵی پێجامەی خەت خەتم لەبەرە. لە تەنیشتی لای دیکەم، لەسەر زەوی و لەسەر چینچکانە (کاک جەمال عەبدولکەریمی حەمە مەلایە) ئەندامی کۆرس بوو، گۆرانیبێژیش بوو و (ژمێریار)ی (کۆمەڵە) بوو- منالەکەی تەنیشت کاک جەمال، پێم وایە (ئازاد)ی کوڕی مامۆستا بیلال بەهائەدینە، لەگەڵ باوکی هاتبوو. ئینجا ئەوانی لە دواوەمانن: با لە ڕاستەوە دەست پێ بکەین: یەکەم کەس مامۆستا کەریم شارەزایە، نائبی سەرۆکی کۆمەڵە بوو، لە تەنیشتیەوە، مامۆستای هونەرمەند- کەمانچەژەن لە تیپ، بیلال بەهائەدینە- ئەویتر بەجلی کوردییە، وابزانم شوفێری سەیارەکەمانە- لە تەنیشتیشی: قوتابی کەمانچەژەنی دەست و پەنجەڕەنگین، (زاهیر محەمەد)ە، لە نێوان کاک زاهیر و ئەندامەکەی تر، قوتابی (جان تۆماس)ە و هێشتا زۆر منال بوو- لە کۆرس بوو و هەروەها (دەف)یشی دەژەنی.

لەسەر شانۆ، لە شاری ڕانیە لەو ئاهەنگە پێشکێشمان کرد، وتاری بەخێرهاتن و باسێکی
کورتی تیپی باواجییان پێشکێش دەکەم، پێش ئەوەی بڕگەکان دەست پێ بکەین.
ئەو تابلۆیەی لە پشتەوەی شانۆ دیارە، (مانگەشەوە) لە لایەن کاک جەمال بەختیار دروست
کراوە، بۆ تیپی مەولەوی ساڵی ١٩٥٨ ئەوانیش پێشکێشی باواجییان کرد

لەسەر ئاوەکەی قولەی ڕانیەی ئەوسا
گرتووە، وەک یادگارێک- لە هەمان
سەفەرمان بۆ ئەوێ

لەو ئاهەنگەشدا، سێوەی مەقامبێژی گەورە و ڕەسەن، بەشداری کرد و خەڵکی ڕانیە مەقامەکانی سێوەیان زۆر پێ خۆش بوو. جا... ئێمە ئەوەمان کرد و کە گەڕاینەوە کۆیە، پاش چەند ڕۆژێک مامۆستا کەریم شارەزا، پێی ڕاگەیاندم و نووسراوێکی لە موتەسەریفی سلێمانی نیشان دام کە داوای ئەو پارەیە دەکات کە لە فرۆشتنی بیتاقەکان بۆمان هاتبوو و دەڵێ: ئەو برە پارەیە دەبێ بنێرنەوە، چونکە ئەوە بۆ قوتابیانی هەژارە- وابزانم... وەڵامێکمان دانەوە کە نیوەتان بۆ دەنێرین بۆ قوتابیانی ڕانیە و نیوەکەی تر بۆ قوتابیانی کۆیە! کەچی بەتوندی، موتەسەریف، کە (هادی چاوشلی) بوو، داواکەی ئێمەی ڕەت کردبووەوە و داوای هەموو پارەکەی دەکردەوە. ئێمەش زانیمان ئەو کابرایە کە شتێکی گوت یان فیکرەیەکی بۆ هات، دەبێ جێبەجێ بکرێ! جا پارەکەیان بۆ ناردنەوە کە شتێکی ئەوتۆش نەبوو! پێم وابێ دەوروبەری ١١ دینارێک بوو.

لەگەڵ عەبدولڕەزاق باقی، لە سەفەرێکمان. لەگەڵ مامۆستا و برادەرانی کۆیی، بۆ ڕانیە، پێکەوە گرتمان. کاک عەبدولڕەزاق خەڵکی کۆیە بوو، زۆر یارمەتی داین لە چالاکییە هونەرییەکانمان و دابینکردنی شتی پێویست... وەک شوێن و کاری (ڕەسمیات) و... تاد بۆمان، لە شارۆچکەی ڕانیە، مانگی ئایی ساڵی ١٩٥٨

# شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨

ڕۆژی ١٣ی مانگی تەمووزی ئەو ساڵ، یەکشەممە بوو... من بەبۆنەی پشووی هاوین لە ماڵەوە بووم، لە کەرکووک- هێشتان دایکم و برا و باوکم و خوشکم هەر لە کەرکووک بوون، نەیانگوازتبووەوە بۆ کۆیە! لەبەرئەوە، کە عوتلەی هاوین دەستی پێ کرد، لەگەڵ ماری و یووسف چووینەوە کەرکووک. لە کەرکووک هەر خەریکی خوێندن و گوێگرتن لە مۆسیقا و پیاسە لەگەڵ برادەرانی کەرکووکی و... سەفەری کورت کورت بۆ دەوروپشتی شار، بۆ تازە خورماتوو، قەرە هەنجیر و... شوێنی خۆشی تر، چەند سەعاتێکمان ڕادەبوارد بەخۆش، لەگەڵ فازل مەجید و ئیلهام مەردانی کەمانچەژەن و ئەنوەر ئاوچی و ئاسوورییەکان وەک: ڕابی بریمۆن و ئیشا عەسکەر و... دای قادری تەپڵژەن و... زۆری تر نیەتم هەبوو سەفەرێکی سلێمانیش بکەم لەگەڵ دایکم و منداڵەکان... بۆ لای ماڵی فیلیپی برام و باوکم و ماڵی کاک ولیەم یوحەننا و... برادەرەکانی تیپی مەولەویش سەردەنێکیان بکەم... هەروەها جاروبار حەزم لێبوو کەمانچە بژەنم و چاک بێ نشاز عەزف بکەم، لە ماڵەوە مەشق و ڕاهێنانم دەکرد بۆ ئەوەی کە لەگەڵ تیپی باواجی پێویستی هەبێ، من کەمانچە لێ بدەم تا یەک دوو لە قوتابییەکانم دەستیان بەچاکی و بەپاکی لێ ڕابێن و کەمانچەکە باش بژەنن، بێ نشاز- ئیتر ئا بەمجۆرە خەریکی کات بەسەربردن بووم، کە ئەوە ڕۆژە... واتا یەکشەممەی ١٣ی تەمووز، لەپڕ

کاک وەحید حوسێن باسەڕنی هاوڕێم بەژوورکەوت- ئەو کاتە کاک وەحید، وەک لە پێشتر، باسم کردووە، کە لە سەرەتای پەنجاکان، ماڵیان لە کەرکووک بوو، ئەویش ئەفسەر بوو ڕوتبەی (رەئیس) بوو، لەگەڵ ماڵی ئێمە یەکترمان ناسی و بووینە دوو برای خۆشەویستی یەکتر و بێ یەکتر کەم وا دەبوو هەفتەیەک یەکتر نەبینین. یان ئەو دەهاتە لام

و یاخود من دەچوومە ماڵیان. جا ئەو ڕۆژە کە دەاتە کەرکووک، بە ئەرکی ڕەسمی هاتبوو... ئیتر جانتاکەی دانا دایکم و برام تیمە بەخێرهاتنمان کرد... ئەو ساڵە ماڵی (ئەمیرە) لە لامان نەمابوون، باوکی لە کۆمپانیای I. P. C. خانوویان دابووییێ و گوازتبوویانەوە ئەوێ و ئێمە بەتەنیا، خانووەکە هەمووی، کە چوار ژوور و هۆڵێکی گەورەی تێدا بوو، لەسەر شەقامە سەرەکییەکەی کە بۆ گردەکەی (تالم تەپە) دەچوو و لەوێوە بۆ کۆمپانیا... کە ئێزگەی شەمەندەفەری کرێکارانی (ستاپلاین) نزیک بوو... هەروەها لە لایەکەی تری جادەکە، خانووەکەمان نزیک (قەسری زۆرا) بوو لەسەر فولکەکەی کە بۆ گەڕەکی (شاطرلو)، لە لای ڕاستەوە... شەقامێک دەچوو- کاک وەحید دەموچاوی شووشت و ئیسراحەتێکی کرد... ئێوارە، هەردووکمان چووینە یانەی ئەفسەران (نادی الضباط) کە بەرامبەر (مدیریة الانضباط العسکري) بوو، کە بە (القشلە)ش ناسرابوو.

بینایەی بەڕێوەبەرایەتیی ئینزیباتی عەسکەری (قشلە) لە ناوەڕاستی شاری کەرکووک و بەرامبەر بە یانەی ئەفسەرانی کەرکووک (نادی الضباط)

لە باخچە جوان و ڕێکوپێکەکەی یانەکە دانیشتین، لەگەڵ یەک دوو ئەفسەری تر کەوا کاک وەحیدیان دەناسی و هاتنە سەر مێزەکەمان و چاک و خۆشییان لەگەڵ بابی زیرەک کرد... ئەوسا نێوان عێراق و قاهیرە زۆر توندوگرژی هەبوو، لە ساڵی (١٩٥٦)دوە کاتێ سێ دەوڵەتەکە: بەریتانیا و ئەمەریکا و ئیسرائیل هێرشیان بردە سەر میسر و شەڕ لە نێوان ئەو سێ دەوڵەتە لە لایەک و میسر بەتیب لە بەرامبەریان وەستا بەسەرۆکایەتی (جمال عبدالناصر) و بە پاڵپشتی (یەکیەتیی سۆڤیەت) بە سەرۆکایەتی خرۆشۆف.

جەمال عەبدولناصر بڕیاری خۆماڵیکردنی کەناڵی سوێسی دا و جێبەجێشی کرد... ئەوە لە نێوان گەنجانی وڵاتانی عەرەب... دەنگی دایەوە و پاڵپشتی میسریان کرد و

خۆپیشـاندان هەمـوو ڕۆژێک لە زۆربەی شـارەکـانی عـەرەبی بەرپا دەبوو... داوایان لە حاکمەکانی وڵاتانی خۆیان دەکرد کە بچنە ناو شەڕەوە و یارمەتی جەیشی میسری بدەن! لە عێراق، کە نووری سەعـید، سەرۆک وەزیران بوو... خۆپێشاندان قەدەغە کرابوو. عـێراق لە ناو چوارچێوەی (ئیستعماری بەریتانی) دەجووڵایەوە، بۆی نەبوو، بەهیچ شێوەیەک، وا نیشـان بدات کـە یارمـەتیـدەری (مـیـسـر)ە. بۆیە لە عـێـراقـیـش، لە بەغـدا بەتایبـەتی، جـموجووڵی گـەنجـان و میللەتی عێراق، دەستی پێ کرد و مـوزاهەرات و خۆپێـشـاندان، هەمـوو شەقـامـەکانی بەغـدا و مـووسڵ و بەسـراو... تاد، گـرتەوە. جا لە ئێزگـەی ڕادیۆی قاهیـرە، هەموو شەوێک، بەرنامەیەک هەبوو، سیاسی بوو، کابرای ئامادەکاری بەرنامەکە هێرشی توندی دەکردە سەر حکوومەتی عێراق و نووری سەعـید و دەستە و دایەرەکەی- بەرنامەکە ناوی (لو قابلت نوري السعـيد، لقلت له)- ئەگەر نووری سەعـید ببینم، پێی دەڵێم،... بەرنامەکەش شێخی ئەزهەر، ناوی (الشيخ الباقوري) بوو، بەڕێوەی دەبرد... کە ئەمە بوو، لە ئێزگەی ڕادیۆی بەغداش، یەکێکی تر، بەرنامەیەکی دەست پێ کرد بەناوی (لوقابلت الباقووری، لقلت له...). ئینجا هەردوو بەرنامەکە، جوێندان و قسەی ناشرینیان بەرامبەر یەکدی دەکرد و هەر یەک حکوومەتی ئەوی بەرامبەری بە (عـميل الاستعمار)ی تاوانبار دەکرد. جا ئەو شەوەش، لەگەڵ کاک وەحید- دانیشتبووین لە یانەکە و گوێمان دابووە ئەو بەرنامـەیە کـە لەڕادیۆکـەی یانەی ئەفـسـەران، لە باخـچـەکـە، هەمـوو دەنگی کرابووەوە و ئیتر لێرە و لەوێ، ئەفسەرەکانیش، هەریەک بەگوێرەی ڕا و بۆچوونی خۆیان، تەعلیـقـیـان لەسەر هەردوولا لێ دەدا و پێیـان پێدەکـەنین، تا نزیک نیـوەشەو مـاینەوە و ئینجا لەگەڵ کاک وەحید گەڕاینەوە ماڵمان.

کە لەگەڵ باوکی زیرەک (کاک وەحید) هاتینەوە ماڵ، ئێمـە وەک عـادەتی ئەوساکەی هەمـوو عـێـراقـیـیەکـان، بەهاوینان لە سـەربان دەنووسـتین. بەڕاسـتی بەڕاسـتی، نوسـتنی سەربان، لە هاوینان و بەتایبەتی لە کەرکووک زۆر خۆش بوو. شەوانی هەمیشە فێنک و کزەبایەکی خۆشی هەڵدەکرد. یەک دانە مێـشـوولەش نەبوو، دەیانگوت لەبەر بۆنی نەوتی ئەو ئامێر و مەکینانە و غازەکـان... مێشـوولە و مێش ناژین. بەڵام کاک وەحید لە خوارەوە نووست. وتی خـوارەوە خـۆشـە فـێـری نوسـتنی سـەربان نین دایکم و منداڵەکـان هەمـوو لە سـەربان نووسـتـبـوون- بەیانی زوو کـرێکاری شـەریکە زوو دەڕۆن، هەر بەپێـیـان یان پایسکل، بەرەو (تالم تەپە). بۆیە هەر لە سەعات (٥)ەوە و هەندێکیان زووتریش، بەڕێ دەکەوتن و هەریەکە (سەفەرتاسی) خۆی بەدەستەوە دەگرت و دوو دوو، سێ سێ... و بەدەم

سەرۆک کۆماری میسر
جەمال عبدولناصر

شێخ ئەحمەد حەسەن باقووری
سەرۆکی جامیعەی ئەزهەری
قاهیرە لە پەنجاکاندا

جغارە خواردن، بەجادەکە شۆڕ دەبوونەوە... جا کاتی شار خامۆش بێ، ترومبێل ئەوەندە نەبوو... کەم کەس سەیارەی هەبوو، بۆیە بەو بەیانییە جارێ دەنگی مەکینەی هیچ سەیارەیەکم گوێ لێ نەدەبوو. بەڵام جاروبار گوێم لە دەنگی ناڵی پێ و دەستی وڵاغی عەرەبانە دەبوو... ئەسپ یا هێستر، کە ڕەنگە، هەندێ مووەزەف کەماڵیان دوور بوایە لە شەمەندەفەرەکەی کۆمپانیا و بۆ ئەوەی زوو بگاتە جێ و قیتارەکە بەجێیی نەهێڵێ، عارەبانەیەکی دەگرت تا مەحەتەکە.

بەڵام، لەپڕ، دەوری سەعات (٥/٣٠ پێنج و نیو، یا شەش) دەبوو... لە دوکانەکەی تەنیشت دەرگای حەوشمان، بەلای چەپیەوە، کە دوکانی کابرایەکی کوردی کەرکووک بوو، هەموو شتمان لەو دەکڕی... ئەوە سبەینان زوو، بۆ عەمەلە و کرێکارانی کۆمپانیا دوکانی دەکردەوە... جگەرە یا شتی تریان لێی دەکڕی ئەو بەیانییەکەی ڕۆژی دووشەممە بوو، ١٤ی تەمووز بوو، ڕادیۆی دوکاندارەکە، بە دەنگێکی بەرز

سرووديكى عەرەبى پەخش دەكرد بەناوى (الله اكبر الله اكبر- الله اكبر فوق كيد المعتدي...).

من لە سەربانەوە گويم ليى بوو سەرسام بووم. چونكە ئەم سرووده سرووديكى (ميسر) بوو لە كاتى هيرشى سێ قۆلّى (العدوان الثلاثي) لەسەر ميسرى زەمانى جەمال عەبدولناصر بەدريژاييى رۆژ لە ئيزاعەكەى (صوت العرب) بلاو دەكرايەوە و سرووديكى زۆر حەماسى بوو، بەراستى. جا من لە سەربان و لە ناو نوينى خۆم راكشابووم، هيشتا خۆر تيشكى لە ئاسۆى رۆژهەلاتەوە بەديار نەكەوتبوو... عالەم هەموو لە خەوى بەيانيانى فينكى سەربان بوون، من هەر تێ دەفكريم! خوايە بەو بەيانييە ئەمە چييە؟ تۆ بلّيى لە ميسر ئينقيلاب كرابێ بەسەر حوكمى جەمال عەبدولناصر؟ بەلام بەدوورم زانى چونكە عالەمى عەرەبى، حاكم و سەرۆكەكانيان نەبێ، هەموو شەعبى عەرەبى بەدواى جەمالدا كەوتبوون وەك رزگاركەريكى عەرەب لە قەلەم دەدرا. باشە، خۆ لە ئيزگەى بەغداش نييە! بەغدا رقيان لەو سرووده بوو و قەت لە ئيزگەكەى بەغدا لێ نەدەدرا و قەدەغە كرابوو!

هەردوو سەركردە: جەمال عەبدولناصر سەرۆكى كۆمارى ميسر و مستەر خرۆشۆف سەرۆكى يەكيەتيى سۆڤيەت

خيرا هەلسام و هاتمە خوارەوە سەيرم كرد كاك وەحيد وا لە بەردەم راديۆكەمان وەستاوە بە تاقى فانيلە و پەجامەوە و، سابوونى لە روومەتى داوە و مووسى بەدەستەوە وا ريشى دەتراشێ و سەيرى راديۆكەش دەكات. هەر منى ديت، وتى: وەرە وەرە بزانە لە بەغدا ئينقيلاب كراوە و وا رادەگەيەنن كە پاشى كەميك (بەيان)يكى گرينگ بلاو دەكريتەوە. تۆزيك بيدەنگ بووم، ئينقيلابەكەى ميسرم هاتەوە بير كە ئەوانيش لە ٢٣ى تەمووزى سالّى ١٩٥٢ بەناوى شۆرش بەرپايان كرد! جا وتم باشە دەبێ كێ بن ئەوانەى لە عيراق ئەو تيكەولێكە بكات؟ زەينم بۆ لاى شيوعييەكان چوو- وتم ئەوان لەپيشن و بەهيزترن لە حزبەكانى تر! وامدەزانى دەبێ حزبيك كارەكەى كردبێ! بەلام كات هات و يەكيك بەدەنگيكى بەرز وەك هاوار، دەستى كرد بە (البيان الاول)ى خويندەوە!

وێنەیەکی زۆر کۆنی قەڵاکەی کەرکووک و پردە بەبەرد و گێچ دروست کراوەکەی لە پێشەوە، لە لای ڕاستەوە دیارە کە لە دەیەها تاق پێک هاتبوو لەسەر ڕووباری خاسە کە بە ناوەڕاستی شاردا ڕەت دەبوو

بەیانەکە بەناوی (القائد العام للقوات المسلحة الوطنية) بوو... کێ بوو؟ ناوی چی بوو؟ جارێ هیچ ناوێک نەدەزانرا. ئیتر من و کاک ڕەحید هەر دانیشتین لە هۆڵەکە و بەرامبەر ڕادیۆکە و گوێمان لە خوێندنی بەیانەکە و لە دوای ئەو، سروودی (الله اکبر) دادەنرا. دایکم هاتە خوارەوە... و پرسی ئەوە چی قەوماوە؟ وتمان وەڵڵا نازانین... ئەوە بەیانێک دەخوێنرێتەوە و دەڵێ: عێراق بوو بە (جمهورية العراق)...

دایکم خەریکی چای لێنان و قاوەڵتی ئامادە دەکرد لە مەتبەخ و سەعات بووە حەوت و هەشت و نۆ... قاوەڵتیمان خوارد و بەشێکی پێشەوەی بەیانەکە بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

(بيان القائد العام للقوات المسلحة:

ايها الشعب العراقي الكريم

بعد الاتكال على الله، و بمؤازرة المخلصين من ابناء الشعب والقوات الوطنية المسلحة، أقْدَمْنا على تحرير الوطن العزيز من سيطرة الطغمة الفاسدة، التي نَصَبها الاستعمار، لحُكم الشعب والتلاعُب بِمُقدَّراتِه، لمصلحتهم وفي سبيل المنافع الشخصية.

اليها الاخوان: ان الجيش هو منكُم وإليكم...)

ئیتر بەیانەکە داوای لە گەل دەکرد یارمەتی بدەن و هاریکاری سوپا بکەن تاکو سەرکەوێ لەو کارەی... و داوای دەکرد هەرکەس ئاگادار بێ لەوانەی (فاسد) و (خائن)ن و خەبەری دەسەلاتداران بدات تاکو لەناو ببرێن! داوای هێمنی و خامۆشی لە خەلک دەکرد و دوور بن لە ئاژاوەنانەوە و نیزام پەیرەو بکەن و لێی دەرنەچین... لە ئاخیریش ئیعلانی دەکرد کە لەمڕۆوە، ئەم حکوومەتە دەبێتە (کۆماری عێراق)... و جارێ لە لایەن (مجلس السیادة)وە بەڕێوە دەبردرێ... ئەو مەجلیسەش دەسەلاتی (صلاحیات)ی سەرۆک کۆماری دەبێ هەتا هەلبژاردنی سەرۆک کۆمار دەکرێ. لە خوارەوەش ڕۆژ و مێژووی بەیانەکە و دامەزراندنی کۆمار چەسپاندرابوو بەڕۆژی چواردەی تەممووزی سالی ١٩٥٨ و ئینجا ئیمزا و ناوی دەسەلاتدارەکە وەک (القائد العالم للقوات المسلحة الوطنية) هاتبوو... بەلام بێ ناوی تەواوی کەسەکە!

کاک وەحید ئەو کاتە گرفتێکی گەورەی هاتە پێش! وتی: من نازانم چبکەم: بچمەوە بەغدا؟ بمێنم؟... چونکە وردە وردە برووسکە دەستی کرد بەناردن بۆ ئەو (مجلس السيادة) و پیرۆزبایی لە هەلگیرسانی ئەم شۆڕشەیان دەکرد و زۆربەی ئەفسەران و پیاوە گەورەکانی حکوومەتەکانی پێشوو و سیاسییەکان... برووسکەی (تأييد) و پیرۆزباییان دەنارد. موشکیلەی کاک وەحید ئەوە بوو وتی: من بەکارێکی ڕەسمی لە حکوومەتەوە... لە وەزارەتی (بەرگرییەوە) هاتووم و هەندێ دیاری و یارمەتیم هێناوە بۆ خەلکانی موربد و پیاوە ناسراوەکانی دۆستی حکوومەتی مەلیکی و ئاغا و ناسراوەکانی کوردستان... دەبوایە ئەمڕۆ. بچم بۆ هەولێر!. ترومبێلە جێبەکەشی هاتبوو لەبەر دەرگامان، سایقەکە کە ئەویش سەرباز (جندي) بوو لە ناو سەیارەکە چاوەڕێی کاک وەحیدی دەکرد... بزانی چ بڕیار دەدات. دوای هاتوچۆ لە هۆلەکەمان و تێفکرین... و دوای دلنیابوونی کە هیچ ئاژاوە و دیاردەی دژی ڕژێمی نوێ نییە، بڕیاری دا بگەڕێتەوە بەغدا. خواحافیزی لێ کردین و ڕۆیی بەرەو بەغدا- سوپاس بۆ خوا، دواتر زانیم کە بەسەلامەتی گەیشتەوە مال و منالی خۆی و تەئیدی ڕژێمی شۆڕشی نوێی کرد!

ئیتر ڕۆژانی داهاتوو... ئاسایی بوونەوە... مەلیک و هەموو ئەندامانی خێزانی (عائلة المالكة) هەر بەیانییەکەی ١٤ی تەمموز کوژران لە قەسر و کۆشکی خۆیان... (قصر الزهور)... نوری سەعید ڕۆژی دواتر، بە جلوبەرگی (ژن) دۆزرایەوە و کوژرا...، خالی مەلیک فەیسەلی دووەم، (وصي عبدالإله)، لاشەکەی لە نێو شەقامەکانی بەغدا بەگوریس، ڕادەکێشرا و دەیانگوت پارچە پارچە بوو بوو، بەلام هەر (سحل)یان دەکرد!

دوایی ئەوەی مابوو لە لاشەکەی. لە بەردەم وەزارەتی دیفاع، لەسەر عەمموودێک هەڵواسرابوو... مێژووەکە، دەیەها کتێبی لەسەر دەرچووە! بەڵام زۆربەیان بەقەڵەمێکی پاک و بێ لایەن نەنووسراون، چونکە لە زەمانی بەعسییە درندەکان نووسراون و کەسانی نووسەرەکان سەر بەرژێمی بەعس بوون، یان لە ترسا، راستییان نەگووتووە!

هەڵبەتە پاش (١٠، ١٢ دە دوانزە رۆژێک)، واتا لە ٢٧ی هەمان مانگ و ساڵ، دەستوورێکی کاتی (دستور مؤقت) دانرا و بڵاوکرایەوە و حکوومەت دامەزرا... ئینجا ئاشکرا بوو کێ و کێ بوون ئەو ئەفسەرانەی کە شۆڕشەکەیان هەڵگیرسان.

مەجلیسی سیادە پێک هاتبوو لە:

١- محەمەد نەجیب ئەلروبەیعی: سەرۆکی مەجلیسی سیادە

٢- محەمەد مەهدی کوببە: ئەندام

٣- خالید نەقشبەندی: ئەندام

(ئەوەی دوایی: کورد بوو و موتەسەریفی هەولێر بوو، یەکسەر کرا بەئەندامی مەجلیسەکە و چووە بەغدا).

حکوومەتیش پێک هاتبوو لە ١٤ چواردە وەزیر، بە سەرۆکایەتی (عبدالکریم قاسم)... وەزارەتێک بوو لە هەر گرووپێک و تایفە و قەومییەت و حزبەکان، ئەندامیان هەبوو: بەم جۆرە ناوی هەندێکیان دەنووسم:

١- عبدولکەریم قاسم: سەرۆکی وەزیران و وەکیلی وەزیری بەرگری (دفاع)

٢- عبدولسەلام محەمەد عارف: جێگری سەرۆکی وەزیران و وەزیری ناوەخۆ

٣- فوئاد ئەلروکابی (بەعسی بوو): وەزیری ئاوەدانکردنەوە.

٤- محەمەد سدیق شەنشل (مەیلی شیوعیەتی هەبوو) وەزیری راگەیاندن- (وزیر الارشاد).

٥- بابا عەلی شێخ مەحموود (کورد)- وەزیری ئەشغال و مواصلات.

٦- د. عبدولجەبار ئەلجومەرد: وەزیری دەرەوە

٧- د. جابر عومەر: (قومي) -وەزیری مەعاریف...

٨- محەمەد حەدید- وەزیری دارایی (مالية).

مەحکەمەیەکیش دامەزرا بەناوی (المحكمة العسكرية الخاصة لمحاكمة المفسدين والمتآمرين) و سەرۆکی مەحکەمەش، ئەفسەرێکی خزمی سەرەک وەزیران بوو ناوی

قارەمانی شۆڕشی ١٤ی تەمموز زعیم عەبدولکەریم قاسم لە ڕاستەوە و عەبدولسەلام عارفی یارمەتیدەری، لە چەپەوە.

عەبدولکەریم قاسمی سەرۆکی وەزیران و وەزیری بەرگری- کە لە ڕاستیشدا دەرکەوت هەر ئەو دانەری نەخشەو پلانی شۆڕشەکە بوو.. بەڵام عبد السلام عارفیش ڕۆڵی گرنگی هەبوو، کە ئەویش هەر قوتابی عەبدولکەریم قاسم بوو. ڕوتبەی عەسکەری عەبدولکەریم (زەعیم ڕوکن) بوو.. بەلام خەڵکی عێراق ئەوەندەیان خۆشویست، ئیتر ناویان نا(زەعیم) نەک لەبەر (روتبە عەسکەریەکەی)، بەڵکو وەک زەعیم- کەورەی میللەت- پاش ماوەیەک کە یەک دوو هەوڵ درا بیکوژن و لەناوی بەرن، میللەت زیاتر خۆشیان ویست و ئیتر هەر بە (الزعیم الاوحد)یان ناو دەهێنا! تا ماوەیەکی زۆر، خۆپیشاندان لە هەموو شارەکان دەکرا وەک (تەئید)ی زەعیم و

(محمد فاضل المهداوي) بوو... لەگەڵ ئەفسەرێکی تر بەناوی (ماجید محمدامین) کە وەک (المدعی العام) تەعین کرا... ئەمانە چەندین وەزیر و ئەفسەریان مەحکەمە کرد... پیاوی گەورە گەورەش ئیعدام کران: لەوان، خوالێخۆشبوو (سەعید قەزاز)... خەڵک زۆر لایەنگری ئەو مەحکەمەیە بوون... بەڵام زۆربەی میللەت، بەتایبەتی ئافرەتان و تەنانەت زەعیم عبدولکەریم بەخۆی، لەگەڵ ئەوەدا نەبوو مەلیک و خێزانی مەلەکی بکوژرێن بەو جۆرەی کوژران، مەلیک ساوا بوو... پێنج ساڵی تەواو نەکرد لە (پاشایەتی)یەکەی، کە سەری خوارد. هێشتا نەچووبووە ناو دنیا، وەک مەسەلەکە دەڵێ: واتا هێشتا ژنی نەهێنا بوو...! ساڵێک پێش شەهیدکردنی ئەو گەنجە جحێڵە جوانکیلەیە، کە گەلی عێراق، بەهەموو چین و دین و نەتەوەکانییەوە، بەدڵ و گیان خۆشیان دەویست... کیژێکی جوان و لە خێزانێکی ناسراو و بە ئەدەب و ڕۆشنبیری بۆ هەڵبژێردرابوو، ناوی (فاضلە بنت الامیر محمد علی بن محمد وحیدالدین) کە ئەو خێزانە لە نەوەی (محمد علی پاشا الکبیر)ە، پاشای لە میسر نێوان ساڵانی (١٨٤١ تا مردنی لە ٢ ئاب ١٨٤٩)- دایکیشی هەر لە خێزانێکی بەناوبانگبوو: ناو خانزادە کچی ئەمیر عومەر فاروق کوری خەلیفە (عەبدولحەمید) بوو. ئەوە بوو، دوای ڕەزامەندی مەلیک فەیسەڵی دووەم و دایک و خاڵ و هەموو ئەندامانی (عائیەی مالیکە)، (ئەمیرە فازلە) بوو بە دەزگیرانی فەیسەڵ و لە شوباتی ١٩٥٨ هاتە بەغدا بۆ سەردانی عێراق و دەزگیرانی لەگەڵ باوکی (أمیر محمد علی أبراهیم) و دایکی (أمیرە خانزادە)- بڕیاریش بوو مەلیک فەیسەڵی دووەم، مەلیکی عێراق، ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ سەردانی تورکیا بکات، چونکە ماڵی دەزگیرانەکەی لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد، لە قەسرێکی هاوینی لە شاری (یێنی کۆی Yene okoy)، نزیک ئەستەمبۆڵ. کە شەوی ١٣ی تەمووز، من و کاک وەحید حوسێن بامەرنی لە یانەی سەربازی کەرکووک (نادي الضباط في كركوك)، شەوەکەمان بەقسەی خۆش و پێکەنین و گوێی لە وتارکەی شێخی ئەرەەر، شێخ باقووری ڕاگرتبوو... لەو کاتە لە بەغدا، پاشای عێراقی لاو، مەلیک فەیسەڵی دووەم، جانتا و جلوبەرگی بۆ ئامادە دەکرا بۆ ئەوەی سبەی، ١٤ی تەمووز، بفڕێ بۆ ئەستەمبۆڵ... بۆ ڕابواردنێکی خۆش، لەو هاوینەدا، لەگەڵ دەزگیرانە ناسکۆڵەکەی.

لە ڕێکەوتە عەجایب و موسەببی پێکەنین و گریانی قەدەر و چارەنووسی ئەو مەلیکە، بێ تاوانە، هێشتا نەفام و سادە، ئەوەبوو کە ڕۆژی چوارشەممەی هەفتەی پێش ١٤ی تەمووز، خاڵی مەلیک فەیسەڵ، (وەلیعەهد: عبدالإله) لە ئەستەمبۆڵ گەڕایەوە بەغدا،

خوالێخۆشبووی شەهید- مەلیکی عێراق لە ١٩٥٣-
١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ فەیسەڵی دووەم، لە کۆشکی
پاشایەتی، لە بەردەم پۆرترێتێکی باپیری، فەیسەڵی
یەکەم وەستاوە

شازادە (فازلە محەمەد عەلی) دەزگیرانی مەلیکی
عێراقی جوانەمەرگ فەیسەڵی دووەم. بەداخەوە
ژیانی بووکێنی و شاژنی مەلیک فەیسەڵی نەبینی!

کۆشک و قەسری (عائیلەی مەلیکی) عێراق. لە بەغدا، کە ناوی (کۆشکی گوڵان قصر الزهور) بوو-. فەیسەڵی دووەم لەم کۆشکە لە دایک بوو لە بەیانی ڕۆژی پێنجشەممەی ڕێکەوتی (٢)ی مانگی ئایار- مایسی ساڵی ١٩٣٥ و هەر لە ناو باخچەکەی ئەم کۆشکەش، لە بەیانی ڕۆژی دووشەممە، ڕێکەوتی ١٤ی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨، لەگەڵ خاڵ و پلکەکانی و خولامیان و هەموو ئەندامی خێزانی پاشایەتی عێراق، لە لایەن گرووپێک یا (فەسیلێک) لە سەربازانی لەشکری عێراق. گوللەباران کران و کوژران!

ئەوەی لەگەڵ (جەلال بایار)ی سەرۆک کۆماری تورکیا کۆبووبووەوە و(نووری سەعید)یشی لەگەڵدا بوو... لەو کۆبوونەوانە، عەدنان مەندەریسی سەرۆک وەزیرانی تورکیا و لێپرسراوانی تر، لە بابەت (شرق الاوسط.) گفتوگۆیان کرد. بەڵام عەبدولئیلاه، خاڵی مەلیکمان، چاویشی بەدەزگیرانی فەیسەڵی خوشکەزای و خانەوادەی کیژەکە کەوتبوو و لەسەر هاتنی مەلیک فەیسەڵ بۆ ئەستەمبوڵ لە ڕۆژی ١٤ی تەمموز، ڕێک کەوتبوون- جا کە خاڵی مەلیک گەڕایەوە بەغدا و مۆژدەی خۆشی پێ بوو سەبارەت بەئامادەکردنی هەموو شتێک بۆ ڕۆژی گواستنەوەی فازیلە خان بۆ فەیسەڵ، لە فڕۆکەخانەی بەغدا، مەلیک فەیسەڵ ئامادە بووبوو و بەگەرمی پێشوازی لە خاڵی کرد.

## سفر جلالة الملك المعظم الى بريطانيا

بات في حكم المقرر ان يغادر بغداد الى استانبول يوم ١٤ من الشهر الجاري جلالة الملك المعظم . وسيبقى جلالته ليلة واحدة في استانبول يحضر خلالها اجتماع رؤساء الدول الاسلامية الاربع في ميثاق بغداد ثم يغادرها الى بريطانيا .
وسيكون سمو ولي العهد المعظم نائبا عن جلالته طيلة غيابه عن العراق .

## عودة ولي العهد المعظم من استانبول

عاد الى العاصمة عائدا من استانبول يوم الاربعاء الماضي سمو ولي العهد المعظم وقد استقبله في المطار جلالة الملك المعظم كما كان في شرف استقباله اصحاب الفخامة والمعالي رئيس وزراء الاتحاد العربي ورئيس الوزراء العراقي والوزراء وكبار موظفي الدولة ورجالاتها .
وقد اجتمع سمو ولي العهد المعظم اثناء وجوده في استانبول بالرئيس جلال بايار رئيس الجمهورية التركية وحضر الاجتماع فخامة السيد نوري السعيد رئيس وزراء الاتحاد

## نوري السعيد يعود الى بغداد

٩/٧/١٩٥٨

وصل بغداد فجر يوم الثلاثاء الماضي على طائرة البان امريكان من استانبول فخامة السيد نوري السعيد رئيس حكومة الاتحاد العربي وقد امضى فخامته في استانبول بضعة ايام في طريق عودته من لندن الى بغداد .

الاسبوع — ٤ —

لەم وێنەیەی سەرەوەدا، مەلیک فەیسەڵی دووەم، پێشوازی گەرمی خاڵی خۆی (عبدالإله) دەکات، لە فڕۆکەخانەی بەغدای پەنجاکان، کە ناوی (مطار المثنى) بوو... لە ڕۆژی ١٩٥٨/٧/٩- کابرا ئەجەلی هاتبوو - لەگەڵ نووری سەعید، سەرەک وەزیران، کە ئەودیان ڕۆژێک پێشتر، واتا لە ١٩٥٨/٧/٨ لە ئەستەمبوڵەوە گەڕایەوە بۆ ئەوەی ئینجا مەلیک، بەغدا بەجێ بێڵێ و بچێتە تورکیا و سەردانی ماڵی دەسگیرانەکەی بکات!

بەڵام، لە کاتێ کە (فازیلە)ی بەخت ڕەش و لەگەڵ خانەوادەی و دەیەها ئەفسەر و وەزیر و پیاوانی حکوومەتی تورکیا و سەفیر و دەزگای سەفارەتی عێراق... هەموو، لە بەیانییەوە ڕۆژی ١٩٥٨/٧/١٤ لە فڕۆکەخانەی ئەستەمبوڵ چاوەڕاوانی دەرکەوتنی فڕۆکەی عێراقین لە ئاسمانی فڕۆکەخانەکە... کە مەلیک دەهێنێ، بەڵام ئەو فڕۆکەیە... لە بەغداوە هەڵنەستاو نەفڕی! ئینجا هەواڵی (ئینقیلاب)ەکەی جەیشی عێراقی، وردە وردە بڵاو بۆوە!

دوا وێنەی مەلیک فەیسەڵی دووەم و خاڵی (عبدالإله) و نووری سەعید- لە فڕۆکەخانەی بەغد ١٩٥٨/٧/٩

ڕەنگە... و دڵنیـام، ئەم وێنەیەیە، دوا وێنە بێ بۆ مـەلیک فـەیسـەڵ و خـاڵی: عەبدولئیلاه و نووری سەعید، گیرابێ. ئەوەش ڕۆژی ١٩٥٨/٧/٩، لە فڕۆکەخانەی (المثنى) لە بەغدا گیراوە، دوای ئەوەی خاڵی مەلیک، لە ئەستەمبووڵەوە گەیشتە ئێرە و مەلیک و نووری سەعید و ئەحمەد موختار بابان- کە ئەو کاتە سەرۆکی وەزیرانی عێراق بوو- پێشوازییان لە عەبدولئیلاه کرد لە دوای ١٩٥٨/٧/١٤، خەڵک کوشتنی مەلیک و ئەندامانی خێزانەکەیان، وردە وردە لە بیر چووە بەهۆی پێشوازیکردن لەو شۆڕشە و ڕووداوی خۆش، کە یەک لە دوای یەک، بۆ خۆشی و کامەرانی گەلی عێراق و بڕیارە عەقلانی و پڕ سوودەکانی بۆ گەلی عێراق وایان کرد، گەلی عێراق سەرکردە تازەکەی (عبدالكريم قاسم) ئەوەندە خۆش بوێ... تا ناویان لێنا (الزاعيم الاوحد)-

یەک لە ڕووداوەکان، شکاندن و هێنانەخوارەوەی پەیکەری (جەنرال مۆد)- داگیرکەری عێراق لە ساڵی (١٩١٧)ەوە، کە لە گەڕەکێکی (کەرخ) لە بەغدا سەپێندرابوو... گەنجانی ئەو ناوچەیە سەرکەوتنە سەر پەیکەرەکە و تا فڕێیان نەدایە سەر زەوی بەخۆی و بە ئەسپەکەوە، دانەبەزین لەسەر بناغەکەی پەیکەرەکەی لەسەردا دانرابوو:

هونەرمەندانی عێراق- بە کورد و عەرەب و ئاسوورییەوە... و تاییفەکانی جیاجیاوە، سروود و گۆرانی و پارچە مۆسیقای خۆش و گونجاو لەگەڵ ڕووداوە گرینگەکە، بۆ ڕادیۆ و

(جەنرال مۆد)ی ئینگلیز، کە لە ساڵی ١٩١٧ بەغدای داگیر کرد

لاوانی بەغدای دیوی (کەرخ) لە کاتی خۆپیشاندانێک بۆ تەئیدی عبدولکەریم قاسم و شۆڕشەکەی (گەل)- هێرشیان کردە سەر پەیکەرەکەی جەنراڵی ئینگلیزی: (جەنرال مۆد) کە لە ساڵی ١٩١٧دا بەغدای داگیر کرد و لە چنگ دەوڵەتی عوسمانییە تورکەکانی ئازادی کرد!! ئینجا پەیکەرەکە، کە جەنرال مۆد سواری ئەسپ بوو، پاڵیان پێوەنا و بەگوریس ڕایان دەکێشا، تا فڕێیاندایە سەر زەوی و تێکوپێکیان شکاند، لە دوای شۆڕشەکەی ١٤ی تەممووز

تەلەفزیۆن، ڕۆژانە، ئامادە دەکرد و تۆمار و پەخش دەکران... شاعیرای بەرز وەک (جەواهیری) و (گۆران) و دەیەهای تر، شیعری پڕ هەستی خۆشەویستی بۆ ئەو شۆڕشە پاکە و ڕابەرەکەی زەعیم (عبدالکریم قاسم) دەهۆنییەوە و بڵاویان دەکردەوە. لە سروود و گۆرانییە زۆر زۆر خۆش و پڕ مانا، سروودەکەی (هەر بژی کورد و عەرەب) بوو، کە لە هۆنراوەی شاعیر (دکتۆر زاهر محمد زهدی) بوو و لە ئاواز و گوتنی گۆرانیبێژی کوردی

صوت الشعب

Tuseday 16 /10 / 2001

**شاعر (هەر بژی کوردو عرب..) في ذمة الخلود**

توقف قلب الشاعر الكوردي الدكتور زاهد محمد زهدي في لندن يوم ٢٨/٩/٢٠٠١ بعد صراع طويل مع المرض، وقد ناهز من العمر (٧٠) عاما وهو شخصية اكاديمية وسياسية اجتماعية معروفة، الف العديد من الدواوين الشعرية باللغة العربية وصاحب انشودة (هەر بژی کورد وعرب رمز النضال) التي غناها المطرب الكوردي الراحل احمد الخليل. تعازينا الحارة لأسرته واصدقائه ومحبيه.

شاعیری گۆرانی هەر بژی کورد و عەرەب
خوالێخۆشبوو د. زاهیر محەمەد زوهدی

هونەرمەند ئەحمەد خەلیل

ڕەسەن و ناسراو ئەحمەد خەلیل بوو. ئەو گۆرانییە، هەر دوای پەخشیکردنی لە تەلەفزیۆنی بەغدا، یەکسەر کەوتە ناو دڵ و سەر زاری خەڵکەوە، بە کورد و عەرەبەوە... مناڵ و گەورە و کچ و کوڕ و قوتابیان لە قوتابخانەکانی سەرتاپای عێراق، دەیانگوتەوە. بەداخەوە، گۆرانیبێژەکەش و شاعیرەکەش، لە کاتی ڕژێمی بەعس و بەتایبەتی لە زەمانی سەدامی موجریم، زۆر ئەزیەتیان پێ گەیی و سووکایەتیان پێ دەکرا، تا هەردووک کۆچی دواییان کرد... خوایان لێ خۆشبێ.

هەروەها ئەحمەد خەلیل و مائیدە نەزهەت بەدووقۆڵی، گۆرانی (عيد المحبة و التاخي و السلام- عيد الوحدة و الحرية)یان لە تەلەڤزیۆنی بەغدا تۆمار کرد و پەخش کرا و یەکسەر کەوتە سەر زاران.

دیسان مائیدە نەزهەت گۆرانییەکی دیکەی بەتەنیا، خۆی لە تەڤزیۆن گوتی، بەناوی (ديمقراطية و سلام، يا كريم يا كريم- ديمقراطية و سلام- يا زعيم يا زعيم). ئاوازێکی

یەکجار خۆشی هەبوو. جا کە بەعسییەکان، لە ساڵی ١٩٦٣ لە کارەساتە شوومەکەی ١٤ی ڕەمەزانی ٨ی شوبات کە ئینقیلابیان لەسەر حکوومەتی زەعیم عەبدولکەریم کرد و کوشتیان، مامۆستایان، ماتیدە نەزهەت و ئەحمەد خەلیل و هەموو ئەو هونەرمەندانەی لە ماوەی حوکمی عەبدولکەریم، سروود و گۆرانییان بۆ ئاشتی و دیموکراسی و برایەتی کورد و عەرەب، گوتبوو، هەڵاتن بۆ دەرەوەی عێراق و دەربەدەر بوون.

منیش لە کۆیە بووم و لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی، ئاهەنگێکمان کرد بۆ شارەکەمان، بەبۆنەی ئەم شۆڕشە، جا من یەک دوو سروودم ئاواز بۆ دانان، یەکییان سروودی (براینە، براینە براینە، کورد و عەرەب براینە)، بۆ یووسفی برام ئامادە کرد، لە هەڵبەست و ئاوازی خۆم- سروودێکی دیکە، لە شیعری محەمەد تۆفیق وەردی کە دەڵێ:

«بە شۆڕش میللەت ئەبێ ڕزگاری لە دەست خوێنمژ و لە چنگ بەدکاری»

بەڕاستی مۆسیقا لە عێراق گەشەی سەند و ئاوازدانەرەکان بەخۆداهاتنەوە و بەرهەمی تازە و ڕێکوپێکیان پێشکێش بەجەماوەر کرد. ئێزگەی ڕادیۆی عێراق، بەهەردوو بەشەوە، بەشی عەرەبی و بەشی کوردی، بابەتی نوێ و لەسەر ئەساسی (نەترس) لە حکوومەت، بابەتەکان بەئازادی و سەربەستی دەنووسران و یەکیەتیی کورد و عەرەب و دیموکراسی... خاڵی سەرەکی بابەتەکان بوون کە بڵاو دەکرانەوە. حکوومەتی تازەی شۆڕشی ١٤ی تەمموز لە دەستوورە کاتییەکەی ئەم خاڵانەی باسمکردن و دەیەها خاڵی تر کە بۆ بەرژەوەندی گەلی عێراق، لە نێو مادەکاندا، پەیڕەو کرابوون و لە وتارەکانی زەعیم هەمیشە دەری دەبڕی کە لەمەودوا ترس نەماوە هەر کەسە بەبێ ترس، ئازادانە ڕای خۆی دەربڕێ بەهەر شێوەیەک بێ، تەنیا جمهوریەتی عێراق پارێزراو بێ: هەموومان دەبێ بۆ پاراستنی کۆماری عێراق و ڕژێمە تازە، ئازاد و سەربەستەکەمان بپارێزین، یەک ڕیزی و برایەتی... و ئاشتیخوازانە- هەزار سڵاو لە گیانی پاکی زەعیم و مەهداوی و دەستە و دایەرەکەی حکوومەتی ڕاستەقینەی عێراقی ئازاد و دیموکرات، بێ! مردن و سەرشۆڕی بۆ ئاژاوەچییەکان و (متآمر)ەکان کە ئەو جمهووریەتە کۆرپەیەیان لەناو برد...

یەکێک لە بڕیارە هەرە گرینگەکانی عەبدولکەریم قاسم کە دوای یەک دوو مانگ لە شۆڕشەکەی، بڕیاری گەڕانەوەی سەرۆکی گەلی کورد، دامەزرێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان، بەڕێز مەلا مستەفای بارزانی، خەباتگێڕ بوو لە یەکیەتیی سۆڤیەت کە ئەو سەرکردە مەزنە، لە ساڵی ١٩٤٦ەوە، دوای کۆتاییهێنان بەکۆماری مەهابادی کورد لە ئێران، لە لایەن ڕژێمی شۆڤینی شای ئێرانەوە، مەلا مستەفا لەگەڵ نزیکی ٥٠٠ کوردی

زەعیم سڵاوی خەڵکی بەشەرەفی عێراق وەردەگرێتەوە و
بەپێکەنینێکی پاک و لە کانگای دڵیەوە، خۆشەویستی
خۆی دەردەبڕێ - ١٩٥٩

پێشمەرگەی پاڵەوانی بارزانی و کوردی تر، ڕێگەی ڕووسیایان گرتە بەر و لە زێی ئاراس سەر سنووری ئێران و ڕووسیا، سەرکەوتووانە پەڕینەوە و لەو وڵاتە نیشتەجێ بوون و دامەزران؛ تا ئەو ڕۆژەی ١٤ی تەممووز، کە حوکمی مەلیکی و ئیستعمار لە عێراق نەما، جەنابی مەلا مستەفاش بروسکەی پیرۆزبایی نارد بۆ زەعیم و حکوومەتی شۆڕش و ئینجا دوای بڕیاری دەعوەتەکەی زەعیم بۆ گەڕانەوەی مەلا مستەفا، بەڕێگەی دەریا و بەپاپۆڕێکی گەورە بەرەو عێراق، بەدڵخۆشی سەرکردە بارزانی و هەموو هەڤاڵانی، بەڕێ کەوتن. کە گەیشتنە سنووری میسر- کەناڵی سوێس- جەنابی مەلامستەفا سەردانی جەمال عەبدولناسری کرد... عەبدولکەریم قاسم پێشوازی لە مەلا مستەفا بارزانی کرد، لە وەزارەتی بەرگری لە بەغدا و بەخێرهاتنی کرد... هەردوولا زۆر ڕازی بوون لەم هەنگاوە گرینگە و بارزانی سوپاسی خۆی و هەڤاڵانی بە زەعیم و حکوومەتی تازەی عێراق دەربڕی- ئەو مێژووەش زۆری لەسەر نووسراوە... من تا ئێرە کە ئەوەی پێوەندی بەبیرەوەرییەکانم هەیە و... ڕووداوەکانم زۆر چاک لە بیرە، وەک ئەوەی دوێنێ بوو ڕووی دا، نووسیم، وەک بیرەوەری! بەڵام... لە لایەکی دیکەوە، هەر کە باسی ئەو شۆڕشە دێ زۆر کەس تا ئەمڕۆش پێیان وایەکە کوشتنی ئەندامانی خێزانی پاشایەتی و بەتایبەتی

مستەفا بارزانی ساڵی ١٩٥٨

عەبدولکەریم قاسم ١٩٥٨

مەلیک فەیسەڵی دووەمی خێر لە خۆ نەدیو! زۆر هەڵە بوو، چونکە جارێ هیچ زەرەری بۆ عێراق نەبوو!

من بەش بەحاڵی خۆشم، لە سەرەتاوە، لەو ساتەی لە ڕادیۆ ڕاگەیەنرا کە مەلیک فەیسەڵی دووەم کوژرا، گریانم هات و زگم پێی دەسووتا! بەتایبەتی کە دەهاتەوە پێش چاوم ئەو ڕۆژەی لە (دارالمعلمین العالیة) دیراسەتم تەواو کرد و ئەو بەدەست خۆی بڕوانامەی دەرچوون (شهادة التخرج)ی دامێ، لە ئاهەنگی ڕۆژی دەرچوونی قوتابیانی ئەو کۆلێژە، لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٧.

مەلیک فەیسەڵی دووەم بڕوانامەی دەرچوونم دەداتێ، لە ئاهەنگی (تخرج) د. ئیبراهیم شەوکەت لە دواوەی مەلیک وەستاوە، کە ئەوسا عەمیدی کۆلێژمان بوو- وێنەکەش لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٥٧ لە بەغدا، باخچەی هۆڵی فەیسەڵی دووەم لە (باب المعظم) گیراوە

زەعیم عەبدولکەریم قاسم، لە ژووری خۆی لە وەزارەتی بەرگری لە بەغدا، پێشوازی لە مستەفا بارزانی قارەمانی کورد دەکات. ساڵی ١٩٥٨

زەعیم عەبدولکەریم قاسم، لە کاتی پێشوازیکردنی کاک مەسعوود بارزانی، کە ئەوسا منداڵ بوو

# پێشانگەی پیشەسازی و کشتوکاڵی
# لە هەولێر و دەعوەتکردنی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە

ئیدارەی محەلی (الادارة المحلية)ی لیوای هەولێر، بەسەرۆکایەتی و ڕیعایەتی بەڕێز موتەسەریفی لیوا، بڕیاری دابوو لە یەکی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨، بەبۆنەی هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمموز، پێشانگەیەکی پیشەسازی و کشتوکاڵی (المعرض الصناعي و الزراعي) ڕێک بخات و بۆ ئەم مەبەستە، ئیدارەی مەحەلی ئاگاداری هەموو جووتیار و خاوەن کێڵگەی کشتوکاڵ و خاوەن دەواجن و مەڕومالات لە لایەک و لە لایەکەی تریش هەموو کۆمپانیا و وەکیلی کەلوپەلی جۆراوجۆری ئۆتۆمبیل و کارەبا و تەلەفزیۆن و ئامێری جۆراوجۆری پێویست بۆ بەکارهێنانی ناو ماڵ و ڕادیۆ و ئامێری دەنگ و هەموو شتی تر، کە خۆیان ئامادە بکەن و بەرهەم و کەلوپەلی نموونەیی بهێنن لەگەڵ خۆیان بۆ پێشاندانیان و نمایشکردن لەو پێشانگەیە کە بڕیار درابوو لە ١٩٥٨/ ١٠/١ لە گۆڕەپان یاری هەولێر، هەریەکە و لە کەپرێک یا دوکانێک کە لە دەورەی ئەو گۆڕەپانە دروست کرابوو، ئەشیاکانیان عەرز بکەن.

جا، چونکە مامۆستا نەشئەت محەمەد سەفوەتیش، کە بەڕێوەبەری مەعاریف بوو، ئەندامی لیژنەی ڕاپەڕاندنی ئەو چالاکییەی ئیدارەی مەحەللی بوو و جەنابیشی هەزار ڕەحمەتی لێ بێ وەختی خۆی، کە هاتە سەردانی قوتابخانەکەمان لە کۆیە ساڵی ١٩٥٧ و چالاکییەکانی ئێمەی دیتبوو لە مۆسیقا و خۆی چەند ئامێرێکی مۆسیقای لە هەولێرەوە بۆ ناردبووین، بۆیە ئەو زانیارییانەی لە پێش ئەندامانی لیژنەی (مەعرەزەکە) دەربڕیبوو و جەنابی موتەسەریف پێ خۆشحاڵ بوو کە (دەعوەتی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە) بکەن تاکو لە هەموو ڕۆژانی (إفتتاح)ی پێشانگەکە، ئەو تیپە مۆسیقا و گۆرانی پێشکەشی میوانان و سەیرکەرانی پێشانگەکە بکات لە ناو مایکرۆفۆنی ئەو ئێزگەیەی کە لە ناو مەعرەزەکە دانرابوو. بەو جۆرە ڕۆژێک پێش دەست پێکردنی مەعرەز، ئێمە، وەک تیپی مۆسیقای باواجی بەترومبیلێک هاتینە هەولێر، لەسەر دەعوەت و لەسەر ئەرکی شارەوانی هەولێر- ئەو تیپەش کە من سەرۆکایەتیم دەکرد، لە ژێر چاودێریی بەڕێز، بەڕێوەبەری

قوتابخانەمان، مامۆستا شەفیق سابیر بوو، کە ئەویش لەگەڵماندا هاتە هەولێر- هەر بەگەیشتنمان ئاگاداری شارەوانی و کاک (نەشئەت)مان کرد- ئەوانیش ئاگاداری موتەسەریفیان کرد کەوا تیپی باواجی گەیشتنە هەولێر. جەنابی موتەسەریف داوای لێکردن کە ئێوارە، سەعات ٦ لە دیوانی موتەسەریفیەت من ئامادەبم بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ ئەندامی لیژنەی پێشانگەکە، وەک وتم، بەچاودێری و سەرپەرشتیی موتەسەریف بوو.

ئێوارە لەگەڵ مەوعیدەکە گەیشتمە دیوانی موتەسەریف کە لە سەرا کۆنەکەی هەولێر بوو- لەوێ سەیرم کرد مامۆستا نەشئەت- مودیری مەعاریف لەوێ بوو منی ناساند بە موتەسەریف: ئەمیر لیوا ڕوکن عەلائەدین مەحمود، کە زۆر بەگەرمی تۆقەی لەگەڵمدا کرد و هەواڵی تیپەکەی پرسی و وتی مامۆستا نەشئەت باسی چالاکییەکانتانی بۆم کردووە و پیرۆزباییتان لێ دەکەم و هیواداربن سبەینێ شتی خۆشمان پێشکێش بکەن! سوپاسم کرد و وتم ئینشائەڵلا لێمان ڕازی دەبن! ئینجا منیان ناساند بە بەڕێز کاک عەبدولوەهاب حاجی حەسەن سەرۆکی شارەوانی، کە ئەو کەسایەتیی دووەم بوو وەک لێپرسراوی بەڕێوەبردنی هەموو ئیش و کارەکان-

لەو کۆبوونەوەیە بڕیار درا کە بەرنامەی کردنەوەی پێشانگە، ڕۆژی ١٩٥٨/١٠/١ بەمجۆرە بێ:

وتاری بەخێرهێنانی میوانان

١- سروودی (الله اكبر) لە لایەن تیپی مۆسیقای باواجییەوە.

(تێبینی: لە ماوەی ساڵی یەکەم و دووەمی شۆڕشەکە، هەموو کۆڕێک، یا ئاهەنگێک یا نمایشی وەرزشی و بۆنە ڕەسمییەکان، بەو سروودە دەبوایە دەست پێ بکات.)

٢- تیپی مۆسیقای عەسکەری.

٣- وتاری کردنەوە و بەخێرهێنانی میوانان، لە لایەن بەڕێزی، موتەسەریفی لیوای هەولێر.

٤- وتاری بەڕێز سەرۆکی شارەوانی، سکرتێری گشتیی پێشانگەکە-

٥-سووڕان و گەڕانی میوانان، لەگەڵ موتەسەریف بۆ سەیرکردن و تەماشاکردن و بینینی ئەوەی کە لە مەعرەزەکەدا پێشان درابوو.

ئیدارەی پێشانگەکە، نامیلکەیەکی قشتیلەی لە چاپ دابوو لە ڕۆژی مەعرەزەکە بەسەر میواناندا بلاو کرایەوە، کە تیایدا وتارەکان و هەموو کۆمپانیاکان و ئەو کەسانەی

عەبدولوەهاب حاجی حەسەن
سەرۆکی شارەوانی هەولێر
ساڵی ١٩٥٨

بەڕێز عەلائەدین مەحموود
موتەسەریفی هەولێر ساڵی ١٩٥٨

زەعیم عەبدولکەریم قاسم

بەرهەمیان لە کوشکەکان و کەپر و دوکانەکان پیشان دەدران... وێنەیان هەبوو لە ناو نامیلکەکە...

پێم خۆشە لێرەدا چەند لاپەڕەیەکی ئەو نامیلکەیە بڵاو بکەمەوە وەک بەڵگەیەک بۆ ئەوەی خەڵکی هەولێر و ڕۆشنبیرانی ئەو شارە ئاگاداری مێژوویەکی نزیکە نیو سەدە لەوەوپێش (ئەمڕۆ کە ئەو قسانە دەنووسمەوە، لە نزیک کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٥دایین)... دانیشتوانی هەولێر بزانن کە مێژوویەکی ڕووناکی هەبووە، شارە خۆشەویستەکەیان، هەروەها بایەخدان بەهونەر و هونەرمەندان و تیپی مۆسیقا لە کوردستاندا و ڕێز لێگرتن لەو کەسانەی بەڕاستی خزمەتی هونەر دەکەن.

هەروەها، لە دوای وتاری بەڕێز موتەسەریف، دەمەوێ بەشی کۆتاییش لە وتاری بەڕێز کاک عەبدولوەهاب حاجی حەسەن، سەرۆکی شارەوانی هەولێر و سکرتێری گشتیی پێشانگە، پێشکێش بکەم کە تیایدا سوپاسی هەردوو تیپی مۆسیقای عەسکەری هەولێر و تیپی مۆسیقای باواجی دەکات بۆ بەشدار بوونیان لە کردنەوەی ئەو پێشانگەیە.

ئەوە دووەم جار بوو تیپی مۆسیقای باواجی، بەتەواوی ئەندامەکانییەوە، بچینە دەرەوەی شارەکەی خۆمان، کۆیە و سەرکەوتووانە ئەرکەکانمان بەجێ بهێنین: جاری یەکەم بۆ شاری ڕانیە بوو... ئەمجارە بۆ شاری هەولێری دێرین بوو- کە گەڕاینەوە کۆیە، دیار بوو

بەرگی پێشەوەی نامیلکەکە

بەرگی دواوەی نامیلکەکە

تیپی مۆسیقای باواجیش، لە دوا لاپەڕەی نامیلکەکە بڵاو کراوەتەوە کە لە خوارەوەی شوێنی دانیشتنی میوانان، دانیشتووین. ڕۆژی کردنەوەی پێشانگەکە ١٩٥٨/١٠/١ لە ڕاستەوە: نەشئەت حەمید، عەونی عەلی مەولوود، سەردار ئەحمەد، ئەکرەم باقی، (مامۆستا عەلی چوکل) ڕێکخەری میوانان بوو حەزی کرد وێنەمان لەگەڵ بگرێ)- زاهیر محەمەد، کەمانچەژەنی سەرەکی تیپ دواکەسە نیوەی دیارە و منیش لە دواوە وەستاوم

## افتتاح المعرض

ليوم ١/١٠/٩٥٨

اخذت جموع المدعوين والمدعوات من كافة الطبقات يتوافدون
ي ثانية [ ساحة الملعب الرياضي في لواء اربيل — من جميع انحاء
اء والالوية المجاورة لمشاهدة يوم الافتتاح فاكتضت بهم ارجاء الملعب
درجاته .

وفي تمام الساعة الرابعة والنصف وصل المعرض سيادة امير اللواء
كن علاء الدين محمود متصرف لواء اربيل ولدى وصول سيادته صدحت
يقى [ الفرقة الثانية لجيشنا الظافر ] بسلام الامراء فوقف الحاضرون
ما .

ثم انشدت فرقة [ باواجي لمتوسطة كويسنجق ] وموسيقاها انيد
اكبر . وبعد الانتهاء من النشيد سارت موسيقى الفرقة الثانية
عراض حول المعرض بين التصفيق والتهليل وهي تعزف [ القطعة
سيقية الخالدة الله اكبر . ] وبعد الانتهاء من الاستعراض . الق
ة متصرف اللواء كلمة الافتتاح فرحب سيادته بالمدعوين وشكرهم على
ورهم وتلبيتهم الدعوة .

ثم تكلم رئيس البلدية والسكرتير العام للمعرض وبعد استراحة
رة تقدم عريف الحفل واعلن موعد افتتاح المعرض فتفضل سيادة
رف اللواء وقطع الشريط ومن خلفه المدعوين ثم اخذوا يتجولون

— ١١ —

لەم لاپەڕەیەی نامیلکەکەدا، باسی ڕۆژی کردنەوە ئیفتتاحی پێشانگەکەی تیایە، بە عەرەبی

## كلمة سيادة متصرف اللواء

سيادة متصرف لواء اربيل يلقي كلمته

أيتها السيدات والسادة

اشكركم على تلبيتكم الدعوة لمشاهدة معرض الادارة المحلية لهذا اللواء ، واني اذ افتتح باسم العلي القدير المعرض الصناعي الزراعي في اربيل لأشكر من الصميم كافة الذوات الذين ساهموا باخراج وتنظيم وادارة المعرض الذي ستشاهدونه بعد قليل والذي هو ثمرة جهود طيبة تظافرت على اخراجه الى حيز الوجود بعد أن كان حلما يداعب النفوس منذ زمن بعيد .

ان هذا المعرض هو الأول من نوعه يقام في هذا البلد الأمين وفي عهد الجمهورية . العهد الجديد الذي يستهدف العدل الاجتماعي والشعور بالمسؤولية ورفع مستوى معيشة الفرد وثقافته وتحسين حالته الصحية في ظل عهد البلاد الديمقراطي الجديد .

— ١٣ —

ئەوەش بەشێکە لە وتارەکەی بەڕێز موتەسەریفی لیوای هەولێر، جەنابی ئەمیر لیوا ڕوکن عەلائەدین مەحموودە

هەواڵی چالاکییەکانمان گەیشتبوونە خەڵکی شاری کۆیە... بۆیە پێشوازی باشیان لێ کردین... و ئەندامانی کۆمەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکان زیاتر هانیان دام بۆ زیاتر خۆ ماندووکردن و ئەنجامدانی کاری گەورەتر!

گەڕاینەوە کەرکووک و لەوێوە بۆ سلێمانی بۆ بەشداریکردنم لە ئاهەنگی تیپی مەولەوی بەبۆنەی جەژنی قوربانی ئەو ساڵە ساڵی ١٩٥٨ وەک پێشتر باسم کرد: کە کاک شەماڵ سائیب بروسکەی بۆ ناردم و چووینە ئەوێ هەموومان: واتا لەگەڵ ماڵەوەمان: دایکم و برا و خوشکەکانم... ئیتر دوای ئاهەنگەکان هەر ماینەوە لە ماڵی فلیپی برام لە سەرچنار... کارتێکی جەژنانەم نارد بۆ کاک کەریم شارەزا، و برادەرانی تر لە کۆیە... کاک کەریمیش لە وەڵامدانەوەی کارتەکەم پێی ڕاگەیاندم کە دەیانەوێ ئاهەنگێکی گەورە لە شاری کۆیە

— ٣٥ —

مشاعرهم وطيور محنطة بدقة متناهية والاركان الخاصة بمدارس البنات على أعمال التطريز وأعمال الابرة التي لا تجد في انتاج الاجانب بأحسن منها .

واشترك في المعرض أصحاب الحيوانات كالخيول والاغنام والابقار والطيور ويلاحظ فيها جودة الانواع ورقي الاصناف وبذرة الفصائل . وفي المعرض أيضا جناح خاص للتسلية والترفيه يضم وسائل كثيرة من طرق التسلية ويلاحظ فيه الابداع والابتكار .

وقد أسس جماعة من الكهربائيين محطة محلية للاذاعة تستعمله ادارة المعرض لاذاعة بياناتها ومقرراتها واذاعة الموسيقى والاغاني . وفي المعرض أيضا سينما صغيرة تعرض فيها أفلام لمناسبات سعيدة وأفلام تخص التثقيف الصحي .

وقبل الختام أود أن ارفع الى قيادة الفرقة الثانية الشكر الجزيل لايفادها فرقة موسيقى الجيش الاشتراك في احياء هذه الحفلة وكذلك الى فرقة باواجي للموسيقى والغناء لمساهمتهم أيضا في هذه الحفلة .

وبعد فيا أيها السادة والسيدات اننا فرحون بكم ونشكركم ونرجو أن تعذرونا من التقصير الذي قد تجدونه في المعرض ولعل أسباب ذلك التقصير يعود الى قصر اليد وضمن الوقت . ارجو لكم كل خير والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته .

عبدالوهاب الحاج حسن

فەرموو، برادەر ئەوەش بەشی کۆتاییی وتارەکەی بەڕێز عبدولوەهاب حاجی حەسەنە کە سەرۆکی شارەوانی ئەوسای هەولێر بوو... تیایدا سوپاسی (تیپی مۆسیقای باواجی) دەکات

بکەن... وا لە خوارەوەش کارتی وەڵامی بەڕێزی کاک شارەزا دادەنێم وەک یادگارێکی جوانی ژیانم: لە پشت وێنەکەش، ئەو چەند دێڕەی نووسیوە:

برای بەڕێزم مامۆستا باکووری سوپاسی هەستی بەرزتان دەکەم. ئەگەر لە بارەی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانەوە دەپرسن، وەزارەتی ناوخۆ ڕێی داوە بەدامەزراندنی کە لە ماوەی مانگێک هەڵبژاردن بکرێ. ئێمەش ناچار بووین کە لە ڕۆژی ٦/٧ ئینتیخابات بکەین: جەنابت هەڵبژاردرای بۆ سەرۆک! من نائیب سەرۆک.

بیلال: سکرتێر. جەمال کەریم: ژمێریار. خالید سەعید. کەمال مستەفا سادق، و سەلاح محەمەد سەعید ئەندام.

بەڵام لەبەر ئاهەنگەکانی تیپی مۆسیقای مەولەوی و هەندێ کاری دیکە... نەمتوانی جارێ بگەڕێمەوە کۆیە! مامۆستا کەریم دیسان لە دوا دوای مانگی تەمووزی ئەو ساڵ (ساڵی ١٩٥٨) نامەیەکی بۆ ناردم، وا لە خوارەوە، وەک یادێکی خۆشی ساڵانی لاوێتی و خوێن گەرمیمان و حەزمان نیشان دەدا بۆ خزمەتی بزاڤی ڕۆشنبیری- ئەدەب و هونەر... تاد، دام ناوە.

هەر دوای دوو ڕۆژ نامەیەکی تری لەم بابەتەوەم پێ گەیشت بەڵام درەنگتر لە مێژووی نامەکە- چونکە من لە سلێمانی بووم لەگەڵ تیپی مەولەوی زۆر خەریکی چالاکی بووین وەک ئاهەنگەکەیان لە هەر سێ ڕۆژی جەژنی قوربان... ئینجا دەعوەتەکەی کە بۆ هەڵەبجە بچین لە یانەی فەرمانبەران خۆیان ئامادە کردبوو بۆ سازدانی ئاهەنگ... هەمووی بەبۆنەی ڕزگاربوونی وڵاتی عێراق لە ئیستیعمار... ئەوەی خوارەوەش نامەکەی دیکەیە کە لە کۆیەوە پێم گەیی، بەڵام درەنگتر لە مێژووی سەر نامەکە، کە دوای دوو ڕۆژ نووسراوە.

کە ئەو کاغەزەم پێ

خوشکەکانی ولیەم
لە ئەزمەڕ هاوینی ١٩٥٨

ولیەم جلی سپی من جلی قاوەیی
لە ئەزمەڕ

لە سەیرانەکەمان بۆ ئەزمەڕ: یووسف، جولێت، ماری خوشکم
دانیشتووەکان: ڤکتۆریا (جهبش) مەری خوشکی ولیەم - هاوینی ١٩٥٨

گەیشت، ئەگەرچی لە سەیرانێک بووین بەدەعوەتی کاک ولیەم یوحەننا بۆ ئەزمەڕ... دایکی ولیەم و خوشکەکانی خواردنی خۆشیان بۆ ئامادە کردبووین و چووینە ئەزمەڕ... هێشتا شوێنێکی سادە بوو... ئاوی ساردی لێبوو...

من بەپەلە گەڕامەوە کۆیە و یەکسەر دەستبەکار بووین هەموومان بۆ خۆ ئامادەکردن و بەرنامە دانان و ڕاهێنانی تیپی باواجی و گۆرانی و گرانیبێژەکان و تەمسیلەکان... ئەوەبوو ئەو ئاهەنگە گەورەی مانگی ئابی ئەو ساڵە، ساڵی ١٩٥٨ لە سێ ڕۆژانی بەرواری ٢٠ و ٢١ و ٢٢ی مانگ کە پێشتر بەدرێژی باس کراوە و بەرنامەکەم دەستنیشان کردووە و لە ڕۆژنامەی ... یاخود (گۆڤاری هەتاو و پێشکەوتن)دا بڵاو کراوەتەوە باسم کردووە... ئیتر قایمقام و هەموو لێپرسراوانی حکوومەت و دانیشتوانی شار، شانازیان بەو تیپە جوان و ڕێکوپێکە و بەگەنجە خوێنگەرمەکانی کۆمەڵەی بووژاندنەوەی هونەرە جوانەکان دەکرد. چونکە وا شاری کۆیەش، وەک شاری سلێمانی، تیپێکی مۆسیقا و تەمسیل و چالاکیی هونەری پێشکەوتووی بوو. بزووتنەوەی ڕاستەقینەی هونەری ئاوازی و گۆرانی کوردی ڕەسەن، لە کۆیە، دەستی پێ کردەوە.

## چۆنیەتی یەکترناسینی من و مشکۆی هەولێری لە کۆیە

پێم وایە شەوێکی زستانی کۆتاییی ساڵی ١٩٥٨ بوو یان سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ بوو، شەوێکیان، برادەری بەڕێزم، کاک مامۆستا خەلیل خۆشناو لە دەرگای دا؛ ماڵمان لە تەنیشت ماڵی قایمقام بوو... دیوارێکمان لە بەیندا بوو، ئێمە لە خانووەکەی (ڕەفیق چەلەبی) بووین... مامۆستا خەلیل وتی: دانانیشم. ئەوا دوو برادەری هەولێریم میوانن و حەزیان کرد بتبینن... ئەگەر ئیش و کارت نییە و زەوقت دەیگرێ، دانیشتنێکی خۆش لە ماڵمان دانیشتووین و یەک لەو برادەرانەش دەنگی خۆش و قۆرياتی خۆش دەڵێ... جا ئەگەر بفەرمووی بۆ ماڵمان... و پێکەوە وابزانم خۆش ڕادەبوێرین.

من، بەڕاستی، حەزم لەو جۆرە دانیشتنانە بوو! وتم: باشە... گەڕامەوە ژوورەوە و عوودەکەم هەڵگرت و لەگەڵ مامۆستا خۆشناو، بەرەو ماڵیان بەڕێ کەوتین. ماڵیان بەرامبەر (ڕەوزەی منداڵان) بوو، لە خوار بینایەی مەحکەمە.. دەیڕوانییە لای نەخۆشخانە! لە ماڵی کاک خەلیل، لە ژووری میوانان، بەلای دەستە چەپەوە بوو کە دەچوویتە ژوورەوە لە دەرگای حەوشەوە- دیم دوو برادەرەکەی خۆشناو، لەسەر مافوورەکان، لەسەر عەرد دانیشتوون و سفرەیەکی تژی لە جۆرەها مەززە... و پەرداخی پڕ عارەقی سپی، لە پێشیان! سەلامم کرد... هەڵسانە سەر پێ و بەخێرهاتنیان کردم و تۆقەمان کرد. کاک خەلیل دەستی درێژ کرد بۆ کابرا زەعیفەکە، وتی: ئەوە کاک شەوکەوتە ناسراو بە مشکۆ لە هەولێرێ زۆریان خۆش دەوێ... مەقامی کوردی و قۆریاتی تورکی زۆر خۆش دەڵێ: ئەوەکەی تر، بەپێچەوانەی کاک مشکۆ بوو. زۆر قەڵەو... سەرێکی گەورە... لەسەر جەستەیەکی خڕوپڕ وتی ئەوەش کاک عەنتەرە!! بەڕاستی (عەنتەر) بوو: دانیشتین و کاک خەلیل پێکی بۆ کردم... وتی: مشکۆ و عەنتەر لە سلێمانییەوە هاتینە... برادەری عەزیزمن و حەزیان کرد ئەمشەوە لە لام بمێننەوە. منیش خۆشحاڵم بەدیتنیان دەربڕی... ئینجا وردە وردە، مەست بووین و عوودەکەم دەرهێنا و... یاڵڵا!... مشکۆ دەستی بەمەقامێکی کوردی کرد... لە بیرم نەماوە... بەڵام زانیم ئەوە مرۆڤێکی هونەرمەندی ڕاستەقینەیە... دەنگێکی خۆش، قوڕگێکی پاک و ژێیەکانی دەنگی جۆرە لەرینەوەیەکی

بیّ نەشارّیان دەردەهیّنا! منیش بەزەوق بووم و بە عوودەکەمەوە، وردە وردە بۆم لیّ دەدا! لە نزیکی نیوەشەودا بووین، لە دەرگای مالیّ درا! کاک خەلیل چوو دەرگای کردەوە... دیار بوو میوانی ئافرەتیان دراوسیّ بوون... کە دەنگی گۆرانی و عوودیان گویّ لیّ بووبوو هاتن،... چوونە ژووری بەرامبەر ژوورەکەی ئیّمەی لیّ بووین! دیار بوو مالّ و خیّزانی کاک خەلیل لەوبەر دانیشتبوون... چوونە لایان!

ئیّمە بەردەوام بووین لە بەزمی خۆمان. دوای ساتیّک لە دەرگای ژوورەکەمان درا، کاک خەلیل چوو دەرگای کردەوە و چووە دەرەوە و پاشان هاتەوە. ئینجا کاک خەلیل بە منی وت: ئەوانە ناسیاوەکانی ئیّوەن، ئەوانەی بەرامبەرمان... لە خانووەکەی (رەوزە!). من تیّگەیشتم و پیّکەنیم! خەلیلیش پیّکەنی وتی: جا ئەوانە دەلّیّن تۆش شتیّکیان بۆ بلّیّ! کاک مشکۆ، وەک پەست بیّ، وای نیشان دا! وتی: ئیّ چیان دەویّ؟! کاک خەلیل پیّی گوت: کاک مشکۆ... ئەوانەی هاتن مامۆستان، لە رەوزەن، بەرامبەری مالّمانن و لە کاک باکووری داوا دەکەن شتیّکیان بۆ بلّیّ! وتی: فەرموو مامۆستا بۆیان بلّیّ، بزانە چیان دەویّ!! هەلّبەتە من دەمزانی گۆرانی عەرەبی کە ئەوسا باو بوون وەک گۆرانییەکانی: فرید ئەترەش و سەباح... تاد. یەک دوو گۆرانیم بۆ

گوتن! ئیتر شەوەکەمان زۆر خۆش بەسەر برد لەگەلّ کاک مشکۆ. دواتر کە لە هەولیّر بینیمەوە و بووین بەهاوریّ، کە دەگەیشتینە یەک، لە دانیشتنیّک یا ئاهەنگیّک، ئەوەمان دەهاتەوە بیر و باسمان دەکرد!

هەر لەو وەرزە هاوینەدا، هاوینی ١٩٥٨، رۆژیّک مامۆستا شەفیق سابیر، بەریّوەبەری قوتابخانەمان، پیّی راگەیاندم کەوا کاک مەسعوود محەمەد... رۆشنبیر و رووناکبیر و کەسایەتی ناوداری کۆیە، دەعوەتی کردووین بۆ هاوینەهەواری چنارۆک، بۆ رابواردنی چەند سەعاتیّک لە باخچەکانی مالّی (مەلا گەورەی جەلیزادە)! منیش کە پیّشتر ناوبانگیم بیستبوو و زۆریش لە بابەت شەخسیەت و پلەی

هونەرمەند مشکۆ

ڕۆشنبیری ئەو بەڕێزە، زانیاریم هەبوو، بەڵام چاوم پێی نەکەوتبوو... بۆیە زۆرم پێ خۆش بوو کە مامۆستا شەفیق وتی عەسریی ئەو ڕۆژە دەچینە چنارۆک- چەند کەسانێکی دیکەشمان لەگەڵدا دەبن.

ناوداری کورد: مەسعوود مەلا محەمەدی جەلیزدە کوڕی مەلای گەورەی کۆیە

ئەوە بوو، عەسرەکە، بەترومبیل، هەڵبەتە بە جیپ، هاتنە دوام و سوار بووم لەگەڵ بەڕێزان: کاک شەفیق و مامۆستا زەکی هەناری و مامۆستا سدیق و چەند بەڕێزێکی تر، سەرکەوتین و ئاوای ئەردیوی هەیبە سوڵتان بووینەوە و لە باخچەکانیماڵی مەلا محەمەدی جەلیزادەی کۆیە، دابەزین. کاک مەسعوود پێشوازی گەرمی لێ کردین و منیش تۆقەم لە گەڵیدا کرد و خۆشحاڵی خۆمم دەربڕی بەچاوپێکەوتنم لەگەڵ جەنابی. کە دانیشتین ئیتر قسەکانی کاک مەسعوود وەک (موسوعە)یەک بوون! لە هەموو بابەتێکەوە زانیاریی تەواوی هەبوو- کە دەستم کرد بە عوود لێدان و یەک دوو گۆرانیم وت بە ئیحراجەوە... چونکە ئەو، وەک زانیبووم، لە ئاشقانی گۆرانی عەرەبی وەک (محمد عبدالوهاب و أم كلثوم) و شاعیرە گەورەکانی میسری وەک: ئەحمەد شەوقی و حافز ئیبراهیم و هونەرمەندانی ناسراوی عەرەبی بوو- مەیلیشی لە دەنگی سەید عەلی ئەسغەر و شەهابەی هەولێری هەبوو...

لە باسی مۆسیقا بەگشتی... زۆر شتی وای باس دەکرد کە لە لام تازە بوون!

ئیتر تا درەنگ ماینەوە و خواردن هات... و دوایی دوعا خوازیمان لێی کرد و گەڕاینەوە. ئەو ڕۆژەم هەر لە بیرە کە کەسایەتییەکی گەورەی کۆییم ناسی و لەگەڵیدا دانیشتم و لە چالاکییە هونەرییەکانم ئاگادار بوو و لێم ڕازی بوو!

لەم وێنەیەشدا، کە سەیرانێکە لەگەڵ چەند مامۆستایەکی کۆیە بۆ (چنارۆک)، لە مانگی ئایار (مایسی) ساڵی ١٩٦٠ و ڕۆژێکی دیکە بوو لە ڕۆژانی خۆشی ژیانم... وەستاوەکان، لە دەستە چەپی وێنەکەوە: مامۆستا کەریم شارەزا، مناڵەکەی تەنیشتی یووسف برای بچووکمە، ئینجا بەڕێز کاک محیەدین نافیز- کاتبی قوتابخانەمان بوو- ئینجا حازم ئەحمەد عەبدوڵلا (مامۆستای وەرزشمان بوو خەڵکی مووسڵ بوو هیوایەتی

وێنەگرتنیشی هەبوو و ئەم وێنەی بەکامێرای خۆی بۆی گرتووین- پاشان خالید عومەر و ئینجا عەبدولڕەحمان سەید عەلی- دانیشتووەکان: من پاڵم داوەتەوە و مامۆستای (رسم) عەبدولڕەزاق ئەلعانی.

لەگەڵ قوتابییەکانی کە تەمەنیان تەمەنی گەنجایەتی و (دور المراهق)یان بوو زۆر بەهۆش و عاقڵانە مامەڵەم لەگەڵ دەکردن و ئەوانیش لەگەڵ من زیاتر هەستیان بەراحەتی دەکرد لە گفتوگۆ و گۆڕینەوەی ڕا و بۆچوون و هەندێ جار پرسیاری تایبەتییان لێ دەپرسیم... وەڵامم بەوردی دەدانەوە... لە قوتابییە (کامل)ەکانی ئەو سەردەمە، زۆربەیان پۆلی سێیەم بوون: ڕەفیق عەبدولڕەحمان، خورشید مستەفا، تەها خورشید، زاهیر مەلا محەمەد، ئەنوەر تاهیر، شمۆئیل گۆیل... ئەوانەم ناوەکانیان لە بیر ماون و... ئەم قوتابیانە زۆر داوایان لێ دەکردم سەیرانێکی تایبەتییان لەگەڵدا بکەم... بۆ دەرەوەی شار... من ڕازی بووم و ڕێک کەوتین کە بچینە ناوچەی (جەلی) کە رووبار و ئاوی کبریتی لێیە...ئەوە بوو بەیانی زووی ڕۆژی ۲۳/٤/۱۹٥۸ کاک ڕەفیق عەبدوڕەحمان لە دەرگای دا و هێشتا لە خانووەکەی کە دوو ژووری بەر دەرگام لە مامۆستا عاشوور ئەفەندی گرتبوو... لەوێ بوو مەسکەنم. دەرگام کردەوە، کاک ڕەفیق بوو، ئەسپێکی سپی جوان بۆ (زین) کردبووم و لەگەڵ خۆیان هێنابووی- خۆم ئامادە کرد و ڕۆیشتین ئیتر بەرەو (دۆڵی ئەسحابان)، ڕێگەکە زۆ سەرکەوتن و نشێوی تێدابوو... هەندێ لەو ڕێگەیانەی ڕۆخ چیاکەی پێدا نشێو دەبووینەوە زۆر تەسک بوون تەنیا شوێن پێی یەک وڵاغ دەبووەوە! لە دۆڵی (ئەسحابان) دە دوازدە قەبریان نیشان دام، هەریەکە درێژی چوار پێنج (بەژن) دەبوون! گوایە ئەسحابەکان بەژنیان ئاوا درێژ بووین و خەڵک سامیان لێ کەوتووە و لێیان ترساون کاتێ هاتوون بۆ شەڕ! ئەی باشە ئەو ئەسحابە (موقەدەسانە!) بەو قەلافەتە و ئەو سامەی هەیانبووە، چۆن کوژران بەدەست کوردەکانەوە؟! من ئەو ناوەم نەدیتبوو و یەکەم جار بوو

ئەو ناوچە و ئەو سروشتە جوانەم بینی...
تا گەیشتینە ڕووباری (جەلی)، دیمەن لە دوای دیمەنی ناوچەکە و شاخ و داخ و دارستان و باغ و بێستان و کانی و کانیاو... لە هەر لایەکەوە سەیرم دەکرد، یەک لە یەک جوانتر و قەشەنگتر!

جا لەو شوێنە جوانانە قوتابییانم وێنەیان دەگرتم، خۆم و بەسواری ولاغەکە... وەک ئەو وێنەی لێرەدایە کە لە دۆڵی ئەسحابان بۆیان گرتم... لە دواوەشم ئەو ڕێگە تەسکەی لە قەد چیاکەوەیە کە پێیدا هاتن، وا دیارە و چەند تەسکە و سوارچاکی (وەک من)ی دەوێ! پێدا بچێت!.

سوپاس بۆ ئەو قوتابییە دڵپاک و دڵسۆزانەم... کە هەندێکیان، بەداخەوە، کۆچی دواییان کردووە، خوای گەورە لێیان ببوورێ و عەفوویان بکات - چونکە گوناهیان نییە- لەسەر ڕووبارەکە دانیشتین و نیوەڕۆیان ئامادە کرد و نان و چای خورا. ئینجا هەستاین و پیاسەمان کرد و کانی ئاوی گەرم و ئاو کبریت... زەرد و بۆنی هێلکەی لێ دەهات و کانی ئاوی قیر و نەوت... تاد

تا ئێوارە، جوانترین ڕۆژم لەگەڵ ئەو گەنجانەی دوارۆژ بەسەر برد بەخۆشی... و ئینجا ئێوارە گەڕاینەوە!

جگە لەو هەموو سەیران و ڕابواردن و لێپرسراوەتی تیپی مۆسیقای باواجی... کە ڕۆژانە، بەردەوام، ڕاهێنان و مەشقمان دەکرد... کاتیشم تەرخان دەکرد بۆ سەردانی برادەران و هونەر دۆستان و ڕۆشنبیران و نووسەر و شاعیرانی ناسراوی کۆیە. کاک دڵزاری شاعیر مەکتەبەیەکی کردبووەوە، لەسەر شەقامی سەرەکی، هەمیشە سەردانم دەکرد و گۆڤار و ڕۆژنامەکانی بۆ دادەنام. کتێب و نامیلکەیەک دەرچووبا... نووسینەکەم لێی دەکڕی- لەبیرمە هەموو ژمارەکانی کتێبی (مەحکەمە تایبەتییە عەسکەرییەکەی بەسەرۆکایەتیی خوالێخۆشبوو (فاضل عباس المهداوي- ڕۆتبەی عەقید) بوو، کاک دڵزار بۆی دادەنام...

مامۆستا و نووسەر
عەبدولڕەحمان نورجان

# ابن رشد وفلسفته

*IBN ROSHD*
*Averroès Et Averroïsme*

بقلم
عبد الرحمن نورجان الدبوني

ليسانس في الاجتماع وليسانس في الحقوق في بغداد
ودبلوم في القانون العام ودبلوم في الشريعة الاسلامية
في جامعة القاهرة

ريع الرسالة لمنكوبي السيول في السليمانية والسعدية وجلولاء

١٩٥٨ م
١٣٧٧ هـ

مطبعة المعارف – بغداد

زۆرم دەخـــوێندەوە... ئەمـــە خـــووێکی بەردەوام بوو هەر لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە... کتێبم کۆ دەکردەوە و دوای خوێندن دەمپاراستن لە دۆلابێکی دار. کتێبی (ابن رشد و فلسفته)ی مـامۆسـتـا عـەبدولڕەحـمـان نورجانم لەم بەرگ تا ئەو بەرگ خوێندەوە!

لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەم (یەکەمین مانگ) ساڵی ١٩٥٩ کـۆمـەڵەکـەمـان، «کـۆمـەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکان» هەڵبژاردنی دەستەی نوێمان کرد بۆ بەڕێوەبردنی کـارەکـانی کـۆمـەڵە، لە سـاڵی نوێ. دیسـان، ئەو برا خۆشەویسـتـانە، منیان هەڵبژاردەوە بۆ (سەرۆکـایەتی)ی کۆمەڵە!! ئەوانی تر ناوەکانیان لە خوارەوە دەنووسمەوە... و ئەم هەڵبژاردنە لە ڕۆژی ٩ی کـانوونی دووەمی سـاڵی ١٩٥٩ دا ئەنجام درا:

١- باکووری- سەرۆکی کۆمەڵە.
٢- مامۆستا کەریم مستەفا شارەزا - جێگری سەرۆک.
٣- مامۆستا عەبدولمەجید سێگردکانی - سکرتێر.
٤- جەمال عەبدولکەریم- ژمێریار.

ئەمساڵ، ئەندامانی کۆمەڵە... ئەوانەی حەزیان لە فێربوونی مۆسیـقـا بوو، خولێکی مۆسیـقـام بۆ کـردنەوە و دەستم کـرد بەفـێرکـردنیـان... مـوحـازەراتەکـان زۆر چاک دەچوون بەڕێوە و برادەرەکـان هەموو دەوامیان دەکرد لەبەر خۆشەویستی مۆسیقا و فێربوونی...

لە لایەکی ترەوە، من لە خۆشەویستی کیژەکە پێوەندی توندمان لە بەیندابوو... کۆبەی بەجێ هێیشت و تەنیا مامەوە مامۆستا سوهام خۆی نەقل کرد بۆ هەولێر، تاکو لە ساڵی باوکی کە لە (موصل) بوو نزیک بێ- دەتوانێ هەموو پێنجشەممە بچێتەوە و دایک و باوک و براو خوشکەکانی ببینێ کارێکی مەعقوول بوو. من هیچ نەبوومە تەگەرە یا ڕێگر لە بڕیارەکەی مافی ئەوەم نەبوو، و خواحافیزی لێ کردم و ڕۆیشت. نەجوا خانیش چووە هەولێر و داخلی قوتابخانەی (الفنون البيتية) بوو- ئیتر چ بکەم؟؟

بەڵام کاتی خۆم هەر بەفیڕۆ نەدەدا و بەسەیران و سەردانی برادەران... خۆشمان ڕادەبوارد و تیپەکە و هەوڵدانی چاکترکردنی و مەشقکردنیش کاتێکی باشی لێم وەردەگرت. کە پشووی بەهار (العطلة الربیعیة) دەستی پێ کرد دوای تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ، لە مانگی (شوبات) ئەو ساڵە، (١٩٥٩) هەموومان چووینە سلێمانی- جا وا ڕێکەوت کە نەفەر نەبوو لە کۆیەوە یەکسەر بۆ سلێمانی- بۆیە ترومبیلەکان هەموو بۆ هەولێر و کەرکووک دەچوون- منیش بەخۆم وت: قابیلە (عطلە)کە لێرە بەتەنیا بین و ماڵی فیلیپی برام نەبینین؟ لەگەڵ سایەقێکی یەک لەو جێبانە ڕێک کەوتم بە (١٠ دینار) کرێ، بەتایبەتی، (بەخصوصی) بمانبات. کابرا ڕازی بوو، وەستا (کەمال کۆیی) ناوبوو- ئێمە خەریکی سەرکەوتنی ناو ئۆتۆمبیلەکە بووین، دیتم مامۆستا (سابیر ئیسماعیل) هاتە بەر پەنجەرەی پێشەوە کە من لە لای سایەق دانیشتبووم و وتی: ئەوە بۆ کوێ، لەگەڵ خێزان، ئۆغر دەکەن؟

من و مامۆستا سابیر ئیسماعیل لە ڕێگەی نێوان کۆیە و سلێمانی، لە وەستانێک بۆ ئیسراحەت ئەم وێنەمان گرت- شوباتی ١٩٥٩ (دۆڵی خەلەکان)

وتم: بۆ سلێمانی! وتی: بەخوا منیش دەمەوێ بچمە سلێمانی بەڵام ترومبێل نییە- جا وتم مامۆستا فەرموو لە گەڵماندا!... ئەوە بوو لەگەڵماندا، هات سەلامی لە دایکم کرد، و پێکەوە بەرەو هەیبە سوڵتان سەرکەوتین.

لە دۆڵی خەلەکان لە چایخانەیەک دانیشتین، دایکم خواردنی (مشویات)ی بۆ کردبووین، لەوێ نیوەڕۆمان خوارد لەگەڵ چای و (وەستا کەمال کۆیی) سایەقیش لە گەڵماندا بانگم کرد و دەستمان بەخواردن کرد- دوایی چایمان خوارد و کەوتینەوە ڕێ.

دوو وێنەی تری ئەو سەفەرەمان، لەگەڵ مامۆستای بەرز و کوردپەروەر و دڵسۆز بۆ قوتابیانی، (سابیر ئیسماعیل) بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتاییم... لە ساڵی /١٩٤٣

لە چایخانەیەک، لە دۆڵی خەلەکان دانیشتووین و نانی نیوەڕۆ دەخۆین لەو
خواردنەی دایکم بۆ ڕێگە بۆی کردبووین، لە ڕاستەوە: ماری، و دایکم و من و
مامۆستا سابیر بەپێوە وەستاوە و کەمال کۆیی- سایەقەکەمان. وەردییەش، لە
نێوان ماری و دایکم وەستاوە

هەمان جەماعەتین، بۆ گرتنی وێنەکە وەستاوین، پێش ئەوەی دەستکەینەوە
بەڕۆیشتن بەرەو سلێمانی. شوباتی ١٩٥٩

هونەرمەند قادر دیلان
ساڵی ١٩٥٤

١٩٤٢دا کەئەو دەرفەتە جوانەی مانگی شوباتی ١٩٥٩م بۆ هەڵکەوت لەگەڵ جەنابی- پێکەوە، ئەو گەشتە بکەین.

لە سلێمانی، مامۆستا سابیر ئیسماعیل لێمان جیا بووەوە و چووە ماڵە خزمانی، ئێمەش چووینە سەرچنار، بۆ ماڵی فیلیپی برام. ماوەی ئەو دوو هەفتەیەی کە پشووی نیوەی ساڵ بوو... هەر لەگەڵ هونەرمەندانی هاورێ، لە تیپی مۆسیقای مەولەوی دابووم و کاتم لەگەڵیاندا بەسەر دەبرد. دەچوومە ماڵی کاک ولیەم... ئینجا پێکەوە، عەسرەکەی، دەچووینە بەردەم دوکانەکەی کاک بەهجەت ڕەشید سەعاتچی، لەسەر ڕەسیفەکە دەوەستاین... قادر دیلان لەولاوە دەهات دوای کەمێک حاتەم و نەجاتی عەبدە دەهاتن... ئەوانە هەمیشە پێکەوە پیاسەیان دەکرد... برادەران ناویان لێنابوون (بلاک ئەند وایت Black and White واتە ڕەش و سپی: نەجات سپی و سوور و شیک، و جوان بوو، حاتەم یەکجار ئەسمەرێکی مەیلەو ڕەشی تەواو بوو، هەردووکیان زۆر ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین و نوکتە لەسەر زاریان بوو! هەمیشەش قسەی خۆشیان لە هەگبەدا هەبوو.

لە ڕاستەوە: مامۆستا ولیەم. لە ناوەڕاستدا: یووسفی برای بچووکمان و جولێت خانی خێزانی فیلیپ- ئینجا لە لای چەپ فیلیپ بەجلی کوردی لە سەیرانێک ساڵی ١٩٥٩ سلێمانی

فولکەکەی بەر دەرکی سەرای سلێمانی لە ١٩٥٥دا

بەهجەت ڕەشیدی
سەعاتچی و هونەرمەندی
سلێمانی ١٩٥٤

مامۆستا و ڕابەری بزووتنەوەی
مۆسیقای شاری سلێمانی لە
سەرەتای پەنجاکانەوە و ئەندامی
دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای
مەولەوی ولیەم یۆحەننا

سێ لە ئەندامانی تیپی مۆسیقای مەولەوی: لە ڕاستەوە:
١- حاتەم سەعید- بەتەپڵ ٢- عەباس... دەف ٣- نەجات
عەبدە- شمشاڵ. ١٩٥٤ سلێمانی

له چەپەوە، منم، له ناوەڕاست: مامۆستا
مونیر وەكیل، خاڵی مامۆستا ولیەمە، و
گەنجێكی دراوسێیان له حەوشی ماڵی
ولیەم. شوباتی ١٩٥٩

ڕۆژانی شوباتی ١٩٥٩ له سلێمانی. له
ماڵی ولیەم
له ڕاستەوە: مونیر وەكیل، باكووری،
فاتم- كچێكی دراوسێیان خوشكی
ڤیكتۆریا و مارین

له عوتڵەی نیوەی ساڵ شوبات ١٩٥٩، لەم وێنەیەدا له ماڵی فیلیپی برام (پلۆ) له
سەرچنارین: له ڕاستەوە تیمەی برامان، مناڵەكە برای جولێت خانە، ئینجا ماری
خوشكمان باوكم دانیشتووە لەگەڵ فیلیپ. له دواوەش وەردییەی خوشكی
بچووكمانە

هەروەها لەو پشووی بەهارەدا، مامۆستا (مونیر الوکیل)، کە خاڵی کاک ولیەم بوو، ئەویش مۆسیقاژەنێکی چاک بوو، دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا، ئەویش هاتبووە سلێمانی... ئیتر هەموو شەوێک دادەنیشتین: یان لە سەرچنار، لە ماڵی فیلیپ یاخود لە ماڵی کاک ولیەم لە سلێمانی و هەرسێکمان پێکەوە تیپێکی بچکۆلەمان پێک دەهێنا و بۆ خۆمان و خێزانەکان و منالەکان و جیرانیش دەهاتنە میوانی ئەو ماوەی لێی دەبووین و مۆسیقای گۆرانی کوردی و عەرەبی... تا درەنگی شەو... پێمان رادەبوارد.

ئەمەش وێنەیەکی تری ئەو سەفەرەمانە بۆ سلێمانی و سەرچنار، بەبۆنەی پشووی نیوەی ساڵی ١٩٥٩ ئەوا هەموومان لە هەیوانەکەی ماڵی (پلۆ= فیلیپ) دانیشتووین:- با لە چەپەوە دەست پێ بکەم: یەکەم کچ وەردییەیە (خوشکی بچووکمان)، باوکم لە تەنیشتیەوە دانیشتووە و جوولێت خانی هاوسەری برام داهاتووتەوە و قسە لەگەڵ باوکم و ماری دەکات- ماری وا لە تەنیشت باوکمانەوە دانیشتووە- دایکیشم لەولاوە وەستاوە و ئازادی کوڕی نۆبەرەی جولیت و فیلیپ لە باوەشیەتی.

خۆزگەم بەو ڕۆژانە کە من زگورتی بووم و هەموو هەوڵ و زەوقم لەگەڵ مۆسیقا و مۆسیقاژەنان و گۆرانیبێژان بەسەر دەبرد و لەگەڵ خێزانەکەم: باوک و دایک و ئەوانی تر، بەئەوپەڕی خۆشی و هەستم بەکامەرانی دەکرد. خۆشترین کاتم ئەو کاتە بوو لەگەڵ ئەو برادەرە هونەرمەند و خۆشخوانانە دانیشم و گوێیان لێ ڕاگرم و زیاتر فێربم و بچمە ناو قووڵاییی هونەری ڕەسەنی ئاواز و ستران: مەقام و بەستەی جوان و فۆلکۆری و نوێ!

لە هەمان ئەم عوتلەیەدا، وا ڕێکەوت کە یانەی هەڵەبجەی فەرمانبەران، بەبۆنەی پشووی نیوەی ساڵ... ساڵی ١٩٥٩، بەتایبەتی بۆ مامۆستایانی قوتابخانەکان... ئاهەنگێکیان ڕێکخست و و شانۆگەرییەکیان ئامادە کردبوو کە لە نووسینی هونەرمەندی شانۆی عێراقی بەناوبانگ (یوسف العاني)بوو بەناوی (تۆمر بێگ= واتا ئەمرەکەی

بەگم) بەڵام کردبوویانە کوردی، وەک ئەوەی ئێمەش لە کۆیە، هەمان چیرۆکمان لەسەر شانۆ پێشکێش کردبوو ساڵی پار (١٩٥٨) و لە گۆڕینی (ترجمە)ی مامۆستا کەریم شارەزا بوو. من (بەگ) بووم- سابیر عەبدوڵلاش عارەبانچی و خزمەتکاری بەگ بوو... هەروەها (ماری) خوشکم، دەوری (کچی بەگ)ی بینی. جا لە هەڵەبجە مامۆستای ئەکتەر و هونەری شانۆ: کاک غەفوور یەحیا ئەو ڕۆڵەی دەبینی... جا بۆ زیاتر خۆشکردنی ئاهەنگەکەیان، تیپی مۆسیقای مەولەوییان دەعوەت کرد ئەوە بوو کە منیش لەوێ بووم، منیشیان دەعوەت کرد. ئیتر هەموو ڕۆژێ- پێم وایە بۆ سێ ڕۆژ بوو- ترومبێلێک کاک قادر دیلان و ولیەم و من (باکووری) و شەوکەت ڕەشیدیش لە سلێمانی بوو، و عوسمان سابوونچی و بەهجەت ڕەشید، دەهات و دوای نیوەڕۆ بەرێ دەکەوتین بۆ هەڵەبجە- لەوێ دوای شانۆگەرییەکە، مووەزەفەکان دەهاتنە نادی و ئیتر دەستمان دەکرد بەپێشکێشکردنی ئاهەنگ و گۆرانی: من و عوسمان سابوونچی و شەوکەت ڕەشید و ڕەفیق چالاک کە وابزانم دەوری هەبوو لە شانۆیەکە... چونکە ئێمە نەدەچووینە هۆڵەکە و نازانین کێ و کێ... ئەکتەرەکان بوون بەڵام دڵنیام ڕەفیق چالاک لەگەڵیان بوو و ڕەنگە ڕۆڵی (بەگ)ەکەشی وەرگرتبوو! هەروەها کاک ئیبراهیم خەیاتی هونەرمەند، ئەویش دیاربوو هەر لە هەڵەبجە دەمایەوە ئەو شەوانە، و بەشداری دەکرد بەگوتنی گۆرانییە خۆشەکەی (ست فاتیمە)- دوای تەواوبوونی بەزمەکە، ئینجا دەگەڕاینەوە سلێمانی و بێ خەم و خەفەت، بێ ترس، هەر بەگۆرانی گوتن و نوکتە و قسە خۆشەکانی ولیەم و بەهجەت و قادر دیلان... تا دەگەیشتینەوە سلێمانی! ئەو جۆرە ڕابواردنەم کە بەهۆی ئەرکی خزمەتکردنی هونەری مۆسیقاوە... تامم دەکرد، ئەم جۆرە ژیانە... لەگەڵ ئەو هاورێ هونەرمەندانە...ئەوپەڕی ئاواتم بوو!

که پشووی بەهار (العطلة الربيعية)- واتا عوتلەی نیوەی ساڵی قوتابخانەکان نزیک تەواو بوون بوو، فیلیپی برام بە ترومبێلەکەی خۆی، کە جۆری (هیلمەن hillman)ی مۆدێلی پەنجاکان بوو، کڕیبووی، ئێمەی گەڕاندەوە کۆیە- هەر بەرێگەکەی دوکان- خەلەکان- چنارۆک- کۆیە- شەو لە لامان مایەوە و بۆ بەیانی کۆمەڵێک ئامۆزا و خزم لە ئافرەت و مناڵ کە پێشتر هاتبوونە کۆیە، لە لای خزمانیان، کاک فیلیپ هەموویانی هەڵگرت و ئەمجارە بۆ کەرکووک بەرێ کەوتن، چونکە ئەو خزمانەمان هەموویان لە کەرکووکەوە هاتبوون- ئەو یەک دوو ڕۆژەی کە ما مابوو بۆ دەست پێکردنەوەی دەوام، لەگەڵ مامۆستاکانی خۆمان ڕامان دەبوارد بە پیاسە بۆ لای حەمامۆک یا پردەکەی ڕووباری

وێنەیەکی ئەو سەفەرەمان کە ڕۆژانە دەچووینە هەڵەبجە و بەشەو دەگەڕاینەوە، لەسەر ڕێگە گۆماو و جۆگە و گۆڵی ئاو زۆر بوون، زستانی ئەو ساڵ بە بەفر و باران بوو. لەسەر ئاوێک ئەو وێنەیەمان گرت: لە چەپەوە یەکەم: قادر دیلان، دووەم: شەوکەت ڕەشید، سێیەم: من- باکووری، چوارەم عوسمان سابوونچی، پێنجەم- دواکەس لەو سەرەوە: ولیەم یۆحەننایە- شوباتی ١٩٥٩

لە هەمان بۆنە و هەمان شوێن و کات لەسەر ڕێگەی سلێمانی- هەڵەبجە من لە ڕاستەوە وەستاوم، ولیەم لە بەرامبەرم دایە. شوباتی ساڵی ١٩٥٩

هەمان سەفەر و شوێن و زەمانەن، عوتلەی شوباتی ساڵی ١٩٥٩ لەسەر ڕێگەی
نێوان سلێمانی و هەڵەبجە، بۆمان گیراوە لە چەپەوە بۆ دواوە: ١- باکووری ٢-
شەوکەت ڕەشید ٣- بەهجەت ڕەشید ٤- ولیەم یۆحەننا ٥- عوسمان سابوونچی

گەرمۆک و دەروێش خدر و ئۆمەر خوچان! مامۆستا سەلاح سەعدی ئاغاش، ئەمساڵی دیراسی (خوێندن) لە کۆیە تەعین بوو بەمامۆستای زمانی ئینگلیزی- جا بۆ (متوسطة) دوو مامۆستا زیاد بوون- یەکێک- کە هەر من بەتەنیا بووم، چەند ساڵ بوو هەر سێ قۆناغی (یەک و دوو و سێ)یەمم وەرگرتبوون و هەموو وانەکانی ئینگلیزیم دەدایەوە، هێشتا چەند موحازەرەیەکی (رسم) و بابەتێکی دیکەشم وەرگرتبوو، لە بیرم نەماوە چی بوو! جا بەهاتنی کاک سەلاح یەکمان زیاد بووین! قوتابیان بووبوون بەدوو بەشەوە: زۆرینەکەیان و مامۆستاکانیش لە لای مانەوەی من بوون... چونکە خزمەتێکی زۆری بزاقی هونەریم دەکرد و ئەگەر من بڕۆیشتبام... تیپەکە و کۆمەڵەکە، بێ ساحێب دەمان و ڕەنگە هەڵدەوەشانەوە! لایەنگیری مانەوەی من زیاتر بوون لەوانە کاک سەلاح، هەزار سڵاو لە گیانی پاک و ڕەوشتی جوانی بێ! ئێمە... من و کاک سەلاح، تەقەی سەرمان دەهات! پێدەکەنین! کاک سەلاح مافی خۆی بوو... منیش مافی خۆم بوو داوا بکەین بمێنینەوە! ئەو ماڵی باوکی لە کۆیە بوون! منیش هەروەتر.. بەلام من جگە لەو لایەنە، لایەنەکەی ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی هەستی هونەری و مۆسیقا و... تاد. ئێمە، لەگەڵ سەلاح و مەجید سێگردکانی و عەبدولڕەحمان سەید عەلی و خالید عومەر و کاک سدیق

له دەم ڕووبارەکەی ژێر پردەکە، هەمان مامۆستاکانین وەستاوین لە زستانی ساڵی١٩٥٩

لەسەر پردە کۆنەکەی ناو (ڕەزان)ی کۆیە:
لە چەپەوە: باکووری، خالید عومەر،
عبدولرەزاق عانی و سەلاح

عەبدولقادر... پیاسەی خۆمان دەکرد و کارەکەمان بەجێ هێشتبوو بۆ لێپرسراوان و ئیدارە و معارف. ئەوەبوو دوایی داوا کرا کە بەشی ئامادەیی (اعدادي) بکرێتەوە لە شارەکە و ڕەزامەندی جێبەجێ بوو... ئیتر گوتیان: بابە هەردووکتان دەمێننەوە!! خەبەرێکی خۆش بوو بۆ هەموو لایەک!

هەندێ جار، پیاو شتی سەیر و سەمەرە دەبینێ یا گوێی لێ دەبێ، یا دەیخوێنێ... جا لەوانە خۆی لەگەڵ خۆیدا، پێکەنینی بێت و پێبکەنێ! فەرموو ئەو (کتابە ڕەسمییە) لێرە نیشان دەدەم... من کە نوسخەم بۆ هات، زۆر قەشمەریم بەو وەزعە دەکرد و پێدەکەنیم! ئاخر (شۆڕش)ێکی گەورە لەو عێراقە هەڵگیرسا و تەخت و تاجی پاشا و حوکمی پاشایەتی وەرگێڕا و مەلیک و سەرتاپای ئەندامی خێزانی، لە باخچەی کۆشکی پاشایەتی... لە بەغدا، گوللەباران کران، گوایە ئەوانە هەر بۆ بەرژەوەندی خۆیان حوکمیان دەکرد و مافی میللەت، بەتایبەتی کورد، خورابوو! بەڵێ وایان دەگوت! عەبدولسەلام عارف سواری هەلیکۆپتەر دەبوو و لە شارێک... یا شارۆچکەیەک دادەبەزی و دەستی بەقسەی حەلەق و بەلەق و مەلەق دەکرد وەک «حكومة ديموقراطية شعبية عربية كوردية قومية اشتراكية... من هذا اليوم بعد ماكو حراميه... لا آغا لا ملك لا قصور... حكم الشعب للشعب...» کەچی، لەو کتابە ڕەسمییەدا، یەک لە گرینگترین مافەکانی گەلی

کورد، دانی پێدا نەنراوە و هەمان بڕیارەکەی پێشووی... پاشایەتی جێبەجێ کراوە... کە (پاشامان) نزیکی ١٠ دە مانگە لە ژێر خۆڵە ڕ بەدەستی ئەو شۆڕشچییانە کوژراوە و حکوومەتی نەماوە، بەڵام دیارە قانوونەکەی هێشتا ماوە. دەفەرموو، گوایە منەتیان لەسەر(کورد) کردووە و مۆڵەتیان داوە جەژنی ئادار... جەژنی نەورۆز بکەن، بەڵام نەک بەناوی جەژنی نەورۆز بەڵکو بەناوی (عید الشجرة) واتا جەژنی درەخت- لە ٢١ی ئاداریش کە جەژنی گەورەی کوردە! ئەم بڕیارە لەمێژ بوو لە بڕیارە پیسەکانی ڕژێم و حکوومەتەکانی پێشتر هەبوو... ئەگەر چی، کورد، لە هەموو شارەکان، بۆ خۆیان جەژنی خۆیان دەکرد و لە ڕقی حکوومەت، دنیا دەبووە ئاگر! لە هەموو لایەک ئاگر دەکرایەوە!

خەنی لە خۆتان، دار و درەخت، وا جەژنتان بۆ دەکەین... لە ٢١ی مارت (ئادار) کە جەژنی نەورۆزە و جەژنی کوردە و جەژنی کوردستانە، نەک جەژنی ئێوە (دار و درەختەکان!) بەڵام با بۆ ئێوە بێ، جارێ، لێتان پیرۆز بێ و موبارەک بێ! ئێوەش هەر درەختەکانی خۆمانن!!

قائمقامية قضاء كويسنجق — البلدية —

الجمهورية العراقية

العدد /
التاريخ / ١٤/ ٣/ ٠٧[illegible]

امـر اداري

الموضوع/ عيد الشجرة

لقد تقرر قيام الاحتفال بعيد الشجرة في قصبة كويسنجق في يوم ٢١ آذار سنة ١٩٥[illegible] في المتنزه العام عليه تقرر تشكيل لجنة من السادة المدونة اسماءهم ادناه :

١ـ المقدم احمد محي الدين ضابط تجنيد رئيسا :
٢ـ السيد صديق عبد القادر مدير متوسطة عضوا :
٣ـ " اندراوس خسرو مدرس " "
٤ـ " صابر اسماعيل مدير ثانوية "
٥ـ " كريم مصطفى معلم أولى "

عبد الوهاب فيضي [illegible]
قائمقام قضاء كويسنجق

صورة منه الى :ـ

كافة الاعضاء / يرجى حضوركم في ديوان هذه القائمقامية في صباح يوم الاثنين المصادف ١٦/ ٣/ ١٩[illegible] للتداول في الموضوع .
- رئاسة بلدية كويسنجق ـ يرجى تعيين مناطق التشجير في البلدة وتهيئة كلما يتطلب لغرض التشجير و تعيين عشرة عمال اعتبارا [illegible] .
- معاونية شرطة القضاء ـ للعلم واتخاذ التدابير اللازمة في يوم الاحتفال .
- كافة الدوائر [illegible] .
- ادارات مدارس القضاء ـ لاجراء مايلزم حول اشتراك المدارس في يوم الاحتفال المذكور .
- رئيس شعبة الغابات في اربيل ـ يرجى ملاحظة برقيتنا [illegible] في [illegible] / ٤/ ١٩٥[illegible] .
متصرفية لواء اربيل ـ الادارة المحلية ـ للتفضل بالعلم .

نور الدين

## دەعوەتەكانی یەكی ئایاری سەلاح سەعدی ئاغای كۆیە

كە هەواڵی مانەوەی مامۆستا سەلاح سەعدی ئاغا لە قوتابخانەی ناوەندی كۆیە وەك مامۆستای ئینگلیزی چەسپا، سەعدی ئاغای باوكی وەعدی دا دەعوەتێكی گەورەمان بكات لە دەشتی بتوێن، ئەو دیوی هەیبە سوڵتان، لەسەر ڕووباری قەسرۆكێ، لە ڕۆژی جەژنی كرێكاران، واتا ١/٥. ئەوە بوو پێشتر، چووبووە ئەوێ، یان خەبەری ناردبوو...، ڕەشماڵێكی گەورە هەڵدرابوو، ڕایەخ و مافووری تێدا ڕاخرابوون لە چواردەوری- مامۆستا جەلال شەریفیش كە لە هەولێر موفەتیش بوو، ئاگادار كرابوو... ئەویش هات و عەسری ڕۆژی ١٩٥٩/٤/٣٠ بەیەك دوو جێب یان لاندرۆڤەر بوو، بەڕێ كەوتین بۆ شوێنەكە! شوێنێكی زۆر دڵگیر بوو، لە دەشتێكی تا چاو دەبینێ، سەوزایی گیا و ڕازاوە بەگوڵەنیسان... دیار بوو... لە خوار ئێمەش، ڕووبارێكی گەورە ئاوی دەخزی و دەڕۆیشت بە ناو ئەو دەشتەدا... ئاوێكی ساردی ساف و سازگاری پێدا دەڕژایە ئەو ناوە ڕەنگینە. ئیتر دابەزین و چای حازر بوو، سەماوەر گیڤەی دەهات سێ چوار پیاو و شوان بەرخیان سەر بڕیەوە و ئاگر كرایەوە و ئێمەش لە ژێر ڕەشماڵەكە بەئیسراحەت «پاشاكی» واتا پاشایانە، هەریەك بۆ خۆی شوێنێكی هەڵبژارد و دانیشتین، وەك لەم وێنەیە دیارین:

لە ڕاستەوە و لە هەرە پێشەوە کاک بەکر سەعدی و سەلاح سەعدی برای، ئینجا مامۆستا خالید عومەر، عەبدوڵڵا کاکە، مامۆستا سدیق عەبدولقادر، جەمال غەفوور، باکووری، مەجید عەبدولقادر سێگردکانی- شەوی ٣٠/٤ لەسەر ١٩٥٩/٥/١ دەشتی بتوێن.

لە پشووی هاوینی قوتابخانان، دیسان چووینە سلێمانی، هەموومان... لە ماڵی کاک ولیەم و فیلیپی برام... و لەگەڵ هاوڕێیانی تیپی مۆسیقای مەولەوی... بەڕاستی ڕابواردنی هونەری تامی تایبەتی خۆی هەیە لە سلێمانی دا، لە مانگی حوزەیران، بۆ یەکەم جار یانەی مامۆستایان دامەزرا! تا ئەو کاتە هەر یەک یانە هەبوو بۆ مووەزەف و مامۆستا و هەموو کادیرانی دائیرەکانی حکوومەت - چونکە تاکو پێش شۆڕشی ١٩٥٨ ماوە و مۆڵەت نەدەدرا بەکردنەوەی یانەی تایبەت بۆ هەر پیشەیەک... و هەروەها سەندیکا و نیقابات ئیجازەیان پێ نەدەدرا! بەلام دوای ١٤ی تەمووز، لە هەر شارێک، هەر

لە کاتی وەستانێک لە ڕێگەمان بۆ دەشتی بتوێن، بۆ ئیسراحەت. لە ڕاستەوە: مامۆستا جەلال شەریف، ئەوی دواوەیم نەناسی، ئینجا منم لە تەنیشت مامۆستا جەلال، لە دواوەم، مامۆستا جەمال غەفووره بەعەینەکەوەیە، لە تەنیشتم مامۆستا سدیق عەبدولقادرە، ئینجا مامۆستای وەرزش، حازم ئەحمەد مووسڵاوی بوو، ئاخیرەکەی عەبدولڕەحمان تاهیرە، کاتبی ناوەندی بوو- لە دواوەش لەسەر سەقفی سەیارەکە ئیسماعیلی فەراشی مەکتەبمانە. ئەم وێنە جوانانەش هەموو، مامۆستا مووسڵاوییەک، حازم ئەحمەد بۆی دەگرتین... کامێرایەکی زۆر چاکی هەبوو و هیوایەنیشی وێنەگرتن بوو

هەر هەمان سەیرانەکەی دەشتی بتوێنە، وا لە ناو ڕووبارەکەی قەسرۆک، کە نزیکی بووین، دەموچاومان دەشۆین بەیانییەکەی ١٩٥٩/٥/١. لە ڕاستەوە: حازم خاوەنی کامێراکەیە و من و ئیسماعیلی فەڕاش و عبدولڕەحمان تاهیری کاتب

سەیرانەکەی دەشتی بتوێن، ڕۆژی ١٩٥٩/٥/١ وا لەسەر ڕۆخ ئاوی ڕووبارەکەی قەسرۆک وەستاوین: لە ڕاستەوە: مامۆستا سدیق عبدولقادر- تاهیر عبدولڕەحمان (کاتب)، مەجید سێگردکانی- مامۆستا جەلال شەریف- باکووری- عەبدوڵلا کاکە. دانیشتووەکان: کاک حازم مووسڵاوی مامۆستای وەرزش و وێنەگرەکەمان - ئەوەی تر ناناسم

گرووپێک و کۆمەڵێک مافیان پێ درا بۆ خۆیان یانە و سەندیکا و... تاد، دابمەزرێنن. بەم پێیەش، مامۆستایانی سلێمانی داوایان کردبوو کە یانەی تایبەتی خۆیان هەبێ. جا ئەوە بوو مۆڵەتیان پێ درابوو دەستەی بەڕێوەبردنی یانەش هەڵبژێردرا. یەکەم چالاکی، بەم بۆنەیەوە، شەوێکی پێنجشەممە، لە باخچەی یانەکەیان ئاهەنگێکی مۆسیقا و گۆرانی خۆش سازدرا و منیش بەشداریم کرد و هەروەها هونەرمەند کاک جەمال جەلال بەسەردان هاتبووە سلێمانی، چەند گۆرانییەکی خۆشی خۆی گوت لەگەڵ تیپی مۆسیقای مەولەوی، بەڵام بەناوی تیپی مۆسیقای نیقابەی مامۆستایان ئیعلان دەکرا، لەبەرئەوەی لە تیپەکەدا مامۆستا هەبوو، وەک کاک ولیەم کە خۆی مامۆستای قوتابخانە بوو...

ژین زمارە ١٤٥٦

آهەنگی کردنەوەی یانەی ماموستایان

لەهەفتەی پیشودا بو یەکەم
جار لە سـایەی جمهوریەتدا
لەسلیمانی ماموستایان یانەیەکیان
بوخویان دامەزراند وە کومەلیکی
بەریوەبەریان هەلبژارد لەناو
خویاندا وە روژی پینج شەمە
بە ئاهەنگیکی رازاوە یانەکەیان
کردەوە وە ئەوشەوە لەو ئاهەنگەدا
زوربەی ماموستایان هاتبون
وە گەلی میوانیشیان لەگەل
کردبو . وە لەو ئاهەنگەدا
تیپی موسیقای نقابەی مامو-
ستایان لەگەل هونەرمەندان
«[illegible] کوری» و «جمال جلال»
وە چەند ماموستایەکی دەنگ
خوش ئاهەنگەکەیان بە گورانی
وە موسیقا هینابوە جوش وە لەناو
باخچەی یانەکەدا ماموستایان
و میوانەکانیان هەتا نیوە شەویکی
درەنگ رایان بوارد وە لەناوە
راستی ئاهەنگەدا ماموستایەک
لەبرا میصریەکانمان چەند
قسەیەکی بوپیکەوتن پیش کەش
کرد کە زور پرمانابو وە دوای
رابواردنیکی کاتیکی خـوش
ئاهەنگەکە دوای پی هیبرا
وە وەکو زانراوە بەشداربوو
لەو یانەیەدا بو هەمو ماموستاکان
پیویستە وە بو هەمو کەسیکیش
هەیە کە داوا بکات بەشداربیت.

جا ڕۆژنامەی (ژین)ی نازدار و خۆشەویست، لە ژمارەی ١٤٥٦یدا لە ڕۆژی دووشەممەی ڕێکەوتی ١٩٥٩/٦/٢٩ ئەم ڕاپۆرتەی لە بابەت ئاهەنگەکە بڵاوکردەوە، وا منیش لەگەڵ ئەم بیرەوەرییەمدا دووبارە بڵاوی دەکەمەوە

هونەرمەند جەمال جەلال لە بەغداوە بۆ سەردانی خزمان و برادەران هاتبووە سلێمانی و مامۆستاکان بەدەرفەتیان زانی ئەویش دەعوەت بکەن بۆ ئاهەنگی یانەکەیان... ئەوەبوو هات و بەشدارییەکی جوانی کرد بەگۆرانییەکی سووک و ئاوازە ڕەسەن و خۆشەکانی خۆی- ئەودی سەرەوەش وێنەی لایەنێکی ئاهەنگەکەیە کە مامۆستا جەمال جەلال لەگەڵ تیپی مۆسیقای مەولەوی، بەناوی تیپی مۆسیقای نیقابەی مامۆستایان، بەرهەمەکانی پێشکێش دەکات. لە مۆسیقاژەنەکانی کەوا دیارن، لە ڕاستەوە: کاک حاتەم سەعید- ئیقاع (رزم) بەتەپڵ و جاز دەژەنێ، کاک هادی عەنبەر عوود دەژەنێ، کاک قادر دیلان کەمان لێ دەدا.

هاوینەکە لەگەڵ تیپی باواجی هەر بەردەوام بووین لە ڕاهێنان و چالاکیی هونەری جۆراوجۆر... ئینجا ڕۆژێ، سوهام خەبەری دامێ، وابزانم بەتەلەفۆن بوو کە فلان ڕۆژ، ژن بۆ برای دەگوازنەوە و ئێمەش دەعوەت کراوین دەبێ بچین. باشە. لە پێش ڕۆژی گواستنەوە، پێم وایە من و ماری خوشکم چووینە مووسڵ- شەوی ئاهەنگەکە چووینە شوێنەکە تیمەی براشم هاتبوو- شەوەکەی خۆش بوو من هەندێ گۆرانیم بە عوود بۆ گوتن.

دوای ئاهەنگی (فاضل)ی برای سوهام، من و ماری گەڕاینەوە کۆیە- ئیتر دیسان لە شارە خۆشەویستەکەم، خەریکی هونەر و گۆرانی و لەگەڵ تیپی مۆسیقاکەمان مەشغوول

وەکو لە وێنەکە دیارە من بە عوودەوە و سێ لە خوشکەکانی سوهام... وەک کۆرس یارمەتیم دەدەن و گۆرانی بە عەرەبی دەڵێین لە ئاهەنگی ژنگواستنەوە بۆ فازڵی برای سوهام، لە یانەی کۆمەڵایەتی، لە مووسڵ هاوینی ساڵی ١٩٥٩

دەبووم... لەبەرئەوە هاوین بوو... قوتابخانە دەرگای داخرا بوو، داوام لێ دەکردن بێنە ماڵەوەمان... لە نزیک ماڵی قایمقام یان چاکتر هەر لە تەنیشت ماڵین بووین، دیوارێکمان لە بەیندا بوو! جا لە ژوورەکەی خۆم پرۆڤەمان دەکرد.

لە گەڕانەوەمان لە مووسڵەوە، من و ماری لە هەولێر ترومبێلمان گرت بۆ کۆیە...و لەبەرئەوەش ئەوسا هێشتا ڕێگەکە قیر نەکرابوو، خواروخێچ، پڕ کەندو و کۆسپ و سەرکەوتن و دابەزین و خۆڵ و گاشەبەرد و تاسەر جۆگەو... تاد، بۆیە ترومبێل لەسەرەخۆ دەڕۆیشت و شوفێر نەیدەتوانی خیرا لێخوڕێ، هەر بۆیەش دەبوایە لە نیوەی ڕێگەکە، کە گوندی (دێگەڵە)یە، لەوێ چایخانە هەبوو، ترومبێل لێی دەوەستان و نەفەرەکان دادەبەزین و نوێژیان دەکرد، ئەگەر کاتی نوێژبایە، و چا و ئاوی ساردیان دەخواردەوە... ئینجا دیسان بەڕێ دەکەوتن. ئەم وێنەیەی سەرەوە... لە (دێگەڵە)مان گرت، مانگی ئەیلوول کە گەڕاینەوە لە مووسڵەوە، لە دوای ئاهەنگی گواستنەوەی بووک (ناری فائزە) بوو، بۆ کاک فازیل!

لەگەڵ خزمان و برادەران، لە کۆیە دیسان، سەیران و دانیشتن بۆ بەزمی گۆرانی و مۆسیقا و خۆشخوانی، بەردەوام بوون، لەگەڵ مامە سێوە... لە باغەکانی حەمامۆک و

گەڕانەوەمان لە مووسڵەوە بۆ کۆیە. لە دێگەڵە لە چایخانەکەدا لە کاتی ئیسراحەتکردن، ئەم وێنەمان گرت. هاوینی ١٩٥٩

ئۆمەر خوچان و لە ڕەزی ماڵی کاک دڵزار و شارەزا... و شاخی مشکە... تاد.

لە پایزی ئەمساڵ، ١٩٥٩، زەعیم عەبدولکەریم قاسم، ڕۆژێک، لە کاتی چوونی بۆ وەزارەت، لە نزیک ناوچەی (شورجە) کەوتە بۆسەیەک، بەعسییە پیسەکانی وەک سەدامی خێڕوو بێ ڕەوشت و ئەیاد سەعید سابت و خوشکی (يسرا سعيد ثابت)و بەفیتی تۆرە دڕندەکەیان، هێرش بەکلاشینکۆف کرایە سەر ترومبێلەکەی زەعیم و بریندار بوو لەگەڵ سکرتێرەکەی... بەڵام خەڵکی شەقام زوو گەیاندیانە نزیکترین نەخۆشخانە... ماوەیەک... مانگێک دەبوو، عیلاج کرا و چاک بووەوە و لە هەموو شارەکانی عێراق ئاهەنگی (سەلامەتی) بۆ کرا. لە کۆیەش، لە حەوشی سەرای کۆن، کە کرابووە (قوتابخانەی باواجی سەرەتایی)، ئاهەنگێکی گەورەی بۆ کرا و وتار و شیعر خوێندرانەوە، تیپی باواجیش چەند سروودێکی پێشکێش کرد. لەم وێنەی لێرەدایە، من بە کەمان و یووسفی برام بە ئەکوردیۆن و نەشئەت حەمید بە تەپڵ ئیقاعەکەی دەگرت، ئەو سروود و گۆرانییانەمان عەرز کرد.

لە مێژووی: ١٩٥٩/١٢/٥دا. جا لە هەموو ساڵێک ئەو جەژنەی خۆشی بەبۆنەی سەلامەتی زەعیم دەکرا و بەرەسمی بووە (عطلە) و ناوی لێنرا (عيدالسلامة والابتهاج) تا ساڵی ١٩٦٣.

## ساڵی ١٩٦٠

من حەزم دەکرد لە کۆیە بمێنم و پەرە بەئیش و کارەکانم و هونەرەکەم بدەم...! ئاخر من ناتوانم لە هەولێر بژیم! ژیان زۆر سادەترە، بزووتنەوەی هونەری مۆسیقا لەوێ زۆر لاوازە و هەر نییە! بەڵام، کە بیرم دەکردەوە. لە لایکی ترەوەش، وەزعی سیاسیی عێراق و ئیدارەکردنی میللەتەکە لە لایەن حکوومەتی عەبدولکەریم... فەوزای کەوتبووە ناویەوە! سیاسەتەکەی مشەوەش بوو!

لایەنی بزووتنەوەی دیموکراسی بەردا بوو! ئەندامانی حزبە دڵساف و دڵپاکەکان دەگیران، بەعسی و شۆڤینی و دڕندە بەرەڵلا دەکران! دوو جۆر مەحکەمە هەبوو! یەکیان پیاوخراپ و (متآمرە)کانیان مەحکووم دەکرد و حەپسیان دەکردن، ئەوەی تر مەحکەمەی (عورفی عەسکەری دووەم) لە کەرکووک، هەرچی، هەر بەناویش، لەگەڵ زەعیم بوایە، دڵسۆز بوایە بۆ حوکم و بۆ دیموکراسی، ئەوانە دەگیران و حەپس دەکران! ئەوانی دژی عەبدولکەریم بوون، بەئاشکراش، نەک بە دزی و لە ژێرەوە، ئەوانە دەستیان کرابووەوە، و خەڵکی بێ دەخل، یان ئەوەی ڕژێمی عەبدولکەریمی خۆشویستبا، وەک فیلیپی برام، بۆ نموونە، دەیانگرتن و تەعزیب دەکران و ئینجا دەیانناردن بۆ حەپسخانەکانی(رمادی) و (نوگرەت سەلمان). واتە ئیشاعات هەبوو کە ڕەنگە کۆیە، و شوێنانی تر تووشی وەزعی ناخۆش بن! لە نێوان عەبدولکەریم و بزووتنەوەی کوردایەتی ئەو پێوەندییە دڵسۆزییە گەرمەی جارانی نەما بوو!

من ئیقناع کرام کە بیر بکەمەوە خۆم نەقلی هەولێر بکەم! بەڵام دوام خست و جارێ کۆیە هەر خۆش بوو و خۆشم ڕادەبوارد.

لە سەیران کردندا هەر بەردەوام بووین لەگەڵ ماڵە دۆستەکان وەک ماڵی ئارتین و عەبدولقادر و جوزێف و ... تاد.

لەو بەهارەی ساڵی ١٩٦٠ وەرزەکەی خۆش بوو، کەشوهەوای ساردبوو... هەتاو گەرم نەبوو... وەرزی سەیران و سەیرانکەران درێژتر بوو تیپی باواجی چەندین ئاهەنگی بۆ (منظمات)ەکان گێڕا، بە بێ فەرق و جیاوازی - چونکە لەو ماوەیەی ساڵی پار و

ئەوا من و عبدولقادر باوکی نەجوا، لە پێشەوە دەڕۆین بەقسە و گفتوگۆ و نوکتە و قسەکانی ئەو پیاوە، کە عەرەبی سووری قسەی دەکرد زۆرم پێخۆش بوو! لە دواوەمان خێزانی ئەو و منالەکانی و دایکم و خوشکانم، بەپێیان، بەرەو باخچەکانی (هەرمۆتە) دەڕۆین بۆ سەیران، لە مانگی شوباتی سالی ١٩٦٠
لەگەڵ (نەجوا جوانەکەشم) بەردەوام جێی ژوانمان ڕێک دەخست!!

بەهاری ١٩٦٠ ژمارەیەک مووزەف و مامۆستا و ئەفسەر، لە خوار یانەی (فەرمانبەرانی کۆیە) وەستاوین، لەسەر ڕێی کۆیە و هەولێر کە لە تەنیشتمانەوەیە، و تازە خەریکی ڕێکخستن و قیرکردنی بوون- ئەم شوێنە ئێستا پڕبووە لە خانوو و پێی دەڵێن: گەڕەکی (ئیسکان) کەسەکان لەو وێنەدا لە ڕاستەوە: ١- باکووری ٢- (مقدم) ئەحمەد محیەدین ٣- سدیق عەبدولقادر. ٤- مەلا فەتاحی (بلدییە) ٥- سەلاح سەعدی ٦- حەمەعەلی شێخ نووری

ئەمساڵ، واتە (لە ١٩٥٩ و ١٩٦٠) دا، جۆرە ناکۆکییەک پەیدابوو لە نێوان هەردوو حزبە سەرەکییەکانی کۆیە: پارتی و شیوعی- من لە سەرەتاوە بەقوتابییە مۆسیقاژەنەکانی تیپەکەم گوت: ئێمە تیپێکی حزبی نین و سەر بەهیچ حزبێک نین! خۆتان وا نیشان نەدەن وەک ئەوەی ئێوە لایەنگری حزبێک بن. بۆیە، کە حزبی پارتی ئاهەنگی ڕێکخستبا بەهەر موناسەبەتێکی خۆیان، دوایان لێمان کردبایە، زۆر بە منوونییەتەوە دەچووین و ئاهەنگەکانمان بۆیان خۆش دەکرد. هەروەها ئەگەر حزبی شیوعیش بۆنە و موناسەباتی هەبوایە و دەعوەتیان کردباین، دەچووین! ئاوازە ڕەسەنەکانی ناوچەکە و تایبەتمەندی گۆرانییەکانی کۆیە و دەوروبەری، ئەمەش بۆ خزمەتی هونەری ئاوازی کوردی ڕەسەن بەگشتی بوو! ئەو قسانەم زۆرجار بەقوتابییەکانم دەگوت. جا... لەو ساڵانەی دوایی، ئەو ڕێرەوەمان پەیرەو کرد و بۆ هەر لایەک بوایە کە ئامانجی خزمەتی هونەر بوایە، بەشداریمان دەکرد.

لە مانگی مارت (ئادار)ی ئەو ساڵە... (١٩٦٠)، سوهام لە هەولێرەوە بۆ پشوودانەکانی نەورۆز... نەچووە مووسڵ، هاتە کۆیە و لە ماڵمان میوان بوو! بەتایبەتی وا ڕێک کەوت کە جەژنی (قیامە)ی مەسیحییەکانیش هەر لەگەڵ نەورۆز ڕێک کەوت، بۆیە چەند ڕۆژێک لە لامان مایەوە- ئەم سەردانەی کەمێک دڵمی زیاتر بۆ لای خۆی ڕاکێشا و چەندین سەیران و ئاهەنگ لە ماڵەوە، لەگەڵ دۆستان و خزمانمان کرد- یەک لەو گەشتانەمان لەگەڵ ماڵی مامۆستا سدیق عەبدولقادری بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان، لەدوای نەقل بوونی مامۆستا (شەفیق سابیر) و ماڵی عەبدولقادر القواص- سووری- باوکی نەجوا، بۆ دۆکان... و ڕۆژێکی تەواو و خۆشمان لەگەڵ دیمەنی سیحراوی ئەم سەددە و ئاوەکەی و لە بەلەمەکان سوار بووین و بەسەر ئاوەکە گۆرانیمان دەگوت... لەو چەند وێنەی لێرەدا دامناون، ئەو سەیرانە خۆشەمان نیشان دەدەن مانگی مارت ١٩٦٠/٣/٣٠

لەیەکەم ڕۆژی جەژنی (قیامە)ش کە لە مانگی نیسان بوو، لەگەڵ ماڵی (قواص) چەند سەیرانێکمان کرد، بەبۆنەی هاتنی سوهام بۆ کۆیە- ساڵی ١٩٦٠ ئەوەبوو یەک دووجار وێنەمان بە دووقۆڵی دەگرت!

کە لە مانگی مارت (ئادار)، نزیک جەژنی (نەورۆز) بووینەوە، لیژنەیەک پێک هێنرا لە مامۆستایان و گەنجانی کۆمەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکان، بۆ سازدانی ئاهەنگێک بە بۆنەی نەورۆزەوە و داوایان پێشکێش (حاکمی عەسکەری کرد و ئەویش ئیجازەی پێدان کە بەرەسمی ئاهەنگێکی گەورەی گشتی بۆ جەماوەری شاری بکرێ- ئەوە بوو هەر

من و سدیق بە جومبووشەوە و ماری و هاوسەری سدیق و سوهام... لەم وێنەی سەر بەلەم دیارن

ئەمە وێنەی ئەو لاندرۆڤەرەیە کە هەر سێ خێزانەکانمانی برد بۆ دۆکان

من و سوهامی میوانمان، لە نێو مێرگ و باخچەکانی هەرمۆتە، لە سەردانەکەی بۆ کۆیە و دابەزین لە ماڵمان لە جەژنی قیامەساڵی ١٩٦٠- ڕەنگە بڵێین کامەرانن!!

سوهام و ماری و یووسف بەحرەکەی دۆکانیش لە دواوەیان دیارە

سەیرانێکمان بۆ باخچەکانی هەرمۆتە، لە نیسانی ١٩٦٠بەبۆنەی جەژنی قیامە. لە ڕاستەوە ١- نەجوا ٢- سوهام ٣- باکووری ٤- باوکی نەجوا ٥- دایکی نەجوا. سەباح و سەمیرە لەسەر زەوی دانیشتوون.

صوت الاحرار عدد ٤١٧

## الاحتفال بعيد النوروز في كويسنجق

أجاز سيادة الحاكم العسكري العام اقيفا من شبيبة كويسنجق باقامة احتفال جماهيري احياء لذكرى كاوه وعيد النوروز المجيد. فأقيم الاحتفال في ساحة مدرسة باواجي الابتدائية من بعد ظهر يوم ٢١-٣-١٩٦٠. زين المسرح والساحة بالشعارات الوطنية بالمناسبة وصور سيادة الزعيم عبدالكريم قاسم. افتتح كريم شارەزا الاحتفال بكلمة موجزة حيا فيها الجماهير وهنأهم بالعيد السعيد، عيد نوروز المجيد. ثم قدمت اغنية نوروز والقى شاعر السلام عثمان عوني قصيدة بعنوان (تموز ونوروز) والقى السيد اكرم عبد القادر كلمة نوروز وقدمت فرقة الشبيبة عدة رقصات شعبية وقدمت فرقة باواجي الموسيقية قطعة موسيقية بعنوان (نوروز) من تأليف الاستاذ باكوري مع نشيد (نەوروز) من تأليف كريم شارەزا والقى ممثل نقابة العمال محمد حيدري كلمة والشاعرة فريشته رئيسة الرابطة قصيدة والشاعر مدحت بيخەو (قصيدة نوروز) وقدمت الفرقة التمثيلية لاتحاد الطلبة تمثيلية (كاوه الحداد) واختتم الاحتفال بالهتاف بحياة الجمهورية الديمقراطية ومؤسسها الزعيم عبد الكريم والاخوة العربية

لێرەدا، ڕاپۆرتێک لە بابەت ئەم ئاهەنگە، کە لە ڕۆژنامەی (صوت الاحرار) بڵاو کرایەوە، لە ژمارەی ٤١٧ی ڕۆژی ٤ی نیسانی ساڵی ١٩٦٠ دا منیش بۆ جاری دووەم نوسخەیەکی کۆپیکراو دادەنێم و بڵاوی دەکەمەوە

کەسە چی ئەرکێکی لەسەر شان بوو جێبەجێی دەکرد... شوێنەکە، ئەگەرچی شوێنی وا نەگونجاو بوو، بەڵام دەبوایە بە (قسەی) حاکم عەسکەری بکرێ-

***

کاک سەلاح سەعدی ئاغا، مامۆستای زمانی ئینگلیزی وەعدی پاری بەجێ هێنا و ئەمساڵیش هەموومانی دەعوت کرد بۆ سەیرانێکی شەو و ڕۆژێک لە دەشتی بتوێن- ئەوە بوو، ئێوارەی ڕۆژی ۳۰/٤/١٩٦٠، بەلاندرۆڤەرە حەیاتەکە، بەسەر چیای (هەیبە سوڵتان) هەڵگەڕاین، گەرچی ڕێگەکە زۆر ناخۆش و بەردەڵان بوو... تاسەی زۆر بوو... مەترسی زۆر بوو، بەڵام پیاو کە بەرەو خۆشی و سەیران لەگەڵ ئەحبابان بچێ، گوێ ناداتە شتی ناخۆش، چونکە لە دڵی خۆیدا دەڵێ: قەی ناکا، ئەو ناخۆشییە دوایی دێت و دەکەوینە خۆشی: ئەی نەگوتراوە: «إن مع العسر يسرا» ؟.

گەیشتینە هەمان دەشت و سەوزاییەکەی پار و گوڵ و گوڵزار لە هەموو لایەکەوە و ڕووبار و ئاوی خۆش و ساف و هەوای پاک و بێ گەرد کە هەموو نەخۆشییەک لادەبا، ڕەشماڵ هەڵدرابوو.!

ئەمجارە، لە جیاتی مامۆستا جەلال شەریف (موفەتیش) کە پار هاتبوو، ئەمساڵ بەڕێز مامۆستا (عیزەدین فەیزی) هات و بەخێرهاتنی گەرمان کرد. ئیتر وەک پار، بەرخ کوژرانەوە و تکە و گۆشتی برژاو و خواردنەوە دەستی پێ کرد و عوودی من و کەمانچەکەم دەنگی دەدایەوە لەو چۆڵە، بەتایبەتی بەشەوی خامۆش تەنیا جریوەی هەندێ باڵندەی دەنگخۆشمان گوێ لێ دەبوو، وەک بڵێی لاسایی ئامێرە مۆسیقایەکانیان دەدایەوە.

لە لایەکی ترەوەش، مێوانی خۆمان (سوهام) هەموو ڕۆژێک دەمانبردە سەیرانێک بۆ ئەو باغ و باخچانەی دەورەی کۆیە... ئێ واجیبە. دەبێ بکرێ! وێنەشمان پێکەوە دەگرت!

لە ڕۆژی هەینی، ڕێکەوتی ٥/٢/١٩٦٠، بۆ جاری سێیەم، لە تەمەنی کۆمەڵەی بووژانەوە...دا، دەستەیەکی تازەی بەڕێوەبردنی (کۆمەڵەی بووژانەوەی هونەرە جوانەکان لە کۆیە) هەڵبژێردرا، لە یانەکەی فەرمانبەراندا. جا لەبەرئەوەی من بڕیارم دابوو خۆم بگوازمەوە بۆ هەولێر و تا ماوەیەکیش لەوێ نیشتەجێ بم، بۆیە بەبرایانی کۆمەڵەم ڕاگەیاند کە ئەو نیازەم هەیە، بۆیە حەز ناکەم لە هیچ پۆستێکی ئیدارەی کۆمەڵە بمێنمەوە... من تەنیا لەگەڵ تیپەکە خەریک دەبم. برادەران، ئەوەیان قەبووڵ نەکرد... بۆیە، وەک ڕێزلێنانێک بۆ من کە ناوم هەر لە ناو دەستەی کۆمەڵەدا هەبێ، هەڵبژێردرام وەک نائیب (جێگری) سەرۆکی کۆمەڵە- ئەوەبوو داوای (نەقلم) کرد بۆ هەولێر و لە نزیک

سەیرانی دەشتی بتوێن، لە ڕاستەوە: مامۆستا عیزەدین فەیزی، مامۆستا فەتحوڵڵا... عبدولڕەحمان سەید علی، باکووری، محیەدین نافیز جەلال. دانیشتووەکان لە ڕاستەوە: سەلاح سەعدی ئاغا، سدیق سادق و حازم ئەحمەد (موصلاوی) ١٩٦٠/٥/١

میوانانی مامۆستا سەلاح سەعدی ئاغا دەشتی بتوێن، ئەمساڵ ١ی ئایار ١٩٦٠ لە ڕاستەوە: باکووری، سەلاح سەعدی، سدیق سادق (خۆی دەهەژێنێ)، عبدولڕەحمان سەید علی، کاک محیەدین نافیز جلال (کاتب) و مامۆستا مەجید عبدولقادری سێگردکانی

حازم ئەحمەد مامۆستای وەرزش، لە مووسڵەوە، تەعینی بۆ (متوسطە)ی کۆیە دەرچووبوو- مامۆستای وەرزش بوو. تابڵێی نەجیب و ڕووخۆش و گونجاو بوو لەگەڵ قوتابیان و مامۆستایان. هەمیشە کامێرای لەگەڵ خۆیدا دەسووڕاند. ئەم وێنانە هەموویان ئەو بۆی گرتووین لەم وێنەدا، کە لەسەر دەعوەتی کاک سەلاح سەعدی ئاغا شەو و ڕۆژێکمان لەم دەوروبەرە... لە دەشتی بتوێن، ڕابوارد- لەم وێنەدا، کەسەکان، لە ڕاستەوە: ١......! ٢- مامۆستا عیزەدین فەیزی، ٣- مامۆستا سدیق عبدولقادر ٤- مامۆستا سەلاح سەعدی ئاغا ٥-سدیق سادق ٦- کاک محیەدین نافیز بەگ. لە دواوەش: عبدولڕەحمان سەید عەلی و مەجید سێگردکانی بەتەنیا، لە دواوەیان وەستاوم بەکراسەوە ١٩٦٠/٥/١

هەر لە دەشتێ بتوێن، بە بۆنەی پشووی یەکی ئایار، جەژنی کرێکاران، ئەم سەیرانەمان کرد، ئەو مامۆستایانە دیارن: لە ڕاستەوە: ١- جەنابم، باکووری و کەمانچەکەم ٢- مۆستا سەلاح سەعدی ئاغا خاوەن دەعوەتەکە، ٣- عبدولڕەحمان سەید علی ٤- سدیق سادق ١٩٦٥/٥/١ دەشتی بتوێن/ کۆیە.

هەر لەهەمان ڕۆژ، لە سەیرانەکەی تۆبزاوا لەگەڵ هەموو ئەندامانی خێزانەکەم: دایکم و برام و خوشکەکانم گرتوومانە، لە سەردانەکەی بۆ کۆیە لە مایسی ١٩٦٠

ڕەنگە ئەم وێنەیەمان- من و سوهام- لە جوانترین وێنەکانی کاتی تەجرەبەی (دۆستایەتییەکان) بێ- لە سەیرانێکمان بۆ باخچەکانی (تۆبزاوا) نزیک کۆیە- لە ژێر درەختێک لە پشووی مانگی مایس ساڵی ١٩٦٠ کە سەردانی کردین بۆ کۆیە، گرتوومانە.

کۆتاییی پشووی ئەو هاوینە لە تەمووزی ١٩٦٠، لە هەولێر، خانووێکم بەکرێ گرت، لەسەر جادەکەی تەنیشت سەرای کۆن، لە نزیک قوژبنی پشتەوەی (بەندیخانەی سەرا)، خانووێکی (حاجی قەرۆک) بوو، بە (١٧ حەڤدە دینار) کرێی مانگانەی بوو- ئینجا کەلوپەلەکانی ماڵەوەمان بەلۆریەکەی (مەلا عیسام) گوازتەوە بۆ هەولێر! تابڵێم پێم ناخۆش بوو! وەک منالێک لە مەمکی دایکی بکرێتەوە، ئاوا هەستم دەکرد!!

من لە کۆیە مامەوە تاکو فرمانی گواستنەوەم بگاتە دەستم و ئیدارەی قوتابخانەکەم- بۆیە مانگی دە و یازدەش واتا تشرینی یەکەم و دووەم، لە شوێن خۆم دەوامم دەکرد، بەڵام زۆر بێ تاقەت و بێ زەوق بووم- کاک عەبدولقادر قەواس هەموو ئێوارەیەک یان دەیبردمە ماڵی خۆیان تا کاتی نووستن، دەهاتمەوە کۆشکەکەی کۆمپانیاکەیان (الشركة العربية

للإعمار) و لەسەر قەرویّلە (چارپایە)کەی بەڕیوەبەری کۆمپانیاکە، (أبو عزیز) دەنووستم، چونکە دایک و باوک خوشکەکانیش بەتاکسییەک، ڕۆیشتن بۆ هەولیّر و ئەوەش جاری دووەم بوو، خیّزانمان کۆیە بەجیّ بهیّڵیّن و بچین بۆ هەولیّر! جاری یەکەم، ساڵی ١٩٤٦ بوو، کە باوکم گوازترایەوە بۆ هەولیّر بەیانیان هەڵدەستام، لە بازاڕ شتیّکم دەخوارد و دەچوومە دەوام لە قوتابخانە- بەڕیوەبەر و مامۆستاکان زۆریان پیّ ناخۆش بوو کە من بەجیّیان دەهیّڵم! دیارە ڕابواردن و سەیرانەکان، وەک جاران نابیّ... تامیان تیّدا نامیّنیّ! لە هەموو زیاتر باوکی نەجوا پیّی ناخۆش بوو. هەر لەم ڕووەوەش، سوهام و ماڵە خوشکەکانی، هاتنە سەردانمان و لە کۆیە، پیّش چوونی ماڵەوەمان بۆ هەولیّر، شەویّک مانەوە، بەترومبیّلی خۆیان، ڕۆژی پاشتر بەرەو دۆکان و سلیّمانی بەڕیّ کەوتین و لە ماڵی ولیەم و فیلیپ گیرساینەوە... بۆ ڕۆژی تر، کاک فیلیپ، بەجلی کوردییەوە... سەیرانیّکی خۆش و بەلەزەتی بۆ میوانەکان ڕیّکخست و بەرەو کانی سارد ئیّمەی برد... لەویّ لەسەر ئاوە سازگارەکە ئەو سیّ چوار خیّزانە خۆشترین سەیرانمان کرد، بەتایبەتی خزمانی مووسلاوی چونکە شویّنی وا خۆش و دڵڕفیّنیان نەدیبوو!

لە دۆکان تاویّکی دریّژ ئیسراحەتمان کرد و پیاسەمان کرد بۆ سەر سەدەکە و سەرئاوەکە... لە ڕاستەوە: فیلیپ بەجلی کوردی من (باکووری) و نووری مووسلاوی میّردی خوشکی سوهامە-! هاوینی تەممووزی ١٩٦٠

له ماڵی فیلیپی برام، له سەرچنار ئیسراحەت دەكەین- ئەوانی پێشتیان له
كامێرایه، سوهام دەستی دیاره، عاسیمه خوشكی سوهامه، نووری
مێردی خوشكێكی تری سوهامه، من و كاك ولیەم ڕوومان له كامێرایه و
من ئازادی فیلیپم له باوەشدایه. هاوینی ١٩٦٠

ئەوانەی خوارەوەش چەند وێنەیەكی دیكەی ئەو (گەشتەمانن، كه دوا سەیران بوو كردم لەگەڵ دۆست و خزمان، هاوینی ١٩٦٠، پێش ئەوەی، بەجارێ و به ماڵەوه (كۆیه)ی خۆشەویستم بەجێ بهێڵم!

له كانی سارد هاوینەهەوارێكی سلێمانی
بوو، له هاوینی ١٩٦٠ لەگەڵ ماڵه
خوشكانی سوهام، فیلیپی برام دەعوەتی
كردین. له ڕاستەوه: عاسیمەی خوشكی
سوهام- فیلیپ، جوولێت هاوسەری، و
سوهام و ئەوەی دانیشتووه ڤیكتۆریایه
خوشكی كاك ولیەم.

میوانەکان هەر حەزیان دەکرد وێنەیان بگرین.. دەیانگوت ئەو ڕەسمانە دەمێنن لای تۆ.. ئێمە شت ناپارێزین- ڕۆژێک، ئێمە دەمرین، تۆ بەم وێنانە ئێمە یاد دەکەیەوە

عاسیمەی خوشکی سوهام و سوهام
لە ناوچەی کانی سارد سلێمانی
هاوینی ١٩٦٠

سوهام و عاسیمەی خوشکی- باخچەکانی
کانی سارد هاوینی ١٩٦٠

## ژیانی هاوسەریەتی - ژنهێنانم لە تای تەرازوومدا

من لەگەڵ مامۆستا سوهام ئەو جۆرە خۆشەویستییە قووڵ و بەهەموو دڵمان نەبوو- بەڵام وەکو دەڵێن (ژنهێنان... نسیبە!).

من کە بەو مەسەلەیەی (ژنهێنانەکەم) ئەمڕۆش کە، هەر بەزەیی و ئینجا پێکەنینم بەخۆم دێ! دەپرسم: چۆن ڕووی دا؟ من (تەخدیر) کرابووم؟ سیحرم لێ کرابوو؟ چۆن، وەک مەڕێک یا بەرخێک بەرەو قەسابخانەی ببەن بۆ ئەوەی سەری بڕن، کەچی ئەو بەکەماڵی ئیسراحەتەوە و بەگیا و پووش خواردن لە ڕێگەی قەسابخانەکە دەڕوا، بەبێ بیرکردنەوە لەوەی کە دوای کەمێک، سەری دەبڕن! منیش خۆم ئاوام دێتە بەرچاو، ئەو کاتە! نەمدەزانی ئەوا بۆ (سەربڕین!) دەچم، بەپێی خۆم! لێرەدا نامەوێ بڵێم، هەموو ئەو ساڵانە... ناخۆش بوون یاخود نەکبەت بوون! نەخێر، کاتی خۆشی هەبوو... سەیرانمان دەکرد، بەمیوان دەچووین، میوانمان دەهاتن! منداڵمان بوو: دوو کوڕ بە یەک زگ!! واتا (جمک)! باوکم بووکی خۆی زۆر خۆش دەویست! لەگەڵ دایکم و خزمانمان پێوەندییان زۆر زۆر چاک بوو!! خواردن و ڕابواردنمان و پارە و پووڵ و مادیات و کەلوپەلی ماڵەوەمان زۆر چاک و لە جۆری باش بوون! بەڵام من، شەخسی خۆم، هەستم هەر سارد بووە بەڵام من، و ئێستاش، ئەگەر تەمەن بگەڕێتەوە دواوە کەوا هەمان بیر و هۆشم هەبێ، قەت نابم بە(مێرد)، و ژن ناهێنم! و بەڕاستی بەڕاستی، خۆشەویستییەکی ئەوتۆ گەرم، قەت لە بەینمان نەبوو هەرگیز لەگەڵیدا ئەو جۆرە پێوەندییە خۆشەی ژن و مێردایەتیم هەست پێ نەکرد. ئەو بیرەوەرییانەم کە دەنووسم، وەک ئامۆژگارییەکە بۆ گەنجان... ئەوانەی هاوسەر هەڵدەبژێرن: با دە جار بیرکەنەوە و کارەکە هەڵسەنگێنن و ئەو کچەی هەڵی دەبژێرن، با بە دڵ و بە هەست و هۆش خۆشی بوێ و چووبێتە دڵیەوە و عاشقی بووبێ! نەک هەروا خۆشەویستییەکی هاکەزایی... خۆی ئیقناع بکات کە ئەو کچەی خۆش دەوێ، بەڵام زۆرجار، دڵەکوتە دەیگرێ و لە خۆی دەپرسێ: ئەرێ ئەو کیژە باشە بۆ من؟ جوانە؟... دڵم بەڕاستی دەیەوێ؟ نابێ بهێڵن هیچ شتێک ڕێگر بێ!

لەگەڵ ئەو مامۆستا و بەڕێزانەی لەم سێ وێنەیەدان، پێش چوونم بۆ ناو قەفەسەکە!

(یان سجنە ئیختیارییەکە وتیان با مووسڵ ببینین و تۆ لەگەڵماندا بە! چونکە ئیتر وا زوو ناتبینینەوە... کاک حازم ئەحمەد ئێمەی بردە کۆلێژی پزیشکی کە لە ١٤ی تەمووز دامەزرا.

لە ناو حەوشەی کۆلێژی پزیشکی مووسڵ: لە ڕاستەوە: محیەدین نافیز، بەکر سەعدی، خالید مەلا عومەر، باکووری، سەلاح سەعدی

هەمان کەسەکان کۆلێژی پزیشکی مووسڵ پشووی نیوە ساڵی ١٩٦٠

مامۆستا حازم، کە وێنەکان دەگرێ لەلای چەپەوە یەکەم کەسە- ئەوانی تر هەمان مامۆستا هاوڕێکانمن لە عوتلەی نیوە ساڵی ١٩٦٠ کۆلێژی پزیشکی مووسڵ

له کۆیەوە لەسەر داوای بەڕێوەبەری مەعاریف هاتمە هەولێر! ڕۆژی ٩ی ئاب ١٩٦٠ ماموّستا (نەشئەت محەمەد سەفوەت) داوای لێم کرد کە لەگەڵ ئەو هونەرمەندانەی (مەعاریف)، لە لای خۆی و خۆمان یەک بگرین و ئامادەبین بۆ سازدانی ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی، شەوانی (١٥ و ١٦ و ١٧)ی ئەم مانگە- (ئاب) لە شەقلاوە، بەبۆنەی گرێدانی کۆنفرانسی (محلي) دووەمی ماموّستایانی کورد، لەوێ. وتی کەوا ئەمڕۆ ئەو هونەرمەندانە تەبلیغ دەکات بێنە ئێرە و تۆش وەرە بیانناسە و تەعارف بکەن و قسەیان لەگەڵدا بکەن... چونکە ئەوانە دوو جەماعەتن و لەگەڵ یەک کۆک نابن!

ئەوە بوو، بۆ ڕۆژی پاشتر چوومەوە دائیرەی معارف، لە هۆڵەکەی نێوان ژوورەکان مێز و کورسیمان بۆ دانرابوو. یەک دووکەس دانیشتبوون و تەعارفمان کرد... دوایی یەک دووێکی دیکەش هاتن جا ئەوانەی ناسیمن کاک جەمال هیدایەت و کاک (ضیاء نورالدين قصاب) و هەروەها یەحیا مەرجان...!! قسەمان کرد و وتم دەبێ هونەرمەندان یەک بگرن و ناکۆکی لە نێوانیان نەمینێ و ڕێککەوتن کە لە بەیانیرا، دەست کەین بەدانانی بەرنامەیەک بۆ شەوەکانی شەقلاوە و لێرە هەموو ڕۆژێ، لە ژوورێکی قوتابخانە کۆنەکەی (سانەوی) بەرامبەر سەرای کۆن، تەنیشتی دائیرەی بەرید و بەرق و تەلەفۆن، لەوێ تەمرین بکەین... بۆ بەیانی چووینە ئەو ژوورەی باسمان کرد و ئەوانەی هاتبوون، جەمال هیدایەت و زیاء نووری قەساب و یەحیا مەرجان و براکەی عەبدولواحید مەرجان و مستەفا ڕەئووف و چەند ئەکتەر... کەچی ئەوانی ناویان لە لیستەکە بوو لە کتابە ڕەسمییەکە کە لێرەدا نیشانی دەدەم و دای دەنێم وەک بەڵگە، نەهاتبوون، نەشمناسین هەتا دوای ئاهەنگەکان کە ئەوانە بوون: جەمال داود، عەبدوڵڵا ئیبراهیم، مونیر داود، مونعیم مەزهەر... ئێمە بەرنامەمان دانا و دەستمان بەپڕۆڤەکردن کرد تا ڕۆژی دەست پێکردنی کۆنفرانسەکە- ئێمەش بە ترومبێل چووینە شەقلاوە- شەوەکە لە حەوشی قوتابخانەیەک، کورسی دانرابوون و پەیتا پەیتا ماموّستاکان دەهاتن- دوایی بەرنامەکانمان دەست پێ کرد، سەعاتێک زیاتری خایاند بەمۆسیقا و گۆرانی و تەمسیلێکی کۆمیدی- ئیتر شەوانی تر، لە باخچەیەک بۆمان دەستنیشان کرابوو، شانۆیەکی وەک (کەپر)مان بۆ ئامادە کرابوو- میوانەکانی لە باخچەکە، لەسەر کورسی دادەنیشتن.

سوودی من لەو بەزمە ئەوەبوو، بەشەو کە لە ئووتێل دابەزیبووین، ئێمەی تیپی مۆسیقا و گۆرانیبێژەکان، من لەگەڵ کاک جەمال هیدایەت و کاک زیا و نازانم کێ لەسەر مێزێک

دانیشتبووین، دوای ئاهەنگەکە- کاک جەمال، جەمال هیدایەت، لێی پرسیم: «ئەرێ مامۆستا، بیستوومانە نیشانت داناوە و مامۆستا سوهام، کە لە هەولێرە... خواستووەتە. لەمێژە! بۆچی بەو هاوینە نایگوازیتەوە و ئێمەش دەعوەت بکەیت و...» پێکەنیم و وتم: «بەڕاستی، موشکیلەم هەیە! پارەم نییە- دینەکەم تەواوکەم» ئەوان پێکەنین! کاک جەمال وتی: دە کاک زیا هەندێ پارەی لە (توفیر) هەبە... وابزانم مانعی نییە یارمەتیت بدات، وە نییە کاک زیا؟» کاک زیاش یەکسەر وتی وەڵلا دەیدەمێ- چەندت پێویستە مامۆستا؟ وتم ڕەنگە بە (١٥٠سەد و پەنجا دینار) ئیشەکەم جێبەجێ دەبێ. وتی: سبەی کە چووینەوە هەولێر، پێکەوە دەچینە بانک و پارەکەت دەدەمێ... هەرواش بوو! بۆ بەیانی لەگەڵ ئەو گەنجە دڵسۆزە چووینە بانکی ڕافیدەین... لەسەر جادەی سەرەکی بوو، لە تەنیشت چێشتخانەی تاجیرانی ئەوسا و کەباب کۆیسنجاقی ئەمڕۆ. چونکە ئەو کاتە ئەوانە هێشتا نەبوون! پارەکەی دامێ... ١٥٠دینار و زۆر سوپاسم کرد.

فرع نقابة المعلمين | تموز ٣٢ | نەقابەی مامۆستایان
في اربيل | | لق هەولێر

العدد ١٧٦
التاريخ ٩ / ٨ / ٦٠

الى الزملاء المدرجة اسمائهم ادناه
الموضوع: اقامة حفلة سمر

[illegible]

ن. رئيس الفرع

صورة منه الى
اللجنة التحضيرية للمؤتمر ـ للعلم

الزميل ... (بالاذاعة)
الزميل جمال داود
الزميل جمال محمد امين
الزميل فرهاد احمد
الزميل عبدالله ابراهيم
الزميل ... داود
الزميل سامي ...
الزميل [illegible]

بەڵام گوازتنەوەکەشم زۆر زۆر پێ ناخۆش بوو چونکە لە قوتابییە جوانەکانم، و تیپە ڕەسەنە خنجیلانەکەم و دۆستان و برادەران دوور دەکەوم، کەچی دڵخۆشیش بووم چونکە (نەجوا) لە هەولێرە و دەیبینمەوە! خێزانی ماڵی سوهام خێزانێکی گەورە بوون: ٨ کچ، سێیان بەمێرد بوون، پێنجیان عازەب بوون، دوانیان قوتابیی (فنون البيتية) بوون یەکیان (سیتسەر-) بوو یەکیشیان لە بەغدا، ئەویش لە نەخۆشخانەیەکی (أهلي)- لێپرسراوی ئیداری سستەرەکان بوو. پێنج برای هەبوو: یەکیان لە (عێن زاله) میکانیک بوو لە کۆمپانیای نەوت- یەکیان (خیاط)بوو لە بەغدا- کوڕە گەورەکەیان (فاضل)

تیپە مۆسیقایەکەمان، کە دوایی بەناوی تیپی مۆسیقای دەرسیم ناونرا، لە ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی، لە باخچەیەکی شەقلاوە بەبۆنەی بەستنی کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورد، لە شەوانی ١٥و ١٦و ١٧ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٠دا. لە ڕاستەوە: باکووری- جەمال حەمەدئەمین- واحید مەرجان- زیا نووری قەساب- ئیبراهیم نوورەدین- جەمال هیدایەت (عوود)- عەدنان مەلا و شەمسەدین سەدرەدین (ایقاع)

تیپەکە لە ئاهەنگی کۆنگرەی مامۆستایانی کوردی دووەم، لە شەقلاوە، من لێرە وەک گۆرانیبێژ وا بەشداری دەکەم- لە شەوانی ١٥و ١٦و ١٧ی ئابی ١٩٦٠

مديرية معارف لواء اربيل
الذاتية

العدد ١٧٨٨٩
التاريخ ١٥/١٠/٩٦٠

امر اداري

الموضوع/ تنقلات

بناء على ما جاء في مذكرة اللجنة التفتيشية في اللواء ٨ في [illegible]/١٠/٩٦٠ واستنادا الى الصلاحية المخولة لنا تقرر اجراء التنقلات والتنسيبات التالية بين مدرسي ومدرسات المدارس الثانوية والمتوسطة على نفقتهم الخاصة اعتبارا من تاريخه اعلاه .

| | الاسم | مدرسته الحالية | المدرسة المنقول اليها |
|---|---|---|---|
| ١- | صديق عبد القادر | مدير ثانوية كويسنجق | مدير متوسطة زازا |
| ٢- | عبد الرحمن السيد علي | مدرس " | يقوم بوكالة ادارة ثانوية كويسنجق |
| ٣- | لطفية محمود سالم | مدرسة متوسطة كويسنجق للبنات | مدرسة الفنون البيتية في اربيل |
| ٤- | ادوارد اسرائيل حمو | مدرس ثانوية كويسنجق | مدرس متوسطة زازا |
| ٥- | وحيدة احمد عطراوي | معلمة شقلاوة | تنسب الى ثانوية اربيل للبنات لتدريس اللغة الانكليزية ومن تكملة الساعات في الفنون البيتية . |
| ٦- | حسيبة نادر | معلمة الايوبية للبنات | تنسب للفنون البيتية - لتدريس الرياضة البدنية . |
| ٧- | عبد الصمد محي الدين | مدرس متوسطة اربيل | مدرس متوسطة زازا |

مدير معارف لواء اربيل

صورة الى
رئاسة مجلس الخدمة العامة - ٧
مديرية المعارف العامة للدراسة الكوردية
مديرية التعليم العامة - الثانوي - ٣ ٧
مديرية التعليم المهني العامة / الفنون البيتية
مديرية الحسابات العامة
مديرية الادارة والذاتية / السجلات
مديرية الاحصاء التربوي
متصرفية لواء اربيل
مديرية خزينة اللواء
مفتشية معارف اللواء
المحاسب الثانوي
مامور المخزن الثانوي
مديريات المدارس / للاعلام بتاريخ الانفكاك والمباشرة للأسهم على حدة
فرع نقابة المعلمين
شعبة الذاتية - للتاشير
الملفة الشخصية - ٧
الدولة المهم

لەم کاتەدا کتابی ڕەسمی نەقلمان بۆ هەولێر دەرچوو! دلخۆشیش بووم کە لەگەڵ کاک سدیق دەبم

فیتەر بوو لە گەڕاجێکی نزیک ماڵی خۆیان لە گەڕەکی (فیصلیة)-یەکیان بێ ئیش و کار بوو- عەسکەر بوو- تەواوی کرد و دانیشت) هەرە بچووکیان (عاصم) قوتابی بوو لە ئامادەیی مووسڵ. خانووی خۆیان بوو- بچووک بوو بەڵام ژووری تەواوی هەبوو بۆیان- باوکی پیرەمێرد و بێکار و کاسبی بوو.

ئەگەر باوەڕ دەکەن یان نایکەن، کەیفی خۆتانە ئەگەر بڵێم!! ئەو ڕۆژەی دایکم و باوک و خێزانمان باسی خوازبێنییان بۆ سوهام دەکرد، لە ژووری میوانانمان، لە کۆیە- من و نەجوا، لە ژووری خۆم، بەتەنیا بووین و دڵداریمان دەکرد. کەچی ڕۆژی ١٩٦٠/٨/٢٥ لە کەنیسەی (أم المعونة) لە گەڕەکی (دواسە)، لە ناو ژمارەیەکی زۆری خزم و برادەرانی هەردوو لامان، مەراسیمی (عقد الزواج)- واتا تقووسی بەیەک بەستنەوەی بووک و زاوا، لە لایەن مەترانێک و سێ چوار قەشە و شەماشە... تەواو بوو- ئینجا هاتینە دەرەوە بۆ ناو حەوشی کەنیسە و لەوێ وەستاین و ئیتر ئەرانی دەعوەت کرابوون پیاو و ژن، بەرێز دەهاتن و تۆقەیان لەگەڵماندا دەکرد و پیرۆزباییان لێ دەکردین.

دایک و باوکی سوهام و له دواوەیان فیلیپ و ولیەم وەستاون– نووری زاواشیان له لای ڕاست وەستاوه و له هاوینی ١٩٥٩ له حەوشی ماڵی خۆیان، له مووسڵ له گەڕەکی فەیسەڵییه، گیراوه

ئەندامانی خێزانی سوهام و هەندێک لەوانی ئێمەشیان تێکەڵن له هاوینی ١٩٥٩ له حەوشی خۆیان له فەیسەڵییه گیراوه

له ژووری کەنیسەکە، دوای تەواوبوونی مەراسیمی عەقدەکە دێینە دەرەوە بۆ
ناو حەوشەکە ڕۆژی ١٩٦٠/٨/٢٥ عەسرێ

بەرەو شوێنی وەستانمان دەڕۆین و میوانانیش، لە ناویاندا ماڵی پلکم سینەم،
بەجلی ڕەش و پشتی لە کامێرایە و بەرامبەریشی یەکسەر، پلکی بچووکم
(ڕەوشێ) ڕووبەڕووی سینەم بەجلی سپی وەستاوە- فیلیپی برام، لەدوای پلکە
(ڕەوشێ) بە پێکەنینەوە... چەپڵە لێ دەدا !! ئینجا لە دواوەم، لە نێوان من و کچە
پلکم کە بوخچەیەکی سپی هەڵگرتووە، دایکم دیارە

ئەو هەرایەش تەواو، ئیتر وەستاین بۆ قەبوولکردنی تەبریکات و پیرۆزبایی دۆست و خزمان، هەر لە حەوشەی کەنیسەکەی أم المعونە.

جا ڕۆژێک پێشتر، بەتەلەفۆن، ژوورێکیان لە هوتێلی (سەرسەنگ) هەر لە هاوینەهەوارەکەی سەرسەنگ، بۆمان گرتبوو و حیجز کرابوو. بۆیە هەرکە خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد و هەرکەسە چووەوە ماڵی خۆی، ئێمەش هەر بەو ترومبێلەی کە ئەویشمان هەر دوێنێ حیجز کردبوو و هاتبووە کەنیسە سایەقێکی کۆنی (ئاشووری) بوو، لە ساڵی ١٩٤٠ کە من لە مووسڵ، لە ماڵی باپیرم بووم و لە قوتابخانەیەکی سەرەتاییم دەخوێند. ماڵی ئەو شوفێرە، دراوسێی ماڵی باپیرم بوون و هاتوچۆیان هەبوو و من دەمناسی. ناوی (ئەوشۆ) بوو- ئەوشۆ کورتەی (عۆدیشۆ)یە- جا چووینە ماڵەوە، خۆمان گۆڕی و جلی ڕەش و سپی بووک و زاوامان گۆڕی بەجلی ئاسایی و دوای ئیسراحەتێکی کورت، بەرەو دێی (یان مصیف) سەرسەنگ بەڕێ کەوتین و دنیا تاریکیش داهاتبوو- ئەوە بوو، بەسەلامەتی گەیشتین و تەلەفۆنات کرا لە مووسڵەوە وتمان گەیشتین ... خەمتان نەبێ! لەو (مصیف)ە خۆش و جوانە، یەک هەفتە ماینەوە لە ژووری (ژمارە ١١)- لە بەرامبەر هوتێلەکەمان، کۆشکی مەلیک دیار بوو کە دوای شۆڕش ناویان گۆڕی بۆ (القصر الجمهوري).

Iraqi Summer Resorts — المصايف العراقية
Sersang Hotel — فندق سرسنك
No 783

| I.D | Fils | I.D. | Fils |
|---|---|---|---|

بەپێی ئەم (وصل)ەی هوتێلەکەی سەرسەنگ، کە تا ئەمڕۆ، لە ئەرشیفمدا پاراستوومە و ئەمە کۆپیەکەیەتی.

دوای دوو ڕۆژ، برای سوهام (عاصم) و خوشکی گەورەی (ڕەمزیە) بە ترومبێلی (فوکس واگۆنی) ڕەمزیە، هاتنە سەردانمان، کە ڕەنگی (حلیبی) بوو و یەکەم سەفەری کە پێی کرد، لە بەغداوە بەبۆنەی (شووکردنی) خوشکی، هاتە مووسڵ و ئامادەی ئاهەنگەکەمان بوو- جا بۆ ڕۆژی سێیەم هاتنە لامان، و پیاسەیەکمان کرد بە ترومبێلەکەی بۆ لای (مصیف سۆلاف)و گەڕاینەوە و ئەوانیش گەڕانەوە مووسڵ- ئینجا ئەو چەند وێنەی شەدرلعەسەلەکەمانیش ببینن، ئازیزان!

لە ناو باخچەکەی هوتێلی سەرسەنگ، لەگەڵ خێزانەکەم، دوای دوو ڕۆژ گەیشتنمان

من و سوهام لە پالکۆنی دواوەی ژوورەکەمان وەستاوین و سەیری دیمەنی ئەو ناوە لە چیا و باغات و دێهات دەکەین- ڕۆژی دووەمی چوونمان بۆ سەرسەنگ ١٩٦٠/٨/٢٦

لەڕۆژی دووەم و سێیەمی چوونمان بۆ سەرسەنگ، برا و خوشکانی (بووک) هاتنە سەردانمان و ئەحواڵ پرسینمان بەترومبێلی (فولکس واگۆن) تازەکەی خوشکیان (رەمزیە)

کۆشکی پاشایەتی عێراق لە سەرسەنگ، لە دوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بووە کۆشکی کۆماری- لە ١٩٦٠/٨/٢٧ وێنەمان گرت

بەڕاستی... من وەک بەرخێکی بێ ئاگا، کە دەیبەن بۆ سەربڕین بۆ قەسابخانە، ئاوابووم. هەست و مێشکم هەرگیز لەگەڵ خۆم نەبوون! جا، کوڕینە! وەک من نەکەن! کچی غەریب لە ڕەگەز و عەشیرەتت هەر هەست دەکا تۆ غەریبی لێی! بۆیە ئامۆژگاریم ئەوەیە کە ویستت بەڕاستی هاوسەر پەیداکەیت بۆ خۆت، لە ناو عێل و عەشرەت و چین و میللەتی خۆت، هاوزمانی خۆت، بگەڕێ! لە ناو ئەوانە هاوسەرت بێ، نەکەی لە یەکێکی نەیناسی و نەتناسی!! تەنیا بەهۆیەکی زەبوون... و تەعلیلێکی بێ مانا، وەک من، قایل مەبە و ژنیان لێ مەهێنە! ژنت با بەزمانی خۆت گفتوگۆ و قسەت لەگەڵ بکات!

کاکە برا... بەخوا لە یەکەم هەفتەکە من بووم بە خاوەن (ژن) من پەشیمان بووم! لە ناوچەیەکی کوردەواری پەروەردە بووم... لە دەرەوە... لە قوتابخانە... لە بازاڕ، بەکوردی لەگەڵ خەڵک دەدوام! لە ماڵەوە بەزمانی زگماکی... بەئاشووری لەگەڵ دایک و باوک و برا گفتوگۆمان دەکرد! کە بووک هاتە ماڵەوە، نەدایکم عەرەبی دەزانی نەباوکم! وەک کەڕ و لاڵ بوون لەگەڵیدا. کە منداڵیشمان بوو... دوو کوڕ بەجارێ!! (جمک) بوون لە ساڵی ١٩٦١ لە هەولێر- ئیتر حەزم لەوەش نەبوو چیتر منداڵمان بێ! چونکە چەند منداڵ زیاد بن، ئەوەندە کەسە زیاتر بەزمانی عەرەبی قسە دەکەن ڕقم لێیان دەبێت!! بۆیە تا ئێستاش (ساڵی ٢٠٠٥) هەر ئەو دوو کوڕەم هەیە...خوا تەمەنیان درێژ بکات و تەندروستیان باش بێ و ماڵ و منداڵیان بپارێزێ! ئاخر جەرگن... چ بکەم، هەر خۆشم دەوێن! بەکورتی و

کوردی: من کامەران نەبووم لە ژیانی هاوسەرایەتی... زۆر شەڕ و هاوارمان دەبێ! زۆر نارەحەتیم دیوە! قەت ئەو ژنەش بەمیزاجی خۆم نەبووە! ڕاستە ساڵەکەم پوختە و ڕێک و ژیکەڵەیە و خانووی خۆمان کرد دوای ١٠ساڵ ژن و مێردیمان! مناڵەکانم لێرە، لە هەولێر گەورە و پەروەردە بوون، زۆر ئاگای لە خوو و ڕەوشتیان بووە، لە قسەمان دەرناچن بەڵام سەیر لێرەیە! ئێمە، من و دایکم و براکانم خوشکەکانم شەش حەوت کەس بووین هەر بەزمانی خۆمان قسەمان دەکرد. ئەو قەت هەوڵی نەدا زمانەکەمان فێر بێ. ئەوە ٤٨ ساڵیشە لە وڵاتی کوردەواری- لە کۆیە و هەولێر مامۆستایە... یەک ڕستەی تەواو کوردی ناتوانێ، بەڕاستی، قسە بکات! ئێمەشی (تعریب) کرد! وەی ئافەرین ئافرەت!!

ئا بەم جۆرە من کەوتمە خانەی (مێردان واتە پیاوانی خاوەن ژن!) پەها، بۆ من زۆر کارێکی ناخۆش بوو! دوای ئەمیرە و نەجوا، کەوتمە گێژاوی... و دەردەسەری ژن لەگەڵ (سوهام خان)!! (هەلور بەلور تەکانێ...) یارییەک بوو لە تەمەنی منداڵیدا لەگەڵ مناڵانی دراوسێمان، لە گەڕەکەکەمان بەشەوان، لە حەوشی ماڵەوە ئەو یارییەمان دەکرد. جا، کە بووم بەخاوەن (ژن)، لەگەڵ خۆمدا، بەحاڵی خۆم پێدەکەنیم و ئەو یارییەم دەهاتەوە بیر: یاری "هەلور- بەلور..." هەلور... بەلور...تەکانێ!! کێ بردیەوە؟

ئەمیرەی کەرکووک ١٩٥٧،
زۆرم حەز دەکرد ئەو بوایە...!
بەڵام... نەبوو!

سوهامی مووسڵ؟ ئەخیری
ئەوە بردیەوە...!!

نەجوای کۆیە ١٩٥٨
زۆرتریشم حەزم دەکرد ئەوە
بوایە... ئەویش نەبوو!!

دوای هەفتەیەک لە سەرسەنگ، گەڕاینەوە مووسڵ و هەر بەو شەوە، بەترومبێلێکی خصوصی چووینەوە هەولێر- بۆ بەیانیش من چوومەوە کۆیە و دەوامم کردەوە لە ٩/١ بەپێی (نظام)ی معارف کە مامۆستایان دەبێ هەموو ساڵ لە ٩/١ دەوام بکەن. هەروەها هێشتا فرمانی گواستنەوەم بۆ هەولێر دەرنەچووبوو- جا، لە کۆیەش لە شوقە (کۆشکە)کەی کۆمپانیا (عەرەبی)یەکەی برادەرم، عەبدولقادر، دەنووستم لەگەڵ ئەندازیار کاک ئەدوەر عەزیز ئەلبازی- گەنجێکی ئاسووری بوو، ئەندازیاری کۆمپانیاکە بوو- بەڕۆژ، زۆر جاران، عەبدولقادر دەیبردمەوە ماڵی خۆیان و نانی نیوەڕۆم لەوێ دەخوارد و دەگەڕامەوە شوقەکە. چەند جارێکیش بۆ نیوەڕۆیان، کاک سەلاحی سەعدی ئاغا، مۆستای ئینگلیزی لە قوتابخانەکەی ناوەندی لەگەڵمدا، دەیبردمەوە ماڵەوەیان و پێکەوە، لەگەڵ باوکی- کاک سەعدی ئاغا- نیوەڕۆمان دەخوارد- ماڵیان لە تەنیشت تاقی حاجی عەولا بەگ بوو کەوا لە سالانی سەرەتای چلەکان، ماڵی ئێمە و ماڵی مامم، بەکرێمان گرتبوو- جا ئەوەیان دەزانی، کاک سەلاح و باوکی- من نیشانم دەدان، ژوور و هەیوانەکەی سەرەوە کە ئێمە لەوێ بووین و ماڵی مام لە خوارەوە- پاشان لە ١٩٤٢ و بەملاوە چۆڵمان کرد، و دیار بوو سەعدی ئاغا کڕیبووی!

ئەو کۆشکەی سەرەوە، کە هەیوانەکەی دیارە، ئەوە ژووری ئێمە بوو، ئێستا دیوارەکەی پێشەوەیان تێکداوە و کراوە بە هەیوان. ماڵی سەلاح سەعدی ئاغا لە سالانی چلەکان و بەملاوەتر، لێرە بوو، دوای ئەوەی ئێمە چۆڵمان کرد، کڕیبوویان.

دوای نزیکی دوو مانگی دەوامکردنم لە کۆیە .. کە بەڕاستی قەت حەزم نەدەکرد ژیانم لەوێ بەجێ بێلم، بەڵام ئەوە بوو کتابی (ڕەسمی) هات و تێیدا من و کاک سدیق عەبدولقادر و یەک دوو مامۆستای تر، نەقلمان دەرچوو بۆ هەولێر- ئەوەی دڵمی خۆش کرد ئەوە بوو کە من و کاک سدیق بۆ یەک قوتابخانە، کە (ناوەندی زازا)بوو، ناومان دەرچووبوو- کاک سدیق عەبدولقادر وەک مودیر و من وەک مامۆستای ئینگلیزی- کەواتە هەر بەیەکەوە بووین و هەستم بەغەریبی نەدەکرد- بەم جۆرە کۆیەی مەنبەعی ئەدەب و هونەر و شوێنی نیشتەجێبوونی حاجی قادری کۆیی و لە دایکبوونی دەیەها مرۆڤی ناوداری وەک مەسعوود محەمەدی جەلیزادە و خانەوادەکانی... براکانی شێخ نوورەدین و شاعیرانی گەورەی وەکو ئەختەر و دڵدار و دلزار و هونەرمەندی رەسەن و دەنگخۆش وەک سێوە و مەلا ئەسعەد و حەمەدەمین حاجی سالحی کەبابچی و تایەر تۆفیق و عەونی شاعیر و ئەحمەدی حەمە مەلا و زۆر زۆری تر بەهرەداران... تا ئێستاش بەردەوام لەم جۆرە کەسانە، شارەکەمان، بەهۆی دیمەنی جوان و ئاو و هەوای ساف و سازگار و دەشتی بەپیت و بەرەکەت... هەر لاوی خوێنگەرمی نیشتمانپەروەری لێ دەردەچن... کە ئەمڕۆ یەکێک لە ڕۆڵەکانی ئەو شارە خنجیلانە خەباتکەرە تێکۆشەرە کە مام جەلالی بەڕێز... هەڵبژێردراوە بۆ بەرزترین پۆست لە وڵاتی عێراق، کە سەرۆکایەتیی کۆمارەکەی پێ سپێردرا و بوویتە (صاحب الفخامة رئيس جمهورية العراق‌الجديد) بەڵێ من کۆیەم بەجێ هێشت وەک مامۆستا و کارمەندێکی دەوڵەت! بەڵام هەرگیز لێی نەپچڕاوم بەهەست و هۆشم- بەردەوام بۆ جێبەجێکردنی هەندێ کاری هونەری، یا ئامادە بوون لە هەندێ کۆڕی ئەدەبی و مێژوویی... یا هەر تەبێ بۆ سەیران، دەچمە ئەوێ...و بۆ ماربێنە قەدیشە و چنارۆک و حەمامۆک و هەرمۆتە... ئەوانەم قەت لە بیر ناچن... هەتا دەمرم... هەر هەوا و ئاوی کۆیە و ژیانم لەوێ لە هەموو شوێنێکی تر، پێم خۆشتر و شیرینترە.

باخ و و ڕەز و ئاو و دەشت و کێوەکانی جوانترین ئاوازی خۆشترین گۆرانییەکانم ئەوانەن کە لە کاتی بەسەربردنی ژیان لە ناویاندا دامناون! هەمیشە ڕووم خۆش و دەم بەخەندە و پێکەنین بووم! لەش و هۆشم ساغ و بەتاقەت... نەخۆشی و نەساغیم تووش نەبوون لە کۆیە! چ حەب و دەرمان و دەرزیم بەکار نەدەهێنا! بەڵام جۆرە (بێعارێکم)... تەحەمولم هەیە! بەر دەگرم! کە وەزعی کوردستان شلەژا، لە شەستەکانەوە بووە هۆی هاتنمان بۆ هەولێر و لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول و دواتریش ڕووداوی شووم و ڕۆژانی ڕەشی ئینقیلابی بەعسییە ڕووڕەشەکان و گۆڕ بەگۆڕەکان... کە ئەوانەم دەبیست،

زیاتر پەشیمانی دای دەگرتم لە هاتنم بۆ هەولێر و نەڕۆیشتنم بۆ شاخ! بەخۆمم دەگوت: ئەگەر لەو ساڵەدا ژنم نەبوایە و بەقسەی ئەو و ئەوم نەکردبایە و زگورتی بامە، لە سەدا سەد وەک زۆر لە برادەرەکانم بەچیا دەکەوتم! ئەوجا لە سەدا سەدیش، چیتر بیرم لە ژنهێنان نەدەکردەوە، هەتا دوای چاکبوونی بارودۆخیش! لە هەولێر، هێشتا دوو ڕۆژ بوو لە کۆبەوە (إنفکاک)م کردبوو و هاتبوومە ماڵەوە، لە هەولێر... شارەوانی هەولێر، سەرۆکەکەی هاوڕێی بەڕێزم کاک (عەبدولوەهاب حاجی حەسەن)، ئاهەنگێکی گۆرانی و مۆسیقای ڕێک خست بۆ کۆکردنەوەی بڕێ پارە و پوول بۆ لێقەوماوانی ئەو لافاوەی بەهۆی باو بارانێکی زۆر کە لەو پایزەدا، لە مانگی تشرینی یەکەم ڕووی دا و زەرەر و زیانێکی زۆری لێ کەوتەوە. جا داوای لە منیش کرد بەشداری بکەم- دوای ئەوە (کتاب شکر)ێکم بۆ هات! ئینجا لە مانگی یازدەدا، لە تشرینی دووەم، هەمان ساڵی ١٩٦٠

فرع نقابة المعلمين
في اربيل

تلفون
٣٢

نەقابەی ماموستایان
لق هەولیر

العدد
التاريخ / ١١ / ٩٦٠

إلى

الزميل جواد رسول ناجي
جابر جبر داود

الزميل اندريوس اسرائيل
" جمال داود
" منير داود
" عبد الله ابراهيم
" صابر طاهر
" عاكف مصطفى
" جمال محمد امين

نوسخەیەکی (کۆپیکراو)ی کتابی نەقابەی مامۆستایان کە داوامان لێ دەکەن (ئەو هونەرمەندانەی ناومان تێیدا هاتووە) بەشداری لەو ئاهەنگە بکەین کە دەیانەوێ سازی بدەن بۆ لێقەوماوانی لافاوەکەی مانگی ڕابردوو- مانگی تشرینی یەکەم

نیـقابەی مـامۆسـتـایـان بەسـازدانـی ئاهەنگێکی دیکە بۆ هەمـان مـەبەست و دیسـان من و هونەرمـەندانـی تر بەشـداریمان تێـیـدا کـرد و ئینجـا (کـتـاب شـکـر)ێکی دیکەم بۆ هات لە نیقابەوە و بەئیمزای مامۆستا جەلال شەریف کە سەرۆکی (فرع)ی هەولێر بوو.

ئینجـا دوای ئەوە، لە ١/٢/١٩٦١دا بەکـتـابـی (مـعـارف)ی ژمـاره ٣٨٠٣ مـن هەڵبژێردرام بەسەرۆکی لیژنەی مۆسیقا و سروود و گۆرانی (اللجنة الموسیقی و الانشاد و الغناء) و ئەندامیەتی چەند هونەرمـەندێک لەگەڵمـدا کە ئەو ناوانە بوون: جـەمال داود، مونیر داود (ئەمە مامۆستایەکی مووسڵاوی بوو، عوودی لێ دەدا)، خەیروڵڵا مـحەمەد، و سێ مـامۆسـتـای ئافرەتیـشـمـان لەگەڵدا بوون، ئەوانە ناویان بوو: ست لطفـیـة مـحمـود سـامـي، ست ناثرة العـمري، و ست جونیـد سلیـمـان الصقـال- کە پێم وایە هەر سێکیـان مووسڵاوی بوون! بەڵێ ئەو سـاڵانە، هێشـتـا مامۆسـتـای ئافـرەتی کـورد کـەم بوون، بۆیە لە مووسـڵـەوە کە لە قـوتابخـانەکـانی ئەوێ دەردەچوون وەک مـامـۆسـتـا، یەکـسـەر دەیاننـاردنە کـوردسـتـان، کۆیە و ڕانیـە و هەولێر... ئەو چالاکـییـانە بوونە هۆی ئەوەی کە زۆر کەسـان لە لێپرسراوی حکوومەت و مامۆستا و پیاوماقوڵی شـار و ئاغاکان و هونەرمەند و نووسەر و شـاعـیـران و ئەفـسـەران بناسم و لەگەڵـیـان پێوەندیی برادەرایەتی و خۆشەویسـتی من و ئەوان دروست بێ، کە تاکو ئەمڕۆش بەردەوام. پێوەندیی نوێ و لەگەڵ کەس و شەخسیاتی نوێ دروست دەبێ، لە خوا بەزیاد بێ!

هەندێ لەو کـتـابە ڕەسمیـانەم لای خۆم پاراسـتـووە لەوساوە، لە ئەرشیـفم وەک بیرەوەری کـە پێـوەندیـیـان بەژیانمەوە هەبووە... وا لێـرە دەیانچـەسـپـێنم، لە جـیـاتـی نووسـینەوە لە بابەتیانەوە، با ئەوانیش ببن بە چەند لاپەڕەیەک، لەم ژیاننامەم.

رئاسة بلدية اربيل
الرقم ١٢٧٢
التاريخ ٤/٤/١٩٦١

حضرة الاستاذ باكوري المحترم

نتشرف بدعوه حضرتكم الى حفلة التعارف التي تقيمها البلدية برعاية سيادة متصرف لواء اربيل بمناسبة ادماج لجنة الماء والكهرباء بالبلدية وذلك في الساعة السابعة من مساء هذا اليوم – الثلاثاء – ٤/٤/١٩٦١ في قلعة اربيل مع العلم ان الحفلة خاصة بالبلدية .

رئيس بلدية اربيل
عبد الوهاب الحاج حسين

مديرية معارف لواء اربيل
الامتحانات

العدد /
التاريخ ٢٨/ ١/ ١٩٦١

مديرية الشؤون الفنية العامة / الامتحانات

الموضوع/ درجة اللغة الانكليزية لطلبة دار المعلمين الابتدائية

١- لقد توفي السيد حيدر محمد امين مدرس اللغة الانكليزية في دار المعلمين في اربيل ليلة ٢٢/١/١٩٦١ وان المرحوم لم يقدم درجات الطلاب لمعدل النصف الاول من السنة الدراسية الى ادارة المدرسة [illegible] وان مديرية دار المعلمين [illegible] الموافقة على اعتبار درجة امتحان نصف السنة كمعدل للنصف الاول من السنة ايضا في موضوع اللغة الانكليزية . نرجو اعلامنا وابداء [illegible] هذه القضية .

٢- لوفاة السيد حيدر محمد امين واحتجاز السيد مجيد احمد مدرس اللغة الانكليزية في دار المعلمين لم يبق من يقوم بتدريس اللغة الانكليزية لذا ارتأينا تشكيل لجنة من السادة المدرسين وحيد الدين عدلي وانور طاهر واندريوس اسرائيل لاجراء امتحانات نصف السنة في الدار المذكورة .

مدير معارف لواء اربيل

صورة الى
مديرية التعليم العامة - اعداد المعلمين / نرجو تأييد امر تعيين مدرسين اثنين للغة الانكليزية في دار المعلمين .
مديرية دار المعلمين الابتدائية - اربيل/ كتابكم ٦٧ في ٢٢/١/١٩٦١ .
السيد انور طاهر بكر - معلم [illegible] اربيل للبنين
• وحيد الدين عدلي - مدرس اللغة الانكليزية في الثانوية
• اندريوس اسرائيل [illegible] في متوسطة [illegible]

(ئەوە تێبینی خوارەوەی لاپەڕەکەیە: لەشەوی ١٩٦١/١/٢٢ مامۆستا حیدر محمد ئەمین، مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو لە (دارالمعلمین الابتدائیة)، لە هەولێر و مامۆستا مەجید ئەحمەد ئاسنگەر، کە ئەویش مامۆستای ئینگلیزی بوو لەوێ، بەڵام گیرابوو حجز کرابوو- جا ئەم کتابە ڕەسمیە دەرچوو کە من و مامۆستایان وەحید دەین عەدلی و ئەنور تاهیر بەکر)- هەرسێکمان مامۆستای ئینگلیزی، دەبێ ئیمتیحانی نیوەی ساڵ ئێمە دەرەجەی قوتابیانی (دارالمعلمین) دابنێین!

الجمهورية العراقيــــــــة
وزارة المعارف
مديرية التعليم العامــــــة
الثانوي
العدد / ٨١٥٢٤
التاريخ / ١٢ / ١٢ / ١٩٦١

امـــــــر وزاري

استنادا الى مقتضيات المصلحــــــــة العامـــــــة
وبناء على ما جاء بكتاب مديرية معارف لواء اربيـــل المرقم ١٨٣١ في ١٩٦١/١١/٢٧
قررنا نقل كل من السيدين برهان الدين نجم الدين المدرس في ملحق متوسطة اربيل واندريوس اسرائيل خدو المدرس في متوسطة زار المبنين بدلل الاخــــر اعتبارا من تاريخه اعلاه ٠

ع/ وزير المعارف
الدكتور عباس راد النجم

نسخة منه الى /
رئاسة مجلس الخدمه العامه
مديرية المحاسبات العامـــه
مفتشية المعارف العامــــه
مديرية الاداره والذاتيه/ الملاك/٢
مديرية الحســـابات
مديرية التعليم الثانوي/ عبد الستار
مديرية معارف لواء اربيل/ يرجى اعلامنا بتاريخي الانفكاك والالتحاق
مديرية خزينة لواء اربيـــــل
مديرية الاحصاء التربـــــوي
مديرية الاســـــتعلامات
السجل الشخصي
ادارة مدرسة ــــــــــــ
المدونا اليـــــه ــــــــــــ

کتابی وەزارەتی (معارف) سەبارەت بە جێگۆڕکێی من و مامۆستا (شێخ بورهان نجم الدين) یەک لە شوێنی ئەوی تر

الجمهورية العراقية

مديرية معارف لواء اربيل
الذاتية
العدد/ ٢١٠٦
التاريخ ١٩/١٢/٩٦١

الى المحاسب الثانوي

الموضوع/ نقل مدرسين

نبلغكم ادناه صورة الامر الوزاري المرقم ٨١٥٢٤ في ١٢/١٢/١٩٦١ بنقل كل من السيدين برهان الدين نجم الدين مدرس ملحق متوسطة اربيل والدريوس اسرائيل خمو مدرس متوسطة زازا كل بمحل الآخر للاطلاع ..

مدير معارف لواء اربيل

صورة منه الى/

مديرية التعليم العامة / الثانوي / يرجى تعديل متوسطة (زار) بمتوسطة (زازا) واعلامنا
الملفة الشخصية / ٢
ادارة المدرستين / ............ / اعلامنا بتاريخ الانفكاك والمباشرة
الذاتية / للتأشير
المومأ اليه / ............ /

((صورة الامر))

امر وزاري

استنادا الى مقتضيات المصلحة العامة
وبناء على ما جاء بكتاب مديرية معارف لواء اربيل المرقم س/ ٨٣١ في ٢٢/١١/٩٦١ قررنا نقل كل من السيدين برهان الدين نجم الدين المدرس في ملحق متوسطة اربيل والدريوس اسرائيل خمو المدرس في متوسطة زازا للبدلين بمحل الآخر اعتبارا من تاريخه اعلاه

توقيع / .........
د. وزير المعارف

نسخة منه الى/
...........
..............

عبد القادر / ١٨

## تایەر تۆفیق و فێربوونی عوود ژەنین

لە هەولێر. وەک پێشتر باسم کرد، حەوشێکمان بەکرێ گرتبوو، لە پێشەوەی (سەرا) کۆنەکە-کە ئەوسا هەموو دائیرەکانی حکوومەت، هەر لە (موتەسەریف)ەوە بگرە تا دائیرەی بەڕێوەبەری پۆلیسی... لەو سەرایەدا بوون. هونەرمەندی برادەر و خۆشەویستم کاکە (تایەر تۆفیق)یش لێرە فەرمانبەر بوو، لە نهۆمی (طابقی) هەرە سەرەوە بوو، لە بیناکە، لە بەشی (صادرە و واردە)ی دیوانی موتەسەریف (ئێستا پارێزگار)ی هەولێر، کاری دەکرد. جا زۆربەی بەیانیان، تاوێک دەچوومە سەردانی و لە لای دادەنیشتم و چایەکم دەخواردەوە و هەندێ باسی بۆ دەکردم: دوێنێ شەوێ لە (فلانە) نادی بووم، لەگەڵ فلان و فلان... و... ئیتر چی قەوماوبوو، چی گوترابوو بۆی دەگێڕامەوە! ڕۆژێک گوتی: کاکە ئەندۆ (ناوی من بوو)، قەت بانگی نەدەکردم (باکووری)... هەر دەیگوت (ئەندۆ). جا گوتی: ئەندۆ، ئەتو دەبێ فێری عودم بکەیت! حەز دەکەم فێرە عوودبم- عوودێکم هەیە، لە بەغداوە هێناومە. جا کەنگێ مەجالت دەبی؟ من پێکەنیم و گوتم:

(کاکە گیان... تۆ ئەوە (١٥پازدە) ساڵە لە بەغدای و لە ئێزگەی، کە پڕە لە مامۆستای هونەرمەندی گەورەی (مۆسیقا)... لەوێ هەوڵت نەدا (عوود) لێدان فێربی، هاتییە لای من؟)- گوتی (وەڵلاهی لەوێ، لێ نەدەگەڕان! هەموو ڕۆژێ، دوای دەوامی دائیرە... منیان دەبرد! ئەملا و ئیملا و... ڕابواردن... ئیتر مەجالم نەبوو! کاتی بێ ئیشی و بەتاڵی نەبوو بیر لەو مەسەلەیە بکەمەوە! بەڵام لێرە... کاتی بۆشاییم زۆرە... نازانم چ بکەم و کێوە بچم، تا ئێوارە مەجبوور دەبم دەچم بۆ نادی، قومار و خواردنەوە تا سەعات دوو و سێی بەیانی!. بۆیە بیرم کردەوە چاکترین شت ئەوەیە، ئەگەر فێرە عوودبم دەتوانم دانیشم ئاواز داینێم و لە ماڵ کەم دەردەچم.)

بەڵێ قسەکانی زۆر ڕاست بوون و بەڵێنم دا و وتم هەر لە سبەی ئێوارە، وەرە ماڵمان و عوودەکەت بێنە و، دەست پێ دەکەین... ئینشائەڵڵا ناوم لە مێژوو دەنووسرێ کە (من) مامۆستای هونەرمەندی گەورەی کورد، تایەر تۆفیق بوویم و عوودم فێر کردووە! شانازییەکە بۆ من.

ئەوەبوو، ئێوارەی ڕۆژی دواتر، کاک تایەر هات، و عوودێکی لە ناو کیسەیەک پێچابوو بەدەستێکیەوە بوو، بەدەستەکەی تریشی، کیسەیەکی گەورەی کاغەزە زەردەکانی گرتبوو نەمزانی چی تیایە.! هاتە ژوورەوە و سەلام، بەخێر هاتن و دایکم هاتە لای بەخێر هاتنی کرد و چاک و خۆشی لەگەڵدا کرد و ماسۆستایەکی ئافرەتیش، مووسڵاوی بوو، ناوی (ست کەوکەب ئادەمۆ) بوو ڕەفیقی سوهامی خێزانم بوو و لە هەمان قوتابخانە، (قوتابخانەی سەفینی کچانی سەرەتایی) پێکەوە بوون... جا لەبەرئەوەی لە هەولێر کەسی نەبوو جگە لە ئێمە، بۆیە لە لای خۆمان، لەگەڵ خوشکەکانم، لە ژوورێک، پێکەوە دەنووست و خواردنیش هەر لەگەڵمان بوو، سێ ژەمی ڕۆژانە، مانگی ١٠ دیناری دەدایە من، لە جیاتی کرێ و خواردن و نووستن!! کچێکی زۆر ڕووخۆش و بەئەدەب و خوورەوشتی جوانی هەبوو. زۆریش وردیلە بوو... کورت و لاواز... بەڵام لەش و ئەندامی سپی و ڕوومەتی سوور و ناسکۆڵە بوو. ئەویش کاک تایەری لە زۆر لەو ئاهەنگانەی لە هەولێر دەکران، دیبووی و مەقامەکانی حەز لێ

ست کەوکەب و هاوسەری

دەکردن، ئەگەر چیش هیچی لێیان تێ نەدەگەیشت. جا هاتە ژوورەکەی میوانان و تۆقەی لەگەڵ کاک تایەر کرد و پێی وت کە ئەو زۆر حەز لە دەنگ و گۆرانییەکانیەتی! تایەریش زۆر کەیفی بەم قسانە هات و پێکەنی و گوتی: ئێە!! نەحەوج". ست کەوکەبیش پێکەنی و وتی: "ئشمعناتە: نەحوج؟" تایەر وتی: یعنی أشکرج!! پاشان... دایکم و ئەوان چوونەوە ژوورەکانیان، وتم: یاڵڵا کاک تایەر، عوودەکەم بدەرێ و چاک گوێم لێ ڕاگرە، ئەگەر ڕۆژ بەڕۆژ، ئەو شتەی، یا ئەو تێبینی و دەرسەی کە پێت دەڵێم، لەماڵەوە مەشقی لەسەر نەکەی فێری نەبی، ڕۆژی پاشتر ناتوانم (شتی)نوێت بدەمێ! چونکە ئەوە (مۆسیقا)یە! زانیاری لەسەر زانیاریی پێشوو بینا دەکرێ. تایەر وتی: زۆر باشە. ئینجا دەستی برد بۆ کیسە کاغەزەکە و سەیرم کرد یەک بوتڵ عارەقی هێناوە و وتی: دە بنێرە (بانگ کە) دوو پەرداغمان لە بۆ بێنن و هەندێ بەفر و ئاو. جارێ سەرو پێکێک دەخۆینەوە، تا زەوقمان بێ! من پێکەنیم وتم کاکە گیان تۆ دەبێ هەمیشە زەوقی

فێربوونی مۆسیقات هەبێ، بەبێ خواردنەوەی عەرەق و مەشرووبات! ئەوها نابێ، برام! با جارێ هەندێ زانیاری و شت لە بابەت عوودەکەت و چۆنیەتی گرتنی و شوێنی پەنجەکان و ... تاد. ئەوانەت پێ بڵێم، ئینجا دوای (دەرس) دەخوێنەوە! وتی: نا... نا... دەتو دوو پارداغمان بۆ بێنە! پێک دەکەین و وردە وردە، قومیشی لێ دەدەین و ئەتۆش زانیارییەکانم پێ بڵێ!

بەکورتی، با درێژەی پێ نەدەم، ئەو شەوەمان بەخواردنەوە ڕابوارد! کاک تایەر هەوەسی هەڵسا و دەستی کرد بەگۆرانی گوتن. خوشک و براکانم و ست کەوکەب هاتن و دانیشتن. ست کەوکەب داوای گۆرانییەکی عەرەبی لێی کرد و خاڵە تاهیریش گۆرانی (یا جارة الوادي) زۆر خۆشی بۆ کچەکە گوت، کە، کە یەکێکە لە گۆرانییە خۆشەکانی محەمەد عەبدولوەهابی میسری- ئابەم جۆرە، بوتڵە عەرەقەکە تەواو بوو، نیوەشەو داهات، کاک تاهیر هەڵسا و (بەدوعا... بەدوعا!) و ڕۆیشت!

ئەو بەزمە دوو سێ ڕۆژان بەردەوام بوو... هەموو ئێوارەیەک دەهات و بوتڵێک عارەقی دەهێنا... وەک بڵێی باسی فێر بوونی عوود و مۆسیقامان هەر نەکردبێ. کە پێم گوت: ئەی جەنابت کەی فێرە عوود دەبی و کەی من دەرست پێ بڵێم!- وتی: بەخوای ئەندۆ، هەوەسم لەسەر عوود نەما! کوڕە تاقەتی دەوێ... کاتی دەوێ! لەو دوو شەوەی کە نەچوومە نادی، بیست کەس لە دووم دەگەڕان! ناتوانم کاکە... لە بیر خۆتی بەرەوە! ئیتر ئەوەبوو، بەداخەوە دەڵێم، کاک تایەر عوودەکەشی نەبردەوە! ئیتر نەهاتەوە! جا دەینارده ماڵەوە دەیگوت با ئەمشەو ئەندۆ بێتە لام لە فلان نادی... ئیشم پێی هەیە! کە دەچووم، ئەوا کاک تاهیر و دووسێ کەسی تر لە دەورەی مێزێک، لە ژوورێکی یانەکە دانیشتوون و قومار دەکەن! کورسییەکی بۆ من لە تەنیشتی خۆی دادەناو (بۆی)ەکەی ڕادەسپارد (تەرتیبات)م بۆ بێنێت! چەندی هەوڵم دەدا ئیقناعی بکەم کەوا من ناتوانم هەموو شەو بخۆمەوە، فایدەی نەبوو! گوێی نەدەدامێ. ئەبوایە لە لایان دانیشم و بخۆمەوە و تایەریشت وا پێکی لە تەنیشتە و (مەصە)ی لێ دەدا و گۆرانیش دەڵێ و نازانم چۆنیش یاری دەکرد! بۆیە هەمیشە دەیدۆڕاند! خوای لێ خۆش بێ!

پێش کۆتایی ئەو ساڵەی (١٩٦١)، منیان گوازتەوە بۆ قوتابخانەی (ملحق متوسطة أربيل) کە لە تەیراوە، لە نزیک پەیکەرەکەی (کورد و عەرەب بوو) ئەوەش لە جیاتی مامۆستای ئینگلیزی (بورهان شێخ نەجمەدین)، شوێنمان گۆڕا یەک لە جێی ئەوی تر، لەبەرئەوەی (شێخ بورهان) لەگەڵ بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، مامۆستا ئەحمەد

عەبدولکەریم، ئینسیجامی نەدەکرد و نێوانیان گرژی و ناخۆشی پەیدا بووبوو. جا، لە ١٩٦١/١٢/١٢ من چوومە (ملحق متوسطة أربيل) و مامۆستا بورهان چووە (متوسطة زازا) لە جیاتی من وێنەی کۆپی ئەو کتابە ڕەسمیەش لە لاپەڕەکانی پێشتر دانراوە! بەنیسبەت خۆم، لەگەڵ هەموو مامۆستاکان برادەر بووم و ڕێزیانم دەگرت و ئەوانیش لەگەڵمدا زۆر ئینسیجامان پێکەوە هەبوو. بەڵام چەند مامۆستایەکی ئەو متوسطەیەی (ملحق متوسطة أربيل)، کە ئەوانە بوون: بورهان نجم الدين (ئینگلیزی)، فاضل شوکت، وابزانم (رياضيات)ی دەگوتەوە، حەمید ئیسماعیل (عربی)، فائق جميل العلي(أجتماعيات)... ئەوانە جەبهەیەکیان دژی بەڕێوەبەر (مامۆستا ئەحمەد شێخ عەبدولکەریم) پێک هێنابوو، نازانم بۆچی! ڕەنگە چاویان بەرایی نەدەدا کە ئەو بکرێ بە (مودیر). لەوانەیە هەر یەک لەوانە، پێی وابوو ئەو لێوەشاوەتر بوو بۆ ئیدارەکە!. بەڵام من و مامۆستا فاتح مظهر (فنية) و کەمال طبب (وەرزش)ی دەگوتەوە، لەگەڵ کاک ئەحمەدی بەڕێوەبەر و لەگەڵ (جبهة الرقضي)یش زۆر ڕێک بووین و موداخەلەمان نەکرد.

## یەکەم (ترومبێل)م چۆن کڕی؟

ئەو ساڵەش ماڵمان گوازتەوە خانوویێکی تر، لە ناو کەندەکەی خوار چایخانەی عەنتەر بوو... کە ئێستا دوکانەکانی (شیرینیی ئەحمەد) و چەند دوکانێکی تر لە شوێنی چایخانەکە کراوە و لەسەر دووریانەکەی سەر ڕێگەی عەنکاوەیە کە فەرعێکیش بوویتە شەقامی پزیشکان خاوەنی خانووەکە، (عەلی) ناو بوو! خانووەکەی تازە دروست کردبوو و ئێمە بەکرێ لێمان گرت! جا ڕۆژێک (عەبدولقادر قەواس) باوکی (نەجوا)ی خۆشەویستم، هاتە سەردانمان و بۆ هەندێ کاری خۆی لە هەولێر! ئەویش پێوەندیی بازرگانی هەبوو لەگەڵ (فارس ئاغای دزەیی کە برازای عەزیز ئاغای دزەیی بوو) کە (محل)ێکی گەورەی هەبوو، پێشتر (عەبدولقادر جێمسی- مقاول) بۆ خۆی دروستی کردبوو... گەورە بوو. جا عەزیز ئاغا لێی کڕیبووەوە و وەکالەتی ئیستیرادی چەند جۆرە ترومبێلێکی هەبوو. فارس ئاغاش وەک ژمێریار (محاسب) لە لای مامی دامەزرابوو... مامۆستایەکی سەرەتاییش، دوای دەوام دەهاتە مەحەلەکە و دەفتەر و حیساباتەکەی بۆیان ڕێک دەخست، ناوی (حەننا حەبابە) بوو، خەڵکی مووسڵ بوو.

عەبدولقادر لە پیاسەیەکدا، منی بردە مەحەلەکە و منی ناساند بە فارس ئاغا... کە ئەویش پێشتر ناوبانگی بیستبووم و زۆری پێ خۆش بوو منی دیت. ئەوەبوو عەبدولقادر پێی گوت: بەڵکە ترومبێلێک، بە قیست، بۆ باکووری بدۆزییەوە... پێشەکی شتێکتان دەداتێ و ئەوی باقی، بۆی بکەنە کۆمپیالە و مانگێ مەبلەغێکتان دەداتێ! من پێکەنیم و لەگەڵ خۆمدا وتم: ئەو کابرایە، ئەوە بەتەمایە چیم لێ بکات! پێشەکی چی و قیستی چی؟ ئێ من مووچەیەکم هەیە و تەنیا منم لە ماڵمان هەموو پێویستی خواردن و جلوبەرگ و کرێی خانی و... و... تاد، بەتۆبزی بۆیان دابین دەکەم! جا قیست چۆن بدەم؟ بەڵام ئەوان لە مشتومڕی خۆیان بەردەوام بوون و فارس وتی: من بۆی پەیدا دەکەم! عەبدولقادر گەڕایەوە کۆیە! زۆری نەبرد فارس دزەیی هات لەگەڵ داودی کوڕی یووسفی مەشرووباتفرۆش. ئەو مام یووسفە ئاسووری بوو... لەمێژە لە هەولێر دوکانی فرۆشتنی هەموو جۆرە (خواردنەوە... عارەق- بیرە- وسکی...) هەبوو. کوڕەکەشی (داود)

فارس ئاغا بەکراسەوەیە

لەگەڵماندا بوو، لە سانەوی هەولێر، لە دوا ساڵانی چلەکان و ماڵمان لە (عەنکاوە) بوو- برادەرم بوو. ئەوەم باس کردووە پێشتر. جا (داود) بووە مووەزەف لە (مصرف الرافدین) لە هەولێر و ترومبێلێکی (فۆلکس واگۆنی) ڕەشی هەبوو. بەڵام بۆ دوکانەکەیان، چووبووە لای کۆمپانیاکەی عەزیز ئاغا بەمەبەستی ئەوەی (پیکاپ)ێکی بۆ ئیستیراد بکەن. (فارس)یش منی هەر لە یاد بووە- بەداودی گوت ئەو فۆلکس واگۆنە بدە باکووری- ئێمە ٥٠٠ دینار لە جیاتی تۆ، وەکو (پێشەکی) و (پیکاپ)ت دەدەینێ. باقی پارەکەش بە (قیست) بماندەوە. داود ڕازی بوو. سەیارەکەی بەجێهێشت بۆ من. فارس، لە جیاتی من ١٠٠ دیناری دایە عەزیز ئاغا، وەک پێشەکی (مقدمە) و لەسەریان کردمە کۆمپیالەیەک بە ١٠٠ دینارەکە و ٤٠٠ دینارەکەی تریش بەقیستی ١٥ دینار مانگێ کە بیدەمە عەزیز ئاغا بەکۆمپیالە.

زۆر سەیر بوو! لەپڕ، من ترومبێلم بوو، وەک ئەوەی فانۆسەکەی سیحراوی (عەلائەدین) بۆی هێنابم. جا سەیر ئەوەبوو نەشم دەزانی بیهاژۆم - فارس دوو سێ ڕۆژان لەگەڵمدا خەریک بوو، تا فێری گێڕ گۆڕین بووم.

بەخوا زۆر خەنی بووم بەو ترومبێلە جوانە! ئیتر پێی دەچوومە قوتابخانە... و بازاڕ... و بەهار هات زۆرمان سەیران کرد بۆ (مصیف) و شەقلاوە و هاوین بۆ گەلی... تاد

هەروەها پێی چووینە کۆیە و سلێمانی و کەرکووک...! مۆدێلی ترومبێلەکەم ئی ساڵی ١٩٥٧ بوو مانای وایە چوار ساڵێک بوو (تەمەنی!) کە لە ئەڵمانیاوە هاتبووە هەولێر... و کەوتە دەست من! ژمارەی لەوحەی (٣١٣ سلێمانی) بوو. گەراجیشمان نەبوو... ئەوەتا وەکو دەبینی لە وێنەکەی سەرەوە لەبەر ئەو دەرگایەی ماڵەوەمان ڕام دەگرت بەدرێژاییی شەو... ئەوەش دەرگایەکەی ماڵی (مام عەلی) بوو، کە پێشتر وتم گواستمانەوە ئەو خانووە، کە دەکەوێتە سەر کەندەکەی خوار چایخانەی عەنتەری ئەوسا! جا شەوێکیان کاک فارس دەعوەتی کردین، من و مام یووسف و کوڕەکەی، داود بۆ ماڵی خۆیان- دانیشتین و من عوودم بردبوو... مام یووسف لاوکی کۆنی دەگوت و باران لە دەرەوە هاژەی دەهات.

کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەر برد دوایی هەڵسایین بڕۆین، باران زۆر دەباری- کە گەیشتمە نزیک ماڵمان، سەیرم کرد کەندەکە وا هاتووە و بووە بە بەحر! هاژەی ئاو وەک هاژەی زێی گەلی عەلیبەگ زیاتر بوو! ئاوەکە لەوبەر، لە ژێر دیوار و دەرگای ماڵی ئێمەی

تیمەی برام، لە دواوەم وەستاوە و لەو لای دیکەوە، مناڵەکە یووسفی برای بچووکمە و یەک دوو خزم، لە بەر دەرگامان و لە تەنیشت ترومبێلەکەمەوە وێنەمان بۆ گیراوە- بەهاری ساڵی ١٩٦١- تەیراوە، بەردەم دەرگای ماڵەوەمان لە خانووەکەی مام عەلی

دەدا! من لەمبەرە لەسەر بەرزاییەکە وەستابووم. ئیتر بەهاوار و بەهۆڕن و بەلایتی سەیارەکە کە لە دەرگە و پەنجەرەکانی ماڵمانم دەدا، مناڵەکان و دایکم دەنگیانم بیست و هاتنە دەرەوە! من بەدەنگێکی بەرز پێم وتن ناتوانم بەترومبێلەکە بپەڕمەوە چونکە ژێر ئاو دەکەوین و هیچ شوێنێکی تر نییە پێیدا بێمەرە ماڵەوە. بۆیە ئەمشەو لە ماڵی فارس ئاغا دەمێنمەوە و دڵتان چ نەکات... خواحافیز! ئەوە بوو گەڕامەوە و لە ماڵی ئەو برایە عەزیزە مامەوە... تا بەیانی... کە باران وەستابوو... ئاوەکەش دابەزیبوو! هەزار سڵاو لە گیانی پاکی فارس ئاغا و هەموو برادەرانی ئەوسای ئازیز و دڵسۆز و دڵپاک! خوای گەورە بە بەهەشتی بەرینی خۆی شادیان بکات! ئەم باسانەم هێشتا هەر هەموویان لە ڕووداوەکانی ژیانم لە ساڵی ١٩٦١دان.

ماڵە دۆست و خزمان لە هەموو لایەکەوە کە دەهاتنە سەردانمان، دەچووینە سەیران و دەمانبردن بۆ لایەک لەم کوردستانە خۆشە.

هاوڕێی ئازیزم محەمەد مەلا سابیری کۆیی- کە لە مقاوەلات و قوم و چەگل فرۆشتن کاری دەکرد- کە بەسەردانێک لە کۆیەوە هاتە لام و میوانمان بوو، ئیتر بە دوو سەیارە: فۆلکس واگۆنەکەی من و شۆفەرلێتی کاک محەمەد ماڵ و منداڵمان بۆ سەیران چووینە کۆڕێ و شەقڵاوە- لە وێنەکەدا ئەوا دایکم و جوولێتی برازنم خێزانی فیلیپ و ماریە و وەردییە خوشکەکانم دانیشتوون و لە دواوەیان نەجوا و ست کەوکەب لەگەڵ باوکم، محەمەد و یووسف... وەستاون یادیان بەخێر! وێنەکەش، وەک بەعەرەبی لەسەری نووسراوە، لە بەهاری ١٩٦١دا گیراوە... لەسەر ڕێگەی نێوان هاوینەهەواری سەلاحەدین وکۆڕێ

له سانەوی هەولێر، کە قوتابی بووم، لە چلەکاندا، لەو برادەرانەی کە لەگەڵماندا بوون: عەولاپاشا بوو (ناوی عەبدوڵلا عەزیز ئاغا دزەیی) بوو، بەلام هەر بە (عەولا پاشا)مان گاز دەکرد. کە بوومە مامۆستا و نەقلی هەولێر بووم، ئەویش لە هەولێر بوو مووەزەف بوو! ترومبێلێکی (سکۆدا)ی ڕەنگ زەردی هەبوو ساڵی ١٩٦١ نیازی هەبوو بیفرۆشێ. فیلیپی براشم لە سەرچنار بوو، لە سەیارەیەک دەگەڕا، هەرزان بێ، بیکڕێ. کوڕی فیلیپ، کە ناوی (ئازاد) بوو، دایکم هێنابوویە هەولێر و لە لامان

ساڵی یەکەمی هاوسەریەتیمان- من و سوهامی خێزانم، لە سەیرانێکدا، وەک لەم وێنەدا دیارین، لە ناو ئەو گۆمە ئاوەداین کە لە ژێر تاڤگەکەی گەلی عەلی بەگە. ئایا ئەوە مانای زۆر کامەرانیمە؟ ئایا دڵم لەگەڵ بەزمەکەدایە؟ ئەم سەیرانانە وەک ئەرکێکن دەبێ بیانکەم چونکە دەڵێن خۆشەویستی دوای ژنهێنان دروست دەبێ!

دەژی لای دایکم زۆری خۆش دەویست. جا لە پشووی هاوینی ئەو ساڵە، فیلیپ و جوولێتی خێزانی هاتنە سەردانمان و سەردانی کوڕەکەیان... من بە برام وت کەوا برادەرێکم (سکۆدا)یەکی هەیە دەیفرۆشێ. ئەو ڕازی بوو بیکڕێ بەلام دوای تاقیکردنەوەی. جا عەولا پاشا دزەیی هەر لە بنەماڵە و خزمی برادەرم (فارس ئاغا) بوو. بەکاک فارسم گوت، وتی باشە پێی دەچینە دوورترین شوێن و سەیرانێکی پێ دەکەین و هەمووتان خواردن ئامادە بکەن و سبەی دێینە لاتان و هەڵتان دەگرین و دەڕۆین! بۆ ڕۆژی دواتر، عەولا پاشا بە(سکۆدا)یەکەی هات و فارس ئاغاش پیکابێکی هێنابوو بۆ کەلوپەل و بەزمی سەیران و لاندرۆڤەرێکیش و بەڕێ کەوتین بۆ (پێنجوین)- دایکم خواردنێکی زۆری کردبوو...فیلیپ لەگەڵ عەولا پاشا و من گەڵیاندا سواری سکۆدا بووین تاکو فیلیپ سەیارەکە تاقی بکاتەوە و گفتوگۆی لەگەڵ عەولا پاشای دەکرد چۆن و بە چەند... تاد لە پێنجوین، لە نێو باغ و باغاتێکی فێنک و خۆش، لێی دانیشتین و خواردنەوە و خواردنێکی زۆرمان نۆشی گیان کرد!

له ناو باخچەکانی شاری
پێنجوین لە هاوین ساڵی ١٩٦١
لە سەیرانێکمان: لە ڕاستەوە،
من بەتاقی فانیلەی بێ قۆڵ، لە
ناوەڕاست عەولا پاشای هاوڕێی
دێرینم و لەو سەرەکەی تر فارس
ئاغای هاوڕێ و خزمی عەوڵلا
پاشا

وێنەیەکی گشتیی
سەیرانەکەمانە لە پێنجوین لە
هاوینی ١٩٦١دا وا خاوخێزان
و منداڵەکان لەگەڵماندا
دانیشتوون، لە کاتی خواردن-
یادیان بەخێر

لە هەمان سەیرانمان بۆ پێنجوین
لەگەڵ خوالێخۆشبووان فارس
ئاغای دزەیی لە لای ڕاست، لە
تەنیشت سەیارە یووسفی برای
بچووکم لە بەردەم سەیارەکەیە.
لەولاشەوە، لە لای چەپ عەولا
پاشایە و بیر دەکاتەوە! ڕەنگە
ئەمە دوا سەفەری بێ بەو
ترومبێلە ئەگەر لە دوای ئەو
سەیرانە، فیلیپی برام لێی بکڕێ
و ڕێک کەون لەسەر نرخەکە!

## هاتنی بەدرەدین عەلی، موتەسەریفی نوێی هەولێر

هاوینی ئەو ساڵەمان خۆش ڕابوارد. پایز هات و ساڵی خوێندنی ١٩٦٢/١٩٦١ دەستی پێ کرد- من لە قوتابخانەی (سەفینی سەرەتاییی کچان) بووم کە شوێنەکەی ئێمڕۆ (ساڵی ٢٠٠٥)ە، (هوتێل شێراتۆن)ی لێ دروست کراوە.

موتەسەریفی هەولێر، (عەلائەدین مەحموود) گواسترایەوە بۆ بەغدا، بۆ پۆستێکی بەرزتر، و لە جیاتی ئەو، قایمقامی ڕەواندز- ناوی (بەدرەدین عەلی)بوو، کرایە موتەسەریفی هەولێر! ئەو کابرایە مرۆڤێکی زۆر خراپ دیار بوو هەر لە یەکەم ڕۆژانی دەست بەکاربوونی لە هەولێر!

چەند کەسانێکی هەولێریش دەورەیان دابوو بووبوون بە (سیخوڕ)ی بەوەفا بۆی، لە پێناو بڕێ پارەی بەرامبەر خیانەتکردنیان! خیانەت لەگەڵ هاووڵاتی خۆیان... خەڵکی سادەی هەژار... بێ تاوان، خەریکی کاسبی خۆیان، بێ ئاگا لەو داو و تەڵەی بۆیان دادەنرایەوە! خێزانەکەم یەکێک بوو لەوانەی، لە سادەییی خۆی و خەمخۆری و دڵپاکی بۆ فێرکردنی قوتابییان... تووشی داوێکی ئەو دڕندەیە هات و تا ماوەیەکی درێژ، ئێمە، تووشی ئازار و موعانات بووین!

بەدرەدین عەلی موتەسەریفی هەولێر
لە ٤/١٩٦٢ تاکو ١٩٦٤

مامۆستایەکی ئافرەتی دیکەش لە هەمان قوتابخانەی (سوهام) ناوی (ست کبییە) بوو- چاوی بەرایی نەدەدا، مامۆستایەکی سەرکەوتوو و خۆشەویست لە لایەن ئیدارە و مامۆستاکانی تر، ببینێ! چونکە هەر بەڕەگەز... و بەکردەوە، داخ و حیقدی لە دڵ بوو... مێردەکەی، هاوڕێم بوو خەڵکی هەولێر بوو، ناوی (عەبدولڕحمان عەبدوڵڵا کوبەچی) بوو. هەر لە ساڵانی دوای چلەکان

١٩٤٨،١٩٤٧ و تا ساڵی ١٩٥٢ له متوسطه و سانەوی هەولێر و ئینجا دوای سانەوی، لە کەرکووک دیسان هەر لە ماڵمان دەژی. بەدایکمی دەگوت (دایە)... وەک برام بوو. ژنەکەی، (کتبییە) لە وەزعی خۆی ڕازی نەبوو و دەیەویست مێردەکەی خۆی نەقلی مووسڵ بکات! ئەو مامۆستایە ناپاکە لە وەزیفەکەیدا، چاوەڕێی هەڵێکی دەکرد یا کردەوەیەکی وای دەکرد، کە ئەزیەتی مامۆستا سوهام بدات! جا ئەو هەلەی بەهۆی قوتابییەکی تەمبەڵ و نەفامەی قۆستەوە کە لە ئینگلیزی خراپ بوو بۆشمان دەرکەوت، کەوا خۆی و مێردی (هاوڕێم عەبدولڕەحمان، سەردانی موتەسەریفیان دەکرد و سیخوڕی (بەدرەدین عەلی) بوون! وەختێکمان زانی (موتەسەریف)ی نامەرد، تەبلیغی بەڕێوەبەرایەتی (معارف)ی کردووە کە مامۆستا (سوهام) عقووبەی بدرێتێ لەبەرئەوە، قوتابییان شکایەتیان لێی کردووە... لە مانگی ڕەمەزان، ئاوی- بەزۆر- دەرخواردی داون!

- ئێمەش لە گوێی گا نووستبووین، نەماندەزانی، ئەوا کتبییە و مێردی- هاوڕێم!- چ چاڵێکمان بۆ هەڵدەکەنن! کتابی ڕەسمی هات و چوویان بوو لە نێوان دائیرەی موتەسەریف و معارف و ئیدارەی قوتابخانە. ئەوەبوو ڕۆژێک (تبلیغ) هات بۆ سوهام کە ڕۆژی فلان مێژووی ئەوەندە لە بەردەم حاکمی فلان ئامادەبێ! وەک لەو تەبلیغەی (استقدام)دا هاتووە کە لێرەدا بڵاوم کردووەتەوە ڕۆژی (محاکمە)ی هات و منیش لەگەڵیدا چووم، کە چووینە بەردەم حاکم، سەیرم کرد حاکم (عەبدولقادر نوورەدین)ی برای (نیهاد نوورەدین ئاغا) بوو کە، کاک نیهاد لەگەڵمدا، لە (سانەوی) هەولێر، سێ ساڵ پێکەوە بووین، هەر لە پۆلی سێی ناوەندی و ئینجا چوار و پێنجی (بەشی ئەدەبی)ش، لە هەمان بیناکەی کەوا تاکە سانەوی بوو لە هەولێر. حاکم (عەبدولقادر)یش ناسرابوو بە حاکم (قەدۆ)، زۆر برادەر و خۆشەویستم بوو هەر لە ساڵانی ١٩٥٧ بەولاوە کە من مامۆستا بووم لە قوتابخانەی (متوسطة)ی کۆیە، ئەویش حاکم بوو لە کۆیە... و چەندەها جار، لە ماڵی ئێمە دادەنیشتین لەگەڵ هاوڕێیانی دیکەی وەک معاونی پۆلیس و بەڕێوەبەرانی قوتابخانەکان و هەندێ مامۆستای ئازیز...! جا کە

ئەو ڕۆژە لەگەڵ سوهام چووینە ژوورەکەی کەوا لە سەرای کۆنەکە بوو، هێشتا بینایەی تازەی (پارێزگا) هەر باسیشی نەبوو! کە منی دیت، لە پشت مێزەکەیەوە کەوتە قاقای پێکەنین و منیش هەروەتر! وتی: دانیشن! دانیشتین، بەرامبەری و ڕووی لە سوهام کرد و لێی پرسی: تۆ بەتۆبزی ئاوت دەرخواردی قوتابییانت داوە، لە ڕەمەزان؟ سوهام وتی نەخێر بەڵام لە کتێبەکەیان... وا... و... وا... وا، ڕاهێنان هەیە ئەبێ بەعەمەلی بیکەین- بەڵام دیسان من بەزۆر ئاویانم دەرخواردی نەداون. کاکە (قەدۆ) هەزار سڵاو لە گیانی پاکی بێت، بەڕاشکاوی وتی: من ئەو مەوقیفەم زۆر پێ ناخۆشە! دەزانم تۆ گوناهت نییە! بەڵام، بەڕاستی، بەدرەدین تێی گەیاندووم کە تۆ لە بەرامبەری و لە پێش چاوی بەتوندوتیژی قسەت کردووە... خراپ لێت گەیشتووە! بۆیە، حەز دەکەم (ڕووی لە من کرد) حەز دەکەم، پێش ئەوەی قەراری حوکم بدەم، هەر ئێستا بچنە لای و داوای لێبوردنی لێ بکە (بە سوهامی گوت). بڵێ: من عەسەبی بووم و بێزار بووم و... شتی ئاوا و داوای لێبوردن بکە و وەرنەوە لام! هەڵساین هەردووکمان چووینە لای (بەدرەدین عەلی) ناپەسند... من تۆقەم لەگەڵیدا کرد، چونکە منی دەناسی، لە دوو سێ شوێن، کاتێ تازە هاتە هەولێر، ئاهەنگی بۆ کرا، لە لایەن شارەوانی و لە یانەی ئازادی و شوێنی تر و من گۆرانیم گوت بە عەرەبی! ئیتر منی ناسیبوو!

وتی: (بە عەرەبی) أستريحوا. (واتا دانیشن).

دانیشتین و من قسەم کرد و بەعەرەبی تێم گەیاند کە خێزانەکەم دڵپاکە و مەبەستی چ نەبووە زۆر دڵسۆزە لە وەزیفەی... سوهامیش، بەهێواش پێی وت کەوا ئەو پەشیمانە جاری پێشوو کە هەندێ بەگرژی قسەی کردبوو لە پێشیدا. جا موتەسەریف ڕووی لە من کرد وتی: تۆ دەناسم، پیاوی باشی بەڵام ژنەکەت شیوعییە و لە کۆبە سەردانی (رابطە)ی ئافرەتانی کردووە! بەڕاستی سەرم سوڕما! پێم وت: سوێندت بۆ دەخۆم، سوهام دوورترین کەسە لە سیاسەت و لە هەموو بزووتنەوەیەکی حزبی. هەر ڕقی لە حزب و سیاسەت دەبێتەوە. سوهامیش ئیفادەی دا کە یەک جاریش سەری نە لە (رابطە) و نە لە هیچ مەقەرێکی حزبی نەداوە و تا ئێستاش. موتەسەریف نەرم بووەوە و من وەعدم دایێ کە خێزانم زیاتر نیزام جێبەجێ بکات و ئامۆژگارییەکانی جەنابت بەجێ بهێنێ! وتی زۆر باشە هیوادارم کارەکانتان دوور بن لە سیاسەت و شیوعییەت بەتایبەتی. فەرموون! هاتینە دەرەوە و چووینەوە لای حاکم قەدۆ! دیار بوو لەو ماوەیەی تا ئێمە لە (قاتی) دووەم لە ژووری موتەسەریفەوە تا هاتینە خوارەوە و هەیوانە درێژەکەی نهۆمی خوارەوەمان

بڕی تا گەیشتینە ژووری حاکم، موتەسەریف تەلەفۆنی بۆ کاک قەدۆ کردبوو و داوای لێ کردبوو کە عقووبەیەکی سووکی بدەیێ و داوای لێبوردنی کرد- ئەوە بوو بە حاکمم گوت: کاکە چووینە لای و داوای لێبوردنمان لێی کرد. حاکم وتی باشە ئەوا (حوکم) دای ئەی (سوهام حەننا) بە ١٥ دینار جەزا، یان ماوەی (لە بیرم نییە هەفتەیەک یان ١٥ ڕۆژ) حەبس، شتێکی وابوو. من پێکەنیم و ١٥ دینارەکەم لەسەر مێزەکەی دانا. ئینجا بە کاتبەکەی خۆی، ئیملای پێ نووسی کەوا بڕیارمان دا بە بەرەڵلاکردنی (المتهمة)... تاد بەڵام موعاناتمان هەر بەوەندە تەواو نەبوو!

چونکە، کە ئینقیلابی ڕەشی پیسی بەعسییەکان، کە ڕووڕەش بوون و دەروونی بۆگەنی ئاژەڵی خوێنخۆر و دەعبای وەحشی بوون... کاتێ شۆڕشی ١٤ی تەمووزیان (کوشت!) و بەناو شۆڕشی ڕەمەزانی خۆیان... کە دڕندەترین حوکم بوو لەو عێراقە ڕوویدا... کە بەزەبری تانک و دەبابە و جەیشی بەعسی خوێنمژ و هەتیو و سەرسەری و ناپەسندانی بەچەکەوە... خەڵکی بێ تاوانیان دەکوشت لە قارەمانەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمموز: لە عەبدولکەریم قاسمەوە تا مەهداوی سەرۆکی دادگای عەسکەری تایبەت و (ماجید ئەمین)ی مودەعی گشتیی عەسکەری لەو مەحکەمەیە و ... سەدەها ئەفسەر و سەربازی گەنجی ئەو وڵاتەیان لەناو برد و لە بەندیخانەکانیان لە ژێر ئازار و ئەشکەنجە دانیان، گیانیان لە دەست دا و زۆربەشیان بێ سەروشوێن کرد و زیندەبەچاڵیانکردن! جا هەر لە یەکەم ڕۆژی ئەو ئینقیلابەی سەربانی خوارد- لە ئاخیری- لە هەولێر، لە تەمەنی ڕووڕەشی هەولێر و (شوعبە خاصە) دەیەها پیاو و ئافرەتیان لە بەندیخانەی سەرای کۆن و لە قوتابخانەکاندا حەپسکردن- یەک لەو ئافرەتانەش، سوهامی خێزانی من بوو لە وەزیفەش فەسڵ کرا... زیاتر لە مانگێک، بێ حوکم و تەحقیقکردن و بێ سەبەبی مەعقوول حەپس کرابوون- ئێمەش تازە جمکێک منالّ- دوو کوڕمان- لە دایک بووبوون، هێشتا تەمەنیان تەنیا ساڵ و نیوێک بوو، لەبەر مەمکان بوون و شیری دایکیان دەخوارد، کە بەند کرا. جا دەبوایە بەیانیان، منالەکان ببەینە لای دایکیان، لە حەپسخانە و شیریان بداتێ... زۆر جاریش پۆلیسەکان نەیاندەهێشت، ئەو ڕۆژە سەبا و شۆبان (کە ناوی کوڕەکانمان بوو) بێ شیری دایکیان دەمانەوە و شیری قووتوومان دەدانێ! پاش مانگێک... فەرمان دەرچوو بۆ بەرەڵلاکردنی هەموو ئافرەتەکان لە بەندیخانەکانی عێراق! بەمجۆرە دایکی منالان هاتەوە ماڵ! بەڵام خوا تۆڵەی سوهام و سەدەها خەڵکی بێ تاوان... ئەوانەی کوژران بەدەستی حەرەسی ناقەومی یاخود بابڵێین (حەرەس قەومییەکی بێ شەرم و موتەخەلیف و

وەحشی)- خوا تۆڵەی هەموومانی لە (بەدرەدین عەلی) سەندەوە و ڕۆژێک، لە ڕادیۆ هەواڵی کوشتنی (بەدرەدین عەلی) دوژمنی یەکەمی کورد، بەدەستی پێشمەرگەکی پاڵەوانی ئەم کوردستانە، و لەبەر دەرگای ماڵی خۆی، لە ناوەڕاستی بەغدا، ڕووبەڕوو چەند گوللەیەکی دەمانچەی پێوەنا و لە ناو خوێندا... خوێنە چەپەڵ و بۆگەنەکەی، گەوزاندی! ئەمەش عەدلەتی خوا و باوکی فەقیر و هەژار و بێ دەسەلاتانە. دەک دەستخۆش پێشمەرگە. ڕۆژێک،

هێشتا سوهام لە حەپسخانە بوو، معاون پۆلیسی خانەقا، کاک سەلاح شەهاب، لەگەڵ پۆلیسێک، وەرەقەیەکی بۆ ناردم پێی دەڵێن (آستقدام متهم).

تیایدا بەعەرەبی هاتووە- هێشتا لە ئەرشیفمدا ئەو دیکۆمینتانەم پاراستوون- دەڵێ چونکە تۆ ناوت هاتووە لە ناو ناوی ئەو کەسانەی کەوا (تەعەدا لێکراوی بریندار) عەبدولڕەحمان عەبدوڵلا، بەحاکمی تەحقیقی ڕاگەیاندوون- داوات لێ دەکەین، بەزووترین کات ئامادە بی لە پێش حاکم تەحقیق... کە ئەوەم خوێندەوە، زانیم ئەو پیاوە، ئەسیر و موطیعی ژنیتی! ئەگینا چۆن دڵی هات ناوی (من) بدا و لەگەڵ ئەوانەی تەقەیان لێی کردبوو و بریندار بووبوو و لە نەخۆشخانە بوو- چۆن ناوی من دەدات و دەزانێت من نازانم- ئێستاشی لەگەڵدا بێ- دەمانچەیەکی زۆر بچووک و سادەش، بەدەستەوە بگرم و چۆن دەیتەقێنن. ڕۆژی پاشتر، چوومە دائیرەی حاکم تەحقیق، ئەویش هەر لە ژوورێکی سەرای کۆنە بوو- حاکمەکەش دیسان هەر برادەر بوو و دەیناسیم! کە چوومە ژوورەوە، وای زانی هەر وا بۆ سەردانی چووم بووم، وەک برادەرێک، یا ڕەنگە ئیشێکم پێی هەبووبێ! وتی فەرموو دانیشە. هەندێ ئەوراقی لە پێش بوو ئیمزای دەکرد- کە تەواو بوو، پۆلیسەکە چووە دەرەوە، کاک عەبدولڕەحمانی حاکم ڕووی تێ کردم و وتی: فەرموو کاک باکووری- وتم وەڵلا چ ئیشم نییە، بەڵام لەسەر داوای جەنابت هاتووم! ئەو سەری سوڕما وتی: من؟ کوا من نەم ناردووە بەشوێنتا!... وەردقەکەم دایێ کە خوێندییەوە... هاتەوە بیری کە من لە ناو ئەوانە ناوم هاتووەکە عەبدولڕەحمان عەبدوڵلای بریندار ناوی هێناون و شکی لێیانە کە ڕەنگە یەکێک لەوانە بێ، دایە بەر دەمانچە! حاکم ئینجا بە سەرسوڕمانەوە وتی: ئێ باشە، ئەوان هەموو تەوقیف کراون! ئەدی چۆن تۆ (تەوقیف)

نەکراوی؟ ئینجا بە ئیشارەتی دەستی وتی: دەەەستە هەستە بڕۆ کاکە! بڕۆ خۆت بزر کە، ئەو جارە بێیەوە لام، مەجبوور دەبم حەپست کەم و تەحقیقت لەگەڵدا بکەم! منیش پێکەنیم و دوعاخوازیم لێی کرد و چوومە دەرەوە!

پرسیم لە خەڵک و برادەرانی شارەزا، کە من چی بکەم لەم بەزمەی ئەو هەتیوە نامەردە بۆ منی دۆزیتەوە؟ گوتیان عیلاج ئەوەیە، بچیتەماڵیان، کە لە نەخۆشخانە دەرچوو و، تێی بگەیێنن کە تۆ ئاگات لەو شتە نییە و با دەعواکە دژی تۆ لە مەحکەمە (سقوط) پێ بکا و بڵێ من ئاگام لە خۆم نەبووە ناوی ئەوم (واتا ناوی من)ی داوە و هیچ داوام لەگەڵیدا نییە و لێی خۆش بووم.

ماڵی ئەو بێ پیاوەتییەش لە ناو ئەو خانووانەی حکوومەت بوو لە گەڕەکی (سەیداوە) کە بۆ مووەزەفان دروست کرابوون، دراوسێی ماڵی برادەری خۆشەویستم (فوئاد ئەحمەد)ی هونەرمەند و تایەر تۆفیقی ئازیزم... ئەوانیش لەو خانووانەیان وەرگرتبوو. جا کە عەبدولڕەحیم چاکتر بووەوە و گەڕایەوە کاولەکەی، لەگەڵ کاک فوئاد و پێم وایە دایکیشم هات، چووینە ماڵیان... پێشتر کاک فوئاد مەوعیدی لێ وەرگرتبوو. ئیتر چووین لە ژوورە بچووکەکەی میوانان دانیشتین من تۆقەم لەگەڵیدا کرد و ئەلحەمدولیلا بەسەلامەتی دەرچووی کاکە...!

ئیتر فوئاد و دایکم و من کەوتینە گلەییکردن کە چۆن تۆ ناوی من دەدەیتە حاکم... ئاخر من چما دەزانم دەمانچە چۆن بگرم؟ من هونەرمەندم، لە توانامدا نییە کێشکەیەک بکوژم، چ جای تۆ ئەی عەبدولڕەحیم! ئاخر چەندەها ساڵ ئێمە برادەر و نان و نمەکی یەکترمان کردووە... زۆر قسەمان کرد، وای بێ هات، شەرمەزاری وای لێ کرد گریا و فرمێسکی هاتنە خوار. وتی بەخوا، بەڕاستی من شکم لێت نەبوو! بەڵام... وتیان لەبەرئەوەی ئێمە بووینە سەبەبی تەوقیفی خێزانت... ڕەنگە تۆ... (قسەکانی تەواو نەکرد)... ئیتر ڕازی بوو وتی من لە تۆ خۆش بوویم و سبەی دەچمە سەرا و شەکوای خۆم لە تۆ دەکێشمەوە... بەمجۆرە... خۆم و خێزانم بەدەست ئەو ناکەسبەچەیە، چەند ساڵ لە ژێر ئیرهابی ئەو ژنە... ئەو بێ شەرمە بووین. جا خوا تۆڵەی ئێمەی لەوانیش سەندەوە! چونکە خۆی گواستەوە بۆ مووسڵ لەگەڵ ژن و مناڵەکانی و لەوێ تووشی نەخۆشی شێرپەنجە دەبێ و زوو دەمرێ و منالەکانی هەتیو مانەوە! دیسان دەڵێم: عەدالەتی ئاسمان و عەرشی خودا (یمهل و لایهمل). هەروەها مەتەڵێکی عەرەبیش هەیە و لە تاقیکردنەوە و تەجرەبەی ژیانمدا، بۆم ساغ بووەتەوە کە ئەو قسەیە ڕاستە و لە ڕووداوی زۆری لەم دنیایەدا ڕوویان

داوە و ئەنجامەکەی ڕاستە کە دەڵێ:« إن للظالم حدا » واتا زاڵم تا ماوەیەک، خوای خالیق مەودای پێ دەدا، بەشکم هۆشی بێتەوە سەر و چی تر زوڵم نەکات. بەڵام ئەگەر هەر بەردەوام بوو لە خراپەکاری و ئەزیەتدانی خەڵک، ئەوا یەزدان ئیتر مەجالی نادات و تەخت و کورسی خۆی و دارودەستە و خێزان و ماڵیشی لێ تێک دەدا و لە ناوی دەبا. عەبدولڕەحیم (هاوڕێم!) ماڵی کۆر بووەوە! لەگەڵ ئەوەش کە بارودۆخی خێزانیم تووشی ئەو ئیشە ناڕەوایە بووین کە بەدەستی هەندێ پیاوی حکوومەتی خراپ و ناحەز... زۆر خێزانیان ئاوا تووشی نارەحەتی دەکردن...

بەڵام من بەسەبر و هێمنم و هەمیشە تەحەممولی تەگەرە و هەندێ جار گرفتی زۆر خراپ و بەڵکە وا بووە دڵ و دەروونم پێیانەوە بریندار بوون... کەچی، خۆم بۆ خۆم دەڵێم «ئەوەش تەواو دەبێ! لە کۆتایی ئینشاڵڵا باش دەبێ!»

***

لەگەڵ تیپی هونەری هەولێر، کە ئێستاکە ناوی دەرسیم نەما لەبەر موتەسەریفی بەدڕەوشت... ناوی ئەو کۆمەڵە هونەرمەندانە کە تیپەکەی لێ دامەزرا، ناوی هەولێری لێ نرا... و منیش لە بۆنەی گشتی، لە بەشداریکردن لەو چالاکییانە دوا نەدەکەوتم. وەک ئاهەنگی (معونة الشتاء) کە لە سەرەتای هەموو زستانێک، سەرۆکایەتیی شاردوانی، بەناوی موتەسەریفیەتیشەوە، ئاهەنگێکی ڕێک دەخست و بلیتی بە پارە دەفرۆشت و لە زەنگینەکان، بێ بلیت، مەبلەغێکی زۆر بەناوی بەدرەدین عەلی-یەوە لێیان دەستاندن و ئەوانیش لە ترسا دەیاندا، بە هەنجەتی ئەوەی، ئەو پارەیە دەدرێ وەک یارمەتی بۆ هەژاران و ڕەش و ڕووتان، تاکو بۆ زستان جل و خواردنیان تەئمین بکەن! بەڵام هەموومان دەمانزانی ئەو پارەیە کێوە دەچوو و چەندی بۆ هەژاران خەرج دەکرا! وەک مەتەڵەکە دەڵێ «لە حوشترێک، گوێچکەیەکی بەبەرکەوت». بارودۆخی کوردستان زۆر خراپ بوو... تەنانەت کەلوپەلی سەرەکی و خواردنی ڕۆژانەی خێزانان وەکو شەکر و چاو برنج و قوتووی ئاوی تەماتە... تاد، ئەمانە هەموو، بەئەمری موتەسەریف کرانە مانگانە بە (بطاقه)- ئەو خواردنانە و شتی پێویستی سەرەکی ژیان، بە ژماردن دەدرانە خاوەن دوکانەکان و مەخزەنەکان... ئەوانیش بە بیتاقەی تایبەت مانگانە پێیان دەفرۆشتین- ئەو کارەش، گوایا، بەگوێرەی عەقلی پۆخڵاوی موتەسەریف و دەزگای ئاسایشی بێ حورمەت و بێ ئەخلاقی ئەوسا و بەپێی بۆچوونیان، بەم کارەیان، ناهێڵن ئەرزاق و خواردن بچێت بۆ شاخ و بۆ گوندەکانی کوردان کە پێشمەرگەیان تێدایە... تاکو پێشمەرگە لە برسا و لە سەرما

بمرن... یان خـۆیان تـەسلیـمی حکوومـەت بکـەن! پەحـا... لەو بێ عـەقـلانە! چەند لە مەدەنییەت و شارستانییەت و ڕۆشنبیری، دوا کەوتبوون! ئینجا بۆیە ئێستا خۆیان شاردووەتەوە لە ناو کونەڕێوی و ئەشکەوتی پڕ زبڵ و مار و دووپشک و ناوێرن خۆیان دەرخەن لەبەر میللەت! سەرشۆڕ و بێ کەس ماونەتەوە... میللەتیش، هەر سەرفراز دەبێ و بەخۆشی دەژی و ئەو ئیرهابەش نامێنێ و تەفرو‌توونا دەبن، بەحەول و قووەتی خوا... و ئیرادەی خێر و کۆششی دڵسۆزانی میللەت!

لەگەڵ خێزانەکەشم گەلێ جار بەینمان تێک دەچوو و دەگەیشتە هەیت و هاوار و ناخۆشی- چونکە من زۆر دەچوومە دەعوەت و ئاهەنگی خەڵکی شار و لێپرسراوان... لەگەڵ هونەرمەندی دەنگخۆش حەیدەر و تایەر تۆفیق! ئەو کارە، لە ماڵەوە لێمان دەبووە مشتومڕی خۆم لەگەڵ دایکم و خوشکانم و خێزانم من گوێم نەدەدانێ! بەخۆمم دەگوت: «گوێی مەدەرێ! ئەوەش تەواو دەبێ».

ئینجا سەیرت دەکرد، دوای چەند ڕۆژێ بارودۆخ ئاسایی دەبوونەوە و دەرفەتێک دەهاتە پێشەوە و دەمبردنە سەفەرێک یا سەیرانێک. ئەم وێنانەی خوارەوە بەڵگەی ئەو قسانەمن! وێنەکان لە بەهاری ساڵی ١٩٦١ دابوو... خێزانم زگی هەبوو... بۆ ڕابواردن چەند ڕۆژێ چووینە سلێمانی و سەرچنار، بۆ ماڵی کاک ولیەم و فیلیپی برام.

لەسەر ئاوەکەی سەرچنار- بەهاری ساڵی ١٩٦١، ١- سوهام ٢- ولیەم یۆحەننا ٣- لە تەنیشتی ولیەم، لەو سەرەوە: تیمەی برامە ٤- من لە پێشەوە وەستاوم ٥- فیلیپی برام دانیشتووە

ئەو گەشتە خێزانییەمان بۆ سەرچنار، لە بەهاری ساڵی ١٩٦١- ١- سوهام ٢- خۆم ٣- ولیەم چاویلکەی ڕەشی لە چاوە ٤- داود ئیشایا کوڕی ئامۆزای باوکمە- ئەوسا لە هەولێر (ئەفسەر) بوو، لە گەڵماندا- لەماڵمان دەژیا

ئەم وێنەیەش لێرەدا و ئەوانەی دیکەش، دیمەنێکی جوان و دڵگیری ئاو و سەیرانگاکەی سەرچنار نیشان دەدات کەوا من وا لێرە لەگەڵ سوهام لەسەر هەندێ بەرد و چەگل لە ناو ئاوەکە وەستاوین. سەرچنار ئەوسا سروشتێکی سادە و بێ قەرەباڵغی و یەک تاکە کۆڵیتیشی لێ نەبوو. ئاوێکی زۆر وەکو (زێ)یەک بوو و پڕ بوو لە ماسی... کە هەندێکیان دوو، سێ و چوار و پێنج کیلۆشیان دەکێشا. بەتایبەتی بە وەرزی سەرما و سۆڵەی زستان، وەک دەبینی لەم وێنانەماندا، چۆل و هۆڵە و کەسێ نییە لە ناو ناوچەکە جگە لە خۆمان. تەنیا ڕۆژانی جەژن، ئەگەر لە بەهارێکی هەتاوی یاخود لە هاوینا ڕێک کەوتبایە خێزان و ماڵ و مناڵ، لە سلێمانییەوە دەهاتن، بەتاکسی و چەند ساتێکی خۆشیان لێرە ڕادەبوارد لەسەر ئەو ئاوە ساف و بێگەرد و سارد و شرینە! خۆزگەم بەوساکە!!

له بەیانی ڕۆژی ١٩٦١/٥/٣- سوهامی خێزانم جمکێک- دوو کوری بوو، له ماڵەوەمان له خانوودکەی مام عەلی که لەسەر کەندەکه بوو وەک پێشتر باسی شوێنەکەم کردووه. بەیانی زوو چوومه ماڵی دکتۆره ئومەیه، که هەر ئەو، لەو ماوەیەی حەملی سوهام خۆی دختۆرەی بوو و ئیستشارەی دەکرد. دکتۆرەم هێنا ماڵەوه و هەر له ماڵ منالەکانی بوون و به سەلامەتی- ئەلحەمدولیللا. یەکیان سەعات ٧,٥٠ دەقیقه هات و ئەوی تر دوای نزیکی ١٠ دەقیقه گەورەتره، ناومان لێنا شۆبان که ناوی مۆسیقارێکی پۆلۆنی ناسراوه و پیانۆژەنێکی لێهاتوو بوو- تا ئەمڕۆ کۆنسیرتەکانی پیانۆی (شوبان) له هەموو جیهان، تیپەکانی وڵاتانی دنیا پێشکێشیان دەکەن له ئاهەنگی تایبەت بەڕۆژی له دایکبوونی، یان له ئێزگه و ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکان پەخش دەکرێن. من خۆم، چەند قەوانێکی ئەو کەڵەهونەرمەندەم هەیه که کۆنسیرتی پیانۆی جیا جیایان لەسەر تۆمار کراوه- هەر ماوەم هەبێ گوێیان لێ ڕادەگرم. کوڕەکەی تر ناومان لێنا سەبا- که له مەقامی سەبای شەرقییەوەیه، کوردیش بەکاری دێنن.

بەهاتنی ئەو دوو میوانه... ئەو جمکه، ژیانی من کەمێک گۆڕانکاری تێدا دروست بوو بۆ نموونه: زیاتر له ماڵ دەمامەوه نەدەچوومه هەموو دەعوەتێک. هەروەها دایکم و

وێنەی هەردوو کوڕه- جمکەکانمان، له ڕۆژی ١٩٦١/٦/٣ له حەوشی ماڵی باوکی سوهام، له گەڕەکی فەیسەڵییە گیراوه من سەبام هەڵگرتووه و دایکیشیان شۆبانی له باوەشه. تەمەنیان یەک مانگی تەواوه

خوشکەکانم تەنانەت براکانم و باوکم مەشغوولیان دەبوو و یارمەتییان دەداین لە بەخێوکردنیان، ماری خەریکی شۆبان دەبوو. وەردییەش خەریکی سەبا دەبوو.

بەڵام لە هەندێ بۆنەی فەرمیی نیقابەی مامۆستایان کە زۆر ئیعتیمادیان و تەرکیزیان لەسەر من دەکرد، دەچووم و بەخۆشییەوە بەشداریم دەکرد. ئەم کتابەش نموونەی یەکێکە لەو موناسەبەتانە، کە نەقابەی مامۆستایان لێژنەی ڕێکخستنی ئاهەنگ، نوسخەیەکیان بۆ من نارد تاکو بەشداری لە ئاهەنگی یارمەتیدانی زستانی (معونة الشتاء) بۆ هەژار و کەمدەرامەتەکان...

الجمهورية العراقية

لجنة تنظيم حفلات نقابة المعلمين
بمناسبة معونة الشتاء
العدد/ ١
التاريخ ١٠/١٢/١٩٦١

الى / متصرفية لواء اربيـل ـ الجمعيات
الموضوع / حفلة

ان هذه اللجنة تبذل قصارى جهدها لانجاح الحفلات التي تنظمها بمناسبة معونة الشتاء بهذه المناسبة اظهر الاستاذ باكوري (مدرس متوسطة زازا) استعداده للمشاركة في هذا المشروع الخيري الانساني لذا ترجو اللجنة من سيادتكم التفضل بالامر الى السيد طاهر توفيق كاتب التحرير ن لا ديباتكم للمساهمة في هذه الحفلات ولكم مزيد الشكر ..

معروف عبدالله
رئيس اللجنة

صورة منه الى/ـ
/ الى مديرية معارف لواء اربيـل ـ للتفضل بالعلم
الاستاذ باكوري / مع الشكر

ئەوەش هەمیشە لە پایز ڕێک دەخرا، پێش هاتنی زستانی سەخت و سارد و باران و بەفر! بەبێ ئەوەی مەدحی خۆم بکەم، بەڵکو بەبۆچوونی خەڵکیش هاتنی من بۆ هەولێر،

منهاج حفلة نقابة المعلمين / بمناسبة معونة الشتاء /

١٧/١٢/١٩٦١

كلمة لسيادة متصرف اللواء / ورئيس اللجنة العليا لمعونة الشتاء
نشيد احنا الشعب كورد، عرب من قبل مدرسة خانزاد ـ للبنات
رقصة غربية من قبل مدرسة الايوبية ـ للبنات
قطعة موسيقية من قبل فرقة النقابة ..
نشيد علتي عراق من قبل مدرسة سفين ـ للبنات
رقصة غربية من قبل مدرسة ئازادي ـ للبنات
وصلة غنائية من قبل الاستاذ طاهر توفيق .
فعالية بمناسبة يوم معونة الشتاء من قبل مدرسة سفين ـ للبنات
نشيد قطرنا الجميل من قبل مدرسة روناكي ـ للبنات
رقصة تانكو من قبل مدرسة خانزاد ـ للبنات
وصلة غنائية من قبل الاستاذ باكوري
رقصة غربية من قبل مدرسة سفين ـ للبنات
نشيد داية من قبل مدرسة الايوبية ـ للبنات
دبكة كوردية من قبل مدرسة روناكي ـ للبنات
الختام "بالسلام الجمهوري

ئەوەش بەرنامەی ئەو ئاهەنگەی بەبۆنەی یارمەتیدانی هەژاران، لە زستاندا، واتا (معونە الشتاء)ە کەیە کە من و تایەر تۆفیق بەرەسمی دەعوەت کراین لە لایەن موتەسەریفەوە، لەسەر پێشنیازی لێژنەی ئاهەنگانی نەقابەی مامۆستایان هەروەها چەندین چالاکیی تریش لەم ئاهەنگەدا پێشکێش کران.

کرد و بوونە هۆی دامەزراندنی چەند لیژنەی ڕاپەڕاندنی هەموو بەشەکانی هونەر: وەک لیژنەی مۆسیقا لە هەولێر کە بەسەرپەرشتیی من بوو، لیژنەی (الخطابة و التمثیل) بەسەرپەرشتیی مامۆستا جەواد ڕەسووڵ ناجی- و چەند لیژنەیەکی تر وەک لەو کتابەی لێرەدا دامناوە کە بەڕێوەبەرایەتیی مەعاریفی هەولێر دەری کرد لە ١٩٦١دا.

## کەی و چۆن گۆرانیبێژی بەناوبانگی، هەولێر (حەیدەر)م ناسی؟

هەر لەو ساڵەی ١٩٦١دا و رۆژێک کاک تایەر تۆفیق هاتە لام و گوتی: سبەی شەو دێم بەدواتدا و دەچینە ماڵە برادەرێکی خۆشمەشرەب و ئەریەحی و بەزەوق. چەند کەسێکی برادەری وەک خۆی و من و تۆشی دەعوەت کردووین. ئەوەبوو، لەسەر مەوعید، ئێوارەکەی دوایی کاک تایەر هات و منیش عوودەکەم هەڵگرت و هەر بەپێیان رۆیشتین... گەیشتینە ماڵەکە و سەیرم کرد دەرگاکە نیوەی کرابووەوە و پیاوێکی کورتیلەی خڕیلەی ورگ گەورە و دەموچاوێکی سووری رووممەت خڕ وەک پف دراین، ئاوا بوون و دەم بە پێکەنین لە لای ژوورەوە، لە گەراجەکە وەستابوو! کاک تایەر پێشکەوت و تۆقەی لەگەڵ کرد و ئینجا منیش دەستم درێژ کرد بۆ تۆقەکردن کاک تایەر وتی: ئەوە دختۆر رەئووف دیشچییە... مامۆستا باکوورییە... دختۆر پێکەنی و گوتی ناوبانگمان بیستووە و زۆر کەیفخۆش بووم بەهاتنت! گەورەت کردین! سوپاسم کرد و وتم: لە گەورەییی هەستی خۆتەوەیە، دختۆر! ئیتر پێشمان کەوت و چووینە ژووری میوانان، جەماعەتێکی زۆر دانیشتبوون و پێوەیان دیار بوو، پیاوماقووڵ و رەنگە مووەزەفی گەورەش بن! من وای بۆ چووم! ئیتر سەلاممان کرد و لەسەر قەنەفەیەک دانیشتین. هەموویان بەخێریان هێناین و کاک تایەر تۆفیق بەوانیشی گوت: ئەوە مامۆستا باکوورییە! دووبارە، بەناو، ئەمجارە بەخێریان هێنام: بەخێر بێی مامۆستا باکووری!

دختۆر رەئووف چووە دەرەوە و پێشوازی لە میوانان دەکرد. زۆری پێ نەچوو، دوو میوان، بەدووی یەک هاتنە ژوورەوە... ئەوەی پێشەوە مرۆڤێکی کەڵەگەت و بەقەڵافەت و رووممەت سوور و سپی جوان، مشکییەکی خەت خەتی رەشی گەورەی لە سەری پێچابوو، چاکەت و کەوایەکی رەنگی رەساسی لەبەر بوو و قایشێکی لە پشت بەستابوو. کاک تایەر بە دەنگێکی کەمێک نزم، لە بن گوێم، وتی: ئەوە حەیدەرە کەچەڵی گۆرانیبێژە! پیاوەکەی تر کە لە دوای بوو، بەپێچەوانەوە پیاوێکی لاواز و کورتیلە... دەموچاو باریکەلە... ئەویش وەک حەیدەر چاکەت و کەوای لەبەر بوو لەگەڵ جەمەدانییەکی لەسەر- کاک تایەر وتی: ئەوەش موحسینی برایتی! ئیتر، هەردووکیان بۆ لای ئێمە هاتن.

حەیدەر تۆقەی لەگەڵ کاک تایەر کرد و ئینجا لەگەڵ من. کاک تایەر وتی: ئەوەش کاک

هونەرمەند حەیدەر بەقاڵ

باکوورییە! کاک حەیدەر وتی: «خۆمت تەقدیم دەکەم: حەیدەرە کەچەڵ!».

ئەوەش موحسینە کەچەڵی برامە! من و تایەر و یەک دوویێکیش لەوانەی نزیکمان بوون، مردین لەبەر پێکەنین! بەڵام حەیدەر هیچ نەشێوا و دانیشت لە تەنیشتەکەی دیکەم و موحسینیش لەولای برای دانیشت! لەوانەی ئەو شەوە لەو ماڵە دەعوەت بوون، ئەوانەم دێنەوە بیر: حاجی حەمەشەریف، حەمەرەشیدی عەبۆ ئاغا، دکتۆر حیکمەت حەکیم (ئەوەم پێشتر دەناسی)، دکتۆر عەبدولرەزاق (ئەوەش هەر لە سانەوی هەولێر لە یەک پۆل قوتابی بووین- لە پۆلی سێی ناوەندی)- لە پۆلی چوار و پێنجیش ئەو لە بەشی زانستی بوو، من لە ئەدەبی ئینجا لە دانیشتووەکان: دکتۆر محەمەد شێخۆ، دکتۆر ئاگۆب نیشان (ئەرمەنی بوو برادەر بووین)، حەمەدەمین عەبۆ ئاغا (ئەوەشم لە قوتابخانەی سانەوییەوە هەر لە پۆلی سێیەوە تا دواقۆناغی ئەدەبی هەر بەیەکەوە بووین، پێم وایە لە میوانەکانی تر: مودیری پۆلیس عەبدولقادر نەجدی بوو و دکتۆر ئیحسان میرزا... تاد. ئیتر، بەڕاستی ئەو شەوەم لە بیر ناچێت. ئەوەندەم عوود لێ دا بۆ کاک حەیدەر و تایەر... گۆرانی و مەقام و قۆریات لە کۆڵانەکە دەنگیان دەدایەوە. هەر لەو شەوەوە دەنگی حەیدەرم خۆش ویست... چریکەدار و لەسەر چینێکی بەرز و ناسک و بێ نشاز زیاتر بەتورکی قۆریاتی دەگوت و بەستە خۆشەکانی جەلال بەگی هونەرمەندی ناوداری تورکیا... ئەوانی سەرقەوانەکانی زۆر لەبەر بوو - وەک جەلال بەگی دەگوتن و لاسای دەنگی ئەوی دەکردەوە! هەر لەو دانیشتنەی ئەو شەوە، کە بینیم دەنگی ئەو پیاوە دەنگێکی ئاسایی نییە! کە لە چڕینی مەقامێک هەڵدەستا و دەنگی دەگەیشتە بەرزترین نۆتەی مۆسیقا یاخود بڵێین بەرزترین تەبەقەی دەنگ، من ئینفیعالم دەکرد و عوودەکەشم لە دەستما سەمای دەکرد و خەریک بوو لە کۆشم دەرپەڕێ و لەگەڵ دەنگی حەیدەر بچێتە سەرێ بۆ... ئاسمان!

کە ئەو حەیدەرە ئەعجوبەیەک بوو... ویستم شتێکی نوێ وەک دیاری پێ ببەخشم... گۆرانییەکی نوێ، کە لە گۆرانییە ڕەسەنەکانی تورکی ئەستەمبۆڵییە و حەیدەر ئەو شەوە

نەیگوت، زانیم کە ئەو بەستەیە نازانێ! من ل، سالی ١٩٥٠ لە کەرکووک فێری بووم لەگەڵ هونەرمەندانی کەرکووک، کە لە دانیشتن و ئاهەنگەکان دەیانگوت! گۆرانییەکەش دەڵێ: «گەزدگم تکا نلی ئاشک یۆللەرندە...»

جا پێم گوت: حەیدەر گوێ لەو گۆرانییە ڕاگرە و حەز دەکەم فێری ببیت. جا کە بۆم لێدا بە عوود و خۆم گوتم، زۆر دڵخۆش بوو... وردە وردە لەگەڵمدا دەیگوت. ئەو شەوە کەمێکی فێر بوو. چونکە حەیدەر نەخوێندەوار بوو. نووسینی نەدەزانی، بۆیە هەر لە زاری منەوە، بەچەندەها دانیشتن بەتەواوی فێری بوو. ئیتر لە هەموو ئاهەنگێک پێکەوە ئەو بەستەیەمان دەگوت و گوێگرانمان خۆشیان ویست. پێش ئەوەی هەستین بڕۆین... حەیدەر وتی حەز دەکەم بۆ سبەی نیوەڕۆ، لە ماڵمان نان بخۆین پێکەوە، تۆ و تایەر و کێی تریشی خۆت لەگەڵ خۆت دەهێنی، ماڵی براتە! من حەزم نەکرد ئەو ماندووبوونە و ئەو زەحمەتەیان بدەمێ، بەڵام ئەو و موحسینی برای زۆریان پێ خۆش بوو بەڕاستی و زۆریان لەگەڵمدا کرد و لەگەڵ کاک تایەر تۆفیقیش ئیلحاحی کرد، کاک حەیدەر. ئیتر خاترمان نەشکاند و ڕازی بووین! ئینجا مایەوە سەر ئەوەی لێی پرسیم: حەزت لە چ خواردنێکە؟ من پێکەنیم و وتم: برام هەر چ خوا بدا... و تۆ و ماڵەوە ئامادەی بکەن، ئێمە دەیخۆین! لێرەش دیسان زۆری لێم کرد و وتی هەر دەبێ پێم بڵێی حەزت لە چ جۆرە چێشتێکە تاکو بۆت لێ بنرێ! بۆچی شتێک لێنێین و تۆ حەزی لێ نەکەی؟ وتم حەیدەر، بەڕاستی بەڕاستی من حەز لە ساوار بەگۆشت بەرخ و تەرەپیاز و نانی خۆمانە و ماستاوی هەولێر دەکەم! حەیدەر پێکەنی و لەگەڵ موحسینی برای بەتورکی قسەی کرد، کەمێکی لێ تێگەیشتم وکە پێم وابێ بەموحسینی گوت: «تو-خوا وەرە... بزانە خواردنی چ داوا دەکات! ساوار! دەعوەت و ساواریان گوتووە؟ ئینجا ڕووی لە من کرد: گوتی ساواری چی کاک باکووری... ئەوە دەعوەت نییە بەساوار لێنان! قەشمەری مەکە: گوتم کاکە حەیدەر تۆ من دەعوەت دەکەی من مەمنوونت دەبم ئەگەر ساوارێکی کوردەواری باشم دەرخوارد بدەی...

درێژی زیاتر پێ نادەم بۆ سبەی نیوەڕۆ، کاک تایەر تۆفیق هاتە ماڵمان و پێکەوە چووین و تیمەی برام و مەتی ئامۆزاشم هاتبووە لای تیمە، ئەوانیشمان بردن و چووینە ماڵی کاک حەیدەر... لە ناو کۆڵانێکی پشت قوتابخانەی سانەوی کچان کە لە سەرەتای گەڕەکی تەیراوە بوون دوو خانووی شەرقی، لە تەنیشت یەک. یەکیان ماڵی حەیدەر بوو کە لەوێ دانیشتین و ئەویتر ماڵی کاک موحسینی برای بوو. کە چووینە ئەوێ،

لەگەڵ ئەم نووسینەم لەو ڕۆژی، لە ماڵی حەیدەری هونەرمەند، پڵاو ساوارمان خوارد،
لەسەر ئەو مێزەی لە وێنەکەدا دیارە. ١٩٦١- گەڕەکی تەیراوە.
لە ڕاستەوە: ئەبو عەلی، مامۆستا مەتی ئامۆزام، حەیدەر، باکووری، تایەر تۆفیق و
تیمەی برام

بەخێرهاتنیان کردین و مامۆستایەکیش لەوێ بوو ناوی ئەبو عەلی بوو، مووەزەفی مەعاریفی هەولێر بوو... مرۆڤێکی دڵپاک و ڕووخۆش و هێمن و خۆشەویست بوو... زگورتی بوو لە هوتێل فەرح لە ژێر قەڵا، تەنیشت چایخانەی حەسەن ڕەزا بوو کە ئێستا ناوی چایخانەی مەچکۆیە، ژوورێکی گرتبوو، هەر لەو ژوورە بەتەنیا دەژیا.

لەو ڕۆژەوە، لەگەڵ حەیدەر میزاج و ڕۆحم تێکەڵ بوو و ئەویش هەروەها، ڕۆحمان لە لای یەکتربوو. ئەگەر دەعوەت بکرابایە بۆ ماڵێک یا سەیرانێک، دەیپرسی: بە باکووریت گوتووە؟ ئەو بێ، من دێم. ئەو نەیێ منیش پێم لەگەڵتاندا نایێت! سەیران و ڕابواردنی ئەو کاتیش زۆر بوو و بەکۆمەڵ بوو! دختۆرەکان پێکەوە ڕۆژێک ڕێک دەکەتن و ئێمەشیان دەعوەت دەکرد، من و حەیدەر و کاک تایەر. ڕۆژێکی تر مووەزەفەکانی بانکی ڕافیدەین، دەچوونە سەیران و دەعوەتی هەر سێمانیان دەکرد... ئیتر بەم جۆرە: ئەندازیاران، ئاغاکان... هەر چینە و سەیرانی خۆیان... ئەوە تووشی گرفتی دەکردم لە ماڵەوە! دەیانگوت: هەر خۆت خۆش ڕادەبوێری. ئێمەش بەند کراوین لە بەندیخانە! بەتایبەتی ئەگەر شەوان درەنگ چووبامەوە... ئەوە هەر مەپرسە، لەسەدا سەد دەبووە هەرا و گرژی و تووڕە بوون! حەیدەریش هەر وا، زۆر جار موشکیلەکەی بۆ من دەگێڕایەوە... کە ماڵەوە لێیان دەبێتە هەرا و هاوارکردن! بەڵام نەدەکرا بۆ ئەوان، ئێمە لە دۆست و برادەرەکانمان دابڕێین.

سەیرانێکە بۆ دەوزێی کەڵەک... برادەرە
ئاغاکان، ئەو بەرخەشیان هێنابوو... لەوێ
سەریان بڕی و کرایە بەربەسێر... حەیدەر
لەن اوەڕاستە، قۆچەکانی بەرخەکەی
گرتووە، و لە تەنیشتی لای چەپی واتا لەلای
ڕاستی وێنەکە، فارس ئاغای دزەیی و لە لای
چەپیشەوە، خزمێکی کاک فارسە...
بەهاری ساڵی ١٩٦١

ئاهەنگی ڕۆژی جیهانی مۆسیقا
پایزی ١٩٧٦ لە هۆڵی سەرکەز شەبابی هەولێر

له یانەی ئازادی ٢٥/٣/١٩٦٨

من و حەیدەر لە ئاهەنگی ڕۆژی جیهانی
مۆسیقا لە هۆڵی مەرکەز شەباب ئێستا
وەزارەتی ڕۆشنبیرییە
ت١ ١٩٦٧ هەولێر

له نێو ئەو کەسایەتییە بەڕێزانە و پیاوەماقوولانەی کە دۆستایەتییەکی توند و برادەرایەتییەکی گەرمم لەگەڵیاندا دروست کرد و تەنانەت بەخاوخێزانیشەوە، لەگەڵیاندا هاموشۆمان دەکردن و دەهاتنە لامان... لە بۆنەی خۆشی و جەژن و سەیران... تاد ...دختۆر ئاگۆب نیشان میناسیان و دختۆر ئیحسان میرزا بوو... هونەرمەند کاک فوئاد ئەحمەد و میساک بەرگدروو، عەبدولقادر جێمسی سقاول، پۆلس ئەجزاچی (واتا صیدلی)، ئیسماعیل ئاغا یەعقووبی، مامۆستا مەجید ئەحمەد ئاسنگەر، مامۆستا سدیق عەبدولقادر، و کاک ئیحسان موفتی، شێخ حوسێن قەرەداغی- بێژەری پێشتر لە ئیزاعەی کوردی بەغدا، و زۆری تر لە خاوەن زەوق و خولیای ڕابواردنی خۆشی تر... ئەم دەعوەتەی کاک دکتۆر ئاگۆب کە دەعوەتی کردووین بۆ ئاهەنگی لە دایکبوونی میناسی کوڕی، لە ماڵی خۆیان، نموونەیەکی ئەو دەعوەتانە بوو کە بە دەستم دەگەیشتن. هەزار سڵاو لە ڕۆحی پاکیان بێ، ڕەحمەتیان لێ بێ، ئەوانەی ئەم دنیایەیان بەجێ هێشتووە... کۆچی دواییان کردووە... تەمەنی درێژیش بۆ ئەوانەی هێشتا لە ژیاندا ماون... یارەبی تەندروستیان باش بێ و هەر بەخۆشی ژیان بەسەر بەرن!

Dr.
A. N. Minassian
M.B., Ch.B. Baghdad
D.C.H. London

الدكتور
آكوب نيشان ميناسيان
دبلوم اختصاص بامراض الاطفال
من كلية الاطباء والجراحين الملكية - لندن

اسم المريض
التاريخ

لەو کەسانەی کە لە هەولێر ناسیمن، بەبۆنەی جۆراوجۆر، هەمووشیان موناسەباتی ئاهەنگی و ئامادەبوون لە تیپی مۆسیقا و لە ماڵان بەبۆنەی بووکهێنان و جەژنی نەورۆز... تاد لە کاتی بێ ئیشیم و ئەگەر مەوعیدم نەبوایە لەگەڵ کەس، عەسران دەچوومە ستۆدیۆی کەمال بۆ وێنەگرتن کە لەسەر قوژبنی جادەکەی کەوا لە فولکەی کۆتری ئاشتییەوە بەرەو منارەی چۆلی دەچێت و بەرامبەر باڵەخانەکەی خوالێخۆشبوو شەریف جامباز بوو- لەوێ لەگەڵ مامۆستا و هونەرمەندی عوودژەن و وێنەگر کاک جەمال داود، دادەنیشتم تا مەغریب. چونکە کەمال خاوەنی ستۆدیۆکە، برای کاک جەمال بوو ئەوە کەمێک گوێیەکانی، دەنگیان باش گوێ لێ نەدەبوو. جا، هەر لەو دانیشتنانە، زۆر جار مامۆستای شاعیری هەولێر پیرباڵ مەحموودیش دەهات... ئەویش هاوڕێی کاک جەمال و کەمال بوو

دادنیشت و دەفتەرێکی دەردەهێنا و شیعری بۆ دەخوێندینەوە... نامیلکەیەکی بچووکی کە تازە دەرچووبوو، هەندێ لە شیعرەکانی تێدا بلاو کردبووەوە، بە عەرەبی، دایمێ و ڕەنگە (شبانة الالم)ی ناو بوو و لە ئەرشیفدا ماوە.

لە ڕەمەزانی ئەو ساڵە... خۆشترین مانگی ڕەمەزان بوو ڕامبواردبێ! هەموو شەو لە ماڵی حەیدەرە کەچەڵی هونەرمەند یان لە ماڵی وەستا خدری بەننای دۆست، یا لە ماڵێکی تر، مەجلیس دادەمەزرا و سین و زلفانێ یاخود کلاو کلاوانێیان دەکرد- دەبوونە

کەمال داود ناسراو بوو بە کەماله کەڕ
خاوەن ستۆدیۆی کەمال لە ١٩٦٠

مامۆستایانی شێوەکاری و فۆتۆگرافی:
جەواد ڕەسووڵ- لە دەستە ڕاست و جەمال داود لە دەستەچەپ

باڵەخانەی شەریف جامباز فولکەی کۆتری ئاشتی- هەولێر

دوو تیپ: حەیدەر و جەماعەتێک لە لایەک و گرووپێکی تر لە بەرامبەریان... ئیتر هەرا و هۆریای حەیدەر و هاوار هاواریان ژوورەکەی پڕ دەکرد- منیش و یەک دوو کەسی تر وەک: مامۆستا عیزەدین فەیزی و سەرۆکی شارەوانی، برادەرمان کاک عەبدولوەهاب حاجی حەسەن و مامۆستا مەلا مەسعوود (بێ بەش)... ئەوانە و منیش لەگەڵیاندا، لە سووچێکی تری ژوورەکە دادەنیشتین و چەند قاپ میوە و پاقلاوە و ئەم بابەتانەیان بۆمان دادەنا و ئێمە وردە وردە میوەکەمان دەخوارد و ئینجا حەیدەر،

مامۆستا مەلا مەسعوود (بێ بەش)

هەر لەگەڵ هەرایەکەی جار نا جار تێی هەڵدەکرد: لە قۆرباتێک... و ئینجا بەستەکەی و هەمووەمان دەبووینە کۆرس و من هەمیشە عوودەکەم دەبرد و ئیتر یارییەکە ڕادەگیرا تا گۆرانییەکە تەواو دەبوو... دوایی دەستیان پێ دەکردەوە... جا شەوێکی تر، لە ماڵێکی تر، هەمان بەزم دەبوو... بەڕاستی مانگێکی ڕەمەزانی خۆشمان بەسەربرد، جا چ بەزمی یارییەکانی... یان بەهەیت و هاواری حەیدەر و هەڤاڵەکانی یا بەشیعری خۆش هەندێکیان نوکتەجاری، مامۆستا مەلا مەسعوودی بێ بەش و ئینجا عوودەکەی منیش!

بەو موناسەبەتە خۆشانە و بە ناسینمان پێکەوە و گوێ ڕاگرتن لە عوودەکەم، کە زۆر کەیفی پێ دەهات و شانازی بەو (دانپیادانانە)ی مامۆستای بەزەوق و مەلایەکی هاوچەرخ و ڕۆشنبیرم دەکرد. بەتایبەتی لە ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (هەولێر) کە ئەوسا دەردەچوو، شیعرێکی بڵاو کردەوە، تەنیا یەکەم بەیتم لە بیرماوە کە دەڵێ:

لێدە باکووری لە نەی
تاهیر بۆم بلێ نەوا...

مامۆستا عیزەدین فەیزی
لە تەمەنی لاویدا

ناوی مەقام و مەقامبێژانیش وەک عەلی مەردانی تێدایە کاتی خۆی نوسخەیەکم هەبوو، بەڵام لێم ون بووە... بەداخەوە! هەروەها نازانم بۆچی ئەو قەسیدەیە لە ناو هەردوو بەشی شیعرەکانی کە لە چاپ دراون، تێیاندا نییە!

له نزیک کۆتاییی سەری ساڵی ١٩٦١ماڵمان گوازتەوە گەڕەکی ئازادی لە خانوویێک دراوسێی ماڵی مامۆستا حوسێن ڕەشوانی بووین... من فۆکس واگۆنی ڕەشم هەبوو ئەو فۆکس واگۆنێکی شین بوو، پێم وایە... بەباشی ڕەنگەکەیم لە بیر نەماوە، خانووەکە ئی ئەفسەرێکی پۆلیس بوو لە هەولێر نەبوو. مامۆستا سەنعان ئەمین وەکیلی بوو لەومان بەکرێ گرت مانگی بە ١٥ دینار. جا شەوان دەچووینە یانەکەی ئازادی و لەگەڵ مامۆستا بەڕێزەکانی دۆست و برادەری کۆن: کاک مستەفا شەعبان و شەریف سابیر و سدیق عەبدولقادر، لەسەر مێزێک یارییەکی تازە دەرچووبوو ناوی (مێو) بوو هەر بە کاغەز (پەپاز)، ئەوەی کۆنکان و پۆکەری پێ دەکەن، هەر بەو جۆرە کاغەزە دەکرا. جا ئەو یارییەمان دەکرد... کاتمان پێی ڕادەبوارد... بەڵام زۆر نەماینەوە لەم خانووە و لە گەڕەکی ئازادی، چونکە دراوسێی لای چەپمان، کابرایەکی کۆنە مووەزەف لام وابێ ناوی ئەنوەر بوو یان تایەر سیدارەیەکی لەسەر دەنا، هەر خۆی و ژنەکەی بوون... مرۆڤێکی هەمیشە مۆن و تووڕە و بێ ڕێز بوو- شەوی سەری ساڵ، ماڵی فیلیپی برام لە سلێمانییەوە هاتنە لامان و شاد بووین بە دەرچوونی فیلیپی برام لە حەپسخانەی رومادی، جا هەم سەری ساڵی ١٩٦٢ بوو و هەروەهاش خۆشی دەرچوونی فیلیپ، کردمانە ئاهەنگێکی خێزانی خۆمان بەخۆمان بووین... گۆرانیمان گوت و فیلیپ قسە و نوکتەی خۆشی حەپسخانەی بۆ دەگێڕاینەوە، دەپسا ین لە پێکەنینمان! بۆ بەیانی مامۆستا نەشئەت محەمەد سەفوەت، بەڕێوەبەری پەروەردە ناردی بە شوێنما، بچم بۆ لای، لە دائیرەی مەعارف، کە لە تەنیشت سینەمای سەلاحەدین بوو. ئەمڕۆ بارەگای گۆڤاری (ڕامان)ە و ژوورەکەی کاک نەشئەتی خوالێخۆشبوو، ئەمڕۆ کاک ئازاد عەبدولواحیدی، سەرنووسەری ڕامانی لێ دادەنیشی. لەو ژوورە سەردانی مامۆستا نەشئەتم کرد.

دوای دانیشتن و بەخێرهاتنم، وتی: ئەمشەو لە ماڵتان چیتان هەبوو؟ قەرەباڵغی هەبوو؟... من پێکەنیم و وتم: مامۆستا چۆنت زانی؟ بەوێ داهاتی؟ گوتی: نەخێر، بەڵام جیرانت گلەییان هەیە، دەنگتان و گۆرانی و عوود لێدانی ئێوە، ئیزعاجی کردوون و دەڵێن هەموو شەو بەزم و گۆرانییە لە ماڵتان و ناهێڵن ئەوان بنوون.

من پێکەنیم و زانیم تەنیا یەک دراوسێی تووڕە و بێ زەوق، دەڵێی پاپۆڕی خنکاوە و بازرگانییەکەی زەرەری هێناوە، کە لە لای چەپمان بوو... ناوی ئەنوەر یان تەهیر بوو. مووزەف بوو نازانم لە کوێ و سیدارەیەکی ڕەشی لەسەر دەنا. هەر زوو بەمامۆستا نەشئەتم وت: دەزانم کێیە ئەوەی ئەو قسەی بۆ تۆ گێڕاوەتەوە! ئەوە فلانە...! مامۆستا وتی:

ڕاستە! ئەو گلەیی دەکات. سوپاسی کاک نەشئەتم کرد و وتم ئینشاڵڵا خانوویێک بدۆزمەوە، دەردەچم و جیرانی وا خراپ و مۆن و گرژ و بێ زەوقم ناویّ!

ئەمەی خواردوە سێ وێنەی خاووخێزانی لە هەدیقەی خانووەکەی ئازادی لەگەڵ فیلیپ و جولیێتی هاوسەری و باوکم و دایکم و هەروەها جان تۆماس و خوشکەکان خێزانم و منالەکانمان تەمەنیان ساڵێک و نیو.. یا زیاتر: کاتی نیوەڕۆ خواردن و دانیشتنی ناو باخچەکە. دووەمیان جولیێت و فیلیپ لە ماڵمان لە هەولێر ١٩٦٢.

ئەگەر ئەو کێشەی بۆمان نەخولقاندبایە، ئەو ئەنودرە ئەفەندییە مۆن و بێ زەوقە، حەزم دەکرد هەر لە ئازادی بمابایینەوە... یانەیەکی خـــۆشی هەبوو... منالەکان گەڕەکەکەیان پێ خۆش بوو... پاک بوو. دانیشتوانی هەموو ڕۆشنبیر و مامۆستا و مـووەزەفی ڕووناکـبیـر بوون! لە لای پێشـەوە باخـچـەیەکی گـەورە و خـۆشی هەبـوو... بۆ منالە سـاواکـانمان چاک بـوو... هەوای سـاف بـوو، تەندروسـتـیـان زۆر باش بوو... دەمـانگەڕاندن و دەمـانسـووڕاندن لە ناو باخـچـەکـە، هەر بۆیەش بڕیارم دا، کە ئەگـەر هاتـو ڕۆژێ لە ڕۆژان بتـوانم خـــانـووێک بـۆ خـــۆم دروست بـکـەم، دەبێ باخچەیەکی گـەورەی هەبێ هەر واش ڕێک کەوت، لە سـالی ١٩٦٩ پارچە عــەردێکم کــڕی لە جەمعـیـیـەی کـانی کە ئێستـا ناوی شۆڕشـە، و

من و سوهام هەریەکە و کوڕێکمان لە باوەشە و لە ناو باخچەکەدا دەیانسووڕێنین.
شوباتی سالی ١٩٦٢

باخچەیەکی گەورەم نەخشە بۆ دانا و خانووەکەم دروست کرد و ئەوا تاکو ئەمڕۆ، (سالی ٢٠٠٥)ە و دوا دوا ڕۆژانی ئەو سالەیە و زۆرمـان نەمـاوە سـالی نوێ، سـالی ٢٠٠٦، بەخێر و خۆشی بێت و بیبینین، کە دەکاتە ٣٦ سال هەر لەو خانووەداین.

لە گـەڕەکی ئازادی نەمـاین و چووینەوە شـار و خـانووێکی تر... ئەوەیە (کرێگرتەیی)... هەر ڕۆژە لە شـوێنێک و لە خـانـووێک! برادەرێکم لە گـەڕەکی ئازادی بۆ پەیدا بوو، ناوی ئیـحـسـان مـوفـتی بوو... خـێزانی ناوی فـەیروز بوو... هەر دووکـیـان خـاوەن زەوق و خۆشمەشرەب بوون... بە خێزانەوە یەکترمان ناسی و ئیتر هاتوچۆ و زیارەت و سەیرانمان پێکەوە دەکرد. کاک ئیحسانیش هەر لە گەڕەکی ئازادی خانووی بەکرێ گرتبوو... خەلکی دەڤەری بادینان بوون خۆی و ژنەکەی! لە مەحکەمە، کاک ئیحسـان دەوامی هەبوو... هەر لەو وەختەش، برادەری کۆنی ڕۆژانی ئێزگەی کوردی، کـاک حوسێن قەرەداغی... بێژەری سـالانی پەنجـاکـان، ئەویش لە ئێـزگـە دەرچـوو و بەوەزیفـەیەک لە مـەسـایف دامـەزرا و خانووێکیان دایێ هەر لە مەسیف. جا زۆر جاران، کاک ئیحسان موفتی، ڕۆژانی پشووی هەینی، یاخـود جەژن، دەهات بە شوێنمـان و من و سوهام و ئەو و فەیرووزی خێزانی، بە

ترومبێلی خۆی، دەیبردینە مەسیف و دەچووینە ماڵی کاک حوسێن قەرەداغی... ئەویش زۆر خەنی دەبوو... چونکە ئەویش هەر خۆی و خێزانی بوون! جا دەیگوت: بەثەری باوکم (پیتی (س)ی بە (ث) لە زاری دەردەهێنا... زمانی وابوو: دەیگوت: بە ثەری باوکم... واتا بەسەری باوکم: تازە بە فلانم (ناوی خێزانی دەهێنا) گوت: کچێ دە هەثتە بابچینە خوارەوە (واتا بۆ هەولێر) بچین ثەردانی ماڵی... (ناوی ئێمەی دەهێنا) بکەین! واتا بێن سەرمان لێ بدەن و لەگەڵماندا ڕابوێرن، چونکە بەتەنیا بوون- شێخ حوسێن زۆر قسە خۆش و نوکتەزان بوو هەزار ڕەحمەتی لێ بێ.

حوسێن شێخ مستەفا قەرەداغی بێژەری ئێسک سووک و ڕووخۆشی ئێزگەی ڕادیۆی عێراق- بەشی کوردی لە ساڵی ١٩٥٥ لە بەغدا

ئیحسان موفتی
هەولێر ١٩٧٤

سەیرانێکی تر هەر لە مانگی نیسانی ١٩٦٢ لەگەڵ مامۆستای خوالێخۆشبوو عارف ڕەئووف نەقشبەندی، منیش مامۆستا بووم لەگەڵیدا و لەو ڕۆژە بەترومبێلی خۆی، ئێمەی بردە سەر دەوزێی کەڵەک و لە بەهارێکی خۆشدا، ڕەحمەتی خوای لێ بێ

سەیرانێک بۆ لای گردەڕەش لەگەڵ هەندێک هاوڕێی بەزەوق و مەرد لە مانگی نیسانی ١٩٦٢دا خوالێخۆشبووان حەمەڕەشیدی عەبۆ ئاغا، دکتۆری دانساز ڕەئووف دیشچی، فەتاح جەبار ئاغا و شێخ جەمال نەقشبەندی باوکی مامۆستا فوئاد شێخ جەمال کە ئەمڕۆ چەند ساڵە لێرە لە گەڕەکی شۆڕش، دراوسێی ئازیزمانە

ئەم سەیرانەمان دەکرد، کاتێک جەنابی موتەسەریفی (ناموحتەرەم... گۆڕ بەگۆڕ- بەدرەدین بێ دین...) ئەمری (سحب الید)ی بۆ خێزانم (سوهام حەنا) دەرکردبوو و حەواڵەی تەحقیقیشی کردبوو، لەسەر دوای ناماموستای نابەڕێز (کەتبییە خانی) ژنی عەبدولڕحمان کوبەچی هاوڕێم... بەڵام لە ڕقی ئەو دوو سێ کەسە بێ ئەخلاقانە، هەموو هەینی و عوتڵە خۆم و مناڵ و برادەرانم سەیرانمان دەکرد و ئەوان پێیان دەزانی و لەناودەیان، شەقیان دەبرد لە داخا، ئێمە بێ باک بووین! لەبەر خاتری مامۆستا نەشئەتی مودیری مەعاریف، خانووەکەی ئازادیمان بەجێ هێشت تاکو ئەو دراوسێیە دڵڕەشە نەبینین. ئەوەبوو، خانووی مامۆستا جیهاد عەبدولڕەزاقم بەکرێ گرت. خۆی لە بەغدا نیشتەجێ بوو لەگەڵ ماڵ و مناڵی- ناسراشبوو بە جیهاد کەللە. لەبەر دەرگای حەوش، لە دەرەوە... پارچە عەردێکی بەتاڵ هەبوو، بەهاران گیاوگوڵێکی زۆری لێ دەڕوا وەک دەشت وابوو. جا مناڵەکان پێیان خۆش بوو بچنە دەرەوە و لەوێ، لە ناو گیا و لە ژێر هەتاوی بەهاری خۆش، چەند ساتێک ڕابوێرن... لە جیاتی نەچوونیان بۆ سەیران، بۆ دەرەوەی شار! ئەوەتا، دوای ئەم قسانە... ئەندامانی خێزان، لە ناو عەردە چۆلەکەی بەردەم دەرگای حەوشی

خانووەکەی کاک جیهاد عەبدولڕەزاقدا لە نێو گیا و بەر بەرۆچکەی هەتاو... یاری دەکەن: لە ڕاستەوە: دایکی منداڵەکانمان (سوهام) لەسەر چینچکان دانیشتووە و پێدەکەنێ بە حاڵی خۆی! لە تەنیشتیەوەشی ماری خوشکم. دەستی ناوەتە ژێر گوێی، وەک ئەوەی حەیران بڵێ و باسی ئەو سەیرانەمان بۆ بکات. ئینجا دایکم وا پاڵی داوەتەوە و پێدەکەنی و هەردوو منداڵەکانمان شۆبان و سەبا لە بەردەمیدا خەریکی یاری خۆیانن! وەردبییەی خوشکی بچووکمان، لە دواودیان، داهاتووەتەوە و سەیری منداڵەکان دەکات و ئینجا تیمە لەسەر زگ درێژ بووە و سەیری سەبا دەکات و شمۆئیلی خزمان و هاوڕێی تیمەی برام دیارە! ئەم وێنەیەش لە بەهاری ساڵی ١٩٦٢ گیراوە...

زۆرجار خارتەلە و تۆلکە و گوڵە حاجیلەش دەڕوان و بۆ نیوەڕۆیان، هەندێ ڕۆژ، لێرە نیوەڕۆیەکەمان دەخوارد.

قادر جێمسی ناوی مرۆڤێکی ناسراو و بازرگانێکی خاوەن شوهرەت بوو- هاوڕێی کۆیی خۆم کاک محەمەدی مەلا سابیر منی بەو پیاوە ناساند. کاک قادر دوکانێکی هەبوو ئەدەواتی یەدەگی ترومبێل و شتی لەم بابەتەی دەفرۆشت، لە ژێر کۆشکەکەی ئوتێل سندبادی، نزیک حەمامە کۆنەکەی سەر ڕێگەی کۆنی شەقلاوە... کەوا کاتی خۆی، لە چلەکاندا... بەنزینخانەی هەولێری لە بەرامبەر بوو! واتا لە بەرامبەر ئەو حەمامە کۆنە. ئەو بەنزینخانە بەپەمپ کاری دەکرد و دەبوایە بە دەست ئەو پەمپە بەکار بهێنرێ. لەگەڵ قادر جێمسی بووینە برادەری ڕۆح بەڕۆح- ئیتر ئەگەر سەیران و دەعوەت و موناسەبەی هەبوایە،

دەعـوەتی دەکـردم... چ لە مـاڵەوەیان یاخـود لە دەرەوەی شـار. وای لێـهـات پێـوەندیی خێزانیشمان بوو... دایکم و خێزانم و ئەوانی ترم دەبردە ماڵی کاک قادر... یا ئەوانیش، لە موناسەبات، سەریان لێ دەداین... کـیـژەکـان و کـوڕەکـەی، کـاتێ لە قـوتابخـانە بوون، لە دەرسی ئینگلیـزی من و سـوهام دەرسمـان دەدانێ لە مـاڵەوەیان... سـوهام دەرسی بە وریا دەدا چونکە ئەو لە قوتابخانەی سەرەتایی بوو... تا تەواوی کرد.

لە دوای ئەم قـسـانەش، چەند وێنەیەکی، یەک دوو سـەیران و دانیـشـتنێ خـۆش، لەگـەڵ کـاک قـادر و مـیـوانەکـانی... دادەنێم: موناسەبەبەتەکەش بەبۆنەی ئەوەبوو کەوا کـاک قـادر کـیـژێکی خـواست و بووە ژنی دووەمی- ئەو دانیـشـتن و دەعـوەتەش، پێم وایە، لەسـەر شەرەفی خەزووری تازەی، کاک میرزا بوو!

لە٢٤ی نیـسـانی ١٩٦٢ من و خـێـزانم نیـازی سـەفـەرمـان هەبوو بۆ بەغـدا کـاک قـادر جێـمـسی وتـی: ئەوا من و حـەیدەر دەچین، وەرن لەگـەڵمـان! حـەیدەر و قـادر جێـمـسی، وەکـالەتی فـرۆشـتـنی پیـپـسـیـان وەرگـرتبـوو، کـە ئەوان لە هەولێـر، وەکـیـل بن و بە کـۆ بیفرۆشن! جا کە ئێمە بەرەو بەغدا بەرێ کـەوتین، هەر کە دەگەیشتینە چایخانەیەک، قادر

میرزا-- خەزووری نوێی کاک قادر جێمسی، لەگەڵ قادری زاوای خەریکی شاییکردنن و منیش بە کەمانچە، مۆسیقایان بۆ لێ دەدەم! قادر جێمسی بەکراسی سپی و یەلەگەوەیە. بەهاری ساڵی ١٩٦٢ -- بەستۆرە

خاڵۆ میرزا کەمانچەکەی بەدەستەوەیە... لە دواوە وەستاوە. کاک عەبدولوەهاب بەزاز و من و قادریش، سەیری دەکەین. فارس دزەیی هەر لە جێوە سەما دەکات و غازی برای قادریش نیوەی لەشی لە ڕاستەوە، دیارە. هەمان ڕۆژ... لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٦٢-- بەستۆرە

خەزوور و زاوا، بەرامبەر یەک سەما دەکەن
منیش بەکەمانچە گۆرانییان بۆ بڵێم و
خۆشخوانیان بم و فارس ئاغای دزەیی و کاکە
عەبدولوەهاب بەزازی هەولێریش بەزەوق و
خۆشییەوە

هەمان سەیران. لە ڕاستەوە: عەبدولوەهاب
بەزاز، لە ناوەڕاست: من بەکەمانەوە گۆرانییان
بۆ دەڵێم و کاک قادر لە تەنیشتەکەی تری من

دەوەستا و دادەبەزین... یەکسەر حەیدەر پارەی چوار بوتڵ پیپسی دەدایە چایچییەکە و، جا حەیدەر هەر قومی لە پیپسەکە دەدا و دەیگوت: «پاە! چەند شرین و خۆشە!» قادر پێدەکەنی، بەڵام من و سوهام هێشتا نەماندەزانی مەسەلە چییە! گەیشتینە کەرکووک... تازە خورماتوو... توزخورماتوو... چایخانەکەی عوزێم هەر پیپسی دەخورایەوە! سوهام دەیگوت: بۆ من مەهێنە کاک حەیدەر، من ناتوانم زیاتر لە نیو شووشە بخۆم! جا بەعەرەبی گفتوگۆیەکە کرا: حەیدەر هەر بەشی ئەویشی دەهێنا! ئاخری لە ڕێگەی خاڵس بووین... خەریک بوون بوەستن: سوهام بە عەرەبی وتی: «کاکە حەیدەر... لا تجیبلی پیپسی... ما أطیق هەلقەد أشرب! بطنی وجعتنی». واتا: چیتر پیپسی بۆ من مەهێنە، زگم ئێشا و ناتوانم بیخۆمەوە. حەیدەر، بە تووڕەییەوە ڕووی لە قادر جێمسی کرد و گوتی: دەفەرموو چاکە لەگەڵ ئینسانی وا بکە! من خۆم کوشتووە و دیعایە دەکەم بۆ پیپسی... کەچی ئەو جۆرە قسە دەکات دەڵێ پیپسییەکەتان خۆش نییە! ئینجا ڕووی لە دواوە کرد، بەسوهامی گوت:

(لیش هادا پیپسی مو زین؟ هادا خۆش مەشروب. أنتی گول مو زین! هیچی؟) ئیتر من و قادر و سوهام لەبەر پێکەنین، نەمانزانی چی بڵێین... تەنانەت کاک قادر،

سوکانەکەی تۆزێ لەدەست خزی و ترومبێل بەولادا ڕۆیی!... ئیتر تا نزیکی بەغدا بووین، حەیدەر هەر بولە بۆڵی بوو و لەگەڵ خۆیدا، بەتورکی، گلەیی و جوێنی بە خۆی و بە ئێمەش دەدا... تا من دڵم دایەوە و سارد بووەوە!

من و کاک قادر و کاک حەیدەر... ئەو شەوە چووینەماڵێک کە دەکەوتە کۆڵانێک لە پشت دائیرەی گومرگی ئەوسا، کە دەرگای سەرەکی گومرگەکە لەسەر شەقامی ڕەشید بوو، هەورازی قاوەخانەی بەرازبلیـیە و... ئەو ناوە. ماڵەکە شوێنی ڕابواردن بوو، ئافرەتێک بەڕێوەی دەبرد ناوی فاتم دەبابە بوو. ئەو فاتمەیە پێشتر لە مەلهایەک، لە شاری مووسڵ، وەک گۆرانیبێژێکی کوردی، کاری دەکرد و شەوان بەرنامەیەکی تایبەتی لە گۆرانی کوردی سووکەلە و فۆلکلۆر، پێشکێش دەکرد. جا دۆستی کورد زۆر بوون، لە هەولێر یان دهۆک و مووسڵ و... تاد جا کە ئەو خانووەی گرت لە بەغدا وەک شوێنی بار، شوێنی مەشرووب خواردنەوە و چێشتخانە...، دۆستانی دەچوونە ئەوێ، بەتایبەتی هەولێرییەکان ئەوە بوو ئێمەش ئەو شەوە، سێ قۆڵی چووین و فاتم بەگەرمی پێشوازی لێ کردین و زۆری خزمەت کردین... تا درەنگ ماینەوە.

بۆ شەوی دواتر، کاک کەمال عوسمان... کە لە پیاوە نزیکەکانی عەبدولکەریم قاسم بوو دەعوەتی کردینە ماڵی خۆی و هەر لەبەر ئێمەش، دانیشتنەکەی گەورەتر کرد و ژمارەیەک لە برادەرانی کوردی، بەغدا و لێپرسراوی حکوومەت... بەتایبەتی: بەڕێز کاک حەسەن ڕەفعەتی وەزیری ئیسکانی دەعوەت کردبوون لەو شەوەشدا کاک حەیدەر دەنگی دەچووە بەری ئاسمان و لەگەڵ عوودەکەم و دانیشتنە خۆشەکە، زۆر ئینسیجامی کردبوو و خۆشترین قۆریات و بەستەی کوردی و تورکی دەگوت... جگە لە قسە و نوکتەکانی!

عەبدولقادر قەواسی ژمێریاری کۆمپانیای عەرەبی سووری کە- وەک پێشتر چەند جارێ باسم کردووە- ئەوانە قۆنتەراتی قیرتاوکردنی ١٣ کیلۆمەتر ڕێگەی نێوان کۆیە و تەق تەقیان پێ درابوو... جا نووسینگە سەرەکییەکەیان لە مووسڵ بوو- نووسینگەیەکیش لە کۆیە بوو، عەبدولقادر باوکی نەجوا لەگەڵ ئەدوەری ئەندازیاری ئاشووری کەرکووکی کارەکانیان جێبەجێ دەکرد. وەک باسیشم کردووە، پێشتر، لەم بیرەوەرییانەم- نەجوای کچەکەی عەبدولقادر لە هەولێر لە قوتابخانەی (الفنون المنزلیة) دەیخوێند و لە بەشی ناوخۆییی هەولێر دەنووستن و دەژیان- بەڵام شەوانی هەینی، بەڕەزامەندی باوکی- نەجوا دەهاتە ماڵمان و شەو دەمایەوە لەگەڵ دایکم و برا و خوشکەکانم وەک کچی ماڵ بوو!

حەسەن ڕەفعەت، کاتێ کە بەڕێوەبەری شارەوانی سلێمانی بوو و مەلیک فەیسەڵی دووەم چووە سلێمانی بۆ سەردانی شوێنی کاولکاری و ئەو خەڵکانەی زەردەرمەند بوون بەهۆی لافاوەکە. پایزی ١٩٥٧

هورمزی هاوڕێم و ڤیکتۆریای هاوسەری

تەنانەت سوهامیشی زۆر خۆش دەویست. خۆ باوکەکەی، عەبدولقادری قەواس، ئەگەری ئیش و کاری نەبوایە، یەکسەر سەردانی دەکردین پێکەوە پیاسەمان دەکرد و شەوان زۆرجار لە ماڵی ئێمە، یان لە ماڵی ئەو دادەنیشتین.

لە مانگی مایسی ١٩٦٢، بۆ تاقیکردنەوەکانی بەکەلۆریای دواناوەندی، لە بەغداوە بەڕێوەبەری ئیمتحانەکەمان بۆ هات ناویم لە بیر نەماوە، بەڵام دێتە بیرم لەقەبی

له چەپەوە عەبدولقادر باوکی
نەجوایە، من لە ناوەڕاست و ڕەقیب
عەیدولسەلام موفتی مفەوەز ئەمنی
کۆیە بوو، لە بەردەم ستۆدیۆ چنارۆک
کۆیە ١/٢/١٩٦٠

(الساعدی) بوو. هەروەها هونەرمەندی هاوڕێم شەماڵ سائیب، وەک معاونی مودیری ئیمتحانات، لە هەولێر دانرابوو ئەویش هات بەیەک شادبووین و، منیش لە هەمان کات مەعاونی دووەم بووم جا بە شەوان لە باخچەکەی ماڵمان لێی دادەنیشتین باوکم کەبابی جوانی بۆ دەبرژاندین. دراوسێی نزیک و برادەرم کاک ئەحمەد ئاکۆ زۆر مرۆڤێکی خۆشمەشرەب و قسەخۆش بوو دەهات گوێی لە عوودی شەماڵ دەبوو زۆر دەگەشایەوە لەم سەردانەشی، لەگەڵ ترومبێلی عەبدوڵلا کاکە ئەحمەد و من و فوئاد ئەحمەد و تایەر ڕەحمەتی برای- سەفەرێکی خۆشمان کرد بۆ سلێمانی. لەگەڵ کاک عومەر هەڵمەت و قادر دیلان و کاک ولیەم و... برادەرنی دیکەش، ئەو شەوە لە لای کاک عومەر دانیشتین و بەنوکتە و قسە خۆشەکانی کاک شەماڵ و بینینی هەندێ فلیمی سینەمایی کەوا کاک هەڵمەت بۆی عەرز کردین، شەوەکی خۆشمان بەسەر برد. بۆ ڕۆژی دوایی سەردانێکی سەرچنارمان کرد و وێنەمان لەوێ گرت- ئینجا بەڕێی کەرکووکەوە گەڕاینەوە هەولێر- بەڵام لە چوونمان بۆ سلێمانی، بەڕێگەی چنارۆک و دۆڵی خەلەکانەوە ڕۆیشتین.

لە هاوینی هەمان ساڵی ١٩٦٢دا، مامۆستا مەتی ئامۆزام و من، ناومان دەرچوو لە کتابێکی ڕەسمی، وەزارەتی مەعاریف، لە بەغداوە، هەردووکمان هەڵبژێردراین بۆ بەشداریکردنمان، لە خولێکی ٤٠ ڕۆژی لە بەریتانیا- بۆ پێشخستنی فێرکردنی زمانی

گەشتەکەمان لە هەولێرەوە بۆ سلێمانی لە چەپەوە: فوئاد ئەحمەد- عەبدوڵڵا کاکە ئەحمەد سەری منیش لە دواوە دیارە- شەماڵ- تایەر نانەکەلی- عومەر هەڵمەت- تیمە
ساڵی ١٩٦٢- سەرچنار

باکووری، خاڵە تایەر، سەردار ئەحمەد، جان نۆماس، فوئاد ئەحمەد، وریا ئەحمەد، شەوکەت ڕەشید
ئاهەنگی یانەی کۆیە ١٩٧٠

ئینگلیزی، لە مانگی تەمموزدا، وەک لەو کۆپیی ڕەسمییەکە کەوا لێرەدا نیشانم داوە- خولەکەش هەموو ساڵێک لە لایەن (المجلس الثقافي البريطاني)یەوە ڕێک دەخرا، لە پشووی هاویندا و هەر جارە ژمارەیەک مامۆستا دەرچووی بەشی ئینگلیزی کۆلێژی (دارالمعلمن العالیة) هەڵدەبژێردران بۆ بەشداربوون تیایدا، لەسەر ئەرکی حکوومەت و ئەنجوومەنی ڕۆشنبیری بەریتانیا- ئەوەش وێنەی کۆپیی نووسراوەکەی وەزارەتە.

الجمهورية العراقية

مديرية معارف لواء اربيل
الذاتية _ الثانوي

العدد/ ٩٢١٩
التاريخ/ ٢٠/٥/٩٦٢

ادارة مدرسة ..........

الموضوع/ دورة صيفية في انكلترة

نبلغكم ادناه صورة الامر الوزاري المرقم ٢٢٦٦٥ في ٩/٥/٩٦٢ للاطلاع فيما يخص ترشيح كل من السيد مقي دربان خمو مدرس ثانوية اربيل للبنين والسيد اندريوس اسرائيل خمو مدرس ملحق متوسطة اربيل الى انكلترة

مدير معارف لواء اربيل

صورة منه الى: ـ
المحاسب الثانوي
الموما اليهما .......... للعلم
الملفة الشخصية _ ٢

((صورة الكتاب))

تقرر ترشيح المدرسين والمدرسات المدرجة اسماؤهم ادناه للاشتراك في الدورة الصيفية للغة الانكليزية التي ينظمها المجلس الثقافي البريطاني في انكلترة والتي ستبدأ من ٢٢ (حزيران) ١٩٦٢ حتى ٢٧ تموز ١٩٦٢ والسماح لهم بالسفر خارج العراق (انكلترة) لهذه الغاية على حسابهم الخاص وعلى ان يعودوا الى العراق قبل انتهاء العطلة الصيفية للالتحاق بمدارسهم.

| التسلسل | الاسم | عنوان الوظيفة | اللواء |
|---|---|---|---|
| ١٢ | مقي دربان خمو | مدرس في ثانوية اربيل للبنين | اربيل |
| ٢٠ | اندريوس اسرائيل خمو | مدرس في ملحق متوسطة اربيل | اربيل |

لە ڕۆژی سەفەرەکە، خزمانی بەغدا و کاک عەبدولقادر قەواس و ژنەکەی و کچە شۆخەکەی نەجوا و ماری خوشکم کە لەگەڵ سهام بوو، بە ترومبێیل باوکی نەجوا منی گەیاندە فڕۆکەخانە و دوعاخوازیمان لەیەک کرد. سەعات ١٢/٣٠ نیوەی شەو فڕین بەئاسماندا و چواری بەیانی لە فڕۆکەخانەی ئەستەمبۆڵ دابەزین بۆ ئیسراحەت. ئینجا پاش ٤ چوار سەعاتی تر گەیشتینە پراگ... ئافرەتە فەراش و پاککەرەوەکان فڕۆکەخانەکەیان پاک دەکردەوە بە جلی تایبەت و لەوێ بارانێکی خۆش دەباری بەو مانگی تەمووزە... کە لە بەغدا ئاگر دەباری، بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە لەندەن! ئەمڕۆ کە ئەوەم دێتەوە بیر و بەراوردی دەکەم لەگەڵ فڕین و فڕۆکەی ئێستا... سەیرم پێ دێ ئەو زەمان بەنزیکی ١٢ سەعات لە بەغداوە، بەفڕۆکە، چووینە لەندەن! خولەکەمان لە شاری HULL هەڵ بوو... لە ناوەڕاستی ئینگلتەرایە... شارۆچکەیەکی زۆر خۆش بوو... شەقامی خاوێن و کەم ترومبێل... وەک لەم وێنەیەی لێرەدا دیارە... کە ئەم شوێنە ناوەڕاستی شارەکەیە و شەقامەکە مەیلەو چۆڵە!... ئێرەش شوێنی ڕاوەستانی پاسی هات و چۆی شارە... ئەم کارتەم ناردەوە سلێمانی، بۆ فیلیپی برام، و لە پشت کارتەکە نووسیومە کەوا من گەیشتمە ئەم شارۆچکەیە لەگەڵ هاوڕێکانم، مامۆستایانی ئینگلیزی- عێراقی دەستمان کرد بە مەشقکردن و خوێندن و خولەکەش بۆ ماوەی چل ڕۆژ بوو.

ئەمەش یەکەم جار بوو کەوا من بچمە دەرەوەی وڵات. زۆرم پێ خۆش بوو بەتایبەتی

سەرەتای مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٦٢ ئەم کارتەم ناردەوە سلێمانی

خۆم حەزم دەکرد ڕۆژێکی وام بۆ بڕەخسێ و بچمە ئینگلتەرا چونکە مامۆستاکانمان لە (دارالمعلمین العالیة)، کە هەموویان خەڵکی ئەو وڵاتە بوون و ئەو هەندە جوان و خۆش باسی وڵاتی خۆیانیان بۆ دەکردین... باسی شارەکەی شەکسپیر- ستراتفوارد و ناوچەی سەرەوەی وڵاتیان کە ناوچەیەکی پڕ لە دیمەنی جوانی گوندنشینی و پڕە لە گۆلی ئاوی گەورە و بچووک (منطقة البحیران) کە شاعیری بەناوبانگ (کریستۆفر مارلۆ)ی تێدا ژیاوە و هەروەها شوێنی ژیانی شاعیریان میلتن وکیتس و مامۆستایەکی ئافرەتیشمان هەبوو، کاتێ لە ساڵی یەکەم (پۆلی یەکەم) بووین، ناوی Miss Herick بوو... ئەو ژنە (هێشتا کچ بوو!) تەمەنی ٥٠ ساڵ دەبوو، پرچی سەری مزاش بوو... زیاتر مووی سپی بوو! جا ئەوە لە نەوەی شاعیری ئینگلیزی ڕۆبرت هێریک بوو لە نێوان ساڵانی ١٥٩١- ١٦٧٤دا ژیاوە... زۆر باسی خانەوادە و شاعیر- باپیری گەورەی خۆی دەکرد و شیعرەکانی بۆمان، زۆر جوان، لێک دەدایەوە. ئەو شتانەم هەموو دەهاتنەوە بیر... کە چوومە ئەو وڵاتە خۆشە شوێنی ئەدەب و شیعر و مێژوویەکی ئەفسانەیی! پڕ لە شەڕ و شۆڕ و کوشتن و... بەڵام هەمیشە پاشایەتی زاڵ بووە و تاکو ئێستاش ئینگلیزەکان شانازی بە شاهنشینی خۆیان و خێزانی پاشایەتیان دەکەن!

کەش و ئاووهەوای ناوچەکە، بەگشتی زۆر خۆش بوو. بەو تەمووزە، لێرە هەموو ڕۆژێک تاوە بارانێک ورد ورد دەبارێ و شەقام و کۆڵانەکانی تەڕ دەکرد و ئاسمانی ساف دەکردەوە... زۆر کەمیش، ڕۆژانە، تاوە تاوە، ڕۆژ لە پشت هەورەکانەوە، سەری دەردەهێنا و

سەیری دەکردین و تیشکی خۆی بۆ دەناردین دوای نیوەڕۆیان، پرۆگرامی تایبەتیمان بۆ دانرابوو... تیایدا هەندێ جار سەردانی هەندێ قوتابخانەمان دەکرد و دەچووینە پۆلەکانی وانەی زمانی ئینگلیزییان دەخوێند. بۆ یەکەم جار (مختبر الصوت -- Eng. Lang. La-boratory) مان بینی و چۆن قوتابی بەهۆی ئەم جۆرە تاقیکردنەوە فێری زمانی بێگانە دەبن.

هەندێک جار دەچووینە یەکێک لە هۆڵەکانی مۆسیقایان تێدا نمایش دەکرا و کۆنسێرت و ئۆرکیسترا و پێشکێشکردنی سیمفۆنیامان دەبیست! یاخود دەچووینە ئەو شارانەی سەر ڕۆخ دەریای (بحر الشمال) وەک شاری سکاربرا... و لە گازینۆ و پلاجەکان دادەنیشتین... هەندێک لە برادەرانمان مەلەشیان دەکرد لە ناو بەحرەکە ... مەلەوانی باشیان تێدا هەبوو لە برا عەرەبەکانی باشووری عێراق... هەندێ ڕۆژانیش Free بووین... واتا ئازاد بووین خۆمان بۆ خۆمان، هەر یەکە و لەگەڵ هاوڕێ و برادەری خۆی، وەک گرووپ ڕێک دەکەوتین و دەچووین بۆ لایەک... بۆ سەیران و ڕابواردن. بەشەو، مامۆستا پیاوەکان... ڕێک دەکەوتن و دەچووینە یەک دوو هۆڵی ناسراو، کە تیایاندا سەما و گۆرانی ئافرەت و نمایشی هەندێ دیمەنی خۆشی ڕەقس و سەما و لەگەڵ کیژانی لەوێ بوون دۆستایەتیمان پەیدا دەکرد و مەوعید و جێی ژوان و بەیەک گەیشتن ڕێک دەخرا... ئینجا کارەکە لە مەوعیدی خۆی ئەنجام دەدرا!

دەرگای سەرەکی کۆلێژی (دارالمعلمين العالية) لە بەغدا ١٩٥٢

که دەچووینە شوێنێکیش بەگرووپ، مامۆستاکانمان لەگەڵمان دەبوون، ئیتر لە ناو پاسەکە... دەمانکردە بەزمی خۆمان، گۆرانی عەرەبی و کوردیمان دەگوت و چەپڵەمان لێ ئەدا... تا دەگەیشتینە شوێنەکە! یەکێک لەو گەشتە خۆشانەمان، ئەوەبوو کە ڕۆژێکی یەکشەممە بوو، لەوێ پشووی Week Endی هەفتەیە، چووینە شاری سکاربرا کە لەسەر ڕۆخی دەریای باکور لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئینگلتەرەیە... لەوێ سەیری ئەو ژن و کچ و مناڵ و پیاوانەمان دەکرد... بە مەلەکردن، یان بە بەلەمی بچووک یاخود بە بەلەمەمی بەپەردە لەسەر ئەو ئاوی ئەو دەریایە کاتیان ڕادەبوارد.

هەروەها لەگەڵ ئەم باسەشم، چەند وێنەیەکی ئەو شارە قەشەنگ و جوانە، پێشکێش دەکەم کە ئیساڵی ١٩٦٢ن، منیش دەرفەتی ئارا لە دەست نادەم.

ئەم وێنەیەشمان هەر لە قوژبنێکی دەرەوەی شارەکە گرتووە، من و مامۆستاکانی کە موحازەراتەکانیان، ڕۆژانە، پێ دەگوتین لە ڕاستەوە: ١- منم (باکووری)- موشەممای باران Rain Coat ێکی سپیم لەسەر دەستە. ٢- مستەر ئیدوارد Mr. G- Edwards B. A - ئەو مامۆستایە ئەدەبی ئینگلیزی نوێی پێ دەگوتین: Modern Literature ٣- مستەر تریبیک MR. G. F. Tribick, B. A ئەمەشیان موحازەرەی لەسەر ئەدەبی ئینگلیزی کۆنی دەداینێ. ٤- لێپرسراوێکی سەفەرەکەمانە

لەسەر ڕۆخی دەریای باکور، کە شاری سکاربرای لەسەرە، مەتی ئامۆزام بۆی گرتم

لە ناوەڕاستی تەمموزی ١٩٦٢ هەر هەمان شەویش، ئامادەی دیتنی شانۆگەرییەکی زۆر خۆش و پڕ جموجووڵ و سوار سوارانێ و شەڕی بە تیروکەوان و غاردان و ڕاکردن بە بەلەم، کە وەک فیلمێکی سینەما بوو بەڕەنگاوڕەنگ چونکە دیمەنەکە سروشتی بوو، نەک لەسەر شانۆی تەختەدار ئێمە بینەران، کە سەدەها کەس بوون، لەسەر گردێک شوێنی دانیشتنی بینەران بوو، جا لەسەر بەردێک یا لەسەر زەوی یا کورسی بچووک کە لە دەرەوە بەکرێیان دەدا... دانیشتنەکەمان بوو- لە خوار گردەکە، بەرامبەرمان، ڕووبارێک... یان بڵێ زێیەک بوو... زێی ڕاستی، سروشتی، نەک دەستکرد! ئینجا لەو بەرەکەی دیکەی ئاوەکە، چیرۆکی تەمسیلییەکە نمایش دەکرا و ناوی ڕۆژ ماری بوو- حەکایەتی بەرگریکردنی چینی دانیشتوانی شوێنێک کە چەوساوە و هەژار و بەڵام شەڕکەرن و زوڵم لە دەسەڵات قەبووڵ ناکەن و هێزی عەسکەری نیزامی- لە کۆتاییی شانۆگەرییەکەش... وێنەیەکی جوانی دیمەنێکی شانۆگەرییەکەیان دەفرۆشت، کە لە دواوەی، واتا لەپشت وێنە فۆتۆگرافەکە، ناو و ئیمزای ئەکتەرە سەرەکییەکان کەوا لە حەکایەتەکە، لەسەر شانۆ، ڕۆڵیان بینی... منیش، بۆ ئەرشیفی خۆم، ئەم وێنەیەم کڕی کە وەتا لێرە، لەدوای ئەم قسانەم، نیشانی دەدەم و لە دواوەی هەموو ناوەکان بەدەستخەتی ئەکتەرەکان، خۆیان، نووسراون و ئیمزا کراون.

شانۆ سروشتییەکەی شانۆگەری (ڕۆز مێری) کە لە شاری سکاربرا لە ئینگلتەرا بینیمان.
هەروەها لە خوارەوەش وێنەی بەرگی پێشەوەی ئەو کاتەلۆگەیە کە بەناوی ڕۆز مێرییە، لەبەر دەرگا دەیانفرۆشت و من دانەیەکم کڕی بۆ یادگاری و ئەرشیفم، هەمیشەش ئەو گەشتە خۆشە بەگشتی کەوا لە سەرەتای تەمووزەوە بۆ دیراسەت و خولێکی زمانی ئینگلیزی، ئێمە، چەند مامۆستایەکی زمانی ئینگلیزی نێردراینە لەندەن و بەریتانیا... لە یادم ناچێ

جارێکی تریش، مامۆستاکانمان ئێمەیان برد بۆ دیتنی شوێنێکی دیکە کەوا لە شوێنە مێژوویی و دێرینەکانی وڵاتی بەریتانیایە ئەویش کۆشک و قەڵای هاوەرد Castle Ho-ward بوو. ئەوەبوو بەپاسێکی کۆستەری جوان و پاک، ڕۆیشتین و لە ناو ترومبێلەکە، بەگۆرانی و چەپڵە لێدان کاتمان بەسەر برد تا گەیشتینە شوێنەکە پێش هەموو شتێک، جارێ من هەوڵم دا نامیلکە یان کاتەلۆگی ئەو قەڵا و قەسرەم دەستکەوێ! دەستیشم

بەرگی پێشەوەی کاتەلۆکی تایبەت بەزانیاری
لە بابەت قەسر و کۆشکی هاوەرد لە
ئینگیلتەرە من و چەند مامۆستایێکی زمانی
ئینگلیزی لە عێراق، سەردانمان کرد.
تەمووزی ساڵی ١٩٦٢

کەوت، وا وێنەی بەرگی پێشەوەی ئەو نامیلکەیە و چەند وێنەیەکی ناوەوەشی بڵاو دەکەمەوە لەگەڵ کورتە باسێک لەسەر ئەم کۆشک و باڵەخانەیە:

ئەو قەسر و کۆشکانە، کە لە ساڵی ١٧٠١ز- دەست کراوە بەدروستکردنیان، پێشتر، بە زیاتر لە سەد ساڵێک، کۆشکی تر لەو شوێنە هەبوون و سەر بە هەندێ میر و گەورە پیاوانی ئەو زەمانە بووە، بەڵام خاپوور کراو؛ و، دواتر بوودتە موڵکی چارلس هاوەرد Charles Howard سێیەم (ئێرل- واتا میر یان لێپرسراوی نوێنەری عائیلەی مالکەی بەریتانیا، لە ساڵی ١٧١٤ لەقەبی ئاوهابوو: 3rd. Earl of Carlisle دەخوێندرێتەوە: "ثێرد ئێرل ئۆڤ کارلایل". بەمانای سێیەم میر یا نوێەر لەسەر ناوچەی کارلایل بەڵام کۆشکە تازەکە، لە زەمانی ئەو پیاوە، خاوەنە نوێیەکەی واتا هاوارد تەواو نەبوو، بەڵکو دوای خۆی بەزیاتر لە سەد ساڵێکیش ئینجا وای لێهاتووە کە مرۆڤ لێی بژی و نیشتەجێ بێ، کە ئەو کارەش لە ساڵی ١٨٧٥دا بووە و ئەدمیرال هاوارد تێیدا دانیشتووە بەخێزانەوە.

لەگەڵ مەتی ئامۆزام، گەلێک وێنەمان لەو کۆشکە و دەوروبەری، بەکامێرای خۆمان گرت، کە ئەوەی لێرەدایە یەکێکە لەو وێنانە کە من و مامۆستا مەتی گرتمان لە بەردەم ئەو نافوورەیە ڕاوەستاوین کە لە ناو باخچە گەورە و فراوانەکەی کۆشکی هاوارد دایە. نافوورەکە لە بەردی داتاشراو دروست کراوە و لەسەر شکلی ئادەمیزاد و هەندێ جۆرێ ئاژەڵ دایە. جا ئاو لە ناو دەم و لووت و شوێنی تری ئەم پەیکەرانە دێتە دەرەوە دەرژێتە

دیمەنی لای باشووری کۆشکی هاوارد

ناو حەوزەکەی دەورەی داوە و لەویوەش بۆ ناو شوێنی جیا جیای ناو باخ و دارستانەکان، دەخزی!

دوا زانیاریش لە بابەت شوێنی ئەم کۆشکەی هاوارد، کە باسم نەکرد، ئەوەیە کە ئەو کۆشک و باڵەخانە و دارستانانە لە شاری ملتن Milton دان و کەوتووەتە نزیکی ئەو شارە، واتا شاری مالتن یان ملتن لە باکوری ناوچەی Yorkدا- و لە ناو موقاتەعەی (هەڵ) کە خولە دیراسییەکەی ئێمەی تێدا ڕێکخرا.

پێش کۆتایی ماوەی ئەو خولەی بەشداریمان تێیدا کرد، کە لە ٥ی تەمووز تا ٢٦ تەمووزی ساڵی ١٩٦٢ی خایاند، مامۆستاکانمان پێیان ڕاگەیاندین کە سبەی ئێوارە ئاهەنگێکی Farewel واتا خواحافیزیتان بۆ دەکەین- ئەوەبوو ئەو مامۆستا ئافرەت و کچانەی لەگەڵماندا بوون لە خولەکە، ئەوانیش وتیان: "بۆ نیوەڕۆ خواردنێکی عێراقیتان بۆ لێ دەنێین". جا بۆ نیوەڕۆی ڕۆژی پێش گەڕانەوەمان، خواردنێکی خۆشیان لێنا کە خواردنە سەرەکییەکەی پلاو ساوار بوو... دۆڵمە بوو هەندێ خواردنی تر. من و مەتی ئامۆزام چووینە بازاڕێکی نزیک شوێنی حەوانەوەکەمان (قسم الداخلي) و هەندێ تەرە پیازمان کڕی... چونکە لەگەڵ ساوار زۆر خۆشە- ئەوەبوو نیوەڕۆیەکەمان خوارد و ئینجا خۆمان ئامادەکرد بۆ شەو- مامۆستاکان ئامێرێکی کەمانچەیان بۆم هێنا و ئیتر شەوێکی

من و مەتی، لە بەردەم نافوورە قەشەنگ و سرنجراکێشەرەکەی ناو باخ و دارستانەکانی کۆشکی Castle Howard

تەمموزی ١٩٦٢

زۆر خۆشمان لەگەڵ مامۆستاکانمان ئینگلیزەکان و بەڕێوەبەری خولەکە، خۆی و ژنەکەی و بەشداربووەکانی خۆشمان، مامۆستا عێراقییەکان هەمووومان گۆرانی عێراقی کوردی و عەرەبیمان دەگوت و ئەوان زۆریان پێ خۆش بوو- تادرەنگ. ئینجا دوا شەویش، کە مامۆستاکانی ئینگلیزی ڕۆیشتنەوە ماڵیان، ئێمە، لە ژوورەکەی من، برادەرەکانی خۆمان، کۆ بووینەوە و هەر بەردەوام بەگۆرانی و قسەی خۆش و دوعاخوازی لە یەکتر، تا کاتی نووستن- ڕامان بوارد. لەو چەند وێنەیەشدا، هەندێ دیمەنی ئەو ئاهەنگەی دەست لێک بەردانی دوا شەومان لەو شارۆچکەیە... بڵاو دەکەمەوە.

ڕۆژێک، پێش ئەوەی شارHull بەجێ بێڵین، من و مەتی بازاڕی سەرەکی شارەکە و هەندێ دیاری و جل و دیاریمان بۆ ماڵ و منداڵان کڕی- ئەم وێنەیە مەتی بۆی گرتم لە بەردەم بازاڕی هەمۆندس

تەمموزی ١٩٦٢

لەڕاستەوە: ١- من (باکووری) ٢- برادەرێک لە مامۆستا عێراقییەکانی خۆمان ٣- مەتی ئامۆزام ٥،٤ دوو کیژی مامۆستای عێراق، بەشداربووی خولەکە- وێنەکەش لە شەوی دوایی و کۆتاییی خولەکە لە ژووری بەشی ناوخۆییدا کات بەسەر دەبەین و دوعاخوازی لە یەکتر دەکەین

لایەنێکی ئاهەنگەکەمانە کە لە کۆتاییی خولەکەدا، لە بەشی ناوخۆیی کردمان، ئێمە و مامۆستا ئینگلیزەکانمان، وەک ئاهەنگی خواحافیزی، من کەمانچە لێ دەدەم و ئەو گەنجەی بەرامبەرم گۆرانی تورکی (قۆریات)مان بۆ دەڵێ و ناوی عیزدەینە خەڵکی کەرکووکە لەوێ مامۆستای زمانی ئینگلیزییە

هەموو مامۆستاکانی عێراق لەگەڵ مامۆستا ئینگلیزەکانمان، پێش گەڕانەوەمان بۆ عێراق ئاهەنگێکی خۆشمان سازدا کە پێکهـ تبوو لە خواردنی کێک و ساردەمەنی و گۆرانی و مۆسیقای عێراقی- من زۆر لە دواوە وەستاوم تەنیا سەر و دەموچاوم دیارە.

تەمموزی ١٩٦٢

## له نه‌مسا

له‌گه‌ڵ مامۆستا مه‌تی، بڕیارمان دا که یه‌کسه‌ر نه‌گه‌ڕێینه‌وه عێراق... به‌ڵکو سه‌رێکی وڵاتی نه‌مساش بده‌ین و شاری (ڤیه‌ننا)ی مه‌ڵبه‌ندی مۆسیقا و مۆسیقاره دێرین و نه‌مره‌کان ببینین. ئه‌وه بوو دوای دوعاخوازی له ئیداره و مامۆستاکان، به‌فڕۆکه به‌ره‌و ڤیه‌ننا به‌ڕێ که‌وتین. من له‌و سه‌فه‌ره‌م، کامێرایه‌کی سینه‌مای ٨ میلیمه‌تریم کڕیبوو هه‌ر له شاری Hull هه‌ڵ- و یه‌ک دوو فیلمم گرتبوو، جا له ناو فڕۆکه‌ش وێنه‌ی خۆمانم گرت و فیلمه‌که‌م ماوه... کاک مه‌تی له‌گه‌ڵ کیژێک، که به‌ته‌نیا سه‌فه‌ری ده‌کرد و له‌گه‌ڵماندا بوو له ناو فڕۆکه‌که، ته‌عاروفی کرد و ئیتر منی به‌جێ هێشت و هه‌ر له‌گه‌ڵ کیژه‌که خه‌ریکی قسه و پێکه‌نین بوون و له‌سه‌ر کورسییه‌که‌ی پێش کورسیی من دانیشتبوون و منیش له دواوه هه‌ر وێنه‌یانم ده‌گرت. به‌ڵام که له فڕۆکه‌خانه‌ی ڤیه‌ننا دابه‌زین، کیژه خواحافیزی لێ کردین و دیار بوو براده‌ری هه‌بوو چاوه‌ڕێی ده‌کرد له فڕۆکه‌خانه‌که و... ئیتر دۆڵ دڕا و ته‌قه‌ی بڕا و مامۆستا مه‌تی هاته‌وه لام! ئینجا هه‌ردووکمان به خۆمان پێکه‌نین!

له ڤیه‌ننا، له ژوورێکی گه‌وره، له پانسیۆنێکی دێرین، له یه‌کێک له گه‌ڕه‌که کۆنه‌کانی ئه‌و شاره، که هه‌مووی جوانه، دابه‌زین و به‌کرێمان گرت، له به‌شێکی ناوچه‌ی هه‌ره کۆنی شاره‌که ناوی رینگ Ring بوو، هه‌فته‌یه‌ک ماینه‌وه ناوی پانسیۆنه‌که و گه‌ڕه‌که‌که شتود تیاته Stad Thaetre بوو به‌ڕاستی ئه‌و شه‌ش حه‌وت شه‌و و ڕۆژه‌م له بیر ناچنه‌وه... به‌تایبه‌تی که ده‌چووینه سه‌ر زێی دانوب، که به ناو شاردا ڕه‌ت ده‌بێ، و مۆسیقای The Blue Danub م ده‌هاته‌وه بیر که له دانانی مۆسیقاری به‌ناوبانگ شتراوسه Strauss, Ja-hann یه‌ک دوو شه‌ومان له کاباڕێ-ی مۆلان ڕووژ Moulin Rouge به‌سه‌ر برد که ئافره‌ت تیایدا خۆیان ڕووت ده‌که‌نه‌وه و سه‌مای سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ی پڕ وێنه‌ی سێکسی تیایاندا ده‌نوێنن! هه‌روه‌ها سه‌ردانی گه‌وره‌ترین و جوانترین (مدینة ألعاب)مان کرد، تا ئه‌و سه‌رده‌مه! له‌وێ جۆره‌ها یاری هه‌یه و هه‌زاره‌ها خێزان منداڵه‌کانیان ده‌هێنن و له‌و شوێنه ڕۆژێکی ته‌واو به‌سه‌ر ده‌به‌ن و منداڵه‌کانیان و خۆشیان، له‌وپه‌ڕی خۆشی و کامه‌رانیدا... کاتیان ڕاده‌بوێرن... ئه‌وه‌تا وێنه‌یه‌کی ئه‌و یاریگه سیحراوییه که چه‌ند دیمه‌نێکی ئامێره‌کانی یاری وه‌ک: چه‌رخ و فه‌له‌ک و به‌له‌م و کۆنه کۆشک و... تاد، تیایدا دیاره ئه‌م (کارته)م

ئەو کارتەی کە لە
ڤیەنناوە ناردم بۆ
ماڵەوەمان لە هەولێر

لەوێوە نارد بۆ هەولێر، بۆ برام تیمە و لە دو وەی کارتەکە باسم بۆ کردووە... لەڕۆژی ۳ی ئابی ۱۹٦۲ ناردوومە بۆ هەولێر، تیمەی برام لە (معمل ألبان)ی هەولێر کارمەند بوو!

هەروەها لە خوارەوەش، وەسڵی شەوێکی (نایت کلەب- کابارێی Night Club )دکەی ڤیەننا، کە ناوی Moulin Rouge مۆلان ڕووژ) بوو، دادەنێم بۆ بیرەوەری ئەو ڕۆژە خۆشانەمان لە ئەوروپا- بەهەشتی ئەم دنیایە!

Vienna's first Night-Club
Moulin rouge
bei der Oper
...EN 1, WALFISCHGASSE 11 - TEL. 52 21 30, 52 14...
1 Whisky 54
1 G. 48
102.-
Reklamationen nur gegen Vorweis dieses Zahlungsbeleges
Bitte beachten Sie auch die Rückseite!
II 8-000154
Ortega Wien

وەسڵی ڕابوردنی چەند کاتێک لە یانەی شەوی مۆلان ڕووژ-ی ڤیەننا- هاوینی ۱۹٦۲

ئینجا ئەمڕۆ، کە ئێمە لە ساڵی ۲۰۰۵دا دەژین، وا هەست دەکەم کە ڕۆژانی ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان، خۆشتر بوون و هەموو هاووڵاتیانی عێراق بە هەست و ژیان بەڕێوە چوون و ڕابواردنیان زۆر خۆشتر و نزیکتر بوون لە ژیانی ئەوروپاییەکانی ئەو سەردەم... نەک ئێستا! ئێستا ئێمە زۆر پاشتر ڕۆیشتووین و دواکەوتووترین لە ئێمەی ئەو ساڵە باسکراوانە! واتا چلەکان و پەنجاکان... شەستەکانیشیان لەگەڵدا بێ!... ڕەنگە لە سیاسەتدا باشترین دەسکەوتی سیاسی بۆ کورد و کوردستان زۆرن... ماوە ژیانەکەشی بەهەوڵی یەزدان و تێکۆشانی کورد... زۆر چاکتر دەبێ و دوارۆژێکی ڕوون پێشبینی لێ دەکرێ!

لەم وێنەیەشدا کە لەگەڵ ئەو نووسینەمەیە، وێنەی ئەو کچەی کە لە پانسیۆنەکەی شاری ڤیەننا لەگەڵماندا- من و کاک مەتی- بووە برادەر... بەیانی زوو لە ژووری خواردنی خانووەکە کاک مەتی بۆمانی گرتووە!. مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٢/نەمسا.

خۆم و کاک مەتی، کە بەیانییەکەی گرتوومانە، لە ژوورەکەمان، لە پانسیۆنەکەی لێی دابەزیبووین، لە شاری ڤیەننا مانگی ئابی١٩٦٢ ئەوا سەیری ڕۆژنامە دەکەین و نەخشەی ئەو ڕۆژە دادەنێین کەچی بکەین و بۆ کوێ بچین و چۆن ڕۆژەکە ڕابوێرین. وێنەکەش ئەو کیژەی لەگەڵماندا بوو لە هەمان (پانسیۆن) کە بووبووە برادەرمان، بۆی گرتووین

یادەوەری ڕۆژانی نەمسا- لە پانسیۆنەکەمان لە شاری ڤیەننا مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٢

**بەڵێ: ئازادی خۆشە! لەوێ ئازاد بووین**

لەدوای ئەم گەشتەمان بۆ نەمسای بووکی ڕازاوەی ناوەڕاستی ئەوروپا، پێم وابی لە نێوان ١٥ و ٢٠ ئابدا بوو، بە شەو، بەفڕۆکە بەرەو ئەستەمبۆڵ فڕین. بەیانی زوو بوو گەیشتینە ئەوێ. پاشان، من خواحافیزیم لە مەتی کرد و ئەو لەوێ مایەوە و وتی من هەفتەیەک لە تورکیا دەمێنمەوە- ئەوە بوو شەوێک حیجزم کردبوو بەفڕۆکە، گەڕامەوە بەغدای خۆمان و، یەک دوو شەو مامەوە و ئینجا بەرەو هەولێرەکەی جوانی شۆخ و شەنگی کوردستان، بەڕێ کەوتم... و هاتمەوە ماڵەوە و بەدایک و باوک و برا و خوشک و منداڵەکانم، بەیەک شاد بووینەوە زۆربشم دیاری بەتایبەتی جلوبەرگی جوان بۆ هەردوو کوڕەکانم هێنابوو!

باسێکی ئەم سەفەرەمان بۆ بەشداریکردنمان لەو خولە دیراسییە لە ئینگلتەرا، لە ڕۆژنامەی (أربیل)، کەوا لە شەستەکاندا، لە هەولێر دەردەچوو، لە ژمارەی ٤٨ی ڕۆژی (٤ی ئەیلوول١٩٦٢)، بڵاو کرایەوە، کە باسی گەڕانەوەمان دەکات، لە هەواڵێکی تایبەت بە بەڕێوەبەرایەتیی مەعاریفی هەولێر، کە بەعەرەبی نووسراوە دەڵێ: «عاد کل من السیدین أندراوس أسرائیل خمو (باکووری)- مدرس ملحي متوسطة أبیل، و متي درمان خمو، مدرس ثانویة أربیل، من لندن، بعد أن شارکا في الدورة التدریبیة...»

بەشێکی ئەو لاپەڕەی ڕۆژنامەکەیە تکایە لەگەڵ هەواڵەکە دابنرێ.

جا لە ڕۆژانی دواتر، ئەو فیلمە سینەماییانەی کە گرتبوومن، و ناردبوومنە کارگەکانی (طبع و تحمیض) لە لەندەن، گەڕانەوە بۆ هەولێر، چونکە ئەدرێسی خۆم بۆ نووسیبوون- ئینجا شەوانە لە ماڵەوە سەیرمان دەکردن و منداڵەکان زۆریان پێ خۆش بوون. ئەگەر چیش فیلمەکان بێ دەنگ بوون. چونکە دەنگی لەسەر تۆمار نەدەکرا. جۆرەکەی گەورەتر... واتا ١٦ ملم- دەنگی لەسەر تۆمار دەکرا... بەڵام من ٨ ملمم کڕی چونکە هەرزانتر بوو و

دەنگیش گرینگ نەبوو بەلای منەوە! وێنە و شوێنەکان گرینگتر بوون!

بەڵام، پێش گەڕانەوەم بۆ هەولێر و لەو یەک دوو ڕۆژەی لە بەغدا مامەوە، شەوێک چوومە سەردانی ماڵی هاوڕێی ئازیزم، زەعیم وەحید حوسێن بامەڕنی، لە (دور الضباط) لە وەجبەی یەکەمە و شەوێکی خۆش و پڕ یادگاری خۆش و خواردن و بەزمی عوود و گۆرانی من و فەخری برای کاک وەحید و

مديرية كمرك ومكوس الموصل — العدد /

التضمين — بالبريد المسجل — التاريخ /١١/ ٦٢

السيد اندريوس باكور المدرس في ملحق متوسطة اربيل (مدرسة متوسطة الجمهورية) اربيل

الموضوع/ فلم سينمائي شخصي

اشارة لكتاب مديرية التوجيه الاجتماعي المرقم ٨١١٤٥ في ٥/١١/٦٢ الموجه الينا وصورة منه اليكم

نرسل اليكم صحبة كتابنا هذا الفلم المشار اليه بالمخابرة اعلاه بعد ان تم فحصه يرجى اشعارنا بالاستلام.

ا و. مدير كمرك ومكوس الموصل

المرفقات

١- فلم [illegible]

نسخة منه الى .-

مديرية البريد والبرق المركزية بالموصل — مخزن كمرك البريد | اشارة للمخابرة اعلاه للعلم رجاء

قسە و نوکتە خۆشەکانیمان، تا درەنگی شەو بەسەر برد. کاک وەحید بەڕێوەبەری ڕادیۆ، و برادەران و هونەرمەندانم دیتن... هونەرمەند گوڵبەهار شیعرێکی دامێ بەناوی (چنارا لسەر ڕوبیاری) کە هەڵبەستی بەڕێز حافز مایی- حافظ مائی بوو و داوای لێ کردم ئاوازێکی بۆ دابنێم. شیعرەکەم خوێندەوە پێم خۆش بوو، بۆیە هەر ئەو شەوە لە ماڵی خزمان، بۆی دانیشتم یەکسەر ئەوا ئاوازەم بۆی دانا وا بەئاسانی بۆم دەهات، چونکە خۆم پێم خۆش بوو. ئێوارەی پاشتر خۆم گۆرانییەکەم لە تەلەڤزیۆن گوت، لە ئاهەنگێکی بەشی کوردی کە بۆم دانرابوو ئەو شەوە، و گوڵبەهاریش لە ماڵی خۆی بینیبووی و زۆری کەیف پێ هاتبوو. ئینجا لەگەڵ هونەرمەند، کاک فوئاد ئەحمەد، کە بەڕێکەوت لە بەغدا بوو و چاوم پێی کەوت، بەجووتە چووینە شوقەکەی خاتوو گوڵبەهار، کە لە ناو فولکەکەی حافز قازی بوو... چەند کەسێکی دیکەش دەعوەت کرابوون... یەکێکیانم ناسی (صادق محقق) بوو خاوەن مەحەلی فرۆشتنی چاکترین و نوێترین پێڵاوی پیاوانە و ئافرەتانە بوو! لە (شارع ڕەشید) نزیک مەیدانی حافز قازی. ئیتر گوڵبەهار منی ناساند بەوانەی لەوێ بوون، گۆرانییەکەیان دیتبوو... پاش دەمێک، گوڵبەهار خان منی بردە ژوورێکی تری بچووک کە ریکۆردەرێکی گەورەی تۆمارکردنی سەر شریتی (بەکرە)- لەوێ بەعوودەکەمەوە، میلۆدییەکەم بەدەنگی خۆم بۆ گوڵبەهار تۆمار کرد و گەڕاینەوە لای برادەران. پاش چەند هەفتەیەک گوڵبەهار بە دەنگی خۆی، لەگەڵ تیپی مۆسیقای ئێزگەی تۆمار کرد و زۆر خۆش دەرچوو. هەر دوای پەخشکردن، یەک دوو جار، ناوبانگی سەند و بووە گۆرانی ئەو هاوینە. جا بۆ هاوینی ئەو ساڵە، لە مەسیف سەلاحەدین لەسەر حەوزەکەی مەلەوانەی

هەمـوو شەو ئاهەنگ دەکرا و گـولّبەهاریش لەوێ، هەمـوو شەو، ئەو گـۆرانییـەی دەگـوت لەگەڵ باقی گۆرانییەکانی خۆی- زۆریش داوا دەکرا.

لەم هاوینەدا، چەند گـۆرانییـەکم بۆ ڕادیۆ و تەلەڤـزیۆن تۆمـار کـرد و لەوان، جگە لەو گۆرانییـەی باسم کرد کە بۆ گولّبەهارم دانا، واتا (چنارا لسەر ڕوبیاری)، گـۆرانی (ئەی مەلەنگێنەش)م تۆمار کرد، بە کەمێک دەستکاری لە مۆسیقاکەی... کە هەر ئەو شەوەی کە بەڕۆژ لە ڕادیۆم تۆمار کرد، بەشەو لە ئاهەنگێکی تایبەت کە هونەرمەندان: مامۆستا عەلی مەردان، ڕەسووڵ گەردی، فوئاد ئەحمەد و من، بەشداریمان کرد... بۆمان تۆمار کرا.

هونەرمەندی گۆانیبێژی ڕەسەن کولّبەهار خان لە شەستەکاندا

# هیوایەتی پوولی پۆستە کۆکردنەوە

لە ١٩٦٣/١/٢٨ کاتێ لە بەغدا بووم لەگەڵ منداڵ و خێزانم و لە ماڵی عەبدولقادر قەواس دابەزیبووین، بەبۆنەی پشووی نیوەی ساڵی خوێندن، بەڵێ، من و ژنم... لە لای خۆشەویستی دڵم... میوان بووین! ئایا وەزعێکی سەیر و ناخۆش نییە؟

لە تەلەڤزیۆن باسێکی گرینگی هیوایەتی پوولی پۆستە کۆکردنەوەمان دەبینی، من زۆرم پێ خۆش بوو و یەکسەر بڕیارم دا کە پوول کۆ بکەمەوە بۆ یەکەم جار دەستم کرد بە کۆکردن و کڕینی پوولی پۆستە و چەند ئەلبوومێک و پێویستییەکانی ئەم هیوایەتەم کڕین، کە لە مێشکی دام، دوای بینینی چەند حاڵەتێکی پوول کۆکردنەوە و دنیای پوول و جوانی ئەم هیوایەتە و گرینگیی مێژوویی و جوگرافی و زانیاری و پەروەردەیی بۆ خەڵکی.

ئەمڕۆ بە هەزاران پوولم هەیە... بەڵام بەداخەوە، کاتم نییە بۆ ڕێکخستنیان و کاری پێویستی تر کە پێوەندی بەم هیوایەتەوە هەیە! دوای گەڕانەوەم بۆ هەولێر، ئینجا برادەرانی ئازیز و خۆشەویستم دەهاتنە سەردانم.

لە کۆیەوە، محەمەدی مەلا سابیر یەکێک بوو لەو بەڕێزانە کە شەوێک هاتە ماڵمان و سەردانی کردم، لەگەڵ خاوخێزانەوە کاتمان بەسەر برد... ئەو کوڕە زۆر منی خۆش دەویست و یارمەتی دەدام کاتێ کە لە کۆیە مامۆستا بووم. جا ئەو دۆستایەتییە هەر مابوو، زوو زوو دەهاتە هەولێر

الجمهورية العراقية
[وزار]ة الشؤون الاجتماعية
[illegible] الاجتماعي
الرقم / [illegible]
التاريخ / [illegible]

مديرية كمرك ومكوس الموصل
م/ [illegible] شخصي

كتابكم المرقم ٨٨٤٤ في ١٩٦٢/٩/٢٩
يرجى الايعاز الى السيد ادريس خمو باكوري [illegible] مبلغ نصف دينار رسم فحص الورق المرفق بكتابكم [illegible]
[illegible] ان كان مصور داخل العراق او مبلغ دينار واحد ان كان مصور خارج العراق حوالة بريدية الى محاسب
[ديـ]وان هذه الوزارة [illegible] احالته الى احدى لجان الفحص ومن ثم اعادته اليكم ان اجيز .

و. وزير الشؤون الاجتماعية
فاضل الحاج [illegible]

[صور]ة منه الى /
مديرية البريد والبرق المركزية بالموصل
مخمن كمرك ومكوس البريد بالموصل
| اشارة للمخابرة اعلاه للمعلومات [illegible]
مديرية التوجيه الاجتماعي
٢ ـ شعبة السينما ـ بنسختين مع اصل المخابرة

---

[مدير]ية كمرك ومكوس الموصل
المخمن
العدد / [illegible]
التاريخ [illegible]/٦٢/١٠

صورة منه الى /
السيد ادريس خمو باكوري ـ اربيل ـ ملحق في المدرسة المتوسطة في اربيل
لتحويل المبلغ اعلاه الى محاسب ديوان وزارة الشؤون الاجتماعية مباشرة

مدير كمرك ومكوس الموصل

محەمەد مەلا سابیر کۆیی و
من لە ماڵمان لە هەولێر-
١٩٦٢/٩/١٩

شۆبان و سەبا، زۆر کەیفیان بە پرۆجەکتەرەکە دەهات کە شەوان فیلمە سینەماییەکانم پێی عەرز دەکرد و نیشانم دەدان و خۆیان دەبینی لە ناو هەندێ دیمەن لە سەیرانەکان و پیاسەکانمان لە شاری هەولێر و دەوروبەری- جا بەخۆیان پێدەکەنین کە دەهاتن و دەچوون و دەکەوتن...

بۆ کاری بازرگانی خۆی و هەرجارەش دەهاتە ماڵمان و لە لام شەوێکمان بەیادی ڕۆژانی کۆیە و (الشركة العربية) و(أبو محمد) واتا باوکی نەجوای شۆخوشەنگ و باسی ئەندازیاران مەجید عومەر و ئەدوەریشمان دەکرد.

لە ماوەی ئەو دوو ساڵە، لە هەولێر، هێواش هێواش و وردە وردە... ژمارەی دۆست و برادەرانم، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوون... بەهۆی ئەوەی کە لە زۆربەی ماڵان، شەوان... بەتایبەتی شەوانی زستان... یان ڕەمەزان، دانیشتنی خۆش خۆش دەکرا و ڕێک دەخرا... جا لەو جۆرە دانیشتنانە، هەمیشە خۆشخوان و گۆرانیبێژ و مۆسیقا، دەبوونە گوڵی ئەو مەجلیسانە و دەیانڕازاندەوە... جا بەشانازییەوە دەڵێم، زۆربەی ئەو مەجلیسانە... یەکەم شت جارێ گۆرانیبێژەکانیان ئاگادار دەکردەوە... کە ئەوسا، واتا لە شەستەکان، چەند هونەرمەندێک هەبوون دەعوەت دەکران، لە سەرەدەی

هەموویان تاهیر تۆفیق... حەیدەر و موحسینی برای، ڕەسوول گەردی... فوئاد ئەحمەد، مشکۆ... و جامیلە و جەمال خەلیلی هاوڕێی. مەرجیش نەبوو، ئەو بەڕێزانە هەموو شەوێک پێکەوە بوونایە... چونکە هەر مەجلیسێک خۆشخوانی تایبەتی خۆبانیان زیاتر لە لا خۆشەویست بوون و ئینسیجامیان دەکرد لەگەڵیاندا! من لە لای هەموویان، وەکو یەک جێم، هەبوو... جا کام گرووپ پێشتر ئاگاداریان کردبام و تاهیر و حەیدەر لە دەعوەتەکە بوونایە... ئەوا من لەوێ ئامادە دەبووم بۆ مێژووش... مێژووی ڕابواردنی هونەریی ئەم شارەی ئەو سالانەی باسیان لێوە دەکەم دەڵێم: ئێمە واتا تاهیر و حەیدەر و من، زیاتر لەگەڵ ئەو خاوەن ئەو جۆرە ڕابواردنە خۆشانە... جا لەماڵیان، یا لەگەڵیاندا لە سەیران و چۆل و دەرەوەی شار، ئامادە دەبووین، کە ئەوانەم زیاتر لە بیرن:

مەجلیسی حاجی حەمە شەریفی عەبۆ ئاغا و برا و دۆست و برادەرەکانی دیکەی وەک: حەمەدەمین عەبۆ ئاغا و حەمەڕەشید و شێخ محەمەدی برایان و دانساز: ڕەئووف دیشچی و هەروەها لەگەڵ دکتۆر عەبدولڕەزاق دەباغ و محەمەد شەهاب دەباغی برای و دکتۆر ئاگۆب میناسیان و دکتۆر ئیحسان میرزا و دکتۆر محەمەد شێخۆی جوانەمەرگ و جار جارەش دکتۆر حیکمەت حەکیم لە ماڵی خۆی دەعوەتی دەکرد و ئەوانەی هەموو ناویانم هێنان ئامادەی ئاهەنگەکەی دەبوون لەو هونەردۆست و برادەرانەش بەزەوق بوون و لەمێژ بوو پێکەوەیان ڕابواردبوو کە بەڕێزان فەتاح جەبار ئاغا و سدیق یونس قونتەراتچی و... لە لایەکی لەگەڵ ئیحسان موفتی و شێخ حوسێن قەرەداغی کە لە ١٩٦٢ بەو لاوە هاتە هەولێر و ئیزاعەی کوردی بەجێ هێشت و بووە کارمەندێکی دائیرەی گەشتوگوزار لە مەسیف سەلاحەدین خانوویێکیان دابوویێ و بەخێزانەوە لەوێ نیشتەجێ بوو.

هەروەها دۆستێکی تر، کە بەعادەتی لە بەغدا نیشتەجێ بوو، بەڵام هەولێری بوو زوو زوو دەهاتەوە سەردانی خزم و دۆستان و برادەرانی، کەوا بەڕێز خوالێخۆشبوو کەمال عوسمان خاوەن زەق و خۆشمەشرەب بوو... ئەو لەگەڵ بەدرەدین عەلی، موتەسەریف، دانوویان پێکەوە نەدەکولا و بەدرەدین (بەدەر لە دین) خۆش نەدەویست! بۆ ئیسپاتی ئەم قسەیەشم، ئەم ڕووداوە دەگێڕمەوە:

شەوێکیان لە مانگی تشرینی یەکەمی ئەو ساڵە، ساڵی ١٩٦٢، لە ماڵی خوالێخۆشبوو حەمەڕەشیدی دۆست و خزمی کەمال، دەعوەت بووین... زۆربەی گرووپەکە لەوێ بووین و هونەرمەندان: حەیدەر و تاهیر و عوودی من، دانیشتنەکە زۆر خۆش بوو... لەناکاو لە دەرگای دەرەوە درا! کە چوون دەرگایان کردەوە، سەیر دەکەن چەند پۆلیسێک

وەستاون و لێپرسراوەکەیان بێ شەرمانە پرسیارێکی سەیر و سەمەرەی لێکردن و گوتی: ئێوە مۆڵەتتان هەیە بۆ سازدانی ئەو ئاهەنگە؟ ئەوانەی لەوێ بوون، هەموومان، پرسیارەکەمان پێ عەجایب بوو! ڕاستە لەو زەمانە، حکوومەتەکان لە هەموو کۆبوونەوەیەک دەترسان، و بۆیە قانوونێکیان دانابوو کە هەموو ئاهەنگی گشتی دەبێ مۆڵەتیان لە موتەسەریفەوە هەبێ، ئەگینا تووشی لێپرسینەوە دەبن! ئێمەش چونکە ئاهەنگی گشتیمان نەبوو! دەعوەتێک برادەرێک، کردبووی بۆ چەند برادەرێکی خۆی و لە ماڵی خۆی! بۆیە، کاک کەمال عوسمان چووە دەرەوە لەبەر دەرگا، ئەو پۆلیسانەی ڕیسوا کرد و مفەوەزەکەی زۆر ڕەزیل کرد و پێم وابی جوێنی بەخۆی و بەو کەسەی کە ناردبووی دابوو! ئینجا بەتەلەفۆن لەگەڵ بەڕێوەبەری شورتە دیسان هاواری کردە سەری بەتووڕەییەوە تێی گەیاند کە ئەو دەعوەت کراو، لە ماڵی خزم و برادەرێکی خۆی! عەیب نییە ئێوە پۆلیس دەنێرن و داوای مۆڵەت و نازانم چی دەکەن؟ بۆ ئێمە ئاهەنگی گشتیمان هەیە یا بووک گواستنەوەمان هەیە؟ نەودبوو، ئەو بەڕێوەبەرە کە زانیبووی ئەوە کەمال عوسمان-ە قسەی لەگەڵ کرد، داوای لێبووردنی کرد و پۆلیسەکان ڕۆیشتن! کەسێکی نامەرد و ترسنۆکی وەک بەدەر لە دین عەلی مەبەستم بەدرەدین عەلییە. ئەو نەبێ کەسێکی تر نییە، شتی ئاوا تووڕەهات بکات! مۆڵەتی ڕەسمی داوا بکرێ لە چەند هاورێ و خزمی یەک کەوا لە ماڵی یەکێکیان دانیشتن، شەو بەسەر دەبەن بەخۆشی و بەگۆرانی و قسەی خۆش و ئەزیەتی کەس لە دەر و جیرانیان نەدابێ ئاخر ئەوە خۆ ئاهەنگی گشتی نییە!

هەروەها لە نێو ناودارانی شاری هەولێر، ئاشنایەتیم پەیدا کرد و لەگەڵ بەڕێز ئیسماعیل ئاغا بەعقووبی یەکترمان ناسی و دیار کەوت کە خاوەن زەوقە و مەجلیسی خۆشی بە ئاواز و گۆرانی و حەیران و مەقامی خۆش دەویست. ئەو بەڕێزە، لەو کاتەدا هێشتا ژنی نەهێنابوو.! خانوویەکی خۆشیشی دروست کردبوو لە ناو هەندێ باغ و بێستانی خۆیان، لە ڕۆژئاوای هەولێر، و ئەوسا هیچ خانوو و جادە لەو ناوە نەبوو... جا دوای یەکتر ناسینمان، چەند جارێ خۆم و ماڵەوە و تیپەی برام و برادەرانی دیکەی دەعوەت دەکردین و شەوێک دەبوو لە شەوە خۆشەکانی ژیانمان، لەوێمان بەسەر دەبرد. منیش چەند جارێ، بەڕێزیم دەعوەت دەکردە ماڵەوەمان و لەگەڵ حەیدەر و تایەری هونەرمەندان... شەوەکەمان بەمەقام و قۆریات و عوود و بەستە... ڕۆژ دەکردەوە!

حکوومەتی عێراق... لە ڕێگەی وەزارەتە پێوەندیدارەکان، بڕیاری دا کە لە ١٩٦٢/

١٢/١، و بەبۆنەی تێپەڕ بوونی ١٠٠٠ هەزار ساڵ، بەسەر دامەزراندن و دروستکردنی شاری بەغدا، میهرەجانێک ڕێک بخرێ و مێژوونووسانی عێراق و دەرەوەی عێراق دەعوەت کران و بۆ ماوەی دوو ڕۆژ مۆڵەتی ڕەسمی بوو بۆ هەموو داوودەزگاکانی حکوومەتی و قوتابخانەکان... جا ڕۆژی ٣ی ئەو مانگەش، موناسەبەتێکی دیکە بوو هەر عوتلەی ڕەسمی بوو، کە ناوی (عيد السلامة والابتهاج)بوو... کە بەبۆنەی سەلامەتی جەنابی زەعیم عەبدولکەریم قاسم بوو کە لە هێرشەکەی کرایە سەری لە لایەن هەندێ ئەندامی حزبی بەعسی فاشیست لە ساڵی ١٩٥٩دا بەسەلامەتی دەرچوو، دوای بریندار بوونی! جا عوتلەکە بووە سێ ڕۆژ و هەر سەیران و خۆشی بوو.هەروەها وەزارەتی ناوخۆی عێراق، کتێبێکی٩١ لاپەڕەی لە چاپ دا و بەبۆنەی ١٠٠٠ ساڵەی

لە ڕاستەوە: حەیدەر- ...... - دکتۆر عەبدولڕەزاق - دکتۆر ئاگوب. لە شەستەکان- هەولێر

تەمەنی شاری بەغداش، ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبی زۆر دەرچوون. گرینگترینیان گۆڤاری (المورد) بوو... کە دەیەها وتاری مێژوویی و وەسفی بەغدا و نەخشەی سەرەکییەکەی کە لە شێوەی بازنە بوو... تێیدا بڵاو کرابووەوە.

هەندێک ناوی تری ئەو بەڕێز و کەسایەتییانەی لەو ماوەیە ناسیمن و هەڵسام و دانیشتنمان بوو پێکەوە! کاک عیزەدین قۆجە کە بەهۆی گرووپەکەی دکتۆر ڕەئووف دیشچی و حاجی

شەقامی ڕەشید- بەغدا- ناوچەی «سینەک» لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم بڵاوی کردەوە بەم وێنەیەوە بۆنەی (عيد السلامة و الابتهاج)

حەمەشەریف و... تاد، یەکترمان ناسی و لە زۆر سەیران و دیوەخانان کاتمان ڕادەبوارد، بە خۆشی و ئاهەنگ و گۆرانی! کاک عیزەدین قۆجەوە، موقاویل (متعهد) بوو... لە شارۆچکەی کەلەک، قۆنتراتی لێدان و هەڵکەندنی ئەو جۆگەیە بوو کە ئاوی لە زێی کەلەک، لە هەوراز شارۆچکەکە وەردەگرت و بەو کەناڵەدا دەهاتە خوارەوە و بۆ باشوور ئاوەکە دەڕژا و بەناو کێڵگە و دەشت و دەرەکەدا دەڕۆیشت... هەروەها لە هونەرمەندان، وەستا جامیلەم ناسی کە حەیران و بەستەی کۆن و قۆریاتی زۆر بەڕێکوپێکی و بەدەنگێکی خۆش دەچڕی... بەخۆی سایقە تەکسی بوو... جا برادەران، وەک جەمال خەلیل عەبدۆکی یەکەم هاوڕێی ئازیزی و ئەوانی دیکەی بەتاکسییەکەی خۆی، دەچوونە سەیرانان و... مەسرەف لەسەر ئەوان و تاکسی و گۆرانیش بۆ خۆشکردنی مەجلیسەکەیان، تا دوای نیوەشەو، لەسەر ئەو!! گەلێک جاریش لە دیوەخانەکەی حاجی حەمەشەریف و برا و برادەرەکانیم دەبینی و لەگەڵ تایەر تۆفیقی نەمریش بەینیان زۆر خۆش بوو لەگەڵ مام ڕەسووڵ گەردیش هەروەتر! خۆ کاک جەمال خەلیلیش هەموو بەستە و گۆرانییەکانی ئەو سەردەمەی لەبەر بوو بەدەنگێکی خۆش و بێ نشاز دەیگوتن و مرۆڤێکی بەزەوق و خاوەن بەهرەی هونەری گۆرانی گوتن بوو.

سەرەتای ساڵی ١٩٦٣، سەرەتایەکی شووم و ناخۆش و کوشتار و شەڕ بوو... هەزارەها عێراقی بێ جیاوازی... عەرەب و کورد و تورکمان و ئاسووری... تاد، لەناوچوون و کوژران و بێ سەروشوێن کران، بەهۆی ئینقیلابە نامەردانە و بێ شەرم و حەیا و بێ شەرەفی مرۆڤایەتی و بێ ویژدانی ئینقیلابچییەکانی ١٤ی ڕەمەزان ٨ی شوباتی شوومی ئەو ساڵە کە دەستی پێ کرد بەهێرشبردنە سەر وەزارەتی بەرگری، شوێنی ڕەسمی زەعیم عەبدولکەریم قاسم سەرەک وەزیران و فەرماندەری گشتیی هێزی چەکداری کۆماری عێراق. ئێمە لە ٣ی شوبات گەڕاینەوە هەولێر و بەزەحمەت! چونکە ڕێگە گیرابوو... شەمەندەفەر لێ درابوو! وەزع ناخۆش دیاربوو من ئەو ڕۆژەم زۆر چاک لە یادە و، وەک دوێنێ بێ وایە... لە پێش چاومە! وا لێرە، بەگوێرەی بیرەوەرییەکەم و پێویستی

جەمال خەلیل عەبدۆک و باکووری

باسکردنی ڕووداوەکە دەیگێڕمەوە:

من مامۆستا بووم لە قوتابخانەی ناوەندی جمهوری کوڕان، سوهامی هاوسەریشم مامۆستا بوو لە قوتابخانەی قەڵاتی کچان و ماڵیشمان لە خانووەکەی مامۆستا جیهاد عەبدولڕەزاق بوو کە لە ناو کۆڵانەکەی کە ئەمڕۆ لە فولکەی شێخ مەحموود، بەرەو ڕۆژئاوا دەچن، یەکەم جادەی فەرعییە، کە تەریبە لەگەڵ شەقامی پزیشکان... (پێشتریش، هەر لەم بیرەوەرییانەم وەسفم کردووە). جا مامۆستایان و قوتابیان لە پشووی نیوە ساڵدا بووین کە لە ٢٥ی مانگی پێشووتر، مانگی کانوونی دووەمی ئەمساڵ (ساڵی ١٩٦٣) دەستی پێ کردبوو و. لە دوا ڕۆژەکانی دابووین وەک پێشتر وتم ئێمە تازە لە بەغداوە گەڕابووینەوە. جا ڕۆژی ٨ی شوبات، ڕۆژی هەینی بوو... تازەش نانی بەیانمان خواردبوو، و من ڕادیۆم کردبووەوە و لە ئێزگەی کوردی مەقامی (مەکەن مەنعی عاشقان)ی تایەر تۆفیق پەخش دەکرد و بە ئیسراحەت و لەزەتەوە گوێم دابوویێ!! ئاخر من هێشتا عاشق بووم و عیشقی یار و دووریم لێی- ئەگەرچیش نزیکم بوو- لە خەیاڵ و هەستمدا، دڵم خورپەی دەکرد! ژنەکان خەریکی کاریماڵەوە و پاککردن و دایکم خەریکی چێشت لێنان بوو بۆ نیوەڕۆ! ڕۆژەکەش هەتاو و ساماڵێکی سارد بوو.

لەپڕ و لەناکاو، ئێزگەکە دەنگی ون بوو و مەقامەکە تەواو نەبووبوو، وەستا! من حەپەسام و جوێنم دا و لەگەڵ خۆما وتم: کاک تایەر... ئەوە بۆ مەقامەکەت تەواو نەکرد؟ ئاخر نازانی من لەگەڵ ڕستە جوانەکان و دەنگە فریشتەییەکەت و ئاوازە سیحراوییەکە، لە ئاسمانی هونەری مۆسیقای ڕەسەن، لەگەڵ شەپۆلەکانی ئەو هەوایە ساردە، لە ئاسماندا دەفڕیم؟

زۆر چاوەنوڕام کرد... یەکێک لە بێژەرەکان بلێ: «گوێگرە بەڕێزەکان... داوای لێبوردنتان لێ دەکەین...

بەهۆی هەڵەیەکی تەکنیکی... یا هونەری، مەقامەکەی تایەر تۆفیق، لەو چەند چرکەدا ڕاگیرا... و ئێستاش بۆ ئێوەی خۆشەویست، بەردەوام دەبین و ئێوەو مەکەن مەنعی عاشقان... تاد» کەوا بەعادەتی، ئەگەر ڕادیۆ وەستا لە پەخشی بەهۆی سەبەبێک، داوای لێبوردن دەکرێ و ئینجا بەرنامەکە بەردەوام دەبێتەوە. بەڵام ئەمە نەکرا! منیش دەستم برد بۆ ڕادیۆکە و میلەکەیم جووڵاندەوە و بردمە سەر ئەو شوێنەی بەشی عەرەبی ڕادیۆی بەغدامان گوێ لێ دەبێ! ئا لەوێ کابرایەک بە هەموو دەنگییەوە هاوار دەکا و موژدەی دەداتە خەڵکی بە شەرەفی عێراق... کەوا (قارەمانی گەل و هێزی چەکداری دڵسۆز

هەڵسان بە ڕماندنی ڕژێمی دیکتاتۆری قاسم و ئەوا کوڕە دلێرەکانتان، بینایەی وەزارەتی بەرگرییان داوەتە بەر هێرشی تۆپ و سارۆخەکانی فڕۆکەکانی بەجەرگ و دوای کەمێک گوێتان لە هەواڵی خۆشی شۆڕشە پیرۆزەکەتان دەبێ...) ئینجا دوای ئەو مۆژدە نامویارەکە: مۆسیقای سەربازی- عەسکەری لێ دەدرێ، ئینجا بەیانێکی تر دەخوێندرێتەوە بەدەنگی ئافرەتێک، جوێن دەدا و ڕژێمی دیکتاتۆریەتی قاسم ڕیسوا دەکات کە هەوڵی داوە حکوومەت و گەلی عێراق لە ڕێی قەومییەت و وەحدەی عەرەبی دوور بخاتەوە... ئینجا سروودێکی میسری، لەوانەی کاتی خۆی، لە ساڵی ١٩٥٦ گۆرانیبێژانی میسر بەباڵای (الوحدة العربية) یان هەڵدەگوت! پەخش دەکرا... دوایی ئەو بەزمە ئیعلانی (منع التجول) کرا!

ئەوەبوو ئیتر ئەو ڕۆژە خەڵکی هەولێر و بگرە هەموو عێراق، دەستیان لەسەر دڵیان بوو! دەترساین شتەکە زۆری لێ بکەوێتەوە گەل تووشی نیگبەت و ئەشکەنجە و ناخۆشی ببێت! تاکو شەو، هەر ئەو بەزمە بوو! بەناوی سەرکردەیەکی عەسکەری... ئامیر فەوجێک یا کەسایەتێکی ناسراو کە گوایا ناردوویەتی بۆ (مجلس قيادة الثورة) و تەئییدی بزووتنەوەکەیان دەکات!

ڕۆژی شەممە ٩ی شوبات، لە هەواڵەکان دیار بوو کەوا وەزارەتی بەرگری هێشتا دەورەی گیراوە بەچەکدارانی بەعس و حەرەس قەومی... عەبدولکەریم هێشتا بەرگری دەکات... بەڵام هێزی ناوەوەی بینایەکە زۆریان لێ کوژراوە و لە دەرەوەش هیچ یارمەتییەک ناتوانرێ بیانگاتێ...! بۆ نیوەڕۆ بڵاو بووەوە کە عەبدولکەریم قاسم و مەهداوی و چەند ئەفسەری تر خۆیان داوە بەدەستەوە و... دوای نیوەڕۆ بەیانێکی ناخۆش لە ئێزگەی بەغدا بڵاو کرایەوە کە دەڵێ: عەبدولکەریم قاسم و مەهداوی و تەها شێخ ئەحمەد خۆیان دا بەدەستەوە و... شۆڕش سەرکەوت. پاشان ڕۆژی شەممە ٩ی شوبات بەپشوو دانرا بۆ هەموو دائیرە و دەزگاکان... هەروەها لە چەندین هەواڵ کە لە ئێزگەوە پەخش دەکران، (مجلس قيادة الثورة) داوای لە خەڵک دەکرد، شیوعییەکان بگرن و بیانکوژن و لەناویان بەرن... چونکە بە بەکرێگیراوی عەبدولکەریم قاسمیان لە قەڵەم درابوون!

هەروەها بڵاو کرایەوە کەوا (مجلس قيادة الثورة) بڕیاری دا کە عەبدولسەلام محەمەد عارف هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتیی کۆماری عێراق بەشێوەیەکی کاتی... هەروەها بڕیاری دا کەوا (مجلس السيادة) هەڵبوەشێنرێتەوە کە پێکهاتبوو لە سێ کەسی ناسراوی عەسکەری بەشەرەف: الفريق محمد نجيب الربيعي و محمد مهدی كبه (سەرۆکی حزبی

ئیستیقلال بوو) سێیەم کەس خالید نەقشبەندی بوو- کە کەسایەتییەکی ناسراوی کورد بوو.

ئینجا بڵاو کرایەوە کەوا:

١- زەعیم ئەحمەد حەسەن بەکر بۆ سەرۆکی وەزارەت هەڵبژێردرا.

٢- عەلی ساڵح سەعدی- نائیب سەرۆکی حکوومەت و وەزیری داخلییە.

٣- موقەدەم ڕوکن ساڵح مەهدی عەمماش- وەزیری دیفاع.

٤- تاڵب حەسەن شەبیب- وەزیری دەرەوە.

٥- بەڕێز بابا عەلی- وەزیری کشتوکاڵ (کوردە)

٦- زەعیم فوئاد عارف- وەزیری دەوڵەت. (کوردە)

٧- حازم جەواد- وەزیری دەوڵەت. ئەوەیان برادەرم بوو، لە کۆلێژی دار المعلمين العالية، پێکەوە قوتابی بووین- ئەو لە بەشی کیمیا بوو من لە بەشی زمانی ئینگلیزی. بەڵام لە بەشی ناوخۆیی قوتابیان کە لە خانوویەک بوو لە گەڕەکی وەزیرییە، هەر لە یەک ژوور بووین لەگەڵ دووسێ قوتابیی دیکە، کە یەکێکیان کاک فوئاد شێخ جەمال نەقشبەندی هەولێری بوو.

جەمال عەبدولناسری سەرۆکی کۆماری میسر، بروسکەی پیرۆزبایی نارد بۆ عەبدولسەلام بەبۆنەی هەڵبژاردنی وەک سەرۆکی کۆماری عێراق.

ئینجا ئەم هەواڵە زۆر ناخۆشە بۆ هەموو گەلی عێراق، لە ئێزگەکەی بەغدا... کە ئینقیلابچییەکان داگیریان کردبوو، بڵاو کرایەوە، لە نزیک سەعات دوو کەم ٢٠ دەقیقە... دوای نیوەڕۆ و تیایاندا هاتبوو:

«لقدتم إلقاء القبض على عدو الشعب عبدالكريم قاسم ومعه فاضل عباس المهداوي وطه الشيخ أحمد، وكنعان خليل حداد، من قبل القوات المسلحة. وقد شكل مجليس عرفي عسكري لمحاكمتهم، وقد أصدر المجلس العرفي العسكري الحكم بالاعدام رمياً بالرصاص، ونفذ فيهم رمياً بالرصاص في الساعة الواحدة والنصف من بعد ظهر هذا اليوم.

الزعيم رشيد مصلح الحاكم العسكري العام

بەڕاستی هەموومان، تاوێک لە ڕادیۆکەمان و لە یەکتر ڕاماین ڕاستە؟ درۆیە؟... بەڵام کیژێکی بێژەری ڕادیۆکەیان، چەندین جار هەواڵەکەی دەخوێندەوە و لەگەڵ تەعلیق و

قسەی قۆڕ و جوێندان، وەک ئەم قسانە: دەیگوت:

«... يا جماهير شعبنا العزيز: لقد أعدم الطاغية الآن... لقد لقي حتفه الاخير تحت أقدام جماهيرنا المناضلة... إن المجرم، الجلاد عبدالكريم قاسم والمجرم الجلاد فاضل عباس المهداوي و القذر الشيوعي طه الشيخ أحمد... قد سحلوا كالجرذان العفنة... وقد دفنتهم جماهيرنا التي تناضل من اجل مجتمع اشتراكي موحّد، تحت راية البعث العربي- و سنبقى، وستبق الجماهير العربية الحبيبة، ترفع شعار «امة عربية واحدة، ذات رسالة خالدة».

کەواتە... ئەم تاوانە پیسە، کە ناویان لێ نا شۆڕش سەرکەوت... ئینجا دوای ئەوە تا ماوەی چەند مانگ بگرە ماوەیەکی درێژ... هەزارەها خەڵکی بێ تاوان کوژران و سەدەها کچی نازدار کە قۆندەرە پیسەکانی، هەموو ئەو بێ شەرەفانەی دەهێنا، کە ئەو کچە بەشەرەفانە... شەرەفیان بریندار کرا و دەیەها ئافرەتی بەمێرد... ڕفێندران بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا ڕابوێرن، بەتۆمەتی ئەوەی کە شیوعی بوون و دژی (قومية العربية) و دین

بوون! بەشەو لە تەلەڤزیۆن وێنەی عەبدولکەریم قاسم و هەڤاڵەکانی بەکوژراوی نیشاندران... چەند جارێ! جوندییەکی بەعس و بێ ڕەوشت پرچی سەری عەبدولکەریم قاسم)ی دەگرت و سەری بەرز دەکردەوە و تفی لە دەموچاوی ئەو مرۆڤە قەدیسە دەکرد! جا چ بەو جۆرە حزبە بەدڕەوشتنە ددڵێی؟

ڕۆژی دووشەممە ١١ی شوبات، دەوامی قوتابخانەکان دەستی پێ کرد لە هەولێر ودزع زۆر یاسایی بوو، بەڵام حەرەس قەومی دامەزرا و هەمزە عوسمان قوتابی بوو لەگەڵماندا لە پۆلی سێیەمەوە (لە ١٩٤٨ سێی ناوەندی) پێکەوە بووین ئەوم دەبینی لەگەڵ حەرەسەکان.

ئەو برادەرەمان، لەسەر حزبی (أخوان المسلمين) حیساب بوو کاتی خۆی... لە زەمانی ڕووداوەکانی موعاهەدەی پۆرتسمەوس و هەرابەکانی ساڵی ١٩٤٨... هەمزە لێپرسراوی

ئەو حزبە بوو لە سانەوی هەولێر... کاتی خۆی باسم کردووە کەوا لە ڕۆژی خۆپیشاندانەکەی قوتابیانی سانەوی، لە بەردەم دەرکی سەرا، ئیخوانەکان دروشمیان هەڵگرتبوو، نووسرابوو: (نريد السلاح أيتها الحكومة...)، کەچی دروشمی پارتی و شیوعییەکان شتی تر بوون وەک: (على صخرة الاتحاد الكردي العربي، نحطم مؤامرات الاستعمار) و ...تاد جا لە دوای دامرکانی هەرا و هۆریای ئینقیلابی بەعسییەکانی دڕندەی ساڵی ١٩٦٢، دەمانبیست کەوا حەرەس قەومی کەوتوونەتە گیانی هاووڵاتیان لە شارەکانی مووسڵ و بەغدا... و هەر خەڵکە دەگیرێ و ئافرەت و کچان دەڕفێنن و لە بنکە پیسەکانی خۆیان ئەتکیان دەکەن و گەنج و مرۆڤی ڕەش و ڕووت و بێ تاوان دەکوژن... بەتایبەتی ئەوانەی سەر بەحزبی شیوعی بوون یان هەر تۆزێ بۆنی شیوعییەتیان لێ هاتبایە- بەڵێ دەرفەت ڕەخسابوو بۆ هەتیوەکانی بەعسی فاشیستی فاشیل لە خوێندندا و سەرسەری و بێ تەربیەت، هەڵکوتنە سەر ماڵان و خەڵکان ئازار بدەن و پارەیان لێ وەرگرن و بیدەن بە حەشیشە و مەشروب و قوزەقورت و سندانی بکەن لە مەقەرە بۆگەنەکانیان.

عەبدولکەریم قاسم دوای ئەوەی لە پەتکی سێدارە بەربووەوە لە کاتی لە سێدارەدان

لە ١٠ی مانگی شوبات- لە لایەن (المجلس الوطني لقيادة الثورة) کە ئینقلابچییەکان دایانمەزراند، هاوڕێی زەعیم قاسم، بەڵام خائینی دەرەجە یەکی ڕووڕەش عەبدولسەلام محەمەد عارف، کە نزیکترین مامۆستا و قائیدی خۆی بە ئیعدامکردن دا وەک تۆڵەیەکی نامەردانە... ئەو عەبدولسەلامە بەسەرۆکی کۆمار دامەزرێندرا، نەک لەبەر ئەگیری و لێهاتوویی... نەخێر ئەو ترسنۆکترین ئینسان بوو... بەڵام تەنیا لەبەرئەوەی دوژمنی عەبدولکەریم قاسم بوو!

١٢ی شوبات ١٩٦٣ خێزانی من (سوهام)... تەوقیف کرا... بە تۆمەتی شیوعییەت و بەشداریکردنی لە ڕێکخراوی (رابطة المرأة العراقية) ئەمەش هەر پاشماوەی دڕندایەتی و

کاره بێ ئەخلاقییەکەی بەدەر لە دین!! بووە... چەندین مامۆستا و پەرستیاریش لەگەڵ سوهام حەپس کران... لە ژووریکیان پەستن، لە ناو سجنی سەرا ئێمە لە ماڵەوە گرفتەکەمان منداڵەکان بوو: شۆیان و سەبا، کەوا هێشتا شیری دایکیان دەخوارد... چونکە تەمەنیان دوو ساڵ نەبووبوو! فێری ناو باوەشی دایکیان بوون. ئەگەر چی هەموومان: دایکم و هەردوو خوشکەکانم و تەنانەت باوکم و براکانم... هەوڵمان دەدا بیانخافڵێنین، بەیاریکردن و بەکڕینی شتی منداڵانە بۆیان... بەڵام هەر کە برسییان دەبوو دەستیان بەگریان دەکرد و سەیری ئەملا و ئەولایان دەکرد... دایکیان ببینن و بێت شیریان دەرخوار بدات! کەچی نەبوو! زمانیشیان نەکرابووەوە! زۆر ساوا و جمک بوون! بەهەزار واستە و تکا و ڕجا لەم و لەو، توانیمان ماوەیان بۆ وەرگرین... دوو ڕۆژ جارێک بیانبەینە بەندیخانە لای دایکیان چاویان پێی بکەوێت تۆزێ مەمکیان بداتێ و دڵیان ئیسراحەت بکات! جا وەرە سەیرکە کە دەمانبردن... ئەوان غاریان دەدایە لای دایکیان و ئەو باوەشی پێیاندا دەگرت و دەگریا! ژنەکانی تریش دەگریان... نەک هەر ئێمە، بەڵکو خێزانی کاک هاشم عەبدوڵڵا... کە سەرۆکی شارەوانی بوو، ئەویش دوو منداڵی جمک و بەرمەمکانی هەبوو، ئەوانیشیان دەهێنان بەهەمان شێوە! جا وەرە بزانە ئافرەتەکان تف و نەعلەت و جوێنی پیسیان دەدا بەدرەدین عەلی موتەسەریف و ئینقیلابچییە بەعسییەکان و بەدەنگی بەرز، لە پشت شیشەکانی ئاسن و دەرگا و پەنجەرەکانەوە تفیان دەکردە ڕژێمی بەعسی گرووا جوێنی پیسیان بەمعاونە عەرەبەکان دەدا! لە بەڕێوەبەرایەتیی مەعاریفیشەوە، کاک نەشئەت محەمەد سەفوەت ئەمری دەرهێنا، منی هەڵبژارد کە قوتابخانەکەمان (قوتابخانەی جمهوری) بەڕێوە ببەم و بوومە مودیر بەوەکالەت- چونکە مامۆستا ئەحمەد شێخ عەبدولکەریمی بەڕێوەبەر گیرا لەگەڵ زۆربەی مامۆستاکان... ئەغلەبیان نەفیکردن بۆ ناسریە و دیوانیە و شارەکانی دیکەی باشووری عێراق! من زۆر هەوڵم دا کە ئەم ئەرکەم پێ نەسپێرێ، چونکە ئامادە نەبووم لە زۆر لایەنەوە، بتوانم ئەم کارە بەچاکی بەڕێوە ببەم قوتابخانە چۆڵ بووبوو... قوتابییش کەم مابوون... مامۆستا نەبوو! منیش حاڵەتی دەروونیم تەواو نەبوو! بەڵام مامۆستا نەشئەت وتی: لەبەر خاتری من، کەسی وا نییە ئەو ئەمرەی پێ بکەم، لە تۆش زیاتر، کە هێمن و ناسراوی... کەسێکی تر شک نابەم بیکەمە بەڕێوەبەر! زۆریش ناخایێنێ: کە وەزع چاکتر بوو... مودیرێک تەعین دەکەم و تۆ دەگەڕێیتەوە مامۆستایەتی! ئا بەم جۆرە قەناعەتی پێ هێنام. بەڵام نەشیتوانی یەکێکی دیکەمان بۆ دابین بکا و ئەو ساڵە و ساڵێکی تری ڕەبەقم بەڕێوە برد... زۆر بەچاکی و

هێمنی و سەرکەوتووانە! شتێکی یارمەتیدەر بوو کە حەمید مەرمەڕچی لە لامان مامۆستای هونەر بوو، ئەگەر چیش خۆی لە هونەری شانۆ شارەزابوو! بەڵام بە ئێمە چی! خۆ شانۆمان نەبوو! ئەوەبوو خۆی لە ژێرەوە بەعسی بوو بەڵام نەماندەزانی تا لەو ئینقیلابە ئاشکرابوو! ئینجا بۆ من باش بوو دەمتوانی ئازادانە بجووڵێمەوە و قوتابخانەکە و مامۆستاکان لێم ڕازی بن.

ئەمە وێنەی دەستەی مامۆستا و بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندیی کۆماری کوڕان (متوسطة الجمهورية للبنين)ە لە هەولێر- کەساڵێک دوای ئینقلابی بەعسییەکان گیراوە لە حەوشی قوتابخانەکە، کە ئێستاش بینایەکە هەر ماوە و بەهەمان ناویشە. وێنەکە لە مانگی ئایاری ١٩٦٤ گیراوە.

دانیشتووەکان لە ڕاستەوە:

١- مامۆستا زوبێر بیلال ئیسماعیل (مێژوو)

٢- مامۆستا ئەحمەد حەسەن بەننا (وەرزش)

٣- مامۆستا عەدنان عەباس ئەسەدی (علوم، کیمیا)

٤- حەمید مەرمەڕچی (کاتب)ی قوتابخانە

٥- مامۆستا سوبحی عومەر (فەلەستینی بوو...!؟)

٦- مامۆستا مەدحەت محەمەد سەفوەت- ئەم بەڕێزە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندیی

ئەربیل بوو کە لە هەمان بینایە بوو، بەڵام بەپێچەوانەی یەکتر دەوامیان دەکرد. جا لە دوای دەوامی خۆی، لە لای ئێمە موحازەراتی ماتماتیکی دەدایەوە.

ڕاوەستاوەکان، لە ڕاستەوە:-

١- وەلی حەسەن ڕەزا (پێم وابێ مێژووی دەدایەوە!)

٢- یەعقووب حەننا سەباغ- جوگرافیا.

٣- خۆم- باکووری بەڕێوەبەری بەوەکالەت.

٤- غازی سنجاری.

٥- فەوزی باقر (مامۆستای سەرەتایی بوو... لە لای ئێمە تەنسیب کرابوو)

٦- خوالێخۆشبوو فازل شەوکەت (وابزانم ڕیازییاتی دەگوتەوە).

لە (٣/٨ مارت)ی ١٩٦٣ دوای مانگێک، لە ئینقیلابەکەی بەغدا، لە سووریاش ئینقیلابێک ڕووی دا بەسەرۆکایەتی سەلاح بەیتار کە ئەوانیش هەر عەسکەر بوون! جەماعەتی ڕژێمی ئێمە، ئەوەیان پێ خۆش بوو. کەوتنە جموجووڵ و هاتوچۆ... بۆ گفتوگۆکردن لە بابەت پێکهێنانی یەکیەتیبەکی عەرەبی بەناوی (الوحدة العربیة)... دوای ماندووبوونی زۆر و لەسەر بەرژەوەندیی لێپرسراوان، ئەم کارە نەگریسە چەپەڵە، سەری نەگرت! من دنیام لەبەر چاو تاریک بووبوو لەبەر وەزعی خێزانم و منداڵەکان... کاتێ سوهام خەبەری بۆ ناردم لە حەپسخانەکەیەوە، گوتی کەوا سبەی لێپێچانەوەیان لەگەڵدا دەکەن! دوای ئەو تەحقیقە بێ شەرمانەی ئەو هەتیوە ڕووڕەشانە، لیستەیەک لە مەعاریفەوە دەرچوو تیایدا هاتبوو کە ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستا و مووەزەف ئەوانەی گیرابوون، (سحب الید) کران لە وەزیفە و خێزانی منیشیان لەگەڵدا بوو! ئەمە لیستە ژمارە ١ بوو کە ٢٩ کەس بوون. ژمارەی کیتابی ڕەسمی (مدیریة التربیة والتعلم- للواء أربیل)- (٣٠٩٠) بوو لە ڕۆژی ١٩٦٣/٣/٢٠ دەرچوو. لە ناو لیستەکە هەندێک ناوم لە بیر ماون کە ئەوانەی خوارەوە بوون:

١- مامۆستا ئیبراهیم خەتاب- مامۆستای (دار المعلمین ابتدائیة) بوو.

٢- ئیدریس حەسیب فەتاح- لەگەڵمدا لە (دار المعلمین العالیة) لە پەنجاکاندا قوتابی بووین- خەڵکی مووسڵ بوو، لە هەولێر دیسان پێکەوە مامۆستا بووین لە ناوەندیی زازا.

٣- یەعقووب حەننا سەباغ- لەگەڵمدا، مامۆستای جمهوری بوو.

٤- حەیدەر یوونس: مامۆستای خالیدییە سەرەتایی بوو.

٥- جەمال جەمیل: بەڕێوەبەری خالیدییە بوو.

٦- شوکریە عەبدولئەحەد- مامۆستای رووناکی کچان بوو.

دوایی لیستەیەک دەرچوو بەکتابی ژمارە ٨٩٠٢ لە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی هەولێر، لە ١٩٦٣/٦/٢٣ کە ئەمجارە ئەم لیستە هەموو ناوەکان فەسڵیان دەرچوو. لە نێوانیاندا، دیسان خێزانی من (سوهام) و مامۆستا خەیرییە نادر مامۆستای ئەیوبییەی کچان، هەروەها عەبدوڵڵا حاجی بەدری سندی یاریدەدەری قوتابخانەی هندرێنی ئێواران بوو... زۆری تریش.

جا لەو ڕۆژانەشدا بوو کە عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا کوبەچی، هاوڕێم، بەر گوللەباران کەوتبوو کە چەند چەکدارێک بەدەمانچە هێرشیان کردبوو... من ئاگام لەم کەین و بەینە نەبوو... هەر، من تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، کە ئەم قسانە دەنووسم، وەڵڵاهی نازانم نە دەمانچە نە تفەنگ نە هیچ جۆرە چەکێک بتەقێنم. کەچی، لەگەڵ تەحقیقکردن خێرا لەگەڵیدا، لە نەخۆشخانە کە بریندار بووبوو، حاکم لێی پرسیبوو: شک لە کێ دەکەی؟ ئەویش چەند ناوێکی دابوو و ناوی منیشی دابوو... بۆیە ئەمری گرتنم لە حاکم تەحقیقی هەولێر دەرچووبوو... ئەو باسەم بەدرێژی کردووە، پێشتر لەم کتێبەدا!

ئەم وەزعە ناخۆشە بەردەوام بوو... لە ٢١ی ئادار، کە جەژنی نەورۆزە، بڵاو کرایەوە بۆ هەموو دائیرە و قوتابخانەکان کەوا دەوام ڕەسمی دەبێ و، نابێ کەس غائیب بێ! بەڵام زۆر کەم لە مامۆستا و قوتابییە عەرەبەکان دەوامیان کرد... ئێمەش کەسمان نەچووینە پۆلەکان و دەرس نەگوتراوە! ڕۆژانی هەینی دایک و خوشک و براکانی خێزانم لە مووسڵەوە دەهاتن و خواردنیان دەهێنا و دەچوونە لای لە بەندیخانە و چاویان پێی دەکەوت. تا لە ڕۆژی ٢١نیسانی ئەو ساڵ... ١٩٦٣ دوای دوو مانگ حەپسکردنی دایکی منداڵانم، بەشەو لە سەراوە یەکێک هات و وتی وەرە کەفالەت بۆ خێزانەکەت بکە، ئەمر هاتووە هەر ئەمشەو هەموویان لە حەپسخانە بەکەفالەت دەربکرێن! ئیتر لە خۆشیاندا نازانم چۆن جلم لەبەر کرد و بەغار چوومە سەرا... ماڵمان نزیک بوو، لە خانووەکەی مامۆستا جیهاد عەبدولڕەزاق کەللە بووین... چووم کەفالەتەکەم ئیمزا کرد کە بە ٥٠ دینار بوو... ئیتر لەگەڵ سوهام، هەر بە بەپێکەنین... تاو تاویش ئەو لە مەراق و لە

خۆشیـاندا... دەگریا! هاتینە مـاڵەوە... منداڵەکان نووسـتبوون: بەئاگا هاتـن... مەپرسە چ وەزعـێکی خـۆشی و ناخـۆشی بـوو... بۆ فـیلمـێکی سـینەمـا دەشیـا! ئەو سـاڵە جـەژنی لە دایکبوونـی شـۆبان و سـەبامـان کـرد لە ٣/٥ زۆر بەخـۆشی... چەند مـاڵە خزم و دۆسـتانمان دەعوەت کردبوو...

کـەچی لە سـەرەتای مـانگی حـوزەیرانی هەمـان سـاڵ، بڕیـاری سـەرۆکـایەتیی حکوومـەتی بەعـس، بڕیاری دا کـە (حـرکـات الشـمـال) دەست پێ بکات بۆ تەمـبـێکردنی کـوردان- شـەڕوشـۆڕ و مـاڵ کـاولی خـەڵکی گـوند و دێهـات، و هەڵاتنی هاووڵاتیـان دەسـتی پێ کـرد ڕۆژانەش لە پێش چاومـان، سەرباز و زیلی عەسکەری پڕ لە جاش و عـەسکەر و هێـستر... و دەبابە... بەرەو ناوچەکـانی باکـوری کـوردسـتـان دەڕۆیشتن و لە ڕێگەشـدا هەر گـوند بوو دەگەیشتنێ، دەیاندانە بەر تۆپ و چەکی قورس و ئاگریان تێبەردەدان. ئێمە دەمانبینی، لە دوورەوە دووکــەڵی زۆر لە ناو زوورگ و دۆڵەکـانی سـەر ڕێگەی کـۆیە و سـەربەن... هەڵدەستایەوە بەرەو ئاسمان! بەڵام چی بکەین؟ هیچمان پێ نەدەکرا.

لە مـانگی تەمموز، لەگەڵ سـوهام چووینە بەغـدا، بەلای مـووسـڵەوە ... لەوێ چاومـان بەخزمـان کەوت، بەشەو لە مووسڵەوە بە شەمەندەفەر (قەتار: بەلەهجەی مامۆستا عەلی مـەردان)... لە بەغـداش، ڕۆژی پاشـتـر من و سـوهام چووینە وەزارەتی ناوخـۆ. لە نزیک (سـوق السـرای)... و لەو کـاتە برادەرێکم، کە لە کـۆلێژی (دار المعلمین العـالیـة) پێکەوە بووین، ئەو لە بەشی کیمیا بوو، من لە بەشی ئینگلیزی، بەڵام لە بەشی ناوخۆیی کە لە خـانوویێک بوو لە گـەڕەکی وەزیرییە، هەردووکـمان لە ژوورێک بووین لەگەڵ دوو برادەری ترمان، یەکیـان کـاک فـوئاد شێخ جەمال نەقشبەندی بوو کە ئیمڕۆش هەر دراوسێمە لە گەڕەکی شـۆڕش و ئەویش مامۆسـتای فـیـزیا بوو، ئێسـتـا خانەنشینە! جا ئەو برادەرەمـان ناوی حـازم جەواد بـوو بەعسـییـەکی گرینگ بوو لە پەنجاکـان کە لە کـۆلێژ بوو. بەڵام منی زۆر خـۆش دەویسـت هەمـوو شەو، لەسـەر جـێگەکـەمـان پاڵمـان دەدایەوە و دەمـانخـوێند. جـا هەندێ جار چاو و لەشمان و مێشکمان کە ماندوو دەبوون، عـوودەکـەم دەردەهێنا بۆ ئەوەی هەندێ مۆسـیـقـا و گـۆرانـیـان بڵـێین. جـا حـازم جـەواد زوو داوای گـۆرانـیـیـەکی مـحـەمـەد عـەبدولوەهابی گۆرانیبێژی ناسراوی میسری لێ داوا دەکردم

حازم جەواد

بۆی بلێم، ناوی (دعاء الشرق) بوو... زۆر چاک فێری بووبووم بەمۆسیقا و بەشیعرەوە و بەئەدایەکی زۆر چاک دەمگوت. کاک حازمیش بۆیە ئەو گۆرانییەی پێ خۆش بوو چونکە لە یەک لە بەیتە

شیعرەکانیدا، دەڵێ:

«نحن شعبٌ عربيٌّ واحدٌ
ضمَّهُ في حَومةِ البعثِ طريقُ
الهُدى و الحق مَنِ أعَلامه:
و إباءُ الروحِ و العهدُ الوثيقُ»

حازم جەواد عەینەکی لە چاوە لەگەڵ میشێل عەفلەق دامەزرێنەری حزبی بەعسی فاشیست. بەغدا ١٩٦٣

جا کە بۆم دەگوت، هەر هەندە نەدەما لە خۆشییا بفرێ... ئینجا عەینەکەکەی لە ژێر سەری دادەنا و وردە وردە لەگەڵ ئاوازی گۆرانییەکە... دەچووە خەوەوە و منیش عوودەکەم هەڵدەگرت و دەمپێچایەوە و دەچوومە ژێر لێفەکەوە و سەیرێکی کاک فوئادم دەکرد... ئەویش خەوی دەهات... بەم جۆرە خەومان لێ دەکەوت تا بەیانی جا ئەو گەنجە... حازم، لە ئینقیلابەکە بووە نائیبی سەرۆکی جمهوری و وەزیری ناوخۆ! بەڵێ، لە حزبەکەدا پۆستێکی گەورە و گرینگی هەبوو- ئەو کات سەدام حوسێن و ئەو هەتیوە خێرووانە، هەر ناویان نەبوو و کەس نەیدەناسین. دار المعلمین العالیة (بۆرة)ی بەعس بوو. تەنانەت قوتابییە کچەکانیش زۆربەیان بەعسی بوون.

بگەڕێمەوە سەر چوونەکەی من و دایکی منداڵان بۆ وەزارەتی ناوخۆ- لەوێ، کە دەچووینە ژوورەوە، یەکەم ژوور بەدەستی ڕاست، ژووری سکرتێری وەزیر بوو. سکرتێرەکەش ئەو روشدی عەبدولساحێب بوو، کە پاشان بوو بە بێژەر لە تەلەڤزیۆنی بەغدا تا کۆچی دوایی کرد. بەو گەنجەم گوت کەوا حەز دەکەم بەڕێز حازم جەواد ببینم و پیرۆزبایی لێ بکەم چونکە لە کۆلێژ برادەرم بوو و لە یەک ژوور دەنوستین. ڕەحمەتی روشدی وتی: فەرموون دانیش، ئێستا لە ڕێگەیە وا دێ! هات. هەر چاوی پێم کەوت،

هاتە ژوورەوە و تۆقەی لەگەڵمان کرد و لەگەڵ خێزانم پێکەوە بەسەر قادرمەکان کەوتین تا ژووری خۆی... زۆر بەخێرهاتنی کردین و پرسی لە کوێی و چی دەکەی و... وەزعتان چۆنە! ئیتر نیو سەعاتێ ماینەوە و قاوەمان خوارد و ئینجا باسی حەکایەتی ژنەکەمم بۆ کرد لە ئەودلەوە... ئەویش ئەلحەقی، وتی زۆر ئینسان وەک ئەو موتەسەریفەی ئێوە هەنە کە لە حزبدا نین و دەیانەوێ ناوبانگمان بشێوێنن و بەناو بۆ مەسڵەحەتی حزب کار دەکەن بەڵام هاووڵاتیان ئەزیەت دەدەن و میللەتمان لێ هار دەکەن! بەڵام وا خەریکین ڕۆژانە چەندەها لەو جۆرە مووەزەفانە عیقاب دەدەین و قاریان دەدەین. ئێوە بێ خەم بن... ناوەکە و ناوونیشانی قوتابخانەکەم بدەیێ. کە دەگەیتە هەولێر... خێزانت دەگەڕێتەوە وەزیفەی. ئەوەبوو ئێمە یەک دوو ڕۆژ ماینەوە ئینجا گەڕاینەوە هەولێر- بەشەو لە بەغداوە عاسم برای خێزانەکەم بە تەلەفۆن وتی: مـوژدە بێ سوهام ناوی دەرچوو لە لیستی ئەو مووەزەفانەی کە فەسڵ کراون فەورەن بگەڕێنەوە سەر وەزیفەیان هەر واش بوو... لە ١٤ی ئاب، لە ڕۆژنامەکانمان خوێندەوە کەوا فلان و فلان... لیستەیەک ناو بوو، ناوی سوهامیش لەگەڵیاندابوو... گەڕانەوە سەر وەزیفەیان- بەکتابی ڕەسمیش لە (وزارة التربية و التعليم- مديرية التعليم الابتدائي) دەرچوو گەیشتە دەستمان: ژمارەی: ٤٨٦٥٠ لە ڕێکەوتی ١٩٦٣/٩/١٥ ئینجا تەربییەی هەولێریش کتابی ڕەسمی خۆی دەرهێنا و سوهام حەننا ناصر تەعین کرایەوە لە قوتابخانەی (القلعة للبنات) دەستی بەکار کرد و موباشەرەی کردەوە تۆڵەی هەموو خەڵکەکەش، لە - موتەسەریفی بێ نامووس، بەدرەدین نەقلی بەغدا کرا بۆ وەزیفەیەکی نزمتر!! زۆریشی نەبرد لە بەغدا، ڕۆژێک لە بەردەم ماڵەکەی خۆی، بەیانییەکی زوو، درایە بەر گوللە و وەکو سەگ کەوتە سەر زەوی و یەکسەر ڕۆحی بۆگەنی گوازترایەوە بۆ ئاگری دۆزەخ (الي جهنم بئس المصير)- دەبرۆ دەی. ئاخر لێکدانەوەیەکت نەدەکرد لەگەڵ خۆتدا و بیرت لەوە نەدەکردەوە کە خوای ئەو میللەتە هەژارە وا لە ئاسماندایە و لە بان سەرتایە و دواڕۆژ هەق و حیسابت لەگەڵ دەکات! چونکە، بەیانی زووی ڕۆژی ١٨ی تشرینی دووەمی هەمان ساڵ... ساڵی ١٩٦٣، لەپڕ ڕادیۆی بەغدا بەیانێکی تێدا خوێنرایەوە بەدەنگێکی بەرز هاواری دەکرد: (إلغاء الحرس القومي) بەفرمانی سەرۆکی کۆمار عەبدولسەلام محەمەد عارف بەتوندوتیژی ئەمری کرد کە هەموو ئەندامانی ئەم حەرەسە نا قەومییە، دەبێ بەزووترین کات، خۆیان تەسلیم نزیکترین دائیرەی عەسکەری و پۆلیس بکەن، بەخۆ و بەچەکەوە! هەروەها داوای کرد لە هەموو بنکەیەکی پۆلیس کە ئەو حەرەسانە بگرن و تەوقیفیان بکەن... ئەوەی مقاوەمە

بکات بیکوژن! بەیانێکی تر دەرچوو بەهەڵوەشانەوەی ئەنجوومەنی شۆڕشی پێشوو و دامەزراندنی ئەنجوومەنێکی نوێ هەر بەناوی (مجلس قیادة الثورة) کە سەرۆک کۆمار، خۆی، سەرۆکی ئەو ئەنجوومەنە بوو! حەرەسەکانی هەولێر، هەموو ناسرابوون... کەسیان نەیگوت لەڵ و یەکسەر بەخۆ و بەچەکەوە خۆیان دا بەدەستەوە. بەڕاستی لە هەولێر، شتی وا گرینگ نەقەوما بوو... حەرەسەکان هەندێکیان لە عەرەبەکان نەبێ، ئەوانی تر کە هەولێری بوون و کورد و تورکمان بوو بەزۆری... دەخلی کەسیان نەکردبوو و کاری خراپیان ئەنجام نەدابوو! بەم جۆرە، ئەو جارەش، خەڵک لەو کابووسە کە ساڵێکی نەخایاند، ڕزگاریان بوو و هەناسەیان وەرگرتەوە و کەوتنە سەر ئیش و کاری خۆیان بەهێمنی، نان و ڕزقی خۆیان پەیدا دەکرد. لە ڕۆژان و هەفتەکانی دواتر، ئینجا لە ڕۆژنامەکان باسی ئەو تاوانە نامرۆڤایەتییانەیان دەکرد کە حەرەس قەومی، بەناوی وەتەنییە و (أخلاص للثورة) ئەنجامیان داوە و ناوی زۆربەیان بڵاو دەکرانەوە و چییان کردووە... لە ناو کتێبەکەش دەرچوو بەناوی (المنحرفون) کە زۆر لەوانەی تاوانیان دژیان کرابوو و ماڵ و منداڵیان بزر کردبوون و یا گرتبوویانن و کوشتبوویان... ئەو ئیعترافاتانە بەئاشکرا بڵاو کراونەتەوە... بەڵگە و ڕۆژ و مێژوو دیاری کراون... لە کوێ و کەی و کێ ئەو تاوانەی کردووە! ئینقیلابی لەسەر خۆی و ڕژێمەکەی خۆی کرد، لە تشرینی دووەمی ١٩٦٣! عەبدولسەلام عارف، سەردانی شاری بەعقووبەی کرد و لە بەردەم خەڵک و سەرباز و عەسکەریەکان وتارێکی (أرتجالی)دا، وەک عادەتی خۆی، جا لە برگەیەکیدا، کە من خۆم گوێم لێی بوو لە هەموو وتارەکەی، وتی «صخم الله و وجوهکم أیها البعثیون،» واتا« خوا رووتان ڕەش کات ئەی بەعسییەکان!»

بەرگی پێشەوەی ئەو کتێبەیە کە باسی تاوانەکانی حەرەس قەومی دەکات وێنەی ئەو شکایەت و داواکاری ئەو کەسانەی تێدا ئازاریان داون لە حەپسخانەکانیان، حکوومەتی ڕژێمی عەبدولسەلام عارف، سەرۆکی کۆماری عێراق کە توانی ڕژێمی ئینقیلابی ساڵی ١٩٦٣ بڕووخێنێ و حەرەس قەومی لە ناو برد، ئەو کتێبەی لە چاپ دا و بڵاوی کردەوە

بەڵێ: ئینقیلابە تازەکەی سەرۆک عەبدولسلام عارف، کە ئینقیلابێک بوو لەسەر ڕژێمی خۆی!

عەبدولسەلام عارف

ئەوەش، پێم وایە، لە مێژوو، پێشتر ڕووی نەداوە! سەرۆکی کۆمارێک یا مەلیک و شای وڵاتێک، وەرگەڕێنەوە سەر ڕژێمی خۆیان و گۆڕانکاری نوێی تێدا بکەن! بەڵام ئەو گۆڕانکارییە زۆر گرینگ و پڕ بایەخ بوو بۆ عێراق... لە لایەنی لابردن و ڕووخاندنی دەوودەزگا و مەقەڕاتی حەرەس قەومی موجریم.

پێم جوانە، بۆ وەچەی تازە... کە زۆر کەم لە بابەت ئەو باس و خواسانە دەزانن و بۆ ئەوەی بشزانن کە، بەعس نەک هەر لە ساڵانی حوکمی سەدام حوسێن ڕژێمێکی ناشرین و دڕندە و بێ ئەخلاق بوون بەڵکو هەر لە ڕۆژی ١٤ی ڕەمەزانی ١٩٦٣ کە هاتنە سەر حوکمی عێراق- ڕۆژێکی ڕەش و شووم بوو بۆ هەموو دانیشتوانی و بەهەموو قەومییەت و دین و مەزهەب و تایفەکان ... هەموو زەرەرمەند بوون و ماڵ نەما یەک دوو کەس لێ شەهید نەکرێ، بەبێ هیچ هۆیەک! بۆیە حەز دەکەم هەندێ لە نووسین و سەرە قەڵەم ومانشێتی تایبەتی بەوانە، کە لەدوای ڕاپەڕین و بەتایبەتیش دوای شەڕی ئازادکردنی عێراق لە سەدام و دەستە و دایەرەکەی بەیارمەتی سوپای ئەمەریکا و سەرۆکایەتیی جۆرج دەبلیو بوش کە ئەمڕۆ سەدان گۆڤار و کتێب و ڕۆژنامە لە هەموو عێراق دەردەچن و بیروڕای خۆیان زۆر ئازادانە دەردەبڕن، جا بزانین هەندێ لەو مانشێت و نووسینانە چییان نووسیوە لە بابەت حزبی بەعس و عەبدولکەریم قاسم و ئینقیلابی ڕەشی پیسی نەگریسی ١٤ی ڕەمەزان ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ و هەندێ لە لێپرسراوانیان: ساڵی ١٩٦٤یش هات و ژیان و قوتابخانە و شەعبەکە هەر ما و ئەوان بۆ دۆزەخ چوون.

عەبدولکەریم قاسم، دڵساف و بەڕەحم و مامۆستای چاک و وێنەی هاوڕێی (حاقد) و دڵ و دەروون و ڕوورەش و خائین عەبدولسەلام، بەخیانەت، هاوڕێ و مامۆستا و سەرکردەی خۆی ئیعدام کرد!

وان كانت الاجيال الجديدة والناجون من حكومة البعث الثانية مازالت تحمل في اعماق ذاكرتها وخارطة جسدها الجراحات الاليمة والكوابيس المرعبة.

فان طعم الوقائع المرعبة ووخز الذكريات الموجعة لايام الحرس القومي لا يمكن ان تنساه ذاكرة ما تبقى من ضحاياها وما تركته من جيش من الارامل واليتامى لم تسلم من ارث عصابات الحرس القومي التي خلقت اكبر مؤسسة قمعية في العالم وابشع تقاليدالقسوة التي طورها الجيل الثاني من الحرس القومي في انقلابهم التموزي الثاني فاهلك اولئك اليتامى وما ولد من اجيال في حروب وسجون وثرامات ومنافٍ .لم يمض يومان عقب زحف دباباتهم الهمجية واغتيال الزعيم الخالد عبد الكريم قاسم حتى تم الشروع ببناء اكبر منظمة سرية مهمتها تصفية الخصوم والتفنن في اساليب الاغتيال وابتكار اساليب غرائبية من القسوة .من هناك افتتح اخطر مشروع سياسي في العراق اباد وبطش بالعشرات من المبدعين والعلماء والمناضلين الذين يشكلون الرأسمال البشري لامتنا العراقية .وعند مرور هذه المناسبة الدموية فان الذاكرة العراقية تستحضر العشرات من الوثائق والشهادات والعشرات من المصادر والمراجع والاوراق التي لم تر النور بعد ومذكرات مدفونة في قلوب ضحاياها.

عشرات من المراجع لكتابة تاريخ هذا الفصل التاريخي الدموي باقلام شعراء وعلماء وساسة ومستشرقين اجانب وبسطاء معهم الاف القصص الشفاهية غير المدونة.

افتتحت هذه الاستذكارات التاريخية بكتاب اصدرته مديرية استخبارات حكومة عبد السلام عارف " المنحرفون" وبعدها توالت مذكرات بعثيين تائبين كهاني الفكيكي وطالب شبيب وحازم جواد وشهود من الشيوعيين العراقيين كزكي خيري وصالح مهدي دكلة ورحيم عجينة وبهاء نوري ومؤرخين اجانب محايدين كحنا بطاطو ومؤرخين محليين كعلي كريم سعيد وشعراء عاصروا المحنة كفاضل العزاوي في كتابه الروح الحية .الا تثير هذه الوفرة في المراجع والشهادات والمذكرات لاهم حقبة سياسية عراقية الرغبة والتفكير الجدي بانشاء مركز متخصص لدراسة ثقافة الانقلابات والقرصنة السياسية التي مثل انقلاب شباط الاسود نموذجها الصارخ.ونحن نعلم بان الشعوب المتحضرة تسعى لانشاء مثل هذه المراكز البحثية لشؤون اقل شأناً وادنى قيمة تعنى بالبيئة والطيور والتلوث وغيرها.فكيف ونحن امام ثقافة غريبة ادت لطمس تراث هذا البلد ومزقت نسيجه الاجتماعي وفتتت مكوناته الوطنية بما لم تنجح فيه السياسات الاستعمارية نفسها كما كانت هذه التقاليد الانقلابية سبباً مهماً لاهدار الثروة الانسانية "لحياة الملايين من العراقيين الذين هلكوا في سلسلة من الحروب المهلكة ودهاليز مظلمة من السجون السرية وبالتالي تشريد الالاف من المبدعين وما تسبب من اهدار وطني لثرواتهم الفكرية والعلمية والثقافية.

ان مركزاً للابحاث بهذا الطراز تسهم فيه النخب السياسية والفكرية والثقافية كفيل بالاجابة على مشاعر القلق وهواجس الخوف لما تبقى من ضحايا هذه الثقافة بعدم عودة هذه العصابات الحزبية المنظمة لممارسة قرصنتها الانقلابية ومؤامراتها المشبوهة.ويثبت مثل هذا المركز بما لا يقبل الشك بان الذاكرة العراقية لايمكن ان تتعامل مع وقائعها التاريخية وفصولها المهمة بمنطق الاهمال واللامبالاة.ومن اهم الثمار المستخلصة لمثل هذا المركز هي تلك التطمينات التاريخية للامة بان المسار الديمقراطي هو الخيار الحتمي لها لعدم عودة مناخات وشروط هذه الثقافة من جديد.

عبدالسلام عارف

(من حفر بئرا لأخية وقع فية)

الثلاثاء ٢٠٠٣/٩/٢ العدد ٤٠٦١

# انقلاب ٨ شباط / ١٩٦٣

# ذاكرة طالب شبيب: دروس وعبر

# زعيم الفقراء وشهيد الوطن

إبراهيم عودة الكناني

التاريخ .. عادة ما يمثل حقائق احداث عبر زمن ماض.. والأديب او الكاتب .. بضمير الحيـــاد عليــه أن يحـــرك وجدانه ويوثق عبر كتاباته .. الحقيقة ناصعة لا يعلوها أي غبار . وبالتالي ينقلها للأجيال بأمانة وهو بذلك إمـــا يعبر عن خلجات نفس ظمأى ـ للحياة ، للحب ، للحقيقة .. ذلك هو التاريخ. كثيرون هم الذين أرادوا أن يشوهوا التاريخ. وبالتالي فهم يحاولون ان يشوهوا الحقيقة.

جريدة (العهد الجديد)

# الخطأ

الأحداث تأتي وترحل القادة الزعماء والرؤساء، كل حسب ثقالة، وكل حسب ما فعل، فمنهم من يكرمون ويخلدون في ذاكرة شعوبهم، ومنهم من يسقطهم ... الناس، وتخلدهم اللعنات.

منهم من يلفه الصمت، ومنهم من يصبح رمزاً في سفر ... شعوبهم. عبد الكريم قاسم، رجل من هذا الوطن، أحب ... العراقيين وكانوا ضميره وآماله، عمل الذي عمله، من أجل شعبه الذي أراد له السعادة والارتواء، فسعى سعيه، ومات شهيداً لأجله.

أبولف هتلر، قتله جنون الانتماء، لشعب أراد له سيادة كل شيء، ومات منتحراً لكبريائه المنهزم.

طغاتنا كباراً وصغاراً، ولوا هاتمين، حتى لم يوفروا ... لتوديعهم؟! مدبرين تركوا كل شيء في مهب الريح ... نجوا بجلودهم، مبادئهم، عقائدهم، ضجيجهم الثوري، ... تركوا كل شيء، حتى لم يوصدوا من خلفهم أبواب ... انهزموا أمام منطق التاريخ، لم يمنحوا لأنفسهم ... في المواجهة ولم يتمتعوا قط بالحد الأدنى من شجاعة ضحاياهم.

كانوا يقتلون الناس العراقيين بجرأة نادرة، لم يمتلكوا شيئاً منها، ما دق أبواب الوطن الغزاة الطامعين؟

طاغيتنا مات حياً، مات في قلوبنا العراقية، وظل حياً في ذاكرة ... مولعاً بأساطير الكلمات، خلق منها، حروباً وجيوشاً وضحايا، خلق منها صرحاً للتحدي لكنه لم يمتلك شجاعة الكلمات!

لقد انهزم، هزمه الزمان، ضيع الأشياء كلها، وطناً وشعباً وحزباً وجيشاً حتى لا يضيع؟!

إنها المأساة، مأساتنا نحن العراقيين، لأننا كنا نصفق لكل شيء، ولم نجد الحساب كثيراً ما تكون للهزائم دروساً تعيه واعية الشعوب، قد دفع الثمن، وقد دفعنا الثمن الصعب، عندما تغافلنا عن محاسبة طغاتنا.

مات الطاغية حياً، هكذا أراد الله أن يكون، يعذبه بموت صعب ليس ككل موت، موت المكاشفة، بتقاطع المستقيمات وأنواع الزوايا، ودوائر فوتوغرافية الوضوح، لعله يرى ما رأى، حقيقة ذاته الهابطة، مات بنرجسيته المتوحشة بشجاعة ضحاياه الذين منكوا موقفاً.

لم يمتلك منه شيئاً، سوى غضب الله الذي انتصر لهم..

تموت يا صدام ببطء الزمن وثقل الجريمة.

مت يا صدام بأحزان حرائر العراق، حين قتلت لهن الشيب والأب والابن، مت بأرواح ضحاياك الذين عبثت فيهم كثيراً، مت بلعنة مقابرنا الجماعية.. التي ستبقى لعنة الخطأ الذي ارتكبه الجميع، لأنهم لم يحاسبوك..

مت يا صدام حين انهزمت..!

خليل عفتان الربيعي

بەڵێ: جا دیسان دەڵێمەوە... ژیان هەر بەردەوام بوو و بەردەوام دەبێ. من لەو حاڵەتە ناخۆشەش کە بەسەرم داهاتبوو، بەهۆی دڵ و دەروونی ڕەشی پیسی مرۆڤی ناپەسند و بیزی و حەرامزادە... لەگەڵ ئەوەشدا لە هونەر و گۆرانی بەردەوام دەرفەتم دەدایە خۆم... تاوێک لەگەڵ هاوڕێی پاک و بەزەوق لەو ماڵ بۆ ئەو ماڵ، لەو دیوەخانە بۆ ئەو دیوەخانە... تەنانەت سەیرانیشمان

مامۆستایانی قوتابخانەی جمهوری و ئەربیلی کوڕان- لە ٢٢ ئایاری ١٩٦٤ لە قوتابخانەکە گیراوە: لە ڕاستەوە: فەوزی باقر- عەدنان عباس ئەسەدی- وەلی حەسەن ڕەزا- غازی سنجاری- زوبێر بیلال- باکووری- فازڵ شەوکەت. ئەو سێ کەسەی دواوەش لە ڕاستەوە: حەمید مەرمەرچی- سوبحی عومەری- مەدحەت محەمەد سەفوەت.

دەکرد... دەمزانی ئەو حاڵەتە هەر کۆتاییی دێت و لە دوای ناخۆشی... خۆشی دێت و دێت! ئەمە عومرە... تەمەنە... نابێ ناخۆشی و بارودۆخێکی کاتی... کە سیاسەتی چەوت وای کردووە... نابێ من هەر بە خەم و پەژارە بەرمە سەر! بۆیە، هەر کاتێ برادەرانم بۆنە و موناسەباتی خۆشیان هەبوایە، زۆر بەدڵخۆشی ڕامانەبوارد و شەوەکە و موناسەبەتەکەم دەڕازاندەوە بۆ خاوەن ماڵ و میوانەکان وەک لەم وێنەیەدا روونە.

لەسەر خوانەیەکی ڕازاوە بەگۆشت و قۆزی کۆ بووینەوە لە ماڵی دکتۆر ئاگۆب لە شەوی سەری ساڵی ١٩٦٤

جـا له وێنه‌كـه‌دا، خـێـزانی دكـتـۆر، به‌ده‌ستی خۆی، گۆشتی به‌رخـه قـۆزیكراوه‌كـه دابه‌شی سـه‌ر مـیـوانه ئازیزه‌كـانی خـۆی و مێردی ده‌كات، به‌وپه‌ڕی دڵخـۆشـیـیـه‌وه! له وێـنه‌كـه‌دا: دایكی میـناس- ئه‌وا گـۆشت و قـۆزی و خـواردن له قـاپه‌كـه‌ی تیـمـه‌ی برام ده‌كـات، له به‌رامـبـه‌ر خـۆی. دوای تیـمـه، له ڕیزی خـۆی مـاری خوشكـمانه و قـاپی خۆی

هه‌مان شه‌وی له ماڵی دكتۆر ئاگۆبی ئه‌رمه‌نی له هه‌ولێر، سه‌ری ساڵی ١٩٦٤ له ئاهه‌نگێكی قشتیله كۆتاییی ساڵی ١٩٦٣ی به شوومـان، به‌خۆشی ڕابوارد و ئینقیلابچییه‌كان كۆتاییان هات و زۆربه‌یان به‌ره‌و دۆزه‌خ ڕۆیشتن و ئێمه‌ش، له خواوه، هه‌ر خۆش و باش ماینه‌وه... چونكه ئێمه باش بووین، له خوا ده‌ترسین و ژیانمان خۆش ده‌وێ و خوامان خۆش ده‌وێ!

پڕ و خـه‌ریكه لێی ده‌خـوات. له ته‌نیـشـت مـاری خـوشكمـان، به‌ڕێز كـاك یوسف پۆلس ئه‌جزاچی، وا به‌پێكه‌نین و خۆشی، ده‌خوا و سه‌بری كامێرا ده‌كات. له ته‌نیشتییه‌وه، منم... ڕانه به‌رخه قۆزیكراوه‌كه‌م به‌ده‌سته‌وه‌یه و خه‌ریكم، به‌ده‌م و ددان گۆشتی لێ بپچڕێنمه‌وه... ئینجا له دواوه‌مـان، له پشت كـاك یووسف پۆلس، سـه‌ری مـیـوانێكی تر دیاره و شـتێ ده‌خواته‌وه.

به‌م شێوه و به‌ڕابواردنی خۆش له‌گه‌ڵ براده‌ران، سه‌ره‌تای ساڵی نوێمان به‌سه‌ر برد! به‌ڵام دیسـان، خۆشییه‌كـانمان به‌یه‌ك دوو ڕووداوی ناخـۆش، لێمان بوونه‌وه به‌ڕۆژانی ترش! له لایه‌ك فیلیپی برام گیرایه‌وه و درایه مه‌حكه‌مه‌ی مه‌جلسی عورفی خاسه له كه‌ركووك و به ٦ شه‌ش مانگ حوكم درا له حه‌پسخانه‌ی كه‌ركووك كه له ناو دائیره‌ی به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تیی پۆلیس بوو... بینایه‌كی كۆن و ئاسه‌وار و گه‌وره بوو له‌سه‌ر شه‌قامی سه‌ره‌كی، به‌رامبه‌ر پرده كۆنه‌كه و، سینه‌مای غازی- جاران كه له‌ڕ‌به‌ری جاده‌كه له‌سه‌ر ڕۆخی زێی خاسه بوو- ئه‌و خه‌به‌ره‌م وه‌رگرت له كـاك مه‌تی ئامۆزام و ئه‌ویش له براكـه‌ی كه له كـه‌ركـووك بوو،

بنیامێنی ناو بوو، بەتەلەفۆن هەواڵەکەی دابووە مەتی! هەڵسام دایکمم نارد، بەڵکو هەوڵ دا براکەم چاوی پێ بکەوێ - مواجەهەی بکات... و مناڵەکانی بهێنێتە لامان، دایکم چوو و ئێوارە هاتەوە زۆ دەگریا و بەخەم و خەفەتەوە جوێنی دایە هەمسوو داوودەزگای ئەو حکوومەتە مەلعوونە... و دوعای دەکرد خوا لەناویان بەرێ! وتی: براکەتیان بۆ ٦ شەش مانگ حوکمی سجنیان داوە و نەیانهێشت ببیبنم. جولێتی خێزانی و منداڵەکانیشی: ئازاد و نیاز و هوەیدای لەگەڵ خۆی هێنانەوە.

خەبەرەکەی تریش، ئیسحاقی کوڕی خواجە ئەبرەهە لە کۆیەوە بۆی هێنام وتی: خاڵە سێوە کۆچی دوایی کرد و لە هەرمۆتە نێژرا! بەڕاستی زۆر ئەو خەمەم گەورەتر بوو! ئەو هونەرمەندە گەورەیە... لەو ئەحواڵە ناخۆشە و بارودۆخە پیسە... بەبێ کەسوکار و بێ ژن و ماڵ، ئاوا لەو تەمەنەشیدا، کە نەخۆش و بی دختۆر و دەرمان مابووەوە... چونکە دۆخی کۆیێ زۆر ناخۆش بوو...! ئینجا ڕۆژە خۆشەکانی کە لەگەڵ سێوە و هونەرمەندە کۆیییەکانی ترم دەهاتنەوە بیر و لە پێش چاوم بەخەیاڵ دەمدیتن... یەک لە دوای یەک، چەند دنیامان لە لا خۆش بوو! سێوە چەند دەگەشایەوە کە من عوودم بۆ لێ دەدا... ئەویش مەقامە ڕەسەنە خۆشەکانی بۆ دەگوتین!! بەڵام، داخەکەم، چوو! ڕۆیی! نایێتەوە... نەخۆی و نە ئەو ڕۆژانە مێژووییانە ناگەڕێنەوە! سێوەمان مرد! سێوەمان ڕۆ!

وڵاتی ئێمە... عێراق بەگشتی، کوردستانیش بەتایبەتی لەو کەش و دۆخە دواکەوتووە... لە کوشتن و ئەزیەتدان و گرانی و ناخۆشیدا خنکابووین، کەچی لە ڕۆژنامەکان خوێندمانەوە و لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆن بینیمان:

کەشتییەکی ئاسمانی ئەمەریکی، ئەمڕۆ، ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ٣ی شوباتی ١٩٦٤ بە ئەسپایی لەسەر مانگ نیشتەوە! سەیرە وەڵڵا سەیرە! نازانم من بۆچی لەو وڵاتە خۆش و پێشکەوتووانە، نەهاتمە دنیاوە! بۆچی لە ناو ئەو کۆمەڵە دواکەوتووە و بێ خەبەر لە عیلم و هونەر و زانستی، و هەر بەدوای خورافیات و عەقلی شەیتان کەوتوون!!- بۆچی باوکم و دایکم ئێمەیان لێرە فڕێ دا! زۆرجار لەگەڵیان دەکەوتمە دەمەقاڵە و گفتوگۆ و پرسیار دەمگوت: ئاخر ئێوە، لە تورکیاوە، کە ڕاویان دەنان و هەڵدەهاتن و ئەوان

دەیانکوشتن، چۆن بەرەو ئەو وڵاتە دواکەوتووە... ئەو میللەتە کە زۆریان پیاوکوژ و بێ ڕەحم و بێ سیفاتی مرۆڤایەتین... چۆن بەرەو ئێرە کەوتنە ڕێ! ئێوە لە دەوی گورگ هەڵدەهاتن، دەهاتنە ناو دەم و شەویلاکی پڵنگی برسی بۆ خوێنی ئێوە؟؟ ئەوان بەستەزمانانە (باوکم و دایکم) بەو قسانەم خەمیان دەخوارد و هەستیان دەکرد کە غەدریان لە ئێمەش کردووە! من و برا و خوشکەکانم و...

هەموو جار لۆمەم دەکردن بۆ ئەو کارەی کە بەبێ بیرکردنەوە، ئەنجامیان دا!! دەیانگوت: کوڕم وەڵڵا کەسمان نەبوو ڕابەراتیمان بکات! پیاوی بەعەقڵ و هۆش و ڕۆشنبیرمان نەبوو لەو ئیشە بکۆڵنەوە و نەهێڵن ئێمە ڕوو لەو ناوچانە بکەین! گەورەکانیشمان لە ئێمە بێ عەقڵتر و بێ مێشکتر بوون! ئێمە خوا خوامان بوو لەو دڕندانە نەجاتمان بێ، بەڵام بۆ کوێ بچین؟ نەماندەزانی! باپیرم، باوکی دایکم... زۆر بەتەمەن بوو... بەڵام قسەکانی زۆر خۆش بوون و باس و وەسفی گوند و وڵاتی خۆیانی بۆ دەکردین. شەوان کە پێکەوە دادەنیشتین، پێکێک عەرەقم بۆی تێ دەکرد! کە دوو سێ قومی لێ دەدا و سەری گەرم دەبوو... ئینجا لەگەڵ باسی کێڵگەکەی و مەڕ و ماڵاتەکەیان و ماڵ و حاڵیان کە بەجێ هێشت و هەڵاتن... نەیاندەزانی بۆ کام لا هەڵێن دەیگوت: «لە هەموو لایەک جەردە و جەندرمەکانی تورکەکان و بەیارمەتی هەندێ لە پیاو خراپی گوندە دراوسێکانمان... دەورەیان دابووین و لێیان دەکوشتین... ئێمەش هەر بەناو دڕک و دار و دۆڵ و دەشت و کێو... هەر غاردە و غاردە و... هەڵدەهاتین» ئینجا فرمێسکی دەهاتە خوار و لاوکێکی دەچڕی بەقورگە پیرەکەیەوە و ئاخی هەڵدەکێشا! دەیگوت: کوڕم بەخوا ئێوە ڕاست دەکەن... بەڵام ئێمە نەقوتابخانەمان هەبوو... نەخوێندەوار بووین... ئاغا و گەورەکانیشمان لە ئێمە کەرتر بوون! هەر هەوڵی مەڕ و ماڵات زیادکردن بوون! بەس هەوڵی خواردنیان دەدا و لە دیوەخانە پاڵیان دەدایەوە تا وەک حەیوان خەویان لێ دەکەوت و بەیانی هەڵدەستانەوە... ئەوە بوو ئیش و کاریان! شتی بەسوود و بەکەڵک بۆ خۆیان

و بۆ ئێمەی کاسبکار و فەلاح و جووتیاری ئەوان... هیچیان نەدەکرد باپیرم ناوی لازار کوڕی عەبدال لێرە دەڵێن ئاودەل بوو... باوکی دایکم بوو- لە مووسڵ کۆچی دوایی کرد لە شەستەکانی سەدەی بیستەم.

هەر لەو ڕۆژانە، هونەرمەندی گەورەی عێراقی، بەڕێز مامۆستا حەقی شبلی عەمیدی شانۆی عێراق، کرایە بەڕێوەبەری دەزگای ئێزگە و تەلەڤزیۆن و سینەمای عێراق- (مدیرعام مؤسسة الاذاعة والتلفزیون و السینما)- جا ئەو بەڕێزە هەر لە ساڵانی پەنجاکانەوە کە لە کۆلێژی (دار المعلمین العالیة) قوتابی بووم و لە ئێزگەی کوردی بەغداش گۆرانیبێژ بووم، مامۆستام ناسیبوو، کە ئەو کاتە معاون مودیری پەیمانگای هونەرە جوانەکان بوو- زۆر جاران دەچوومە پەیمانگا بۆ ئامادە بوونی هەندێ موحازەراتی مۆسیقا کە مامۆستایان: جەمیل بەشیر و مونیر بەشیر و غانم حەداد و ڕوحی خەماش، دەیانگوتنەوە... جا لەو سات و کاتی ئاوا، سەردانێکی مامۆستا حەقیشم دەکرد- هەروەها چەند جارێ لە کۆلێژەکەمان، کە ئاهەنگی یەکترناسینمان دەبوو، شانۆگەرییەکی بۆ ئامادە دەکردین و لەسەر داوای ئێمە بۆی ئیخراج دەکردین تەنانەت ساڵێکیان، چیرۆکی (قەیسەر و کلیوپاترە)ی نووسینی شێکسپیرمان ئامادە کرد و منیش تیایدا ڕۆڵم وەرگرت لەگەڵ قوتابیی کچ سەلوا زەکۆ کە ئەویش قوتابی بوو لەگەڵماندا، لە بەشی ئینگلیزی: ئەو شانۆگەرییە مامۆستا حەقی شبلی بۆی دەرهێنایین و

مانگی مارت ١٩٥٤ لەم وێنەیەدا، من و قوتابیی کچ سەلوا زەکۆیە، هەردووکمان قوتابیی بەشی ئینگلیزی بووین لە (دار المعلمین العالیە) وا لەسەر شانۆی کۆلێژەکەمان قەیسەر و کیلۆپاترە بەشداری دەکەین کەوا بەزمانی ئیگلیزی (شێکسپیر)، لە دەرهێنانی دەرهێنەری عێراقی گەورە حەقی شبلی بوو

لەسەر شانۆی کۆلێژی خۆمان و بۆ قوتابیان نمایشمان کرد:

جا بەڕێز حەقی شبلی بووە بەڕێوەبەری ئێزگە، و تەلەڤزیۆن، کاغەزێکی پیرۆزباییم بۆ نارد لە هەولێرەوە ئەویش وەڵامەکەی بۆ ناردم کەوا لێرەدا هەمان دەسنووسی خۆی دادەنێم:

حەقی شبلی

بغداد ١٢/١٢/١٩٦٦

عزيزي الاستاذ باكوري المحترم

تحية خالصة :-

استلمت رسالتك الرقيقة وقد سررت بها جداً وانتهز هذه الفرصة الطيبة لاشكرك جزيل الشكر على شعورك النبيل نحوي راجياً لك الصحة والتوفيق أخي الفنان الوحيد.

آمل أن تكون أحوالك الفنية بالرغم من مشاغلك في التدريس مستمرة وسائرة على أحسن ما يرام. مشتاق حقاً لرؤيتك ورؤية جميع الاخوان في أربيل الزاهرة. [illegible] وسلامي للاخ فؤاد ولجميع الفنانين في أربيل. مع [illegible] تمنياتي الطيبة لكم. ولكم تحياتي وسروري.

المخلص

حقي الشبلي

چەند هەفتەیەک پێش ئەو وەزیفەیە یا ئەو شوێنەی پێی درا... مامۆستا حەقی هاتە هەولێر... لە لای من و پاشان لە ماڵی کاک فوئاد ئەحمەد... دەعوەت کرا لە باخچە بچکۆلەکەی ماڵی فوئاد کە لە خانووەکانی حکوومەت بوو، لە سەیداوە دانیشتین، من و یووسفی برام و فوئاد و مامۆستا حەقی، تا درەنگی شەو بەگۆرانی و مۆسیقا شەومان بەسەر برد... یووسفی برام هێشتا لە قۆناغی ناوەندی بوو- هەر لەو شەوە پێی وتم و بە یووسفی وت: هەر ئەو قۆناغە واتا ناوەندیی تەواو کەیت وەرە (معهد الفنون الجميلة) و من قەبووڵت دەکەم! هەر بۆیەش لە نامەکەی سڵاوی ناردووە بۆ هەموو هونەرمەندانی هەولێر و بەڵام بۆ کاک فوئاد ئەحمەد بە ناو... ن وی هێناوە... دەڵێ: (سلامي للاخ فؤاد) دواتریش لە دانیشتنێکی خۆمانی، لە بەغدا، پێی وتم، بە عەرەبی کە جگە لە تۆ، کەسێک لە کوردستان ئەو هەستەی بەرامبەر من نەبوو.

لە بەغداوەش هاوڕێی ئازیزم، کاک وەحید بامەڕنی ئەفسەر- باوکی زیرەک- ئەگەر دانیشتنی خۆشی و سەیرانیان هەبوایە، کاغەزی بۆ دەناردم و داوای لێم دەکرد کە سەردانیان بکەم وەک ئەم نامەیەی لێردا داماوە و بەعەرەبی نووسیوە... چونکە ئەو سەردەمە، نووسینی کوردی زۆر بەکار نەدەهێنرا بۆ نامەی تایبەتی نێوان برادەر و خزمان... بەڵکو عەرەبییەکە زیاتر باو بوو ئەوەش لەبەرئەوەی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن، لە قوتابخانەکان بەعەرەبی بوو.

له ٢٠ی مانگی ئادار ئەو ساڵە... ساڵی ١٩٦٤، وەزع له عێراق بەگشتی و له کوردستانیش بەتایبەتی، کەمێک هێور بووبووەوە بەهۆی جۆرە پێوەندییەک کە له نێوان حکوومەت و بەڕێز مەلا مستەفادا دروست بوو بوو و بەیانێک دەرچوو بەم بۆنەیەوە!! حکوومەت زۆر لەو کەسانەی دوای ئینقلابەکەی بەعس ١٩٦٣ گیرابوون و بەندیخانەکان پڕ بوون، دەست کرا بەئازادکردنیان و فیلیپی براشم کە له رومادی له بەندیخانە بوو... نێردرایە سلێمانی تاکو لەوێوە ئازاد بکرێ.

له هەولێر زۆر پەست بووبووم و حەزم دەکرد گۆڕانێک ڕووبدا و لێی دەرچم... بۆیە دوو سێ جار، له هەواڵی ڕادیۆ، یا له ڕۆژنامان کە ئاگادارییەک یا ئیعلانێکم گوێ لێی دەبوو کەوا له فلان شوێن پێویستیان بە مووەزەفی دەوڵەت یا مامۆستا یا کەسانی خاوەن بەهرەی تر هەیە، من زوو داوایەکم دەنارد بۆیان. بەڵام هەمیشە وەڵامم بۆ دەهاتەوە بە رەفز واتا ڕەزامەندییان لەسەر وەرگرتنم نەبوو. بۆ ؟ نازانم.

له پایزی ساڵی ١٩٦٣ له ئێزگەی ڕادیۆی لەندەن B. B. C. گوێم لێ بوو کە پێویستیان بەکارمەندی نوێ هەیە له دەوڵەتانی عەرەب کە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی باش بزانن بۆ ئەوەی ببن بە بێژەر لەو ئێزگەیە. من خێرا داوام نووسی و ناردم بۆیان له ١٩٦٣/١١/ ١١ وەڵامیان دامەوە و فۆرمیان بۆ ناردم پڕم کردەوە، ناردم بۆیان... بەڵام قەبووڵ نەکرام ئەمەش وێنەی یەکەم وەڵامیانە کە داوام لێ دەکەن فۆرمەکەیان بۆ پڕ بکەمەوە و بۆیان بنێرم!

له لبنانەوە، داوایەکم بۆ هات، دوای پێوەندیکردن بەوەزارەتی پەروەردەیان... چونکە داوایان کردبوو مامۆستای جۆراوجۆر، ئەوانی ئامادەن له لبنان کار بکەن، با داوا بنێرن

THE BRITISH BROADCASTING CORPORATION
MIDDLE EAST OFFICE
WAZZAN BUILDING PHOENICIA STREET BEIRUT LEBANON

CABLES BROADCASTS BEIRUT

11th November 1963

Dear Mr. Bakory,

With reference to your application I have pleasure in enclosing an Application Form. Would you be kind enough to complete this, taking great care to answer every question, and forward it to:

Miss E. Burton,
A. A. Arabic Service,
British Broadcasting Corporation
Bush House,
Strand,
London, W.C. 2.
England.

Yours sincerely,

( J. H. Whitehead )
Middle East Representative

Mr. Andrews Bakory,
Intermediate School,
Arbil,
Iraq.

Enc.
PD

بۆیان- منیش عەریزەیەکم بۆ ناردن... کەچی لە وەلامدا... داوای لێبووردن دەکەن کە ناتوانن داوایەکەم جێبەجێ بکەن...

هەروەها لە هەمان ساڵ، لە ڕادیۆی بەشی ئینگلیزی، لە وڵاتی پاکستان بیستم کە پێویستییان بە بێژەر هەیە دیسان داوام بۆین نارد... وەلامم بۆ هاتەوە بە (نأسف لقدم إمكن تنفيذ طلبكم) واتا ئێمە ناتوانین داواکەت جێبەجێ بکەین... لەگەڵ داوای لێبوردن.

زۆر هەوڵم دەدا، بچمە دەرەوەی عێراق بۆ تەواوکردنی خوێندن، لە یەکێ لە زانکۆکانی ئەوروپا یا هەر وڵاتێکی تر... بەلام بۆم نەکرا و سەر نەکەوتم لە هەوڵەکانم. بەداخەوە! چونکە زۆرم حەز لە خوێندن بوو و پێم خۆش بوو بڕوانامەیەکی ماستەر... دکتۆرام هەبوایە! ... نسیب نەبوو!

الجمهورية اللبنانية
وزارة التربية الوطنية
مصلحة الشؤون الثقافية والفنون الجميلة
قسم المفوظات
رقم الصادر ٨٥٤/٨

السيد اندريوس اسرائيل خحو

بيروت في ١ تموز ١٩٦٤

الموضوع: طلب توظيف في لبنان
المرجع: كتابك المؤرخ في ١٣/٦/١٩٦٤

جوابا عن كتابك المشار اليه اعلاه الذى تطلب فيه الى هذه الوزارة النظر في امكان قبولك مع زوجتك مدرسين في المدارس اللبنانية

يؤسف هذه الوزارة ان لا تتمكن من اجابة طلبك بالنظر الى ان من الشروط الاولية للحصول على وظيفة رسمية في لبنان ان يكون المرشح حاملا الجنسية اللبنانية ×

رئيس مصلحة الشؤون الثقافية والفنون الجميلة
عبد الرؤوف

عبد الرؤوف فضل الله

وەلامەکەی وەزارەتی پەروەردەیانە بۆ من

موتەسەریفی نوێی هەولێر، لەو ساڵەدا بۆمان هات، بەڕێز عەبدولمونعیم مەسرەف بوو. پیاوێکی زۆر ڕووخۆش و بەزەوق و هونەردۆست بوو. بەئەسل ئەفسەر بوو، بەلام کرایە موتەسەریفی هەولێر زوو زوو، ئێمەی هونەرمەندانی دەعوەت دەکردین بۆ قەسری خۆی- قەسری موتەسەریفی ئەوسا. جا لە دەعوەتەکە خەڵکی ناسراوی شاریش دەعوەت دەکران و تا درەنگی شەو خۆشمان ڕادەبوارد. جەنابی موتەسەریف دەهاتە لامان... دەیپرسی: چیتان نوقسانە؟ چیتان دەوێ ئێمەش

سوپاسمان دەکرد و دەمانگوت: تۆ خۆش هەموو شتێ هەیە من هەندێ گۆرانی عەرەبیم بۆ دەگوتن- زۆری لە لا خۆش بوون.

عەبدولمونعیم مەسرەف
موتەسەریفی هەولێر

هەر لەسەر دەستی ئەو پیاوە نەجیبە، پڕۆژەی گلکەند دەستی پێ کرد... کە ئەو ناوچەیە هەمووی خەرابە و کاول وئاوی پیسی شاری تێدا کۆ دەبووەوە، پڕۆژەکەش ئەوە بوو کە بکرێ بە باخچە و شوێنی خۆش، بۆ گەشتوگوزار. هەرواش ڕووی دا...

لە مانگی ئەیلوولی ئەو ساڵەش، هەردوو کوڕەکانم: شۆبان و سەبا و ئازادی کوڕی فیلیپی مامیان، کە دایکم هێنابوویە هەولێر و لەگەڵمان دەژیا و لەگەڵ منداڵەکانمان دەخافلا، جا هەرسێکمان ناردنە (روضة الاطفال الرسمية)، و ناویان تۆمار کرا. هەموو بەیانییەک، ترومبێلی پاسی ڕەوزەکە دەهاتە بەر دەرگای ماڵمان و هەرسێک سواردەبوون و دەیانبردنە ڕەوزە و نیوەڕۆ دەیانهێنانەوە. شۆبان پێی ناخۆش بوو، سەرەتا! دەگریا و هەر سەیری دەکردین لە شووشەکەی پەنجەرەی دواوەی پاسەکەیان، تا ئێمە لەبەر چاوی ون دەبووین و تەنانەت وەستا محەمەد شەڵتەی شوفێرەکەشیان پێی پێدەکەنی.

عەبدولمونعیم مەسرەف و چەند لێپرسراوێکی شار، سەردانی کرێکارەکان و پڕۆژەی گلکەند دەکەن. ١٩٦٤

مانگانەش، بۆ ئەو ڕەوزەیە، تەنیا ٦٠٠ فلسمان دەدایە وەستا محەمەد شەڵتە هەقی کرێی سەیارەکە- ساڵی یەکەم لە قۆناغی تەمهیدیدا مانەوە، ساڵی دووەم ئینجا لە ڕەوزە دەوامیان کرد. لە بابەت خەسڵەت و حەز و خوو و ڕەوشتیان، زۆر باش بوون و لە ڕاپۆرتی بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەکەدا، ڕازی بوون لێیان، وەک لەم دوو دێکۆمینت، یا وەسیقەی بڕوانامەیاندا هاتووە. ئەوانی تر باوکم و دایکم و تیمە و ماری و ئازادی کوڕی فیلیپپیش، چوونە خانووەکەی ناو غابات. ئەگەرچیش ئەم جیابوونەوەم لە ماڵە باوک، ئەرکێکی قورسی هاویشتە سەر شانم و هەستم کرد کە ئەمڕۆ، تازە، من پیاوی ماڵم! پێشتر...

لە لای ڕاستەوە: مناڵە بچووکەکە، ناوی هوەیدەیە و مناڵەکەی دواوەشی ئازادی برایەتی. ئەوانە هەردووکیان مناڵی فیلیپی برامن و لە ژیاندا ماون و لە ئەمەریکا دەژین- مناڵە توورەکەی تەنیشتیان، لە لای چەپ، سەبای کورمە! یارییەکەی خۆی توند گرتووە

کورەکەی دیکەم ناوی شۆبانە و بە شۆپان گازی دەکەن

دایکم و باوکم لێپرسراوی بەڕێوەبردنی ماڵ و کارەکانی پێویست بەماڵ و مناڵیان هەڵگرتبوو. باوکم لە بازاڕ مانگ و مانگ شتی دەهێناوە و دایکیشم هەفتەی دوو سێ جار دەچووە بازاڕی گۆشت و سەوزە و... تاد دەیهێنا و چێشتی بۆ لێ دەنایەن... ماری و وەردیبیە پاککردن و شووشتن و بەیارمەتی سوهامیش، ئەگەر نەساغ نەبوایە... ئەو کارانەیان دەکرد- کەچی دوای جیابوونەوەمانم... ئەو ماندووبوونە بۆ من مایەوە ؛ و ئازادی و سەربەستی و هات و چوونم بۆ ئەملا و ئیملا و سەردانی برادەران... کەمتر بووەوە! بەتایبەتی شەوان، قەت و قەت، مناڵەکانم ڕازی نەدەبوون لە دەرەوە بمێنمەوە!

بۆ ڕابواردنی سەری ساڵ، هاوڕێی ئازیزم لە کەرکووک فازڵ مەجید... برادەری ساڵانی پەنجاکانم و تا ئێستا، دەعوەتی کردین من و خاوخێزانم بۆ ڕابواردنی سەری ساڵ لە کەرکووک، لەگەڵ ئەوان. ئەوەبوو چووینە لایان و شەو لە ماڵی ناسری برای کاک فازڵ، شوێن، و مێز و کورسی ڕیز کرابوون و هەموو شتێ زۆر جوان و ڕێکوپێک بوو لەگەڵ جۆرەها دیاری و دەسکەگوڵی جوان ژوورەکەی ڕازاندا بووەوە. ئیتر لێی دانیشتین: هەمووومان و عوودی من و گۆرانی ناوە ندەش هەڵدەستاین و تاوێک هەڵپەڕکێ و شاییمان دەکرد. سەعات١٢ی شەو کارەبا کوژایەوە و... ساڵی ١٩٦٥ هات... یەکترمان ماچ کرد. ئینجا باقی شەوەکەمان ڕابوار: لە هۆڵی (بهو الأمانة) لە کەرکووک کە

هەر سێ منداڵەکانی فیلیپ: گەورەکەی
دواوە ئازادە و کیژۆڵەکە هوەیدا و
کوڕەکەی تر نیازە

لە ڕاستەوە: سەبا (فارس الصف) بوو لە
لای چەپی شۆیانە لە ڕەوزە. ١٩٦٤

سەبا و شۆیان تەمموز ١٩٦٢

لە ڕاستەوە: من، سەبا، دایکی، شۆیان ١٩٦٤

ئاسوورییەکان ئاهەنگیان تیایدا سازدا بوو و ئێمەشیان دەعوەت کرد. کە چوومە ناویانەوە... زۆربەیان دەیانناسیم و بەچەپڵە پێشوازییان لێم کرد... دوایی منیان بانگ کردە سەر شانۆ و بەعوودی تەنیا نیو سەعاتێک گۆرانی کوردی و ئاسووریم گوت و هەموو هەڵسابوونە سەر پێ و هەڵدەپەڕین. دواتر کاک یووسفی براشم چەند پارچە مۆسیقایەکی بە کەمان و لەگەڵمدا بەشداری کرد.

أشكر لكم تهانيكم
لا زلتم بخير
بغداد
١٩٦٤

وێنەکانی لێرە دامناون، شێوەیان باو بوو وەک کارتی وەڵامدانەوەی جەژنانە. ئەم کارتەی لە لای ڕاستەوەیە، لە مامۆستای گەورە حەقی شبلییەوە هاتە، لە وەڵامی کارتێکی جەژنانە... کە من بۆم ناردبوو- ١٩٦٤

الى حضرة الأخ العزيز اندريوس باكوري المحترم
نغتنم فرصة العيد السعيد فنقدم خالص تهانينا
من نافع علي مردان
٢٥/١٢/٩٦٤
العنوان
كركوك — شارع الاوقاف
محلة ترجمين - نافع علي مردان

کارتی جەژنی سەری ساڵ و جەژنی میلادی مەسیح، کە بۆم هات... بەڵام وێنەکەم دانەنا... تەنیا نووسینەکەم بەپێویست زانی لەگەڵ ناو و ئەدرێسی ئەو برادەرەم

أشكر لكم تهانيكم
لا زلتم بخير
فاضل مجيد
٢٥/١٢/٩٦٤

وەڵامی جەژنانەکەمە کەوا بۆ هاوڕێم فازڵ مەجیدم ناردبوو بۆ کەرکووک، بە بۆنەی جەژنی میلاد و سەری ساڵی ١٩٦٤/٦٥

بو ماموستای بەرزو بەڕیز کاک باکوری
أشكر لكم تهانيكم
لا زلتم بخـــير

ئەم کارتە، لە هاوڕێی زۆر ئازیزم مامۆستا سدیق سادق بۆم هات لە وەڵامی جەژنانەم بەبۆنەی سەری ساڵی ١٩٦٤/١٩٦٥

هەندێ کارتی جەژنانەم نارد و وەڵامیان دامەوە... برادەرانی کەرکووک و بەغدا و کۆیە هەندێک برادەری کەش بەهەمان شێوە، کارتی جەژنی میلاد و سەری ساڵیان بۆ ناردم... ئەوسا ئەو مۆدێلەی ناردنی کارتی جەژنانە بۆ برادەر و خۆشەویستان زۆر باو بوو: ئەمڕۆ کەم کەس ئەوە دەکەن. چونکە ئەو سۆزە گەرمە... ئەو برادەرایەتییە بەسۆزە... ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییە و ئەو نەریتە جوانانە کەم دەبنەوە و خەڵکی ئێستا، بەتایبەتی گەنجەکان بایەخی پێ نادەن... زۆر بەداخەوە!

أشكركم لتهانيكم
لا زلتم بخير كما وهنأتم

زوهدی عەلیم ناسی لە کەرکووک، لە ساڵی ١٩٥٠ و بەهۆی هاوڕێم فازڵ مەجید. ساڵانێکی خۆشی و هاوڕێیاتی و هونەری، هەموو ڕۆژانی هەینی و پشوومان پێکەوە ڕادەبوارد.

جا کە لە کۆیەش بووم، هەر نامە و کارتی جەژنمان دەگۆڕییەوە- وەک ئەو کارتە سوپاسنامەی بۆی ناردووم لە ساڵی ١٩٦٥

بۆ ماموستا باڵوری بەرێز
لە صلاح سعدی
٩٦٥/٤/١٠

زوهدی ژمێریاری I. P.C. بوو- لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی نەوت. لە پێشتریش لەگەڵ گرووپە شانۆکارییەکەی مامۆستا حەقی شبلی ئەندام بووە لە هەولێر، لەگەڵ ئەو تیپە و تیپی تەمسیلی لبنانی و نەکتەری کۆمیدی (بشارە واکیم) شانۆگەری و دیمەنی کۆمیدییان ئەنجام داوە. ئایەم ئاهەنگە خۆشە لەگەڵ برادەرانی ئازیز فازڵ مەجید و ناصری برای و زوهدی عەلی و گەلێک خزم و ناسیاو، ساڵی ١٩٦٤مان بەڕێ کرد.

# ساڵی ١٩٦٥

هەر لە هەولێرین و بەردەوامم لەگەڵ هونەرمەندانی مۆسیقا و گۆرانی- هەروەها مەسەلەی هیوایەتی (پوولی پۆستە کۆکردنەوەکەم) کاتێکی باشی لەگەڵدا بەسەر دەبەم و حەزم قوولتر بووە بۆ کۆکردنەوەی پوول و بەردەوام ئەلبوومان دەکڕم و لە هەر موناسەبەتێک کە لە عێراق پوولی تایبەت بەو موناسەبەتەوە دەردەچن و لە پۆستەخانە یان لە بەغدا... زوو هەوڵ دەدەم چنگم کەون و لە ئەلبوومەکانم شوێنیان بۆ بکەمەوە...

لە ٢٤ی مانگی یەکەمی ئەمساڵ، مانگی کانوونی دووەم، مستەر چەرچڵ کۆچی دوایی کرد و زۆر کەس، من و باوکم و پیاوە ڕۆشنبیرەکانی کە لە ساڵانی شەڕی دووەمی جیهانی گەنج بوون و شەڕ و ماڵ کاولیەکانیان لە بیرە کە هیتلەری سەرۆکی ئەڵمانیا بە تەما بوو، وەک دیکتاتۆرێکی دڕندە، دنیا داگیر بکات... زۆرمان سوو بووەوە و من وێنەکانم دەهاتنەوە بیر کە لە ناو کووچە و کۆڵان و جادە خوار و خێچەکانی کۆبە، ئەو ڕەسمانەی هەڵواسرابوون، بەخۆ و شەپقە و چرووتەکەی و هەردوو پەنجەکانی دەستی ڕاستی بەرز کردبووەوە و لەسەر شکلی پیتی (V)ی ئینگلیزی یاخود وەک ژمارە ٧ی عەرەبی، کە ئامادە بوو بۆ سەرکەوتن (النصر)... چونکە وشەی سەرکەوتن بە ئینگلیزی (Victory)یە کە بە پیتیV دەست پێ دەکات. لە هەموو وڵاتەکانی دنیا و زۆر لە سەرۆکەکانی وڵاتان گەیشتنە لەندەن و لە مەراسیمێکی ڕەسمی و جەماوەری بێ وێنە، لە کەنیسەکەی (وێستمنستەر ئەبیی) لەگەڵ مەلیک و پیاوە گەورەکانی ئینگیلتەرا نێژرا.

چەرچڵ بەنیاز بوو هیتلەر بەکورسیی کارەبایی لە سێدارە بدات

جەژنی ڕەمەزان، هەروەک عادەتمان بوو، کە لە هەر پشوو و عوتڵەیەک، ئەگەر سێ چوار ڕۆژ بوایە سەفەرێکمان دەکرد و کەمێک ژیانە ڕووتینییەکەی ڕۆژانە و هەوامان دەگۆڕی- زیاتر دەچووینە بەغدا چونکە لەوێ خزم و دۆست زۆرتر بوون

مستەر ونستن چەرچڵ سەرەک وەزیرانی بەریتانیا لە
ساڵی (١٩٤٠)ەوە تا کۆتاییی شەڕی جیهانی دووەم،
لە ساڵی ١٩٤٥ و لەوەش بەدواوە بۆ ماوەیەک هەر
لەو شوێنەدا بوو. ئەو پیاوە بەیەکێک لەو هۆیە
گرینگانە دەژمێردرێ کە سەرکردایەتییەکەی و هەوڵ
و کۆششەکان و سیاسەتە دژ بەدیکتاتۆری هیتلەر،
وڵاتانی سوێندخۆران (الحلفاء) لەو نەکبەتە
خوێناوییە سەرکەون و هیتلەر لەناو بەرن ئەمەش
چەند وێنەیەکی مەراسیمی ڕێورەسمی ناشتنی
(مستەر چەرچڵ)ن

مەلیکە ئێلێزابێت و میر فیلیپی
مێردی و خاوخێزانی پاشایەتیی
بەریتانیا لە ڕێورەسمەکەدا

برا و ئەندامانی خێزانی چەرچڵ
لە دوای تەرمیدا دەڕۆن

تەرمی چەرچڵ لەسەر شانی گەورە
ئەفسەرانی ئینگلیز

تەرمی مستەر چەرچڵ لەسەر عارەبانەی عەسکەری، بەناو شەقامەکانی لەندەن بەرەو کەنیسەی Westminister دەبەن چونکە لەوێ دەنێژرێ

ئەوەبوو لە جەژنی ڕەمەزاندا چووینە بەغدا. لە جەژندا، فڕۆکەی (جمعیة الطیران العراقیة) خەڵک و منداڵ و خێزانیان بۆ ماوەی نیو سەعات یا زیاتر، لە ئاسمانی بەغدا دەفڕین و بەسەر سەری بینایان و شەقامەکانی بەغدا، هاتوچۆیان دەکرد. جا منیش بۆ ماوەی نیو سەعات، فڕۆکەیەکم گرت و کرێیەکەی ١٥٠٠ فلس بوو واتا دینارێک و نیو من و هەردوو منداڵەکان، کە تەمەنیان چوار ساڵ بوو، لەگەڵ دایکیان و وەردییەی خوشکم، کابرای فڕۆکەوان سەرکەوت و منداڵەکان زۆریان لا خۆش بوو... هەموو بەغدامان دەبینی لە خوارەوە... زێی دیجلە چۆن بەپێچ و پەنا دەخزی بەناوەندی شار... و (شارع ڕەشید) و قەرەباڵغی ترومبێلە زەرد و سوور و سەوز و شین... زۆر دیمەنیان جوان بوو لە هاتوچۆیان دا... دارستان و بەلەم لەسەر ئاوی زێ و جادەی (أبو نواس) بەسەریاندا... هەموو گەڕاین، بەدینار و نیوێک، توخوا هەرزان نەبوو؟ کاکە گیان دیناری عێراقی بەنرخ بوو! یەکسان بوو بە ٣ دۆلار و ٣٣٠ فلس، بە پارەی ئەمەریکا، یان پاونێک و ٥ شلن، بەپارەی ئینگلیزی- فڕۆکەکانی ئەو (جمعیە)تە هەر لە بەشێکی فڕۆکەخانەی بەغدادا (مطار المثنی) شوێنیان بوو. لەوێوە دەفڕین و دادەبەزینەوە و دەنیشتنەوە. ڕۆژانی جەژن ئەو فڕۆکە بچووکانە زۆر دەبینران لە ئاسمانی بەغدادا هاتوچۆیان بوو. منالان و باوکیان و دایکانیان ڕوویان لەو فڕۆکەخانە بچووکەی (کۆمەڵەی فڕینی عێراقی- جمعیة الطران

العرقية) دەکرد و سواری فڕۆکەیەک دەبوون پیاسەیان لە ئاسمانی بەغدا و دەوروبەری دەکرد! بەو دینار و نیوە، کە لە تاکسی هەرزانتر بوو!

ساڵی پار، لەسەر شۆستەکەی ژێر قەڵات، بەرەو بازاڕ دەچووم، و پێش ئەوەی پێچ بکەمەوە بۆ لای چەپ و پێش ئەوەی بگەمە بەر دوکانەکەی مامۆستا (گیوی موکریان)ی، کە، جگە لەوەی کە لایەکی دوکانەکە، (چاپخانەی کوردستان) و ئامێر و پیتەکانی تێدا دامەزرابوون، بەشی پێشەوەی تەرخان کردبوو بۆ وێنەگرتن، بەکامێرا کۆنەکانی وەک سندوقێکن و کیسەیەکی ڕەش لە دواوەیان هەڵدەواسرێ، بۆ جێبەجێکردنی هەندێ کاری وێنەگرتنەکە: دەڵێم، پێش ئەوەی بگەمە بەر ئەو چاپخانە دێرینە، کوڕێکی گەنجی ئەسمەر و لاواز... پرچ و برۆ ڕەش وەک خەڵووز و دەموچاوی کەمێک درێژووکە. بەڵام باڵای کەمێک کورت، هاتە پێشم و دەستی درێژ کرد بۆ تۆقەکردن لەگەڵمدا و دوکانێکی بچووکی لە قوژبنەکە نیشاندام و وتی: ئەمە ستۆدیۆمە، پێم وابێ ناوی «ستۆدیۆ سەفین» بوو...

خۆی پێ ناساندم و وتی: من «بورهان خۆشناو»ی وێنەگرم. من حەزم کرد سڵاوت لێ بکەم و لە نزیکەوە قسەت لەگەڵ بکەم. من گۆرانییەکانت و ئاوازەکانتم زۆر خۆش دەوێن و زۆریش بەدڵمن. منیش سوپاسم کرد و سەیرم کرد ئەویش کامێرایەکی گەورەی سندوق لەسەر سێپایەکەی، لە ژێر دیوارەکە و تەلانی قەڵاتەکەیە... هەروەها چوارچێوەیەکی لە دار و جام هەڵواسراوە لە پشت کامێراکە.

وێنەگری هەولێری
بورهان خۆشناو ١٩٦٥

چوومە نزیکیەوە، سەیرم کرد وێنەی چەند هونەرمەندێکی گۆرانیبێژی لە ناو ئەو چوارچێوە داناوە، وەک: عەلی مەردان، تاهیر تۆفیق، حەسەن زیرەک، ڕەسووڵ گەردی، فوئاد ئەحمەد «دیارە کاک بورهان ئەو گۆرانیبێژانەت خۆش دەوێن!!» وتی « ئەرێ بەخوا مامۆستا، کاسێتی ئەوانەم هەیە و ڕۆژانە گوێیان لێ دەگرم. جا ئەگەر ڕەزامەندیت هەبێ، حەز دەکەم وێنەیەکی خۆتم بدەیتێ بۆ ئەوەی، بەشانازییەوە، لەگەڵ وێنەی ئەو هاوڕێیانەت دایبنێم! من ڕازی بووم و وتم «ئەمجارە واوە بێمەوە، وێنەکەمت بۆ دێنم!» دڵی خۆش بوو و سوپاسی کردم.

ئەوەبوو جارێکی تر، دوای ماوەیەک دیسان، لە هەمان

شوێن بینیم و وێنەکەم دا پێی. ئەویش دوای سوپاسێکی زۆر و بەگەرمی دەستەکانی گوشیم. ئینجا دەفتەرێکی لە باخەڵی دەرهێنا و وتی: مامۆستا من شیعری سادە و ناسکیش دەنووسم، پێم وایە هەندێکیان لەگەڵ ڕووحییەتی تۆ دەگونجێن. حەز دەکەم ئەم شیعرانەم لێ وەرگری و ئەگەر یەکیان یا زیاتر، بەدڵت بوون، ئاوازیان بۆ دابنێیی و بە دەنگی خۆت لە ئێزگە بیانڵێیی و تۆماریان بکەیت.

شیعرەکانم لێ وەرگرت و وەعدم دایێ بیانخوێنمەوە ئەوەی دەستیش بدات، دەیکەم بەگۆرانی.

ئەوە بوو لە پشووی نیوەی ساڵ، شوباتی ١٩٦٥، لە بەغدا بووین و یەک لە پارچە شیعرەکانی بوڕهان خۆشناویم ئاواز بۆ دانابوو، ئیتر سەردانی ئێزگەم کرد و تۆمارم کرد- زۆر خۆش دەرچوو. ناوی گۆرانی، یاخود بڵێین شیعرەکە، «یارم باڵاکەی ...» بوو. کە هاتمەوە هەولێر، لە بەغداوە، بەلای شوێنەکەی بوڕهاندا پیاسەم کرد... ئەو هەر لە دوورەوە، بەپێکەنینەوە، بەرەو پیرم داهات و لە خۆشییاندا دەفڕی: هەزار جار دەیگوت: مامۆستا: بەقوربانت بم...زۆر سوپاست دەکەم... دەنگت نەڕزێ...، ئا لەم جۆرە دوعایانەی بۆ دەکردم. هێشتان ئەو شیعرانەم لە لا ماون. وەک خۆی وتی: زۆر سادە و ساکارن... وشەی ئاسان... بەڵام مۆسیقایان تێدایە! قافیەکە زۆر جوان... وەزنی شیعرەکە ڕێکوپێک... دوای چەند ماوەیەک گۆرانییەکی دیکەشم ئاواز بۆی دانا و کردم بەگۆرانی...

بەڵام ئەو گەنجە... تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوو، خۆی گەیاندە وڵاتی هەنگاریا بەڵام سوودی نەبوو و کۆچی دوایی کرد، بەداخەوە، جوانەمەرگ بوو، هەزار سڵاو لە گیانی ناسک و پاکی بێت، مامۆستا محەمەد مستەفا عەلی لە وتارێکی، لە گۆڤاری (زاگرۆس) ئاشکرای کردووە کە هەر لەوێ نێژراوە، لە نیسانی ١٩٧١.

موتەسەریفەکەمان، عەبدولمونعیم مەسرەف، وەک پێشتر باسم کردووە، کابرایەکی ئەریەحی، بەزەوق، ڕووخۆش لەگەڵ هەموو کەسێک... زۆر بێ دەعیە بوو. هەموو هەولێرییەکان خۆشیان دەویست- هەوەس لە دانیشتنی خۆش وو... برادەرانی هاومەشرەب و بەزەوقی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو... کە لە کاتی ڕابواردن، یا لە ماڵان یان لە سەیرانان، لەگەڵیاندا هەڵسان و دانیشتن و سەیرانی پێ خۆشتر دەبوو. بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش و کاری ڕەسمی و جێبەجێکردنی ئیش و کاری هاووڵاتیانیش وەک یەک، ئەنجامی دەدان... سەری لە نەخۆشخانە و قەسابخانە و کارگەکانی کە هەبوون و ڕێکخستنی کاری شارەوانی... ڕێگەوبان... تاد. قەت لێی ماندوو نەدەبوو مانگیش نەبوو، لێپرسراوانی حکوومەت لە

بەغداوە نەیێن بۆ هەولێر... بۆ چاودێریکردنی کارەکانی و وەرگرتنی زانیاری لە بابەت کەموکوڕی و پێویستی لیوای هەولێر بەگشتی.

دوای گەڕانەوەی سەرەک وەزیران بۆ بەغدا، بەڕێز کاک محەمەد شەهاب دەباغ: سەرۆکی بەلەدییەی هەولێر، دەعوەتێکی زۆر تایبەت- تەنیا چوار پێنج کەسی دەعوەتکردن، لە پێشەوەش موتەسەریف کاک مونعیم مەسرەف بوو- ئینجا بەڕێوەبەری پۆلیس و کاک جەودەت ئەحمەد ناجی- کاتب تەحریراتی موتەسەریفییەت و لە هونەرمەندان: کاک تایەر تۆفیق و کاک حەیدەر و من بووین، لەماڵی خۆی، کەوا نزیک فولکەی زەعیم بوو... دەعوەتە خۆشەکە کرا. شایانی باسە گۆرانییە کوردییەکان لە لایەن تایەرەوە و قۆریات و تورکییەکان حەیدەر و عەرەبییەکانیش من دەمگوتن و عوودیشم بۆ هەموان لێ دەدا. موتەسەریف و جەودەت ناجی حەزیان لە گۆرانییەکانی محەمەد

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٦ گیراوە لە بەردەم باڵەخانەی سەرای کۆنی هەولێر کە بەناوی موتەسەریفییەت ناوزەد دەکرا، بەڕێز موتەسەریفی هەولێر عەبدولمونعیم مەسرەف- یەکەم کەسە لە سەرەی پێشەوە، لە لای چەپەوە و پەنجەی لەسەر لێوی داناوە، پێشوازیی دەکات لە بەڕێز عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆکی حکوومەتی عێراقی ئەوسا، ژمارەیەکیش لە پیاوی حکوومەت و مووەزەفی پلەوپایە بەرز وەک لیوا عەبدولڕەحمان محەمەد عارف کە ئەو زەمانە سەرۆکی ئەرکانی سوپا بوو. هەروەها لە لای ڕاستی وێنەکە، دووەم کەس کە چاویلکەی ڕەشی لە چاوە: بەڕێز کاک محەمەد شەهاب دەباغ، ئەو کاتە سەرۆکی شارەوانی هەولێر بوو... ئەم وێنەیە لە کاتی سەردانی سەرۆکی حکوومەت بۆ شاری هەولێر گیراوە.

محەمەد شەهاب دەباغ سەرۆکی شارەوانی هەولێر ١٩٦٥-١٩٦٦

عەبدولوەهابی میسری دەکرد... منیش تەقسیرم نەدەکرد بۆیان و کاک جەودەت بەتایبەتی، یەکجار لەزەتی وەردەگرت، کە ئەو گۆرانییانەم بۆیان دەگوت.

ئینجا تەشقەڵەیان بە حەیدەر دەکرد و موتەسەریف پێی گوت: حەیدەر مادام سەرۆکی شارەوانی ئەو دەعوەتەی بۆ کردین، تۆش وەکو سەرۆکی مەسئولی عەلوەچییەکان، کە ئێوەش سەر بە بلدییەنە، دەبێ دەعوەتێکمان بکەیت! حەیدەر، لە ژێرەوە لە بنا گوێم وتی: دەڤەرموو دەی باکووری... دوو پێکم قوزەلقوت کرد، تووشی بەزمی خۆم هاتم! دەوێرم دەعوەتەکە نەکەم؟ سبەینێ عەلوەکەمان قەپات دەکەن!... هەڵبەت من دەمزانی موتەسەریف بەگەمە و بۆ تەشقەڵە و پێکەنین ئەو داوایەی لێی کرد! دەنا کاک مونعیم مەسرەف لەو لێپرسراوە حکوومەتییانە نەبوو هەڕەشە لە کاسبکاران بکات، بۆ هەر هۆیەک بێت! بەڵام کاک حەیدەریش ئەوەی دەزانی دەعوەتەکەشی کرد! چەند کەسێکی دیکەش بەو بۆنەیەوە، لە ئەحباب و خۆشەویستەکانمان ئامادەی دانیشتنە خۆشەکە بوون! جا حەیدەر بەخۆی پێکی بۆ هەمووان دەکرد و گۆرانیشی دەگوت!

حەیدەری دەنگخۆشی هەولێری، منیش عوودی بۆ لێ دەدەم

گەڕەکی شۆڕش- بەشی یەکەمینی- کە لە لای دەستە چەپی جادەی نێوان هەولێر و شەقڵاوە، دەست بەدروستکردنی خانووەکان کرابوو وابزانم ساڵێک لەمەوپێش، واتا لە ساڵی ١٩٦٣ەوە... سێ ڕیزە خانوو بوون یان چوار ڕیز و سێ کۆڵانیان لە نێوان بوو. خانووەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە... بەرەو ڕۆژئاوا خەریتە و نەخشەیان بۆ کرا- زۆربەی بەشداربووەکانی ئەو پرۆژەیە کە ناوی (جمعیة شورش التعاونیة لبناء المساکن) بوو... مامۆستا بوون. لە ساڵی ١٩٦٥ من خانووی مامۆستا

حەمید حەمەدم بەکرێ گرت لە مامۆستا حەمید چونکە خۆی لە شەقلاوە نیشتەجێ بوو و بەڕێوەبەری قوتابخانەی سانەوی شەقلاوە بوو، پێویستی بەو خانووە نەبوو، وەک خۆی پێی وتم: من قەت نایێمە هەولێر. ئەمین بە خانووەکە ئی خۆتە! بەڵام موشکیلەی گەورەی هەموو دانیشتوانی ئەو گەڕەکە تازەیە ئەوە بوو کۆڵانەکان قیرتاو نەکرابوون و دوو زستانی زۆر سەختم چێژت و قوڕ و چڵپاوی زستان، خۆم و منداڵەکانم، دەمانشێلا... دوو جووت قۆندەرەمان هەبوو یەکیان بۆ قوڕەکە... ئەوی ترمان بەدەستەوە دەگرت تا سەر جادە سەرەکییەکە... لەوێ، قوندەرە قوڕاوییەکە لە کیسەیەکی نایلۆنمان دەبەست و لە دوکانێکی ناسیارێک محەمەدی ناو بوو، بەڕەحمەت بێ و قۆندەرە پاکەکەمان لە پێ دەکرد و دەڕۆیشتین بۆ دەوام! ئینجا هەمووشمان بەترومبێل، پاسی بەلەدیە-یان مصلحة نقل الرکاب- هاتوو چوومان دەکرد لە گەڕانەوەمان، لە لای دوکانەکە و چایخانە تاکەکە... چایخانەی کاک عەبدوڵڵا- دادەبەزین و قوندەرەکانمان دەگۆڕییەوە دوای ئەوەی ئێمە لەو خانووە و ئەو گەڕەکە دەرچووین، ئینجا دەست کرا بە کاری قیرتاوکردنی کۆڵانەکان و رەسیفیان بۆ دروست کرا و خەڵکەکە تیسراحەتی کرد و کاک حەمید حەمەدی خاوەن خانووەکەش، گەڕایەوە هەولێر و ئێمەش خانووەکەی حازروبزر بۆمان بەجێ هێشت و دەرچووین.

قوتابیانی پۆلی ٣ی قوتابخانەی جمهوریيە و من لەگەڵیاندا دانیشتووم-
خۆم مورشیدیان بووم

لە ڕووسیا، هەواڵی گەشتی بۆشایی ئاسمان (السفینة الفضائیة)، بەناوی (شروق۲)مان لە تەلەڤزیۆندا سەیر دەکرد و ئەم کەشتییە دوو کەسی تیایە و لە دەورەی گۆی زەوی دەخولێتەوە. جا یەکێکیان ناوی (لیۆنیف)ە ئەم کابرایە، لە ناو بۆشایی ئاسمان، لە سەفینەکە هاتە دەرەوە و بۆ ماوەی ۲۰ دەقیقە لەو بۆشاییەدا مەلەی دەکرد! جا من بیرم دەکردەوە: ئەرێ تۆ بڵێی لە وڵاتی ئێمەش، لە کوردستان، یەکێک هەڵکەوێ شتێکی وا بکات؟ نەوەڵڵا... ئەوە زۆر دوورە! تا کوردستان ئاوا لە ژێر حوکمی خۆی نەبێ و لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتە عەرەبەی پێی دەڵێن عێراقدا بێ، هەر خەریکی خۆپاراستن دەبێ لە شەڕ پێ فرۆشتنی ئەو لێپرسراوە متخلفانە کە وا تێ دەگەن، دەبێ کوردستانییەکان، هەتا هەتایە، لە ژێر ڕکێفی ئەوان بن و بەکەیفی ئەوان، هەڵسێ و بڕوا و دانیشێ! ئێ باشە چۆن گەنجانمان کاتی وایان بۆ هەڵدەکەوێ، بەئیسراحەت بیر بکەنەوە و عیلم و زانست بخوێنن و پێشکەون و ئینجا یەکێکی وەک (لیۆنیف)یان لە ناودا پەیدا بێ؟ دامەزرانی تیمەی برام لە کارگەی ئەلبان و گوازتنەوەی ماڵی باوکم بۆ خانووەکەی ناو غابات نزیک کارگەکە، ڕووداوێکی خۆش و چاوەڕوان نەکراو بوو. من و منداڵەکانمان... هەفتەی جارێک یاخود ڕۆژانی هەینی و جەژن و پشوودان، دەچووینە سەردانیان، ئیتر دایکم و هەموویان خەنی دەبوون بەدیتنمان هەروەها ئێمەش بەتایبەتی کوڕەکانم: سەیا و شۆبان... چونکە ماریە و وەردییە دەیانبردنە ناو دارستانەکە بۆ لای جۆلانەکان و لەوێ ڕایان دەبوارد و ناو دارستانەکەش فێنک و سێبەر بوو... خۆش بوو.

دەرگای غاباتەکە

شوێنی کارگەی ئەلبان

هەندێ جار ماڵە خزم و دۆستیش دەچوونە ماڵی باوکم... شوێنێکی فێنک، بە درەخت و ئاو بوو...

خواردنیان دەبرد و بە ماڵ و منداڵەوە، ڕۆژیان لەوێ بەسەر دەبرد. جا هەندێ جار ڕێک دەکەوت ئێمەش دەچووین... ئیتر سەیران کە خۆشتر دەبوو.

لە پشووی هاوینی ئەمساڵ ١٩٦٥ من و سوهام، شەوی ٢٥ی تەمووز، بەترومبێلێکی پاسی کۆمپانیای (الاقتصاد)، لە ناوچەی کازمییەی بەغدا، لەگەڵ نەفەری تر کە خەڵکانی شیعەی نەجەف و کازمییە بوون، بەرێ کەوتین بەرەو سنووری ئێران. گەیشتینە مەخفەری پۆلیسی عێراقی و گومرگی سەر سنوور لە (منذریە) کە نزیک خانەقینە، دوای ماوەیەکی زۆر لە پشکنین، سوار بووین، سنوور

کرێکارەکانی کارگەی ئەلبان لە کاتی ئیشکردندا

سەردانێکمان بۆ ماڵی باوکم لە خانووەکەی حکوومەت لە ناو غاباتەکەی کەوا کارگەی ئەلبانی لێبوو و دابوویانە طیمەی برام... دایکم و من (بەچاویلکەوە) و ماری دانیشتووین. وەردییە و سوهام لە دواوە وەستاون. سەبا گیتاری یووسف مامی بەدەستەوەیە... طیمە خاولی لە سەری ئاڵاندووە و شۆبانیش لە پێشەوە دانیشتووە

یەکێک لەو ڕێکەوتانە نیشان دەدا. بەهار بوو چووینە ماڵی باوکم لە غاباتەکە، سەیرمان کرد خێزانی دکتۆر ئیحسان میرزا لەگەڵ منداڵەکانی لەوێن ئیتر منداڵەکان ڕۆژێکی خۆشیان ڕابوارد... زەمانێکی خۆش بوو بۆ ئێمەش!

تێپەڕین و ئینجا لە نێو خاکی ئێران، دیسان پشکنین کرا. بەڕاستی زۆر ئەزیەتمان خوارد و دەمگوت: بەخوا بمزانیبا ئەوەندە عەزاب دەدرێین، نەدەهاتم. بەتایبەتی لە دیوی عێراق. گەرما... شوێن نەبوو لێی دانیشی... ئاو و ئاودەستخانە نەبوو! ئەو هەموو منداڵ و ژن و پیاوە دەچوونە ئەو دەشتە... بۆ دەست بەئاو گەیاندن. چایخانەیەکی لێبوو... تابلێیی پیس و پۆخڵ... زبڵ و بۆنی بۆگەنی دەوروپشت... مێشکی تێکدابووم. بەڵام دیوی ئێران: گازینۆیەکی جوان... بینایەکی ڕێکوپێک سارد و پاک... تا لێرە ئیسراحەتمان کرد. ساردەمەنی هەبوو... خواردنی پاک هەبوو!

شەو داهات گەیشتینە کرماشان. لەوێ لە ئوتێلێکی (شعبی) لێی نوستین، و بەری بەیان دیسان بەڕێ کەوتینەوە. ڕێگەکە خۆشتر بوو... کەشوهەوا کەمێک باشتر بوو. سەعات ٥ی عەسر، گەیشتینە تاران- ئوتێلێکمان نزیک گەراجەکە دۆزییەوە و لە ژوورێک، وەک لاشە لێی کەوتین... لەبەر ماندووبوون و ڕاوەستانی سەر سنوور و پشکنین و گەرما... ناوی (موسافرخانەی نووین) بوو، لە شەقامی (بزر جهری). شوێنەکەی باش بوو ناوەڕاستی شار بوو بەڵام زۆر پاک نەبوو. ئەمما نزیکی حەمام و بازاڕی تارانی سەرەکی بوو. خواردنگەی خۆمانی نزیک بوون...

٢٧ی تەمموز، من و سهام پیاسەمان دەکرد لە ناو شەقامێکی تاران- سێشەممە بوو- لەسەرەخۆ، سەیری دوکانەکان و ئەولا و ئیملامان دەکرد، بەرێکەوت سەیرم کرد ئەوە کاک نەجاتی عەبدەیە، شمشاڵژەنی تیپی مۆسیقای مەولەوی لە سلێمانی و خێزانی، ئەوانیش هەر بۆ سەیرکردن، لەسەرەخۆ دەڕۆیشتن... کە یەکترمان دیت، زۆر کە یفخۆش بووین و ماندووبوونمان لە یەک کرد... و کەی هاتی، و لە کوێ دابەزیون؟ و ئا لەم پرسیارانە... ئەوان لە ئوتێل زیبا دابەزیبوون... ئیتر لەو ڕۆژەوە، هەر لە بەیانییەوە، دەچووینە ئوتێلەکەیان و ئینجا هەر چوارمان پێکەوە دەگەڕاین و دەسووڕاین و نانی نیوەڕۆمان بەیەکەوە لە یەکێک لە چێشتخانەکانی شاری تاران دەخوارد.

هونەرمەند نەجاتی عەبدەی نەیژەن، لە تەمەنی لاویدا

لە ئێران زۆر خۆشمان ڕابوارد... تارانێکی هەرزان- پارەی (دینار)ی عێراقیش کە دەمانگۆڕییەوە بە (تومان)ی

یەکەم لە ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقای تیپی مۆسیقای مەولەوی کەوا لە شاری کۆیەیان پێشکێش کرد، گۆرانیبێژ ڕەشۆڵ و تیپەکەشی لە ڕاستەوە: تەپڵژەن حاتەم سەعید، عەباس- دەف، نەجاتی عەبدە - نەی، باکووری- عوود، قادر دیلان - کەمان
پایزی ۱۹۵۷ بەبۆنەی لاناوەکەی شاری سلێمانی

ئێرانی- بڕە پارەیەکی باشی دەکرد... هەر خەرجمان دەکرد و تومەنەکان تەواو نەدەبوون. هەموو شەوێ یان لە (مەلها) یا سینەما بووین بەڕۆژ لە بازاڕ دەگەڕاین و عەسران دەچووینە هاوینەهەواری (شەمران= شەمیران... لە قەدی چیای شیرین و لەوێ گازینۆ و خواردنی باشی هەبوو... هەوای فێنک و دیمەنی گەلی پڕ ڕووباری ئاو و دارودرەخت زۆر دڵڕفێن بوون...

بەڵام لە گەڕانەوەمان، کۆبی گۆتەنی، (لە کەپوومان هاتە دەرێ!)- چونکە نەخۆشی کۆلێرا بلاو بووەوە لەو هاوینە و ئێمەش نەماندەزانی کە لەسەر سنوور حجز دەکرێین- ئەوەبوو، ئێمەش و ماڵی کاک نەجاتیش، ٥ شەو لە سەحرا و چۆلی (مونذریە)ی بیابانی پڕ لە دووپشک و مار و دڕک و خۆڵ و تۆز و بێ ئاوی و بێ خۆشووشتن ماینەوە... ئەو ئیجرایە بێ تێفکرین و لێکدانەوەی لێپرسراوانی حکوومەتی عێراق و وەزیری تەندروستی و دارودەستە و دختۆرانی جاهیل و تێ نەگەیشتوو، گوایا دەبێ ئەو پێنج ڕۆژە ئەو سەدەها خەڵکە بمێننەوە، نەبادا میکرۆبی کولێرایان وەرگرتبێ... جا کاکە (حیجر صحی) کراین و بەخوا ئەوەی نەخۆشیش نەبوایە، لەو پیسایییە و بێ خۆ شووشتن و بێ سابوون و بێ

سوهام و خۆم لە شەوی ٢٨ تەمموزی ساڵی ١٩٦٥ لە یەکێک لە مەلهاکانی تاراندا دانیشتبووین، بۆمان گیراوە، لە ناوچەی شەمێران

خواردن، ئەوە نەخۆش دەکەوت! بەڵام خوا کردی، ئێمە هەموومان لەش ساغ و ئاگاداری خۆمان دەکرد، بێ ئەوەی جەنابی وەزیری تەندروستی ئامۆژگاریمان بکات... ئەوەبوو ناخۆشترین ٥ ڕۆژی ژیانم لەو (موندریە) بەسەر برد و دوعام دەکرد... نەک هەر من، هەزار کەس زیاتر بووین، ژن و منداڵ و پیاوی پیری پەککەوتە کە لە زیارەتی مەرقەدی، نازانم کێ، لە ئێرانەوە دەگەڕانەوە، هەموویان لە دانیشتوانی نەجەف و کەربەلا و ناوڕاستی عێراق بوون... هەموو جوێنیان بەلێپرسراوان دەدا کە ئێمەیان، لەسەر هیچ و خۆڕایی... تووشی ئەم موسیبەتە کرد... ڕقمان لە ناوی (موندریە)ش بووەوە.

کە گەڕاینەوە هەولێر، شمۆئیل ئەفەندی و خێزانی، گواستبوویانەوە ژوورێک لە حەوشەکەی ئێمە لە گەڕەکی شۆڕش، کە خانووی کاک حەمید حەمەد بوو- چاکیشیان کردبوو، چونکە دایکم و هەردوو مناڵەکان: سەبا و شۆباغان لە لای ئەو، واتا دایکم و خوشکەکانم بەجێمان هێشتبوون... هێشتا مناڵ بوون، تەمەنیان چوار ساڵ بوو. بەڵام پایزی ئەمساڵ مامۆستا حەمید حەمەد کە خۆی و ماڵ و منداڵی لە شەقلاوە نیشتەجێ بوون، لەمێژە! ئەمساڵ، کە بینی ئەوە خانووی حازروبزر هەیە لە هەولێر... داوای کرد بۆ گوازتنەوەی بۆ هەولێر! جا منی تەنگاو کردبوو... دەیگوت دەمانەوێ بگوازینەوە ناو خانووەکەمان و من ئەمساڵ بوومە موشریف و دەبێ لە هەولێر بم. ئەوە بوو ماڵی شمۆئیل ئەفەندی خانووێکیان لە عەنکاوە دۆزییەوە و گواستیانەوە ئەوێ و ئێمەش بۆ خانووێکی

تر و بەم جۆرەش لێک جیا بووینەوە.

ڕەنگە بۆ خوێنەرانی خولیای سیاسەت و کۆمەڵایەتیش، چەند ڕووداوێکی ئەمساڵە، کە ئاگاداریم هەیە لێیان و لەبیرمە، زۆرباش کەی، و چۆن ڕوویان دا، باسێکی کورت لە هەر یەکێکیان بکەم، ئەگەرچیش ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەخۆمەوە نییە، بەڵام وەک تەمەشاکەرێکی ئەو ڕووداوانە، لەسەر ڕێگەمدا... و ڕەنگە بۆ ئەوانەی نەیانبیستوون، یان بیستوویانن بەڵام خۆزگە دەخوازن زیاتر زانیارییان هەبێ و ئەگەر وێنەش هەبێ، ئەوە باشتر:

لەڕاستەوە ١- من (باکووری)
٢- شمۆئیل ئەفەندی
٣- یووسف باکووری
٤- هونەرمەند جان تۆماس
وێنەکە لە ماڵی مامۆستا شمۆئیل، لە عەنکاوە، گیراوە- ساڵی ١٩٩٣

لە دەعوەتەکەی مامۆستا (شمۆئیل ئەفەندی، بۆمان، لە ماڵی خۆی، لە عەنکاوە: لە ڕاستەوە ١- باکووری ٢- یووسف باکووری ٣- ڕەجیبە، خێزانی شمۆئیل ٤- وەردییەی خوشکم

١- له مانگی نیسانی ئەمساڵ... ١٩٦٥ ، سەرۆک کۆماری وڵاتی توونس (بۆرقێبە- بۆرگێبە) ، له گفتوگۆ و دەربڕینی بیر و باوەڕی خۆی بۆ هەندێ ئاژانسی دەنگوباسی و ڕۆژنامە ، گوتی: «... بۆ وڵاتانی عەرەب و سەرکردەکانیان، باشترە ئەگەر لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل پێک بێن و دان بە مافی هەبوونی ئیسرائیل بنێن و ئیعتیرافی پێ بکەن. ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ، تازە ئیسرائیل بووە واقیعێک و بووە دەوڵەت و هەموو دنیا ئیعتیرافیان پێی کرد و لە U. Nیش کورسیی تایبەتی پێ بەخشرا. کەواتە، با بەس بێ شەڕوشۆڕ لەم ناوچەیەدا و هەر عەرەب زیاتر لەناو دەچن و ئیسرائیلیش وردە وردە خاکی وڵاتانی عەرەب زەوت دەکات و خاکی خۆی بەرین دەکات و هێزیش نییە ئەمڕۆ بتوانێ ئیسرائیل مەحوو بکاتەوە و فڕێی بداتە ناو دەریا!

بورگێبە- بورقێبە وێنەی سەرەک کۆماری توونس له ساڵی ١٩٦٥و بەدواوە

٢- لەو ماوەیەشدا ئاڵمانیای ڕۆژئاوایی- پایەتەختی (بۆن)ە، ئیعتیرافی بە ئیسرائیل کرد. بۆیە هەشت وڵاتی عەرەبی کە عێراق یەکێکیان بوو، پێوەندی سیاسییان لەگەڵ بۆنی پایەتەختی ئەڵمانیا بڕی و سەفیرەکانیان گەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان.

٣- له ١٩ی حوزەیران، له بەغدا بووم بیستمان کەوا یەکێک له سیاسی و سەرکردەکانی حیزبی (جبهة التحرير) له وڵاتی جەزائیر، ناوی (هەواری بوومیدیەن)ە، کودەتا (ئینقلابێکی عەسکەری) کردووە دژی سەرۆک کۆمار و حکوومەتەکەی جەزائیر و سەرۆک (ئەحمەد بن بێلا)یان گرتووە و لایان بردووە. خۆی جەزائیر، لەمێژ نییە کە سەربەخۆیی وەدەست هێناوە دوای ٨ ساڵ خەباتی دژوار دژی ئیستعماری فەرەنسی. بەڵێ له ٣ی تەممووزی ١٩٦٢ بوو کە ئەحمەد بن بێلا و هەواری بوومیدیەن بە سەرفرازی هاتنەوە ناو جەزائیری پایەتەخت و هەموو گەلی ئەو وڵاتە پێشوازییان لێکردن بەبۆنەی سەرکەوتن دژی داگیرکەر- کەچی ئەو پیاوە- واتا هەواری بوومیدیەن، سەودا و حەزی ناوەوەی- رغبة مكبوتة، وای لێ کرد چەند ئەفسەرێکی سوپا و دوو سێ دەبابە لەگەڵ هەندێ عەسکەر، بەسەر کۆشک و قەسری (بن بيلا) دایدەن و بیگرن و بیخەنە حەپسخانە... هەواری، بوو بە سەرۆک کۆمار. دیارە له

سیاسەتدا ڕەفاقەتی و خزمایەتی لە گۆڕێدا نییە- بەرژەوەندی خۆم چاکترە لە برادەرایەتی تۆ! جا بەبۆنەی هاتنی ناوی ئەم کابرایە حەز دەکەم ئەو ڕووداوە باس بکەم ئەگەرچی جارێ کاتی نەهاتووە (هەواری بوومیدیەن)ی سەرۆکی کۆماری جەزائیر ئەو کابرایە زۆر بەبێ ئەخلاقی و بەدڕەوشتی جووڵایەوە و غەدری لە کورد کرد. لە ساڵی ١٩٧٥ کاتێ لەگەڵ سەدام حوسێن و شای ئێران، لە جەزائیر، کۆبوونەوەیەکی سێ قۆڵی (خیانەتکاری)یان ئەنجام دا، بەنهێنی دژی کوردەکانی کوردستانی عێراق، بەتایبەتی- ناوی ئەو ڕێککەوتنە لە ڕۆژنامەکان بە (اتفاقیة الجزائر) هاتووە- لەو ڕێککەوتنە نامووبارەکەیان، لەسەر دەست و بژبوانی ئەو (هەواری)یەدا، سەدام سێ بەش و زیاتری زێی (شط العرب) و لەگەڵ بەشێکی زۆری خاکی بەسرای عێراقی بە ئێرانی شا بەخشی وەک ئەوەی موڵکی باب و باپیرە لە برسا مردووەکانی گوندی عوجەی بۆگەن بوون و بەمیرات بۆی مابوونەوە و ئەویش کردی بەدیاری بۆ ڕەزا شا هەر بۆ ئەوەی کورد لەناو بەرن! بەڵام لەوان: دوویان گۆڕبەگۆڕ بوون و بەزەلیلی و دەربەدەری چوون بەرەو دۆزەخ... بەرەو (جهنم وبئس المصر) واتا هەواری و شا، و سێ یەمەکەشیان وا لە ژوورێکی وەک قەبری پڕ لە مشک و مار دەژی و ڕۆژانی هەندە نەماوە کە ئەویش بگاتە هاوڕێکانی، ئینجا لە دۆزەخ بەبڕیارە پیسەکەی خۆیاندا دەچنەوە!

لە ڕاستەوە هەواری بوومیدیەن، لە تەنیشت هەڤاڵی خۆی، ئەحمەد بن بیلا وەستاوە، لەڕۆژی ١٩٦٢/٧/٣ کاتێ پێکەوە، سەرکەوتووانە، هاتنەوە شاری جەزائیر

کەچی کورد میللەت و نیشتمان هەر ماون و دەمێنن و پەنا بەخوا و هێزی گەل... ئەو ڕۆژەش نزیک بووەتەوە، کە ئینشاڵڵا کە تیایدا تەواوی مافی ڕەوای کورد وەدەست بێت بە مافی سەربەخۆییشەوە و کوردستان دەبێتە بەهەشتی سەرزەمین و دانیشتوانی لەوپەڕی

سێکوچکەی شەڕ و غەدر و خیانەت لە ڕاستەوە: سەدام حوسێن، لە ناوەڕاست میکرۆبی عەرەبی شۆڤێن: هەواری بوو میدیەن- سەرۆکی جەزائیر لە لای چەپیش شای ئێران، لە ساڵی ١٩٧٥ ئەم وێنەیە گیراوە کاتێ هەر سێکیان تەڵە و خەندەق و کارەساتیان بۆ کوردستان ئامادە دەکرد، لە شاری جەزائیر

ئازادی و خۆشی و دیموکراسیەتدا دەژین، بەکوێرایی چاوی دوژمن، جا هەر کەسێک یا دەوڵەتێک یا نەتەوەیەک بێت ئامین.

٤- وەزارەتی (تاهیر یەحیا) بەتێکڕایی ئیستیقالەیان دایە سەرۆک کۆمار عەبدولسەلام محەمەد عارف بە ڕەزامەندی هەردوو لا. جا سەرۆک کۆمار تەکلیفی ئەفسەرێکی کرد ناوی عارف عەبدولڕەزاق بوو، ڕوتبەی (عقيد الجو)ی هەبوو، بۆ پێکهێنانی وەزارەت ئەویش وەزارەتەکەی تەشکیل کرد و خۆی بووە سەرۆکی حکومەتی نوێ. لە دوای چەند ڕۆژێک، عەبدولسەلام عارفی سەرۆکی کۆمار لەگەڵ وەفدێکی ڕەسمی، سەفەری کرد بۆ وڵاتی مەغریب، بۆ ئامادەبوونی کۆبوونەوەی لووتکە (قمە)ی عەرەبی. جا کاکمان عارف عەبدولڕەزاق ئەو هەلەی قۆستەوە و ئینقیلابێکی کرد بەیارمەتیی چەند ئەفسەرێک... بەڵام سەرنەکەوتن و خێرا هەموویان گیران، تەنیا عارف خۆی نەبێ... چونکە دیار بوو ئامادەباشی کردبوو بۆ هەڵاتن ئەگەر سەرنەکەوت!! بۆیە ئەو هەڵات و

دوای کۆتاییی کۆبوونەوەی لووتکەی عەرەب، لە (دار البیضاء) لە وڵاتی مەغریب سەرۆک عەبدولسەلام گەڕایەوە بەغدا. بەڵام لە فڕۆکەخانە کەس نەبوو پێشوازی لێ بکات جگە لە برای خۆی عەبدولڕەحمان محەمەد عارفی سەرۆکی ئەرکانی سوپا، چونکە وەزارەت نەمابوو، هەموو هەڵاتبوون — ئەیلوول ١٩٦٥

د. عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆکی وەزیران دوای هەڵاتنی عارف عەبدولڕەزاق، ساڵی ١٩٦٥

عقید الجو الرکن عارف عبدالرزاق سەرۆکی حکوومەت کە ئینقیلابی کرد و سەرنەکەوت و هەڵات ساڵی ١٩٦٥

چووە قاهیرە پایەتەختی میسر- سەرۆک کۆماریش ئەمجارە د. عەبدولڕەحمان بەزازی تەکلیف کرد بۆ پێکهێنانی وەزارەتێکی نوێ.

***

خانووەکەی مامۆستا حەمید حەمەدمان چۆڵ کرد و خۆی هاتە ناویەوە، هەر لە گەڕەکی شۆڕش، خانوویێکی ترمان گرت، خاوەنەکەی کاک سەباح لەتیف بوو. بەڕاستیش (لطیف) بوو. خۆی لە ماڵی باوکی بوو. وتی خانووەکە ئی خۆتە... تا هەوەست لەسەری بێ تێیدا دەبی... ئەوە موڵکی خۆتە... بەڕاستی حەزم نەدەکرد ئەو گەڕەکە خۆشە بەجێ بهێڵم... گەڕەکێکی سەربەخۆ بوو وەک ئەوەی لە شارۆچکەیەکی تر بووین، نەک لە هەولێرا!! دەشتودەر و دەوروبەری خانووەکان دەشتایی و چۆڵ بوو! بەهاران هەر کەمێک لە خانووەکان دوور کەوتباینەوە، سەوزایی و گوڵی بەهاریی جوان و هەوایەکی ساف و دیمەنی چیاکانی مەسیف و سەفینمان لێ دیار بوون... سەیرانمان لە نزیک ماڵی خۆمان دەکرد!!

مەجید ئەحمەد ئاسنگەر

مامۆستا مەجید ئەحمەدی ئاسنگەر، هەر لە قوتابخانەوە، لە کۆیەوە پێکەوە ساڵ بەساڵ، لە قوتابخانەیەک بۆ ئەوی سەرەوەتر و لە پۆلێک بۆ ئەوی هەوارزتر، لەگەڵ هاوڕێ و قوتابیانی تر... ساڵەکانی ژیانمان بەسەر دەبردن...

لەم گەڕەکەی شۆڕشی هەولێریش کاک مەجید، پارچە عەردێکی بەنسیب بوو و خانوویێکی بۆ کرا لە لایەن جەمعییەی تەعاونی شۆڕش. وا ڕێکەوتیش کە ببین بەدراوسێی زۆر نزیک یەکتر و تەنیا دیوارمان لە بەینا بوو. لە قوتابخانەش وەک مامۆستا لەگەڵیدا پێکەوە بووین... لە (جمهووری کوڕان) و بەیەکەوە دەچووینە دەوام و دەگەڕاینەوە. هەروەها خێزانی ئەویش مامۆستا بوو لەگەڵ سوهامی دایکی منداڵانم. ئەوانیش بەیەکەوە دەڕۆیشتن بۆ دەوامیان جا کەسێ نەدەماوە نە لە ماڵیان و نە لە ماڵی ئێمە، خوشکم وەردییە، سەرپەرشتی منداڵەکانی ئێمەی دەکردن... سێ منداڵی لە ئەستۆ دەمانەوە: هەردوو کوڕەکانمان شۆیان و سەبا و کیژۆڵەیەکی کاک مەجید، ڕەنگە دوو ساڵی، یا کەمتر بوو ناوی (ڕۆژان) بوو، شیری دەخوارد. جا دایکی ڕۆژان بوتڵی شیر و مەمەکە و موستەلزەماتی بۆ وەردییەی

کیژۆڵە جوانەکەی مامۆستا مەجید ئەحمەد
ئاسنگەر (ڕۆژان)- گەڕەکی شۆڕش-
هەولێر ١٩٦٦/١/٢١

(ڕۆژان)ی کچی مامۆستا مەجید ئەحمەد
ئاسنگەر، لە ١٩٦٥/١٢/١٠ گیراوە-
شۆڕش - هەولێر

خوشکم دادەنا، وەردییە ئەو سێ منداڵەی پێکەوە بەخێو دەکرد تاکو دایکانیان لە دەوام دەگەڕانەوە. بەڕاستی ئەو ماوەیەی تەمەنمان خۆش بەسەر برد... لەگەڵ هەموو تەنگ و چەڵەمەی وەزعی گشتیی وڵات و کێشەی منداڵان و دەوام و... زۆر گرفتی تر... بەڵام دەبێ ژیان هەر بەردەوام بێ و ڕەوڕەوەکە بۆ دواوە ناگەڕێتەوە... و وەردییە لایەنێکی موشکیلەکەمانی حەل کردبوو... چونکە تەنانەت چێشتی نیوەڕۆشی بۆ گەرم دەکردین و چایەکەشی بۆ ئامادە دەکردین.

لەسەر ئەمری موتەسەریف و بەمەبەستی بڕێک پارە کۆکردنەوە بۆ فەقیر و هەژاران، وەک عادەتی هەموو ساڵێک، پێش وەرزی زستان و باران و سەرما، ئاهەنگێک دەکرا و شارەوانی پێی هەڵدەستا، بەناوی (معونة الشتاء)... جا چەند هونەرمەندێک دەعوەت کراین و ئەو ئاهەنگەمان ڕازاندەوە بەمەقاماتی ڕەسەنی کوردی لە لایەن گۆرانیبێژی گەورە: تایەر تۆفیق و سروود و بەستەی فوئاد ئەحمەد و قۆریاتی محەمەد ئەربیلی... و بەندەش... تا درەنگ ماینەوە ئاهەنگەکەش کرا لەگەڵ تیپی مۆسیقای ئەوسا کە تازەمان پێک هێنابوو... بەناوی (دەرسیم) بوو بەڵام بەدزی! چونکە موتەسەریفی پێشووی بەدڕەوشت (نا بەدر نا بەدین)- واتا بەدرەدین عەلی، هەڵیوەشاندبوو و هەموومانی دەربەدەر کردبووین، تاکو ئەو بەڕێزە عەبدولمونعیم مەسرەف هات و لە سەدا سەد بەپێچەوانەی ئەویان بوو. ئەمە حەزی لە عەدالەت و دۆستی هونەر و هونەرمەندان بوو. ئیشی چاکی بۆ هەولێر کرد! و زۆریش زەوقانی بوو.

دوا وێنەم کە بۆم گیراوە لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٥ لەو ئاهەنگەی بەناوی (معونة الشتاء)، بەشداریم تێیدا کرد بەچەند گۆرانی خۆم، لەگەڵ ئەو هونەرمەندانەی لە وێنەکەدا دیارن، کە ئەمانەی خوارەوە بوون: لە ڕاستەوە: کاک جەمال داودی وێنەگر لە تەنیشت پەردەکە وەستاوە و ئاوڕی بۆ لای ئێمە داوە و قسەمان لەگەڵ دەکات، لەسەر شانۆش، لە پێش جەماوەر ئاهەنگەکە بەڕێوە دەچێ، بەڕێک و جوانی لە پشت کاک جەمال، هونەرمەندی شێوەکاری کاک ئەسکەندەر عوسمان وەستاوە.

دانیشتووەکان لە ڕاستەوە:

١- کاک چەتۆ: مۆسیقاژەن و ئەکتەر و وێنەگری فۆتۆگرافی و مامۆستای قوتابخانە و قسەخۆش و...

٢- کاک فوئاد ئەحمەدی گۆرانیبێژ.

٣- یاکووری.

٤- هونەرمەندی میللەتەکەمان و مامۆستای مەقام تابەر تۆفیق.

٥- کاک محەمەد ئەربیللی.

لە شەوی ١٩٦٥/١٢/١٢ ئەو دانیشتنە بوو، بەبۆنەی کۆتاییی ساڵی ١٩٦٥.

##ساڵی ١٩٦٦

خۆشترین ڕابواردن بەخۆشی و گۆرانی و ئاوازی دڵگیری مۆسیقا، بەتایبەتی بەعوود، لە لام: دانیشتن و ئاهەنگی سەری ساڵە. جا لە ماڵێک بێ، لە دەشت بێ، یان لە یانەیەکی ڕێکوپێک بێت، گرینگ ئەوەیە شوێنێکی گونجاو، چەند خێزانێکی بەزەوق و دەم بە پێکەنین... چەند دەنگخۆشێک،... پێکەوە شەوی سەری ساڵ بەسەر بەرن! خۆشترین چرکەی سەعاتی ئەو شەوەش، سەعات -/١٢ دوازدەی تەواوە، کاتێ گڵۆپ و ڕووناکی دەکوژێنرێتەوە و تاریکی ناو هۆڵەکە دادەپۆشێ و ئینجا... ماچ و مووچی کوڕ و کچان و گەنجان و دڵداران... و ژن و مێردان... دەست پێ دەکات!

منیش وا لێراهاتووم، هەموو سەری ساڵێکی نوێ، دەبێ بەکۆمەڵە... بە گرووپ، خێزانی خۆمان خاوخێزان و دایک و ماڵ و مناڵ دەچین بۆ شوێنێک. ئیتر زۆربەی جاران دەعوەت دەکرێین لە ماڵە دۆستێک کە بڕیار جاران دەعوەت دەکرێین لە ماڵ دۆستێک کە بڕیار دەدەن سەری ساڵ پێکەوە دانیشن و چاوەڕێی ساتی نوێی ساڵی نوێ، بەگۆرانی و دانس و سەما و تەنانەت بە سەرخۆشیش ئەو دەمانە بەسەر بەرن و ساڵی ڕابردوو ببێ بەبیرەوەری، بەتاڵی یا شیرین... ساڵی نوێش: هیوا... هیوا دەخوازن کە پڕ لە خێر و خۆشی و بەرەکەت و هێمنی و خامۆشی و کامەرانی بێ.

لە چەپەوە. دکتۆر ئیحسان میرزا، غادەی کچی دکتۆر، ئینجا خێزانی دکتۆر لەگەڵ سوهامی خێزانم مشتومڕیانەوە... منداڵەکان

غادەی کچی دکتۆر ئیحسان، لەسەر ئیقاعی شەرقی و
مۆسیقای من و یووسف سەمای شەرقی دەکات!

بۆ سـالّی تازەش ۱۹٦٦ لە مالّی دکتۆر ئیحسان میرزا دەعوەت کراین... چەند خێزانێکی دیکەش بانگهێشتی دانیشتنی خۆشی سالّی تازە بوون! مالّی دکتۆر ئاگۆب، مالّی مامۆستا مەتی ئامۆزام، مالّی حەمید مەرمەرچی مالّی جۆرج رەسام... خێزانی دۆستانی موسلّمان لەو دانیشتنانە بانگ نەدەکران، چونکە ئەو زەمانە هێشتا خێزانی موسلّمان بەتێکەلّی لەگەلّ پیاو قەت و قەت دانەدەنیشتن، بەتایبەتیش چونکە لێرە مەشروبات دەخورایەوە و دانس دەکرا و هەرا و پێکەنین و تەعلیق لێدان لەم و لەو پەیدا دەبوو.

دنیاش سەیرە... عاجباتییە! ئێمەی ئەو خێزانانەی لەو شەوەدا ئەوەندە خۆشمان رابوارد و پاش چەند رۆژێ، کە هێشتا تامی ساتە خۆشەکانمان لە بیر نەچووبوونەوە... لەپڕ، لە ۱۵ی ئەو مانگەی کانوونی دووەمە... هەوالّی مردنی برادەری هەموومان و خزمی چەند کەسانێکیش کە شەوی سەری سالّ لەگەلّماندا بووە، خوالێخۆشبوو (جۆرج رەسام)مان بیست و تووشی خەم و خەفەت بووین! ئەو شەوە جۆرج هەر ددم بەپێکەنین بوو، سۆر و مۆر دەبووەوە لەگەلّ قسە و نوکتە خۆشەکانی ئەم و ئەو. زۆریش لەگەلّ گۆرانییە عەرەبییەکانم سەر و دلّی خۆش بوو...! جۆرج ئەندازیاری ئەشغال بوو... سەرۆکی دائیرەی ئەشغالی هەولێر بوو- موهەندیسە برادەرەکانی لەوپەڕی خەمباری و خەمگینیدا بوون کە دەچوونە مالّی خوالێخۆشبوو و مالّ و مندالّە وردیلەکانی دەبینران!! مرۆڤێکی زۆر دلّپاک و موخلیس بوو بۆ کار و وەزیفەکەی کەچی پاش پێنج رۆژ خەبەرێکی دیکەمان گوێ لێ بوو لە رادیۆی دەنگی کوردستان، لە ۲۰ی مانگ بلاّو کرایەوە دلّی هەموو دانیشتوانی کوردستانی گەش و خۆش کرد، خەبەرەکەش کوژرانی دوژمنی کورد و شاری هەولێر بەتایبەتی، بەدرەدین عەلی بوو! بەلّێ: جارێ من، خۆم و خێزانم و هەموو خزمانم، حەمد

و سەنای خوای گەورەمان دەکرد بۆ لەناوبردنی ئەو تاوانبارە بێ ڕەحمە دەیانگوت: خوایە زۆر شوکور: هەر خۆت ئیش باش دەزانی! تۆڵەی هەموو میللەت کرایەوە خۆشییەکە زیاتر لەمەدا بوو، کە پێشمەرگەیەکی کوردستان، ئەو ناپیاوەی لەبەر دەرگای ماڵی خۆی بەدۆزەخ گەیاند و کوشت. دەک قوربانتان بم: ئەی میرانی کوردستان. ئێوە هیوامانن، هەر دەمانگەیەنن بەسەرفرازی و لە سەرکەوتنێک بۆ سەرکەوتنێک، لە دواتانین تا لووتکە!

لە هەواڵێکی زانستیشدا لە شەوی ٣ی مانگی شوبات سەعات ٩,٤٥ (چارەگێکی دەویست بۆ دە)، گالیسکەیەکی ئاسمانی (عربة فضائیة) ڕووسی بەناوی (لوونا ٩)، بەهێواشی و لەسەرەخۆ، لەسەر ڕووی مانگ نیشتەوە. من بەخۆمم گوت: «ئەگەر گەل سەربەست و ئازاد بێ، حکوومەت هانی فێر بوون و وەرگرتنی زانست بێ و هەموو پێویستییەکان بۆ عالم و قوتابی دابین بکرێ، هەڵبەت کاری گەورەی وەک ئەو ڕووداوە زانستییە و زیاتریش دەتوانرێ بکرێ. بەڵام ئەگەر کەری وەک بەدرەدین عەلی و سەدام حوسێن و میللەتکوژی وەک هیتلەر و دیکتاتۆرەکانی تری هەبێ، ئەوا وەک مێزی حوشتر، بۆ دواوە هەنگاو دەنێن...!

لە ڕۆژی ١٧ی مانگی مارت/ئادار - ئەمەریکاش کارێکی زانستییانەی دیکەی ئەنجام دا، کە ئەویش هەڵدانی (ناردنی بۆ ئاسمان و بۆشایی) کەشتییێکی بەناوی (جیمنی ٨) کە دوو کەشتیەوانیشی تێدا بوو، یەک ناوی (نیل ئارمسترۆنگ) بوو، ئەوی تریش ناوی (دیڤید سکۆت) بوو. دوای ١٢ سەعات لە ناو بۆشاییی ئاسمان سووڕانەوە، گەڕانەوە سەر عەرد.

لە بەرە بەیانی ڕۆژی ١٤ی نیسان، لە ئێزگەی ڕادیۆی بەغدا، دوای قورئان خوێندن، هەواڵێک یان (روونکردنەوەیەک بڵاوکرایەوە چەند جارێ دووبارە دەکرایەوە لە بابەت کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەی (هەلیکۆپتەری عەسکەری، کە سەرۆک کۆمار- عەبدولسەلام محەمەد عارف و چەند گەورە ئەفسەرێکی دیکەشی لەگەڵدا بوون- لە بەسراوە بەرەو بەغدا دەهاتن، بەڵام لە نێوان (بەسرە و قورنە) کەوتە خوارەوە و هەموویان کوژران و گیانیان لە دەست دا ئینجا (منع التجول) ئیعلان کرا. ئێزگەش بەردەوام بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی تەواشیح و ئایاتی قورئانی.

لە ڕاپۆرتێکی فوئاد خەلیل نوێنەری هەواڵەکانی عێراق (مندوب وكالة الابناء العراقية)دا کەوا ئەو لەگەڵ گرووپی ڕاگەیاندنەکان بوو لە کاتی سەردانی سەرۆکی کۆمار بۆ شاری (بەسرە)دا، هاتووە، بە عەرەبی: أن الطائرة... قد عثر عليها في الساعة

الخامسة و ٢٠ دقيقة من صباح الخميس ٤/١٤ في منطقة قريبة من قرية (النشوة) التي تقع علي شط العرب. أي بعد فقدان الطائرة بحوالي عشر ساعات.

پاش ٣ ڕۆژ- ڕۆژانی پرسه و تازیه، ڕۆژی ١٧ی نیسان- ئەمساڵەی ١٩٦٦ عەبدولڕەحمان محەمەد عارف، برای سەرۆک کۆماری کۆچکردوو، هەڵبژێردرا- بەکۆی دەنگەکان- بۆ سەرۆکایەتیی عێراق- ئینجا ئەویش، لە ڕۆژی ١٩ی مانگ، فرمانی دا بە د. عەبدولڕەحمان بەزاز کەوا وەزارەتی نوێ پێک بهێنێ. بەمجۆرە عەبدولڕەحمان بەزاز دووبارە کرا بە سەرۆکی حکوومەت، لە کاتێک ئەو لەمێژ بوو هەوڵی دەدا ببێ بەسەرۆک کۆمار! بەهەر حاڵ بەزاز مرۆڤێکی ڕۆشنبیر بوو، کۆلێژی یاسای تەواو کردبوو و دکتۆراشی هەبوو لە یاسا، ساڵانێک مامۆستا بوو لە کۆلێژی یاسا (كلية الحقوق)ی عێراق-

سەرۆکی وەزیرانی نوێمان ئیمانی بە مافی ڕەوای کورد هەبوو! بۆیە، کاتێ کە هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتیی وەزارەت، سەردانێکی کوردستانی کرد و هاتە هەولێر و لەگەڵ لێپرسراوانی تایبەت کۆبوونەوەی کرد کە گەڕایەوە بەغدا، بەیانێکی وەزاری بڵاو کردەوە لە تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان، لە ١٢ خاڵ پێک هاتبوو. شتی عاقڵانە و باشیان تێدابوو بۆ بەرژەوەندی کورد و بۆ عێراق بەگشتی. دیار بوو جەنابی (مەلا مستەفا بارزانی)ش ڕەزامەندی لەسەر بڵاوکراوەکە... واتا بەیانەکەی (بەزاز) هەبوو، بۆیە بروسکەیەکی ڕەزامەندی و تەئیدی بۆ سەرۆکی حکوومەت نارد. جا خەڵک لە کوردستان، منداڵان هەر ئەو ڕۆژە، بەجاڕدان وەربوون و بڵاو بوونەوە و لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان، غاریان دەدا و هاواریان دەکرد و گرووپێک دەیانگوت:

عەبدولڕەحمان عارف
سەرۆکی وەزیرانی عێراق

کێتان دەوێ لە کوردان؟ ئەوانەی تر وەڵامیان دەدانەوە و دەیانگوت: مەلا مستەفای بارزان. ئیتر وەزعی شار و لادێ بەرەو هێمنی و خامۆشی دەچوو- بەڵام ناحەزان هەر لە هەموو زەمان و کاتێک هەوڵی تێکدانی باری گوزەرانی خەڵک و حکوومەت دەدەن، و هەمیشە مرۆڤی دڕندە و بێ ڕەوشت و تێکدەر، دێنە کایەوە و هێمن و ژیانی ئاسایی لە هاووڵاتیان و وڵات دەشڵەژێنن، وەک ئەو پیاوە بێعار و بێ شەرەفەی کە ناوی- بەناخێری- (عقيد الجو عارف عبدالرزاق)ە و کە ماوەیەکی کورت لەمەوپێش، لە کاتی حوکمی عەبدولسەلام عارف، پار ساڵ (١٩٦٥) هەوڵی کودەتایەکی دا و دەیویست ببێ

به(رئیس جمهوریه) و سەر نەکەوت و هەڵات بۆ قاهیرە: جا هەر ئەو گویدرێژە- چونکە کەر ئیشی وا شێتانە و لۆقە هاویشتن دەکات- دیسان، لە ٣٠ نیسانی ئەمساڵ، هەوڵێکی دیکەی گۆڕینی حوکم و حکوومەت و ڕژێمی کرد، کاتێ کە سەرۆکی کۆمار لە بەغدا نەبوو- لە مووسڵەوە چەند فڕۆکەیەکی عەسکەری فڕین و چوونە بەغدا و کۆشکی کۆماریان بۆمباباران کرد- بەڵام دیسان هەوڵەکەیان سەر نەکەوت و ڕووڕەش و شەرمەزار، گیران و سجن کران- هێشتا حکوومەت تازە و فەریک بوو... تەمەنی ١٥- ٢٠ ڕۆژێک بوو.

سەرۆکی شارەوانیش، کاک محەمەد چەلەبی دەباغ، بەم بۆنە خۆشانەی ئەو ماوەیە کە بۆنی ڕەحەتی هاووڵاتیانی لێوە دەهات و نەمانی شەڕ و بەیانە ١٢ خاڵەکەی سەرۆکی حکوومەت و بەبۆنەی ١٤ی تەمووز، دەعوەتی ژمارەیەکی زۆری لێپرسراوانی حکوومەت و ئەفسەری سوپا و بازرگان و خەڵکی شار و هونەرمەندانی کرد بۆ سازدانی ئاهەنگێکی گەورە لەسەر ڕۆخی مەلەوانگەی سەر شەقامی بەغدا، لە ناو مەلعەب- لەبەر ئەو هۆیانە، گۆرانی و مۆسیقایەکان پێشوازیی باشیان لێ دەکران و ئێمەش بەزەوقەوە و بەدڵێکی پڕ هیوا بۆ دوارۆژێکی خۆشتر، گۆرانیمان دەگوت و ئیبداعمان دەکرد و ژوورەوە و دەرەوەی شوێنی ئاهەنگەکە، خەڵک بەچەپڵە و بە سەما و هەڵپەڕکێ وەڵامیان دەدایەوە و کامەران بوون.

بەردەم دەرگای سەرای یاخود دیوانی موتەسەریفیەتی هەولێر کیراوە، لە سەردانەکەی عەبدولڕەحمان بەزاز بۆ هەولێر ساڵی ١٩٦٦

لەو ماوەیەداماڵیشمان گوازتەوە خانوویەکی بەرامبەر خانووە قوڕەکەی هونەرمەند ڕەسووڵ بێزار گەردی هاوڕێم، کە خانوویەکی بچووکی شارەوانی بوو... هەیوانێکی بچووک و دوو ژووری بچووک، خۆی و منداڵەکانی تێیدا دەحەوانەوە. شوێنەکەی لە جێگەی بەشێکی (مطعم سفین)ی ئەمڕۆیە (ساڵی ٢٠٠٤) کە لە سەرەتای شەقامی پزیشکانە، لە دەستی ڕاستی فولکەی شێخ مەحموودی ئەمڕۆ! خانووەکەی ئێمەش بەرامبەریەتی

خانووی ڕەحمەتی شەهاب بەزاز بوو. سێ چوار دختۆر، هەر یەکە و ژووریکیان کردووە بەعیادەی خۆیان ئەمڕۆ...!

جا کاک ڕەسووڵ زۆر خەنی بوو و یەکجار دڵخۆش بوو کە بووینە دراوسێی - ئەگەرچی بەرامبەر یەک بووین، نەک لە تەنیشت یەک. هاتە لای باوکم و دایکم و زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردن- لەگەڵ باوکم باسی زەمانی پۆلیسایەتییان دەکرد و باسی قشڵەی کۆیەیان دەکرد و پێدەکەنین- ئینجا پێش هەڵسانی بۆ ئەوەی بڕوات، وتی: بزانە مام ئیسرائیل... باکووری.. داکی کاک باکووری، سبەی نیوەڕۆ ئێمە خواردنتان بۆ دەکەین و

خانووە کۆنەکەی ڕەسووڵ گەردی ئەمڕۆ چێشتخانەی (سەفین)ە

خانووەکەی ئێمە تێدا بووین کە لە شەهاب بەزاز بەکرێمان گرت بەرامبەر ماڵی ڕەسووڵ گەردی

میوانی برای خۆتانن. هەوڵمان دا کە ئەود نەکات. ئاخر ئەو خۆی زگورتییە... ژنی نییە، تەلاقی داوە لەمێژە- بەڵام قسە و ئیعتیرازەکەمان سوودی نەبوو، سوێندی خوارد کە نابێ ئێمە چێشت لێ نێین و ئەو بۆمان ئامادە دەکات. هەرواش بوو- بۆ نیوەڕۆی دوایی، سەفین کوڕی و عەبدوڵڵای کوڕی خواردنێکی زۆریان بۆمان هێنا و کاک ڕەسووڵیش هات و خواردنەکەی سەیر کرد گوتی: عافیەتتان بێ... بەخێربێن سەرچاوی کوڕی بچووکتان و برای کاک باکووریمە... و لە خزمەتتان دام (یارەبی جێگەت بەهەشت بێ و هەزارەها سڵاو لەو ڕووح و گیانی پاکەت بێ، ئەی هونەرمەندی ڕاستەقینەی کورد- ئەی مرۆڤی دڵپاک.)

لەسەر داوای کاک ڕەسووڵی هونەرمەندی حەیرانبێژی ڕەسەنی کورد، پێکەوە بەپێیان،
بەشەقامە سەرەکییەکەی هەولێر، هەر لە ماڵی خۆی کە خانووە قوڕەکە بوو،
گوڵەسووسنێکیشی لەگەڵ خۆی هەڵگرت لە ماڵی خۆیەوە، هەر بەمەرکانەوە تا ستۆدیۆکە،
بەرامبەر چایخانەی مەچکۆ، ڕۆیشتین و وێنەکەمان بۆ گیرا لە بەهاری ساڵی ١٩٦٤

باپیرم، باوکی دایکم، ناوی لازار عەبدال بوو، زۆر یارمەتی خێزانەکەی (کچی) واتا دایکم، و باوکم و ئێمەی منداڵەکانیانی داوە بەدرێژاییی ساڵانی تەمەنی... هەمیشە لە تەنگانە و لە کاتی ساڵانی گرانی و نەخۆشی، بەهانامانەوە هاتووە! بەداخەوە، ڕۆژی ١٦ی تەمموزی ئەمساڵە... ١٩٦٦، لە مووسڵەوە، لە مێردی (سینەم)ی پلکم، ناوی نادر بوو، بروسکەیەکمان بۆ هات، تیایدا هەواڵی کۆچی دوایی باپیرمان پێ ڕادەگەیەنێ- بروسکەکەش بە ئەدرێسی تیمەی برام هات، کە لە خانووەکەی ناو غاباتی کارگەی ئەلبانداا بوون. دەڵێ- بەعەرەبی- (عمي لازار توفي) واتا مامم لازار مرد- ئیمزای نادر. بەدایکمان نەگوت. وتمان دەڵێین باوکت زۆر نەساغە. ئینجا من و دایکم و فیلیپ و تیمە و منداڵەکان هەموو چووینە مووسڵ... کە دایکم قەرەباڵغی دیت لە ماڵی پلکم... زانی کە باوکی تەواو بووە- ئیتر هەموومان بۆی گریاین... و سێ

نموذج رقم (٨٠)
مصلحة البريد والبرق والتلفون
برقية واردة داخلية
وصلت في الساعة ١٢ دقيقة
التاريخ ١٦
عمي لازار توفي
نادر

ڕۆژ مایەوە... و گەڕاینەوە هەولێر- باپیرم لە قەبرستانی (دێر)ی (مارگۆرگیس) نێژرا لە لای دەستەڕاستی جادەی نێوان مووسڵ و دهۆک- لەسەر گردێک، نزیکی مووسڵ.

باپیرم لازار عەبدال بەجلوبەرگی گوندی ناوچەی خۆیان، لە نزیک و دەوروبەری گۆلی وان (بحیرەوان)-- ئەوەکەی تر باوکمە بەچاکەت و پانتۆڵ وێنەکەشی لە شارۆچکەی (سن الذبان)... ئێستا حەبانییەیە، لە ١٩٣٧/١٢/٧ گیراوە، کاتێ باوکم و من کە پۆلی سێی سەرەتایی بووم، لە کۆیە بەسەردانی خزمان چووینە ئەوێ

باسی یەکەم ترومبێلم کە کڕی، ساڵی ١٩٦١ کە (قالۆچە)- واتا فۆلکس واگۆن بوو، باسم کردووە و کە فرۆشتم، زۆر پەشیمان بوومەوە... چونکە لێی ڕاهاتبووم و زۆر کار و ئیشی ماڵەوە و بازاڕ و جگە لە چوونمان بۆ دەوام، خۆم و دایکی منداڵان... و جگە لە سەیرانکردن و سەفەر و سەردانی خزمان لە شارەکانی تر... کە بەڕاستی، ئۆتۆمبیل زۆر پێویستە، بۆیە هەر هەوڵم دەدا ترومبێلێکی دیکە بکڕم! تا توانیم، ئەمساڵ، ترومبێلێکی گەورەی سالۆن واتا قەمەرە، پەیدا بکەم، کە ترومبێلێکی ڤوکسهۆڵی ئینگلیزی بوو، ڕەنگی سپی بوو، مودێلی ١٩٥٥ بوو. ژمارەی لەوحەکەی وابزانم ٤٣٠ ئەربیل بوو. ئەوەش خاوەنەکەی دۆستم بوو (کاک سوڵتان عبدوڵلا) بوو و بە ٥٥٠ دینارم لێ ستاند، بەقست، مانگی ١٥ دینارم دەدایێ بەکۆمپیاله- کاک سوڵتان مامۆستا و هونەرمەندە، ئەگەرچی لە هونەری کڕین و فرۆشتنی ترومبێل چاکترە و باشتر شارەزایە و ئەزموون و خیبرەی پەیدا کردووە و هونەری مۆسیقای بەلاوە ناوە! ئەو سەیارەیەم لە ٢٣ی تشرینی یەکەم- ئەمساڵ (١٩٦٦) کڕی. وەک بڵێی پێی کەیف خۆش بووین و ئیتر هاتوچۆ بۆ قوتابخانە و بازاڕ و مووسڵ و کەرکووک و بەستۆڕە و...تاد بۆ گەشت و سەیران تەئمین بوو. بەڵام مەسرەفێکی نوێشی بۆ من زیاد کرد، هەر لە بەنزین کڕین و تایە و مەکینە... تاد. مووچەکەمان بەناشوکری نەبێ... قەت تا سەری مانگ بەشی هەموو پێداویستی ماڵ لە جلوبەرگ و خواردن و ئەملا و ئەولا و میوان و سەفەر و... ها.. هوو؟ حەیران لە دوورە!! بەڵام چ دەکەی بەخوا پێویستە ترومبێل بۆتە شتێکی پێویست.

ئیتر بەو ترومبێلەش، زۆربەی ئێواران، دەچووینە ماڵی باوکم... کە لە ناو غاباتەکەی کارگەی ئەلبانی هەولێر بوون... تا درەنگ دەماینەوە... و منداڵەکان لەگەڵ باپیر و داپیرەیان و پلک و مامیان، بەخۆشی کاتیان بەسەر دەبرد... و خواردنمان لە ناو گیا و مێرگە خۆشەکانی دارستانەکە

ترومبێلەکەم، جۆری ڤۆکسهۆلی ٥٥، لە بەستۆڕەدا... مانگی نەورۆزی ١٩٦٧ لە سەیرانێکدا بۆم گیراوە

دەخوارد... کە خۆشتر دەبوو چونکە بەقەرەباڵغی دۆست و خزمان، خواردن بەتامتر و خۆشترە... یەکێک لە سەیرانەکانمان بۆ ماڵی باوکم لە ناو دارستانەکەی کارگەی شیری هەولێر، لە ناو مێرگ و مێرغوزارێکی ژێر درەختە بەرز و گەورە و بەتەمەنەکانی ئەو شوێنە دڵگیرەدا، لە بەهاری ساڵی ١٩٦٧، خۆم منداڵ و خێزان ئەوانە بووین: لە پێشەوە، لە لای ڕاستەوە: ماری خوشکی گەورەمان لەسەر زەوی لێی دانیشتووە. لە تەنیشتی: شوبانی کوڕمانە گیتاری یووسفی مامی بەدەستەوەیە، ئینجا سەبا کوڕەکەی دیکەمان، لە تەنیشت وەردییەی خوشکمە، زۆری خۆش دەویست، لە دایکی زیاتر! لە دواوەشیان من و خانمم، دایکی شوبان و سەبا، وەستاوین.

جۆرە ژیانێکی هێمن... سادە... بێ گرفت، لەگەڵ خەریکبوون لە کاری سەرەکیی خۆی، مرۆڤی هونەرمەند... ئەم شتانە ئەگەر لە ژیانیدا ئاسایی بن و هەبن... پێم وایە هونەرەکەی ئەو مرۆڤە پەرە دەسێنێ... زیاتر دەتوانێ بەشێوەیەکی لە سەدا سەد تەعبیر لە ئامانج و هیوا و بزووتنەوەی دەماری هونەری لە جەستە و لە مێشکیدا گەشە بکەن و بۆیەکەش، بەرهەمی چاکتر و گۆرانی خۆشتر و ئاوازی سەرکەوتووتر بخولقێنێت!

ئەمەش سەیرانێکی دیکەیە، لەو بەهارە خۆشەی ئەو جێگەیە جوان و ڕەنگینە، بەستۆڕەی سەیرانگای دێرینی هەولێریان... بەڕاستی ئەو شوێنە، چونکە دەورە دراوە بە چیا و دەشتێکی سەوز و جوان و ئاوێکی شرینی سازگاری ساردی وەک بەفراوی وەک نیمچە زێیەک، بەهاران لە ڕۆژهەلاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا، وەک زنجیرێکی زیوین، دەخزی... و خوڕەی ئاوەکەی سیمفۆنیاییێکی سروشتی دەژەنێ! خوایە وەتەن ئاواکەی چەند دڵگیر و شیرینە! لەبەرئەوەی ئەو جێگەیەم زۆر خۆش دەویست و کە دەچوومە ئەوێ بۆ سەیران لەگەڵ برادەران و دۆستان یان لەگەڵ خاوخێزان، هەستم بەخۆشییەکی دەروونی دەکرد و هۆش و عەقڵم بەجارێ ژیانیان لە لام خۆشتر دەکرد. بۆ هەر کە شیعرە جوانەکەی مامۆستا عوسمان شارباژێریم خوێندەوە لە دیوانە بچووکەکەی، کە وەسفی ئەو ناوە واتا وەسفی (بەستۆڕە) دەکات و دەڵێ:

هەستە هەستە کیژی جوان

بەهارە کاتی سەیران

درەنگە خۆت بگۆڕە

با بڕۆین بۆ بەستۆڕە

بەکسەر ئەو ئاوازە سووک و خۆش و پڕ مۆسیقای دڵڕفێن و سادە و ئاسانەم بۆ هات و کردم بەگۆرانی، تا ئەمڕۆش بەتام و خۆشە لای هاوولاتیان و لە سەیرانان لە دانیشتنیان لە بەستۆڕە بەچەپڵە ڕێزانەوە دەیچڕن!

بەستۆڕەی گشتی. ڕووبارەکە و دەشتاییەکە و ترومبێلی سەیرانکەران لە ڕۆژێکی جەژن- یان هەینی- سالانی شەستەکان

ترومبێلی دووەمم- ڤۆکسهۆل مودێل ٥٥ یا ٥٤ لەبەر دەرگای ماڵەوە... لە گەڕەکی شۆڕش- هەولێر لە ڕۆژی ٢/٥/١٩٦٧ گیراوە

لە هەواڵێکی زانستیدا، لە ١٥ی ئەم مانگەدا (ئەیلوولی ١٩٦٦)، ئەمەریکا کەشتییەکی بۆشاییی ئاسمان (سفینة فضائية) بەناوی (جیمنی ١١)ی نارده بۆشاییی ئاسمان دوو (رواد)ی بۆشایی بەناوی (کۆنراد و گۆردن)ی تێدابوو- ئەم کەشتییە لە بەرزاییی هەزار و کسوور میل دەسووڕایەوە و دەجووڵایەوە لە بۆشاییی ئاسماندا- ئەمڕۆش، بەسەلامەتی و بێ گرفت، هاتەوە خوار و لەسەر زەوی نیشتەوە!

سەرۆکی کۆمار، بەڕێز عەبدولڕەحمان محەمەد عارف، ئەمڕۆ ٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦ ، بەسەردانێکی پشکنینی پایەتەختی کوردستان و لە نزیکەوە گیروگرفتی ڕەسمی و شارەوانی و هاوولاتیان و ژیان و گوزەرانیان بزانێ، و هەروەها بلاو کرایەوە کە لەم سەفەرەیدا، بۆ ئاشتییەکی یەکجاری لە نێوان حکوومەت و بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد، گەیشتە هەولێر و بەگەرمی لە لایەن لێپرسراوانی حکوومەت و هاوولاتیان، پێشوازی لێ کرا و لە یانەی ئەفسەران (نادي الضباط) دابەزی، کە لەسەر کەندەکەی بەرامبەر چایخانەی بایز و بەرامبەر بینایەی (سانەوی هەولێری کوڕان) بوو لەسەر جادەکەی کە بۆ شاری مووسڵ دەڕۆیشت- ئێستا کە (ساڵی ٢٠٠٥)- شوێنی یانەکە دەرگای چوونە ناو باڵەخانەی ئەنجوومەنی وەزیران و ئیستیعلاماتەکەی کە بۆ ئەنجوومەن دەچێ پێشتریش ماوەیەک بووە (فندق أربيل) دوایی لە زەمانی سەدام کرایە دەزگای ئەمن!... کاتێ کە مەوکیبی سەرۆک کۆمار عەبدولڕەحمان محەمەد عارف لە بەرەبەیانی، کەوتە ڕێ بەرەو باکوری کوردستان، بەو جادەیەی بەرەو تەیراوەدا و بەناویدا ڕەت دەبێ و ئینجا دەکەوێتە سەر جادە سەرەکییەکە و لە تەنیشت (نەخۆشخانەی هەولێری کۆماری) ڕەت دەبێ و ئیتر بەردو سەلاحەدین دەڕوا. لە ئەو شوێنانە هەموویان، کە خەڵک دەیانبینی لە ناو ترومبێلێکی عەسکەری، بێ سەقف، ئەوا سەرۆک عەبدولڕەحمان محەمەد عارف، بەجلی عەسکەری (خاکی) هاوینی وەستاوە و سلاوی خەڵک بەدەستی ڕاستی وەردەگرێت و ئەوان چەپڵەی بۆ لێ دەدەن و بای بای لێ دەکەن، تا لە شار دەرچوو... من وام هەست دەکرد کە ئەو پیاوە مەترسیدار نەبوو! عەرەبێکی هێمن و تێگەیشتوو بوو، توندڕەو نەبوو. ئیمانی بەعەدالەتی مەسەلەی کوردی هەبوو،

چەند کەسایەتیی ناودار و ناسراوی کورد دیارن کەوا چاوەڕێی گەیشتنی عەبدولڕەحمان عارفی سەرۆکی کۆمار دەکەن بۆ جندیان ئینجا لە سەردانی مەلا مستەفای نەمر، پێکەوە دانیشن و مەسەلەی ئاشتی بخرێتە گفتوگۆ

هەروەها سەرۆکی حکوومەتەکەشی د. عەبدولڕەحمان بەزاز، ئەگەرچی مەیلی بەعسییانی هەبوو، بەڵام لە قسە و چاوپێکەوتنەکانی بۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن، خۆم بیستبووم کە دەیگوت: «أنا أؤمن بالحل السلمي للمشكلة الكردية...» واتا (من ئیمانم هەیە بەچارەکردنی مەسەلەی و گرفتەکانی کوردی بەڕێگەی گفتوگۆ و بەئاشتییانە) بۆیە خەڵکی شار لەو ڕۆژانە کە هەواڵی گەیشتنی سەرۆک کۆمار بۆ لای جەنابی مەلا مستەفا و بەخێرهێنانی گەرم و پێشوازی باشی لێ کرابوو... خەڵک هەستیان بەخۆشییەک دەکرد کەوا لە ڕێگەیە... توندوتیژی و نەمانی شەڕ ئامانجی سەرەکی کورد بوو! بە ڕا و بۆچوونی من وابوو، ئەوسا، ئەگەر ئەو پیاوە بمێنێ، کاری باش دەکات بۆ خۆشگوزەرانی خەڵک و پێشکەوتنی عێراق- سەردانی فەرەنسای کرد و لەگەڵ سەرۆکی ئەو کاتەی فەرەنسا، (شارڵ دیگۆل) کۆبووەوە... چەند ڕێکەوتنی سیاسی و ئیقتیسادی و بازرگانیان ئیمزا کرد بۆ بەرژەوەندی هەردوو لا.

بارزانی نەمر لە ناوچە ئازادکراوەکانی ئەوسادا پێشوازی لە سەرۆک کۆماری پێشووتری ئێراق دەکات

هەروەها سەردانی میسر و جەمال عەبدولناسری کرد بۆ هەمان مەبەست و بۆ مەسلەحەتی بەرقەرار بوونی ئاشتی لە ناوچەی وڵاتە عەرەبەکان.

سەردانەکەی سەرۆکی کۆماری عێراق (عەبدولڕەحمان عارف و خێزان) بۆ پاریس- فەرەنسا، لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٦٧ و میوانداریکردنیان لە لایەن سەرۆکی کۆماری فەرەنسا شارڵ دیگۆل

***

له هەمان سەردانەکەی سەرۆکی عێراق بۆ پاریس، شارڵ دیگۆل پێشوازی له عەبدولڕەحمان عارف کرد له کۆشکی ئیلزێی کۆماری، مانگی شوباتی ساڵی ۱۹٦۸

سەردانی سەرۆکی کۆماری عێراق عەبدولڕەحمان محەمەد عارفه بۆ قاهیره و پێشوازیکردنی له لایەن سەرۆکی (میسر) جەمال عبدولناسر، له مانگی ئاداری ساڵی ۱۹٦۸

له سەرەتای مانگی ئەیلوول، کاک وەحید بامەرنی هاوڕێم ژنی بۆ زیرەکی کوڕی گوازتەوه و دەعوەتنامەیان بۆ ناردم... جا له ٥ی مانگ به ماڵەوه و لەگەڵ (بووک)، که زانیم ناوی (حیاة) خانه... هەموویان هاتنه هەولێر و له لامان دابەزین... ئیتر فورسەتێکی خۆش بوو. بۆ ڕابواردنی شەوەکه هەموومان چووینه ماڵی باوکم، له غاباتەکه... کاک وەحید و منداڵەکانی زۆریان پێ خۆش بوو چونکه شوێنێکی پڕ دار و درەخت و گیا و سەوزایی... و جۆگه ئاوی سارد و پاکیش له نێوان درەختەکاندا دەخزی وەک زیو! بەڵام بۆ نوستن گەڕاینەوه ماڵمان که له شۆڕش بووین، چونکه نوستن له سەربان له غابات زەحمەت بوو لەبەر مێشووله (پێشکه)... پیاو خەوی لێ حەرام دەبوو!

ئەو یەک دوو ڕۆژه به زیرەک و خێزانەکەی و باوکی و دایکی شاد بووین و تا ڕۆژی گەڕانەوەیان... که سەفەرێکه له یادمان ناچێت، خوا بیانپارێزی... مرۆڤی کەیف و ڕابواردن و مۆسیقا و گۆرانی و بەزەوقن جگه له نیشتمان و کوردپەرستیش.

ئەمە وێنەیەکی (دەگمەن)ە لە لام، کاک وەحید لە مێژووی ۱۹٥۳/۲/۲۳ پێشکێشی کردووم لە بەغدا- وێنەکەش هەرسێ کوڕەکانی کاک وەحیدن تەمەنی خۆیان و باوکیان و دایکیان درێژ بێ یارەبی قەت ناخۆشی تووشیان نەبێ.

۱- ئەوەی گەورەکە، بەپێجامە خەت خەتەکە، ئەوە کوڕی گەورەی کاک وەحیدە و ناوی (زیرەک)ە و ئەوەبوو کە پێشتر وتم هاتنە لامن دوای ژنگوازتنەوە بۆ زیرەکی کوڕیان.

بەڵی ئەمە زیرەکە کە لە مانگی ئەیلوولی ۱۹٦٦ ژنیان بۆ هێنا ناوی حەیات خانە پیرۆزی بێت.

۲- منداڵەکەی لە پێشەوە، لەسەر کورسییەکە دانیشتووە، (گوهدار)ە بچووکترینیانە.

۳- ئەوی لە دوای گوهداریشە ناوی (رێبەر)ە- تەمەنیان درێژ بێ.

هەڵبەتە زیرەک و رێبەر بوون بە ئەفسەر- ئەمما گوهدار... کاسبی دەکات- جا لە پشت وێنەکەش، کاک وەحید نووسیویەتی : (أخذ التصوير في سطح الدار ببغداد، أهديها للأخ العزيز أندريوس ۱۹٥۳/۲/۲۳ ئیمزا- وحيد

# ساڵی ١٩٦٧

سەرەتای ساڵ جارێ هەر لە خانووەکەی بەڕێز شەهاب بەزازین بەرامبەر خانووە قوڕەکەی ڕەسووڵ گەردی- جا زۆربەی نیوەڕۆیانی هەینی، سەردانێکی مام ڕەسووڵ دەکەم، دەبینم ئەوە لەگەڵ حەیدەرە کەچەڵی دەنگخۆشی هەولێری و خاڵە تایەر تۆفیق و حاجی حەمەشەریف و حەمەڕەشید و حەمەدەمین عەبۆ ئاغا... ئەوا دانیشتوون و یاری کۆنکان دەکەن- جا لەگەڵ یاریکردنەکەش، جاروبار حەیدەر ڕستە قۆریاتێک تێ هەڵدەکات و پاش کەمێک کاک تایەر ڕستە مەقامێک دەچڕێ لەگەڵ فڕێدانی کاغەزێکی کۆنکانەکە بۆ سەر مێزەکە و... مام ڕەسووڵ نقەی لێوە نایێ!

من، لە وەزیفەکەی خۆمم، مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە قوتابخانەی ناوەندی

قوتابیانی پۆلی سێی هۆبەی ئەلفن کە من ئینگلیزیم پێ دەگوتن و فێرم دەکردن. من لە دواوە وەستاوم بۆیان دەخوێنمەوە- بەڵام، بەداخەوە ناوی هیچیانم لە بیر نەماوە تاکو بیاننووسم لە ڕۆژی ٤ی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٦٧ وێنەکە گیراوە.

مامۆستاکانی جمهووری- ئەو ساڵە، ئەوانە بوون دانیشووەکان لە ڕاستەوە:
١- ئەنوەر شەکەرچی- مامۆستای وەرزش. ٢- عەبدولڕەزاق حاجی محەمەد- مامۆستای ڕیازیات. ٣- وەلی حەسەن ڕەزا- مامۆستای مێژوو. ٤- زوبێر بیلال ئیسماعیل- مامۆستای مێژوو. ٥- عەبدوڵڵا کاکە- کاتبی مەکتەب- زاتییە. ٦- ئەکرەم حوسێن عەلاف- مامۆستای هونەری ڕەسم
ڕاوەستاوەکان لە ڕاستەوە:
١- ئەوە نووسەری کتێبێک بوو لەسەر (هەولێر) هاتە لامان و هەندێ وێنەی مامۆستا و قوتابیانی گرت (ئەو وێنەیەش هی ئەوە بۆی گرتین) بۆ کتێبەکەی. ٢- حوسێن ڕەشوانی - مامۆستای زمانی عەرەبی. ٣- عیرفان سەعید- ئینگلیزی. ٤- کەمال عەبدولمجەید- بەڕێوەبەری قوتابخانە. ٥- باکووری- ئینگلیزی. ٦- سەباح.....!!
٧- عەبدوڵڵا فەقێ موارد- ڕیازیات. ٨- جەلیل سوڵتان- عەرەبی
٩- یەعقووب سەباغ- جوگرافیا

جمهووری و لە ناوەندی ئەربیل، کە لە دوای یەکدی دەوام دەکەن، لەویش موحازەرات دەڵێمەوە.

هەندێ ڕووداوی ئەو ماوەیە بەکوتی ڕوویان دا، دەگێڕمەوە:

أ- لە ڕۆژی چوارشەممەی ڕێکەوتی ١١ی کانوونی دووەمی ئەمساڵ (١٩٦٧)، سەرۆک فورسان: (محەمەد سابیر ئاغا)، لە نزیک قوشتەپە، دەستدرێژی لێ کرا و هاتە کوشتن. ئەو پیاوە زۆر نزیک بوو لە حکوومەت.

ب- له ئەمەریکا، کەشتیی ئاسمانی (ئەپۆلۆ) کە لە دوا کاتیدا بوو بۆ فرین بۆ ئاسمان، بەڵام هەر لەسەر زەوی ئاگری تێبەر بوو و ٣ کەسیشی تێدا بوو خۆیان و کەشتیەکەیان بوون بەخەڵووز و خۆڵەمێش.

ج- لە بەغداش یاسای هەڵبژاردنی گشتی (قانون الانتخابات العام) لە ڕۆژنامە و ئێزگە و تەلەڤزیۆن بڵاو کرایەوە. بەڵام ئایا کاری پێ کرا؟!

د- زەکی حوسێن- قائیدی فیرقەی یەکەمی عەسکەری، ماوەیەک لە ئەمەریکا بوو لەگەڵ هەندێ ئەفسەر و کەسایەتی تر- جا لە گەڕانەوەی بۆ بەغدا، هاتە هەولێریش بۆ سەردان ئەوە بوو، موتەسەریفی هەولێر عەبدولمونعیم مەسرەف ئاهەنگێکی گەورە و دەعوەتی چەند کەسایەتی هەولێری ئێمەی هونەرمەندان: جگە لە خۆم، کاک حەیدەر، کاک تایەر تۆفیق، کاک فوئاد ئەحمەد... لەگەڵ چەند مۆسیقاژەنێکی خۆمان... هەمووومان لەو شەوە کە ڕێکەوتی ٦ی ئاداری ئەمساڵ (١٩٦٧) لە کۆشکی موتەسەریف کۆ بووینەوە، لە هۆڵە گەورەکە هەموو لەسەر مافوور و ڕایەخ دانیشتین لەسەر زەوی، نەک لەسەر کورسی و قەنەفە- میوانەکان، بەڕێز، لەژێر دیوارەکان، پاڵیان دابووەوە و بالیف و دۆشەکیان لە ژێر بوو... ئێمەش لە ناوەندی هۆڵەکە، هەر لەسەر مافوورەکان دانیشتین. تیپی مۆسیقا لە ناوەڕاست و گۆرانیبێژەکان لە دواوەیان، وەک ئەڵقە... مۆسیقا لێ دەدرا و گۆرانی دەگوترا... من یەک دوو گۆرانی عەرەبیم گوت! شەوێک بوو لە شەوەکانی هاروونەلرەشید!! شەوێکی حەکایەتی (هەزار و یەک شەو)ەکانی ریوایەتی (ألف لیلە و لیلە)- تا درەنگی شەو ماینەوە.

لیوا ڕوکن زەکی حوسێن حیلمی قائدی فرقەی یەک و موتەسەریفی هەولێر عەبدولمونعیم مەسرەف

لەو ئاهەنگەدا لە ڕاستەوە: فوئاد ئەحمەد وەستاوە و گۆرانی دەڵێ، حەیدەر دانیشتووە بێ دەنگ، من کەمان دەژەنم و یووسفی برام عوود لێ دەدا

جەژنی نەورۆزمان، ئەمساڵەی ١٩٦٧ ڕێک کەوت لەگەڵ یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان. ئیتر بووە دوو جەژن- بارودۆخەکەش ئارام بوو، خەڵک سەر و دڵیان خۆش و ڕەحەت بوو- لەسەر ڕۆخی قەڵا، لە هەموو لایەکییەوە، تایەی ترومبێل بە دەیەها و سەدەها دانرابوون بۆ سووتاندن- منیش لە ترسی دووکەڵە ڕەش و پیسەکە... هەڵسام خۆم و منداڵ و دایکیان بەرەو مووسڵ سەفەرمان کرد- دوای جەژن گەڕاینەوە و ئینجا یەک دوو سەیرانمان کرد بۆ بەستۆرە و شوێنی تر.

لە سەیرانگای خۆش و ڕەنگین و سەر ئاوی سازگاری بەستۆرە: ١٩٦٧/٣/٣١ کە یەک هەفتە، بەبۆنەی جەژنی نەورۆز و جەژنی قوربان، هەر سەیران و خۆش ڕابواردنی دانیشتوانی شاری هەولێر بوو لە ڕاستەوە: ١- یووسفی برای بچووکمان. ٢- باکووری- منداڵەکانیش کوڕەکانمن: سەبا و شۆبان. ٣- دایکم. ٤- ماری خوشکم. ٥- وەردییەی خوشکی بچووکترمان

ئەگەر باسی خۆشی لە ژیانمدا بکەم هەر ئەو ڕۆژانە خۆش بوون دایک و باوک و خوشک و برا و دۆست و خزم، لە دەورم

بوون و سەریان لێم دەدا و سەردانم دەکرن و سەیرانمان دەکرد و گۆرانی و عوود و چەپڵەڕێزان بوو. کەچی ئەمڕۆ، لەو تەمەنەمدا (ساڵی٢٠٠٥)، وەختە پێ بنێمە ساڵی ٧٨ی تەمەنم، هەرخۆم لێرە ماوم. دایک و باوک و برای نازدارم کاک فیلیپ مردوون. براکانی دیکەم و خوشکەکانم لە هەندەران پەرت و بڵاو بوون. یووسف لە ئەمەریکا و ئەوانی تر لە سوێد و خزمانی کە ماون: کوڕ و کچە پلکەکانم، لە لەندەن و ئوستراليان... پەهەی! پەهەی! توخوا ئەمە ژیانە؟ ئەدی گرژ و مۆنی خەڵکی و ناخۆشی ژیان و بێ کارەبا... بێ ئاو... بێ نەوت... بێ بانزین!... گرانی!...

ساڵانی پێشوو، شەو نەبوو لە ماڵێک، یا لە هۆڵێک لە دەشتێک ژیانمان بەخۆشی ڕانەبواردبایە. هەمیشە بەعوودەوە لە دەرەوە بووم! وای لێهات خێزانم زوو زوو ڕووی گرژتر دەبوو... نێوانمان دەبووە هەرا... چەند ڕۆژێ قسەمان لەگەڵ یەک نەدەکرد! ئێ ئەمڕۆ. بەخوا ساڵ دێ و دەڕوا مەگەر جارێک یا دووان... دانیشتنێک و دەعوەتێک ڕێک کەوێ و دەعوەت بکرێم! خەڵک زەوقی نەماوە- ئەم جیلەش لەزەتی ژیان نازانێ- تەلەڤزیۆن و وێنەی ئافرەتی نیوە ڕووت و سنگ و مەمک و ڕانان دەبینن، شێت دەبن ئەدێ (ئیرهاب)؟! چاکە لای خۆمان، لە کوردستان تا ئێستا سەلامەتین! بەڵام لە بەغدا و مووسڵ و شارەکانی ڕۆژئاوا: ڕومادی و فەلوجە و... و باشووری بەغدا... ئەو شارانە ڕۆژانە قەسابخانەی بەشەر (بەنی ئادەم) و سەر بڕینی خەڵک و فڕاندنی کچ و موززەف و لێرسراو... عێراقێکی شڵەژاو... بێ کەس، بێ یاسا! هۆبە... هەرکەس لۆ خۆبە! خوامان هەیە و... ئەو ئاگادارمان بێ... ئامین.

ڕۆژی هەینی ٢١ی نیسانی ئەمساڵەش، تیپی یەکەمی سەربازی (الفرقة الاولي) نمایشی ساڵانەی خۆی سازدا لەسەر زەوییەکەی بەرامبەر (معسکر)ی سەر ڕێگەی هەولێر- مووسڵی کۆن و منیش دەعوەت کرابوو، چونکە قائید فرقەکە لەو چەند ئاهەنگەی پێشتر لە لایەن موتەسەریفەوە بۆی کرا، و لەیانەی ئازادش، کاک محەمەد حەسەن دزەیی میوانداری کرد، ئێمە یەکترمان ناسی و هەر بۆیەش، لەسەر پێشنیازی ئەو هەروەها ڕەنگە پێشنیازی عەبدولمونعیم مەسرەفیش من وەک کەسایەتی دەعوەتی ئیستیعرازەکە کرام. ئەو میهرەجانەش لە لایەن وەزیری بەرگری شاکر مەحموود شوکری، لە جیاتی سەرۆک کۆمار، کرایەوە و دەست کرا بەنمایشەکە... شتێکی زۆر جوان و ڕێکوپێک بوو... جا بۆ ئێوارە خوانێکی خواردن و خواردنەوە لە کۆشکی موتەسەریف ڕێکخرا... دوای بەزم و ڕەزمی گۆرانی و ڕابواردنێکی خۆشی شاهانە، کە من لە تەنیشتی لای ڕاستی

وەزیر بووم، لەسەر مێزەکە و قسە لە من و پرسیار لەو... بووین بەبرادەر. باسی هونەر کرا، دەرکەوت برادەرێکی زۆر نزیک و خۆشەویستی مامۆستا (حەقی شبلی) بوو! وتی زەمانێکیان پێکەوە لە پاریس ڕابواردووە... لە بەغداش زوو زوو یەکتر دەبینن و ڕادەبوێرن- هەڵبەتە لە کۆتاییی ئاهەنگیش من ڕام سپارد سەلامی خۆم بۆ مامۆستا بگەیەنێ. بەڕێزیش وتی: ئەگەر ئەو جارە سەردانی بەغدات کرد، دەبێ بتبینین!

ئینجا بەڕێز کاک محەمەد شەهاب دەباغ سەرۆکی شارەوانی، لە شەوی ٢٨ی مارت، دانیشتنێکی زۆر خۆش و ڕێک، لە ماڵی خۆی، لە نزیک فولکەی زەعیم سازدا و میوانەکانی کەم بوون بەڵام کەسایەتی و لێپرسراوانی ناودار و خۆشەویست و دۆستی بەزەوق بوون. لە پێشەوەش کاک مونعیم مەسرەفی موتەسەریف و دکتۆر عەبدولڕەزاق، محەمەد حەسەن دزەیی، جەوددت ناجی، و بەڕێوەبەری پۆلیس و ئینجا کاک حەیدەری خۆشخوانی مەجلیس و بەندەش بەخۆم و عوودەکەم.

لە لایەکی تریش، دڵم زۆر خۆشە و ڕەحەت بوو لە لایەن پەروەردەکردنی کوڕەکانم: هەردووک لە قوتابخانە لە یەکەمەکانی پۆلەکەیان بوون لە خوێندن و چالاکی نواندن و واجیب ئامادەکردن- هەستی هونەری دەنگخۆشیشیان پێوە دیار بوو- مامۆستا عەبدولمونعیم مەزهەر، مامۆستای هونەر و مۆسیقا و سروودیان بوو- کە دەیبینیم پێدەکەنی و دەیگوت ماشەڵڵا کوڕەکانت زۆر چالاکن و لە هونەردا لە ریزی یەکەمن- لە ریزی بەیانیان دەریان دەهێنم، لە پێش قوتابیان سروود و گۆرانی دیکەش دەڵێن و شەرم ناکەن و منیش پتر هانیان دەدەم. بەباوکیان دەچن (فرخ الوز عوام)!

وێنەی (صبا) - فارس الصف - و برای (شۆبان) دەستی لە مل کردووە

وێنەی لەگەڵ ئەم قسانەشمدایە: هەردووک کوڕەکانم لە ڕۆژی ١٩٦٧/٤/ ٢٣ وێنەم گرتن: صبا- میدالی (فارس

الصف)ی لە ملە. شۆبانیش دەستی لە ملی برای کردووە- هەندێ جاریش (شۆبان) لە پێشتر دەبوو، لە پاکی و چالاکی، جا مەدالیەکەی (فارس الصف) بەر شۆبان دەکەوت!

بەڕێوەبەری قوتابخانەیان، مامۆستا کەریم شارەزا و مامۆستاکانیان، تێکڕا زۆر لێیان ڕازی بوون. مامۆستا شارەزای بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان، ئەگەر قوتابیانی بزووتنەوە و چالاکیی ئەدەبی و هونەرییان پیشان بدابایە بەبۆنەکانی ئاهەنگ و گۆبوونەوەکانی (وەلی ئەمر و مامۆستایان)، ئەوا نامەی (سوپاسنامە)ی بۆ دەناردین وەک ئەم نموونەیەی لێرە، لەگەڵ نووسینەکەمدا داماوە.

الى / ولي امر الطالب / شوبان اندريوس

م/ شكر

ادارة مدرسة [illegible] كركوك [illegible]

[illegible] نشاطات ملحوظة [illegible]

[illegible] الموفقية والنجاح في الحياة [illegible]

[illegible]

شوبان اندريوس [illegible]

لە ڕۆژی ٥ی حوزەیران، ئەمساڵ ١٩٦٧ شەڕ دەستی پێ کرد لە نێوان ئیسرائیل و دەوڵەتە عەرەبەکان فڕۆکە جەنگییەکانی ئیسرائیل جارێ یەکسەر هێرشێکی گەورەیان کردە سەر قاهیرە و فڕۆکەخانە سەربازییەکەی میسریان خاپوور کرد و فڕۆکەی ساغیان لێی نەهێشت. بەم جۆرە هێزی ئاسمانی میسر لە سەرەتای جەنگ، پەکی کەوت و نەما! کەچی ئەحمەد سەعیدی بێژەری ڕادیۆی قاهیرە (صوت العرب) بڵاوی دەکردەوە دەیگوت: ئەمڕۆ هێزە بەجەرگەکانی میسر، ٧٠ فڕۆکەی جەنگی ئیسرائیلیان خستە خوارەوە و تێکیان شکاندن! لە ٨ی مانگ- واتا دوای ٣ ڕۆژ، جوولەکە (شەرم لشێخیان) داگیرکرد لە سەحرای (سینا) و نزیکی کەناڵ و شاری سوێس بوون. لە ٩ی مانگ- مانگی حوزەیران- واتا دوای ٦ ڕۆژ، بەفرمانی (مجلس الامن) شەڕ وەستێندرا- و ئیسرائیل لە باکور و باشوور، زەوی عەرەبی زۆر داگیر کرد-ئینجا جەمال عەبدولناسر لە وتەیەکی، لە ڕادیۆی قاهیرە بڵاوی کردەوە و دانی بەوە دانا کە خۆی بەرپرسیارە لەم شەڕە و ئامادەی هەموو جۆرە لێپرسینەوەیە- هەروەها بڕیاری دا کە لەسەر حوکم لاچێ و بەشێوەیەکی کاتی، هەموو مەسئولیاتی حوکمی میسری تەسلیم بە (القائد العام- زکریا محی الدین) کرد...

لە ١٥ی حوزەیران- کوڕەکانم هەردووک بردنە مووسڵ و لە نەخۆشخانەی جمهووری، لە

لای دختـۆرێکی مـیـسری سـونـەتی کردن- زۆر خراپ سونەتی کردن- پێم وابێ ئەمـە یەکـەم جـاری بـوو منداڵ سـونـەت بکات زیـاتـر لـە ١٠ ڕۆژ منالەکـان برینەکـانیان چاک نەبوونەوە هەر لە مـاڵی پلکیان بوون، دەرمـان و دەرزیان لێ دەدان.

هەردوو کوڕەکانم لەگەڵ کیژێکی وەستا ئارتینی خەیات لە غاباتی هەولێر یاری دەکەن. لە ڕاستەوە: شۆبان، سۆسیک کچی وەستا ئارتین، ئینجا سەبای کوڕم پێش ماوەیەک لە سوننەتکردنیان لە مووسڵ. وێنەکە لە نیسانی ١٩٦٦ گیراوە

لە ٢١ی تشرینی یەکـەم- ئەمـسـاڵ- بەڕێز، سـەرۆکی تەندروسـتی هەولێـر (رئيس صحة أربيل) دکـتـۆر عـوسـمـان ئەحـمـەد- لە مـاڵی خـۆی، ئاهەنگێکی زۆر گـەورەی سـازدا و زۆربـەی دخـتـۆرەکـانی شـاری هەولێـر و کـەسـایەتیی نـاسـراوی بانگهـێـشت و کـردبوون- لە هونەرمەندانیش: (کاک حەیدەر، کاک تایەر و من.

لە ماڵی دکتۆر عوسمان- لە شەستەکان لە ڕاستەوە ١- ئەحمەد بەکر خەیات ٢- پارێزەر محەمەد شەهاب دەباغ ٣- دکتۆر عوسمان ئەحمەد ٤- دکتۆر عەبدولڕەزاق شەهاب دەباغ ٥- نزاری کوڕی د. عوسمان

٤ی تشرینی دووەم- تیمێکی وەرزش و یاری تۆپی پێ سەر بە شاری قامیشلۆی سووریا و لەسەر بانگهێشت و دەعوەتی شارەوانی هەولێر، گەیشتنە شارەکە و لە ئێوارەکەی تیپی هەولێر و قامیشلی یارییەکی هاوڕێیانەیان کرد... تەنیا بۆ یەکتر ناسین. بۆیە هەردوولا- بێ گۆڵ لە یەککردن- سەرکەوتوو بوون. بۆ شەو لە ماڵی موتەسەریف عەبدولمونعیم مەسرەف خوانێکی خواردنی گەورەی بۆ هەردوو لا... یاریکەرەکان و ڕاهێنەرەکان و میوانی تریش و ئێمەی هونەرمەندان سێکوچکەکە: حەیدەر- تاهیر و من- خۆشخوان و بولبولی خۆش ئاوازی ئاهەنگەکە بووین- بەم بۆنەشەوە لەگەڵ سێ لە لاعیبەکان، تەعاروفم کرد، ئاسووری بوون. جا باسی خۆیان و وەزعی ئاسووری و کوردیان بۆ دەگێڕامەوە... شەوەکەیان پێ خۆشبوو وێنەیان گرت... و یەکێکیان دەنگیشی خۆش بوو، گۆرانییەکی میللی ئاسوورییانەی بۆ گوتین و من عوودم بۆ لێ دەدا.

شاری قامشلۆی سووریا

# ساڵی ۱۹٦۸

وەستا ئیبراهیمی بەربەر (سەرتاش)، لە دوکانەکەی کە لە ژێر قەڵات بوو، بەرامبەر مەحەلی قۆندەرە فرۆشی باتا- هێنامەماڵەوەمان، لە شۆڕش، چونکە سەری ئەمساڵ دایکم لە لامان بوو، لە حەوشەکەمان لە گەڕەکی شۆڕش. جا چوو لە ناو باخچەکەی لای پشتەوە، کتلی ئاوێک بێنێتە مەتبەخ چایمان بۆ بکا، تومەس عەرد بەستبووی و شەختە سەر ڕەسیفەکەی دەوروپشتی خانووی بەستبوو. دایکم پێی خلیسکا و پشتاوپشت کەوت و پشتی ئازاری پێ گەیی... مامۆژنیشم (یا شمشات) دایکی بنیامین، لە لامان بوو... بەهەزار حاڵ دایکمان هێنایە ژوورەوە. دواتر بردمە نەخۆشخانە و (آشعە)یان بۆ پشتی گرت، سوپاس بۆ خوا، شکانی نەبوو. چووم وەستا براییمی حەلاقم هێنا و (محص)ی کرد و گوتی بمبەوە دوکان، لەزگە هەیە بۆی دەینم... چووین لەزگەکەمان هێنا... پێم وایە قیر و نازانم چیتر، تێکەڵ کردبوون و لە شوێنی کە ئازاری دایکمی دەدا، لەسەر ئێسقانەکانی فەقەرات زۆر چاک بۆی چەسپاند و بەستییەوە- یاخوا دەستت نەڕزی و تەمەنت درێژ بێ بەڕاستی تۆ لە دختۆرەکانی پسپۆڕی شکان و لەگەڵچوون شارەزاتر و دختۆرتری.

مامۆژنم قسەی زۆر خۆشبوو و گاڵتەوگەپی کۆنی وڵاتی خۆیان و بە عەرەبیش لەگەڵ سوهام کە قسەی دەکرد، هەمووومان دەکەوتینە سەر پشت لە پێکەنینان. چونکە ئاخاوتنەکەی بەزمانی عەرەبی، زۆر سەیر بوو... دایکیشم هەموو جار دەیگوت: کچێ بەسە... ناتوانم پێکەنم پشتم دێشی!! ئەو زیاتر نوکتەی ڕێکخراوی

مامۆژنم (شمشات) دایکی بنیامین، خوایان لێ خۆش بێ

خۆی دەهێناوە. جا سەری ساڵمان بەم جۆرە ڕابواردن! نە ئاهەنگ. نە مۆسیقا.

ئەمساڵیش، یەکی مانگ... یەکی ساڵی نوێ/ کانوونی دووەم، ڕێککەوت لەگەڵ یەکی مانگی ڕەمەزان... (ساڵی ١٣٨٧هـ) دوای یەک دوو ڕۆژ بەفر و بارانێکی زۆر باری و هەموو ناوچەکەش... ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گرتەوە و هەر هەموو لایەک سەرما و باران و بەفر بوو (الحمدلله).

لە ١٧ی شوبات- ڕۆژنامەی (التآخي) دووەم جارە، دەرچووەوە و لە دوا لاپەڕەیدا، وتارێکی وەرگێڕاوەی من، کە لە ئینگلیزییەوە تەرجەمەم کردبوو بەناوی (عصر الصفيح) بڵاو کرابووەوە. ئەم وتارەم لەمێژبوو ناردبوو بۆ (التآخي)، بەڵام... حکوومەت دایخست و تا ئەمڕۆ... ١٧ی شوباتی ئەمساڵ، وەک مانگی چواردە دەرچوو و ڕووڕەش و ناحەزان و دوژمنانی کوردی، پەردە لەسەر لادان و چاکتر ناسران!

لە ٥ی مانگی مارت (ئادار)، هەواڵی کوشتنی (حەوێزی مام یەحیا و سمکۆ ئاسەف) و چەند چەکدارێکی تر لەگەڵیان، لە شارۆچکەی کۆیەمان بیست. من زۆرم سوو بووەوە و خەمبار بووم چونکە هەردووک (کاک حەوێز و سمکۆ ) برادەرم بوون و لە هەولێر چاک و خۆشی گەرمیان لەگەڵمان دەکرد کە منیان بدیتبایە- ئیتر ئەوە سیاسەتە! نازانم بڵێم چی!!

بۆ جەژنی قوربانی ئەمساڵ، سەرۆک مەلا مستەفا بارزانی بروسکەیەکی پیرۆزبایی نارد بۆ سەرۆکی کۆمار عەبدولڕەحمان محەمەد عارف و ئەویش وەڵامێکی جوانی دابووەوە و بروسکەکان لە ڕۆژنامەی (التآخي)دا لە ١٢ی ئەم مانگەدا (مارت- ئادار) بڵاو کرانەوە.

لە شەوی ٢٥ی مارت، ئەمساڵ (١٩٦٨)، بەڕێز موتەسەریفی هەولێر، برادەمارن... برادەری هونەرمەندان،. کاک عەبدولمونعیم مەسرەف، ئاهەنگێکی قەشەنگ و ڕێک و جوانی سازدا بۆ ڕێزلێنان لە (لیوا زەکی حوسێن حیلمی) کە لە قیادەی فیرقەی یەکەم بوو لە

دەعوەتەکەی محەمەد حەسەن دزەیی لە یانەی ئازادی- هەولێر شەوی ١٩٦٨/٣/٢٦
١- حەیدەر ٢- باکووری- عوود. ٣- یوسف باکووری کەمانچە. ٤- واحید مەرجان- کەمانچە. ٥- موحسین برای حەیدەر- تەپڵ

هەولێر و گوازترایەوە بۆ شوێنێکی تر هەروەها لەو دانیشتنە خۆشەش، موتەسەریف هاوڕێیەکی ئازیزی خۆی، (دکتۆر بۆغۆص)یشی بانگ کردبوو، جا ئێمەی هونەرمەندانیش لە سەرووی لیستەکە بووین، بەڕێزان: تایەر تۆفیق، حەیدەر، و من بە عوودەوە) شەوێکی مێژوویی بوو- بۆ شەوی دواتریش (بەڕێز کاک محەمەد حەسەن دزەیی) وەک سەرۆکی دەستەی یانەی ئازادی لە شەوی ٣/٢٦ هەموو ئەو کەسانەی دەعوتکردن بۆ یانەی ئازادی... کە ئەو شەوە تەنیا بۆ ئەم مەبەستە یانەکە کرابوو- دیسان ئێمەش هونەرمەندانی ڕەسەن، ئەو شەوەمان ڕازاندەوە بەمۆسیقای خۆش و ئاوازی مەقام و قۆریاتی بەستەی بەجۆش... تا دوا ساتەکانی شەوی خامۆش!!

هەر لەم موناسەبەتەدا، دیسان شەوی ٣/٢٨، بەڕێز کاک محەمەد شەهاب دەباغ، سەرۆکی شارەوانی هەولێر، لە ماڵی خۆی دانیشتنێکی جوانی ڕێکخست و دەعوەتی ژمارەیەک لەو بەڕێزانەی کردە ماڵی... موتەسەریف میوانی (شەرەف) بوو، لەگەڵ کاک جەودەت ئەحمەد ناجی و دکتۆر عەبدولڕەزاق دەباغ- برای خاوەن دەعوەت - و کاک محەمەد حەسەن دزەیی و بەڕێوەبەری پۆلیس و ژمارەیەکی تر لە هەڤاڵانی و برادەر و دۆستانی و من و تایەر تۆفیق و حەیدەریش میوانی هونەری ئەو دانیشتنانە بووین... چ

وەک خۆشخوان و دەنگبێژ، و چ وەک مۆسیقاژەن و ئاوازی ناسکی عوود و دنیای گۆرانی کوردی و عەرەبی و تورکی: پەحا!! چ خۆشە ئەو دنیایە... و چەند خۆشترە ئەگەر شار و دەوروپشت و ولات بەگشتی لە کەشوهەوای ئاشتی و هێمنی و سەرفرازی و ئازادیدا تەمەن بڕوا و گیان و ماڵ و حاڵ و دەروون... هەموو ئاسایی و سروشتی، ژیان بەسەر چێ خۆشخوانیش پێشەنگی ژیان بێ!

ئەو شەوەش کە لە ماڵی هاوڕێمان و خۆشەویستی هەموو لایەک کاک محەمەد شەهاب دەباغ بووین. لەگەڵ چریکەی تایەر و حەیدەر و عوودی من، ڕەشەبا و بارانی توندوتیژیش، لە دەرەوە ئاهەنگ و بەزمی خۆیان بەرپا کردبوو! چەند جارێ تەزووی کارەبا ئەدەما و لە تاریکی دەماینەوە... بەڵام ئاهەنگ و گۆرانی بەردەوام دەبوو: کاک محەمەد، فانۆس و چەند مۆمێکی هێنا و پێیکردن! جا کاک عەبدولمونعم موتەسەریف و میوانەکان پێیان خۆشتر بوو، مۆسیقا و گۆرانی، لەبەر ڕووناکی فانۆس و مۆم... تا بەیانی لەگەڵ دەنگی خۆشخوانی ڕەسەن و بەتام...

مارت لۆثەر کینگ، قەشەیەکی ئەمەریکا، لە پێست ڕەشەکانی (زنوج)ی ئەو ولاتە بوو کاتێ لە ٥ی نیسان، ئەمساڵ، لە ئوتێلێک دابەزیبوو، لە شاری (مەمفیس)، تیرۆر کرا و بەدەستی پیاوێکی پێست سپی کوژرا... و هەرایەک ناوە کە بووە نارەزاییی ملیۆنەها کەس لە هەموو جیهاندا، ئەو تاوانە دڕندانەیان ئیدانە دەکرد، بە (پاپا)شەوە!

لە ناوچەی هەولێریش، لە بۆسەیەک، شێخ حەنەش و چەند چەکدارێکی کوژران، لە ١٣ی نیسان و بووە هۆی ڕاگەیاندنی (منع التجول) لە شاری هەولێر! چەند کەسێکیش دەستگیر کران...

ژیان هەر بەردەوامە! بۆ من، کە لە چوارچێوەی هونەریدا تەمەنم بەرێگەی خۆیدا دەڕوات... هەرچی ڕوودەدا و هەواڵی ناخۆش و کوشتن و تەنگاوکردنی خەڵک و حەپسکردن و ئەزیەتدانی مرۆڤ، زۆر کاری خراپ لەسەر دەروونم و جەستە و مێشکم چونکە لە دوای ئینقیلابە ڕەش و نامەردانەکەی بەعسی شۆڤێن و بۆگەن، منیش و خێزانم و ئەندامانی ماڵەوەم زۆرم چێژت هەر لە حەپسکردنی خێزانم و ڕاوەدوونانی خۆم لە لایەن ئەو موتەسەریفە بەربەریەی ئەوسا... مەبەستم (بەدرەدین عەلی) ناپەسندە، هەروەها پەرتوبڵاوی هۆش و فیکرم لەبەر منداڵەکانم کە لە تەمەنی بەر مەمکان بوون کە دایکیان حەپس کرا، و... و نا دروستی تەن و سیحەتی دایک و باوکم... و تەنگەژیانی ڕۆژانەی برا

و خوشک و خاووخێش! ئەمانە زۆر تەئسیریان تێ کردبووم ئەو کاتە...! بەڵام من زۆر بەتەحەمول و بەسەبرم! فەلسەفەی ژیانم هەمیشە ئەوەیە: تەنگانە و ناخۆشی هەر هەیە لە ژیانی هەموو کەسێ! بەڵام دوای تەنگانەش ئینجا خۆشی و ڕەحەتیش دێتەوە، زوو یا درەنگ!

جا لەو دوو سێ مانگەدا، ددیەها بۆنە و موناسەبەی خۆشی و ئیسراحەتی هاتەوە و گەش بوومەوە دیسان کەوتمەوە سەر ژیانی ناوەندی هونەرمەندی و چاک و خۆش برادەران و دۆستانم ئەگەرچیش یەک شت هەبوو نەمدەتوانی زاڵ بم بەسەریدا و لە بیر خۆمی بیەمەوە! ئەویش ڕوخسار و چاوی کیژۆڵە خۆشەویستەکەی ژیانی گەنجایەتیم... کە لە دەستم چوو: نەجوا... ئاخ نەجوا... لە کوێی ئێستا!؟

لە ٢٨ی نیسان، کاک قادر جێمسی میواندارییەکی تێروتەسەلی بۆ کردین، بەماڵەوە چووینە ماڵیان لە گەڕەکی شۆڕش- بەرامبەر بەنزینخانەی شۆڕش.

لە ١ی مایس مامۆستا مەجید ئەحمەد ئاسنگەری شاعیر و هاوڕێی تەمەنی قوتابخانە و کۆلێژ و وەزیفەم، لە ماڵی خۆیان دانیشتنێکی جوانی بۆ ڕێک خستین... لەگەڵ یەک دوو خێزانی تر، برایانە و خزمان بۆی دانیشتین و عوود و شیعر و بیرەوەری... زادی ڕابواردن ئەو شەوەمان بوون... ماڵی مەتی ئامۆزام و پێم وایە ماڵی مامۆستا (مونیب)یش ئامادە و دەعوەت کرابوون.

مەجید ئەحمەد و مامۆستا نەجیب (مامۆستای ڕیازیات) و من، لە سەیرانێک، لە (مدمیف) بۆمان گیراوە لە شوباتی ١٩٦٥دا

لە ٥ی مایس، لە ماڵی مامۆستا مەتی ئامۆزام، بەبۆنەی لە دایکبوونی (نۆفەل)ی کوڕی، لە ماڵی خۆیان... مەجلیسێکی میواندارى جوانی سازدا و بانگهێشت کراین لەگەڵ خزمان و دۆستانی تر. ئیتر ئا بەم جۆرە ڕۆژانی ژیان دەڕن... تاوێک خۆش، تاوێک ناخۆش! مرۆڤ دەبێ خاوەن سەبر بێ... ئارام بێ چونکە هەوراز نشێوی لە دوایە، ناخۆشی خۆشی لە دوا هەر دێ. (أن مع العسر يسرا).

مامۆستای دێرین مەعرووف عەبدوڵڵا بووبووە یاریدەدەری بەڕێوەبەری (مەعاریف) لە ٦ی مایسدا، لە ناو ترومبێلەکەی، چەند گوللەیەکیان پێوەنا- مامۆستایەک لەگەڵیدا بوو کوژرا، و خۆی بریندار بوو.

لە ٨ی مایسدا، ڕۆژنامەی (التآخي) دیسان داخرایەوە لە لایەن حکوومەتەوە و بووە مایەی ناخۆشی و ناڕەزاییی خوێنەرانی و هاوولاتیان، بەتێکڕایی. هەر بۆیە، دوو وەزیری کورد لە وەزارەتی حکوومەتی عێراق دەرچوون و ئیستیقالەیان دا. یەکێکیان وەزیری شارەوانی (بلدیات) بوو کاک ئیحسان شێرزاد و ئەوی تر (کاک..............)

لە شەوی ٧/١١، ئێمە- من و خێزانم و منداڵەکانم چووینە بەغدا بەبۆنەی نیشان و شەوی خەنەدانانی (عاصم)ی خاڵی منداڵانم و دەزگیرانەکەی، وەک عادەتی مووسڵاوییەکان. شەوێکی زۆر خۆشمان ڕابوارد لە باخچەی ماڵی زاوا، لە شارع فەلەستین و هەمووی خواردن و گۆرانی و مۆسیقا بوو... و بۆ عەسرێی ڕۆژی دوایی ٧/١٢ لە کەنیسە (عقد قران)یان کرا و (ماری) کە خزمێکیان بوو بووە هاوسەری... واتا خاڵۆژنی منداڵەکان و لە ١٤ی تەمووز، نیشانی (مونتەها) بوو، پلکی منداڵەکان.

نموذج رقم (٨٠)

مصلحة البريد والبرق والتلفون

برقية واردة داخلية

نوع البرقية

وقت تسليمها

وصلت في الساعة ١٦ دقيقة

من بغداد حسابت من قبل

التعليمات الادارية — تاريخ الاصدار ٧/٢

# کۆتایی ١٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨

ئەوە بوو، بەیانی ڕۆژی ١٧ی تەمموز، مەلا بانگدان بەترومبێلەکەی خۆم (ڤۆکسهۆل)ەکە دەگەڕاینەوە هەولێر دوای ئەو چەند شەوە خۆشەی لەگەڵ خزمان و دۆستان لە بەغدا بەسەرمان بردن- کە لە ناوچەی گردەکانی (چیای) حەمرین بەسەر کەوتین و کەوتینە سەر ڕێگای ڕاست، بەرەو تووزخورماتوو، من کەیفخۆش بووم و گۆرانیم بۆ منداڵەکانم دەگوت و ئەوان پێم پێ دەکەنین و چەپڵەیان لێ دەدا، لەپڕ (قایشی) پانکەی مەکینەی ترومبێلەکەم پسا... کەمێک... ڕۆیشتم، بەڵام مەکینە کوڵاندی. لەوێ وەستام و چ قایشی یەدەگ (سپێرم) نەبوو چ بکەم؟ لەو کاتە، ترومبێلەک لە بەغداوە دەهات، لە تەنیشتم ستۆپی گرت و وەستا. خاوەنەکەی دابەزی و سەلام و تۆقەمان کرد، دەرچوو برادەرێکی خۆشەویستم بوو، کە لە کەرکووک زەمانێکی زۆرمان لە دانشتن و ئاهەنگی خۆش، لەگەڵ برادەرانی کەرکووکی تر، پێکەوەمان ڕابوارد بوو، ئەوەش کاک عەلائەدینی سەرۆکی (المحكمة الكبري) بوو لە کەرکووک، دوای چاک و خۆشی پرسی ڕادیۆت نەکردووتەوە؟ گوتم ناوەڵڵا، من خۆم گۆرانیم دەگوت و منداڵەکانم (کۆرس)م بوون. بۆ؟ چ هەیە؟- فەرمووی: ئو...هوو! هەرایە لە بەغدا: وەتی: ڕاوەستە، وا بزانم قایشێکی (مستعمل) هەیە لە سندووقەکەی ترومبێلەکەم. قایشەکەی دامێ و بەکارم هێنا... ئەگەرچی کەمێک گەورەتر بوو... ئیتر خواحافیزی لێمان کرد و ئەو ڕۆیی و من قایشەکەم لە پانکەکە خست و ڕۆیشتین... بەڵام زۆر بەزەحمەت گەیشتینە تووزخورماتوو... چونکە قایشەکە فراوان بوو، پانکەکە (بۆشی) دەکرد... و مەکینە دەکوڵا. دەبوایە هەرجارە لە شوێنێک کە (ئاو) هەبوایە، بوەستم... مەکینەکە سارد کەمەوە و ئاوی ساردی تێکەم. بەڵام ڕادیۆشم کردەوە و هەواڵەکانی بەناو (شۆڕشی ١٧ی تەمموز)یان دەخوێندەوە. (بەیان)ی ژمارەی ٤ دەخوێندرایەوە کە دەڵێ: ئەمە شۆڕشێکی (سپی)یە- واتا خوێنی تێدا نەڕژاوە. لە تووز قایشێکم کڕی و بەغار چووینە کەرکووک- سەیرمان کرد (منع التجول)ە و لێرە و لەوێ، ڕامان دەگرن و پرسیا دەکەن: لە بەغدا وەزع چۆن بوو؟ وتم: بەخوا ئێمە لە(شارع فلسطين) بووین و بەیانی زوو دەرچووین، یەک عەسکەریشمان نەدیت و جادە جارێ چۆڵ

موحسین دزەیی

بوو... تاکە تاکە خەڵک لەسەر شەقامەکان بۆ کار و کاسبی خۆیان دەچوون. ترومبێل و دەبابەمان نەدیت تا لە سنووری شاری بەغداش دەرچووین، وەزعێکی زۆر ئاسایی بووە گوێمان لە تەقەش نەبووە. ئەو شەوە لە کەرکووک ماینەوە، لە ماڵە خزمان. بەیانی ١٨ی مانگ بەرێ کەوتین بۆ هەولێر- هەولێریش چی پێوەدیار نەبوو، تا گەیشتینە ماڵی خۆیان لە نزیک فولکەی (قايمقامية القضاء) بوو. کە نزیک نەخۆشخانەی (جمهوري)یە ئیتر رادیۆمان کردەوە لە هەواڵەکانی دیاری کرا کەوا (ئەحمەد حەسەن بەکر) هەڵبژێردراوە بۆ سەرۆک کۆماری و حەردان تکریتی کراوە بە (رئيس أركان الجيش) و لە ١٩ی مانگ وەزارەتی نوێ دامەزرا... عەبدولڕەزاق نایف کرا بە سەرۆکی وەزیران و یەک لە وەزیرەکانیش، بەڕێز کاک موحسین دزەیی بوو کرا بەوەزیری (إعمار الشمال)- واتا وەزیری ئاوەدانکردنەوەی کوردستان.

سەرۆک کۆمار
ئەحمەد حەسەن بەکر

بەڕاستی عێراقییەکانیش، ماندوو بووبوون، لە ئینقیلابێک بۆ ئینقلابێکی تر و هەر لە ساڵی ١٩٥٨ەوە، هەزارەها کەس هاتنە کوشتن، هەر جارەش کە تاقمێکی بێ ئەصلوفەصل دەهاتن، دەیانوت ئەمە شۆڕشی عێراقە دژی جەردە و دز و ئیرهابی و... و...، ئینجا کە خۆیان دەچەسپاند، ئەوان دڕندانەتر دەکەوتنە هەوڵ و کۆشش بۆ کوشتنی زۆرترین خەڵکی کە لەگەڵ بیروباوەڕی نەگریسی ئەوان نەبوونایە و دزینی هەرچی پارە و پوولی حکوومەت هەبوو، هەر وەزیرە و بۆ خۆی لێی دەدا و فەسالدی مادی و ئەخلاقی و بەدڕەوشتی لەولا بوەستێ بۆیە کەس دڵی بەو گۆڕانکارییەش نەبوو. کەس گوێی نەدانێ چی دەڵێن و چی دەکەن و نەخشە و پلانیان بۆ خۆشکردنی بارودۆخی وڵات و گوزەرانی خەڵک چی بوو؟ بڕوایان نەدەکرد. چونکە تاقمەکەیان چاک دەناسین و دەیانزانی (حزبی بەعس) حزبێکە بۆ خەڵک نییە! هەموو ئەندامەکانی سەرکردایەتیەکەیان درۆزن و ڕووڕەشن لە بەرامبەر میللەتی عێراق! هەرچی خراپە پێیان بکرێ، دەیکەن و هەرچی بیانەوێ بیڵێن. دەیڵێن! خەڵکەکە زۆر

ئاسایی بوون... هەریەک دەچووە دوکانی خۆی، یان بۆ دائیرەی خۆی بەبێ دەنگی، یان بۆ سەر ئیش و کار و کێڵگەی و جووتیاری خۆی... ! هەر دوای چەند ڕۆژێک، لە ٣٠ی مانگدا (٨/٣٠) جارێکی تر هەمان تاقمەکە ئاژاوەیان نایەوە هەر لە ناو خۆیانەوە... بزووتنەوەیەکی کە ناویان لێنا (حركة تصحيحية)- واتە (هەنگاوی ڕاستکردنەوە) چەند وەزیرێکیان لابرد و دوور خستەوە، گوایا ئەوانە، لە ناو خۆیاندا خەریکی پیلانێک بوون بۆ گۆڕانکارییەکی دڕندانە... بۆ دوورخستنەوەی ئەحمەد حەسەن بەکر و تاقمەکەی. جا جەماعەتەکەی سەر بە ئەحمەد حەسەن بەکر بەیانێکیان بڵاو کردەوە لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن (تێبینی: ئەو تاقمە ئاژاوەچییانە هیوایەتیان بەیانات دەرکردن بوو- (باکووری)- تێیدا هاتبوو: (...إن ثورة السابع عشر من تموز التي إختمرت في ضمير هذا الشعب... لن تستسلم لقوي الثورة المضادة و لن تلين أمام الاطماع الفردية التي أرادت أستبدال حكم الجماهير بحكم الافراد...) ئینجا سێ بڕیاری دەرکردنی سێ کەس درا کە ئەوانە بوون: ١- دوور خستنەوەی (عبدالرزاق النايف والفريق أبراهيم عبدالرحمن الداود من عضوية مجلس قيادة الثورة وأحالتهما علي التقاعة. ٢- إقالة السيد عبدالرزاق النايف. ٣- تعيين السيد أحمد حسن البكر، رئيسا الجمهورية: قائدا عاما للقوات المسلحة.

برای دووەمم (کاک تیماتیۆس) ئەویش لە ١٠ی ئابی ئەمساڵ کچێکی ئاسووری خەڵکی (سلێمانی)مان بۆ خواست، باوکی ناوی (عودیشۆ) کۆنە عەسکەری (لیڤی) ئینگلیزی بوو... زۆر پاک و خاوێن و ڕەوشتی ئینگلیزیانە لێ ڕاهاتبوو... کچەکەی ناوی (مادلین) بوو... ئینجا کە خۆمان ڕێکخست، ٤ی ئەیلوول هەموومان چووینەوە سلێمانی... بۆ ماڵی بووک و هێنامانە ماڵی هونەرمەندی خزمان، کاک ولیەم کوری مام یۆخەنا. نیوەڕۆمان لە ماڵیان خوارد و ئینجا کەوتینە

زاوا (طیمەی برام) و بووک (مادلین- ١٩٦٨/٩/٥ هەولێر

ڕێ بۆ کەرکووک و بۆ هەولێر- شەوی پێنجشەممە ٥ی ئەیلوول لە باخچەکەی حەوشەی ئێمە، لە خانووەکەی سلێمان خدر بووین، ئاهەنگی برای ئازیزم تیمە و مادلین- مان کرد و زۆر خۆش بوو... خزم و دۆست هەموو ئامادە بوون... لە مووسڵ و کەرکووک و سلێمانی... جگە لەوانی لە هەولێرن بەئەسڵ... شەوێکی خۆشمان بەسەر برد بەعوود و گۆرانی و دەروجیرانیش هەلهەلەیان لێ دەدا و شادبوون لەگەڵماندا! کەواتە لەو کاتەی ئەفسەرە تەزویرەکان، وەک سەگ، شەڕیان لەسەر لاشەی حکوومەت دەکرد لە بەغدا، خەڵک گوێشیان نەدەدانێ و خەریکی ئیش و کار و ڕابواردن و ژنهێنان بوون، لە شوێنی تر لەو ولاتە!

من زۆر بەکورتی، بە چەند دێرێک باسی ئەو ڕوودانە دەکەم کە لەگەڵیاندا ژیاوم و وەک شایەت حاڵێک، شاهیدی ئەو خۆشی و ناخۆشی میللەتەکەم بوویم و بینیومە بەچاوی خۆم... بۆیە وەک خۆیان، چۆن ڕوویان داوە ئاوا وەسفی حاڵەتەکان دەکەم! کەچی کتێب زۆربەیان کە لە زەمانی بەعسییەکان... لە ١٩٦٣ بەملاوە، کە باسی مێژووی عێراق دەکەن، زۆر درۆ و دەلەسە دەکەن دژی کورد و کوردستان و سەرکردەکان دەنووسن و باس دەکەن ئینجا هەنجەت و ئەسباب و تاوانی بەدرۆش دەدەنە پاڵیان... بەڵێ من ئەوەی دیومە دەنووسم، لەگەڵ ژیانی خۆم و خێزانم و برادەرانی کە پێکەوە ژیانمان بەسەر بردووە و تا ئەمڕۆش... ئەوانە دەنووسم!

## پێشبڕکێی ئەمەریکا و یەکێتیی سۆڤیەت، لە ناردنی کەشتیی ئاسمانی بۆ ئاسمان و پشکنینی ئاسمان و مانگ و ئەستێرەکان

بۆ نموونە: سۆڤیەتەکان، ئێزگەیەکی ئاسمانی (محطة فضائية)یان ناردبوو لە مانگی ئەیلوول، تاکو لە دەورەی مانگ بسووڕێ و خول بخوات! جا دوای تەواوکردنی ئەم کارەی بەشێوەیەکی چاک و سەرکەوتووانە، لە ۲۲ی ئەیلوول، بەئەسپایی و سەلامەتی دابەزی و لەسەر عەرد نیشتەوە.

پاش ڕووسەکان، ئەمەریکا (ئەپۆلۆ)یان فڕێ دایە ئاسمان و سێ کەس پێیان دەڵێن (رواد الفضاء) لە کەشتییەکەدابوون بەسەرپەرشتی یاخود سەرۆکایەتی (وۆلتەر شیرا) لە ۱۱ی تشرینی یەکەم. دوای سووڕانەوەی لە دەورەی گۆی زەوی (الكرة الارضية)، بەسەلامەتی و هێمنی، لە ۲۲ی هەمان مانگ، لەسەر زەوی نیشتەوە.

ئینجا ڕووسەکان، دیسان، لە ۲٦ی تشرینی یەکەم، گەشتەکی بۆشایی (مركبة فضائية)یان هاوێشتە دەرەوەی گۆی زەوی و پیاوێکی تێدابوو. ئەو ئێزگە ئاسمانییە، کامێرای تیادا بوو، دەها و سەدەها وێنەی جۆراوجۆری زەوی گرت و ناردنییە مەحەتەکەی سەر زەوی لە وڵاتی یەکیەتیی سۆڤیەت.

سەبارەت بە وەزع و حاڵەتی شار و ڕەحەتی هاووڵاتیان زۆر شلۆق و نارەحەت و ناخۆش بوو. هەر گوێمان لێ دەبوو دەڵێن: "ئەمڕۆ لە ناو فلان جادە کەسێک کوژا" یان "لەسەر فلانە شەقام دوو کەس کوژران..." ئیتر ترس کەوتە دڵی خەڵکەوە... لەگەڵ مەغریب هاتوچۆ نەدەما! هەرکەسە و دەچووەوە ماڵ و دەرگا و پەنجەرەیان دادەخست! و ئینجا تەق و تۆقی تفەنگ، دەمانچە، کلاشینکۆف دەستی پێ دەکرد! نەماندەزانی ئەوە کێن ئەوانەی گوللە و تەقە داوێن و بۆ کوێ! پۆلیسن؟

دزن؟ پێشمەرگەن هاتوونەتە ناو شار؟!

سینەماکان عەسران فیلمیان نیشان دەدا- و زوو دەرگایان دادەخست و دەچوونەوە ماڵەوە. بڕوا بکەن شەوێک خێزانەکەم وەزعی زۆر خراپ بوو! نەساغ بوو- زگی و گەدەی

دێشا و هاواری دەکرد، بەڵام نەمان وێرا بیبەینە لای دختۆرێک یا نەخۆشخانە، ئەوەندە تەقە هەبوو لە دەرەوە.

لەبەرئەوەش کە هەندێکمان لێ ڕاهاتبووین شەوان هەر دەبوایە لە شوێنێک ڕابوێرین، لەگەڵ بەرێز مەلا حەویز ئاغای کۆیە، کە ئەوانیش بە ماڵەوە هاتبوونە هەولێر و خانووێکیان لە پشت سینەمای سەلاحەدین نازانم بەکرێ گرتبوو یان کڕیبوویان، تێدا نیشتەجێ بوون و هەروەها لەگەڵ برادەری خۆشەویستم کاک محەممەد مەجید و یەک دوو کەسی دراوسێی تر ڕێک کەوتین کە هەر شەوە لە ماڵی یەکێکمان، بەنۆرە، دانیشین و شەوەکە بەیاریی (کۆنکان) کە من زۆر باشیشم نەدەزانی و بەخواردن و میوە... بەڕێ کەین.

شەوی ٢٥ی تشرینی دووەم نۆرە- کەوتە سەر من و هاتنە لام و دەستمان کرد بەخواردنی میوە کە ئامادەم کردبوو و لەگەڵ خواردنەکەش، مێز و کورسیمان لە ناوەڕاستی ژوورەکە دانابوو، دەستمان کرد بەکۆنکان و لە دەرەوەش برادەرانی! هەموو شەو، دەستیان کرد بە تەقە، ئەوە لە جیاتی (مۆسیقای تصویری) بوو! هاهاها!

هەندێ شەو برسیمان دەبوو هێلکەوڕۆنیان بۆ دەکردین، یازدە هێلکە بەروبعێک دینار ٢٥٠ فلس بوو. بۆیە هێلکەمان دایم هەبوو. ئێمە- ماڵ و منداڵ و خۆم- هەموومان، خواردنی بەیانیانمان هەر هێلکەوڕۆنە... لەگەڵ پارچە تەماتەی لە ڕۆن سوور کراوە جا هەموو بەیانییەک بای ڕوبعەدینارێک هێلکەمان دەخوارد!!

شەوانی پێنجشەممە لەسەر هەینی، ئەگەر لە ماڵێک یا لە یانەیەک یاسەیرانێک دەعوەت نەکرابم، ئەوا لە ماڵەوە تەرتیبات و مەززە و مەشروب ئامادە دەکرێ، خۆم و خزمێک یا کەسێکی میوان یا هەر بەتەنیا، بۆی دادەنیشم تا ئاهەنگی ئوم کەلسووم دەست پێ دەکات ئەوەی بە عادەتی، یەکەم پێنجشەممەی دوای هەر سەرەمانگێک، ئاهەنگی ڕاستەوخۆی ئوم کەلسووم لە سەعات ١٠ یاخود ١١ی شەو دەست پێ دەکات. هەر جارەش گۆرانییەکی نوێ لەگەڵ دوو گۆرانیی کۆنی خۆی پێشکێش دەکات، بۆ مێژووی دەست پێکردنی گۆرانی (هذة لیلتي) دەڵێم ئەوە لە شەوی پێنجشەممەی ڕێکەوتی ٥ی کانوونی یەکەم، بۆ یەکەم جار ئەم گۆرانییەی وت کە لە شیعری شاعیرێکی لبنانییە ناوی (جورج جەرداق)ە و ئاوازی (محەممەد عەبدولوەهاب)ە هەزار هەزار سڵاو لە گیانی پاکیان بێ.

# ساڵی ١٩٦٩

هێشتان لە قوتابخانەی (متوسطة الجمهورية)، بەرامبەر (قائمقامية القضاء) لە هەولێر، مامۆستام و زمانی ئینگلیزی فێری قوتابیان دەکەم و مامۆستایەکی تریش لەگەڵمدایە، مامۆستا عیرفان سەعید، کە ئەویش ئینگلیزی دەڵێتەوە. ماڵیشم نزیکە لە خانووێکین خاوەنەکەی ناوی فازڵ-ە و لەسەر جادەکەی کە دەنۆڕێتە قوتابخانەی مستەوفی- (ئیمڕۆ خانووەکە زەمانێک هاوڕێی قوتابیاتیم لە کۆیە، کاک مستەفا عەبدولکەریم کاری چاکردنی تەلەڤزیۆنی تێدا دەکرد- ساڵی ٢٠٠٥) هەروەها لە تەنیشتی (ئەمڕۆ، دیسان

مامۆستایانی قوتابخانەی ناوەندیی کۆماری (متوسطة الجمهورية) هەولێر. ڕۆژێکی مانگی کانوونی دووەم ساڵی ١٩٧٠ گیراوە.

میلاکی قوتابخانەکەمان، ئەو مامۆستایانە بوون: لە لای چەپی وێنەکەوە ڕاوەستاوەکان: ١- مامۆستا وەلی حەسەن ڕەزا- وانەی ئیجتیماعیات ٢- مامۆستا زاهیر عەبدولڕەزاق- کوردی ٣- مامۆستا باکووری - ئینگلیزی ٤- مامۆستا عیرفان سەعید- ئینگلیزی ٥- مامۆستا سەلاح ئیسماعیل حەسەن- تەبیعیات ٦- مامۆستا سەردار جەمیل- ریازیات. ئەوی لە پێشەوە، لەسەر چۆکان چۆکی داوەتەوە: کاک ئیحسان نوورەدین کاتبی مەکتەب بوو

هەمان ساڵ ٢٠٠٥ و پێشتریش) دائرەی (تخطیط)ی تێدایە. خانووەکە بەرزە لە شەقامەکەوە و بە سێ چوار پلیکانە، بەسەر دەکەوتین.

یەکیەتیی سۆڤیەت، لە ١٤ی ئەم مانگە (کانوونی دووەمی ئەمساڵە ١٩٦٩) کەشتییەکی ئاسمانی بەناوی سیووز ٤ی ناردە ئاسمانی و یەک رائیدی تێدایە- رۆژی دواتریش، ١٥ی مانگ، سیووز ٥ی فڕێ دایەوە بۆشاییی ئاسمان سێ کەس تێدابوو و لە پلان و نەخشەکەشدا هاتبوو کەوا هەردوو کەشتییەکان لە ئاسمان، بەیەک بگەن ئەوەبوو لەگەڵ یەک، یەکتریان گرتەوە و دوو کەشتییەوانی سیووز ٥ چوونە ناو سیووز ٤ و ژمارەی کەشتییەوانەکان لە ناویا بوونە ٣ سێ کەس، و لە سیووز ٥ یەک کەس مایەوە جا لە ١٧ی مانگ پاش دوو رۆژ سووڕان لە ئاسماندا، کەشتی ژمارە ٤ دابەزی و بەسەلامەتی گەڕایەوە و سێ کەسەکەی لەناویدا بوون هەموو سەلامەت بوون. بۆ رۆژی دواییش ١٨ی ١ ئینجا (سیوز ٥ )یش هاتەوە خوار و بەسەلامەتی لەسەر زەوی نیشتەوە! ئەمەیە زانست!

دوای ئەوەی بەڕێز عەبدولمونعیم مەسرەف- موتەسەریف- چووەوە بەغدا، موتەسەرفێکی نوێمان بۆ هات، ئەفسەرێکی کوردی سلێمانی ناوی حەمەدەمین فەرەجە. لەم وێنەیەدا، دووەم کەسە لە لای چەپەوە، سەیری وێنەکانی ئەم پێشەنگەیە دەکات کە خۆی لە ساڵی ١٩٦٩ لە هەولێر کردیەوە

ئەگەر وڵات هێمن بێ، لێپرسراوی دڵپاک و خەمخۆری میللەت بێ، هەوڵی بڵاوکردنەوەی عیلم و فەن و رۆشنبیری بێ، دوور بێ لە دڵڕەقی و ئەزبەتدانی هاووڵاتی خۆی و دزینی لوقمەی خواردنی... ئەوا ئەو وڵاتە، بەم جۆرە سەربەرز دەبێ، زانست، هونەر، رۆشنبیری، سیاسەتی پاک و بێ گەرد بۆ بەرژەوەندی خودی وڵات و گەل بەرپا بکرێ. ئەوا هەموو شتێک دەتوانرێ بکرێ بۆ نیشتمان و بۆ جیهانیش بەگشتی! دەستان خۆش، قەلبتان ساغ ئەی زانایانی رووسیا و ئەمەریکا! سەرۆکەکانیان هەر بژین و خوا هەموو لایەکتان بپارێزی... خزمەتی کۆمەڵی خۆتان و جیهانتان لە ئەستۆدایە، قوربان!

لە قوتابخانەکەمان هەموو مامۆستایەکان چالاکانە ئەرکی خۆیان بەجێ دەهێنا و ئیدارە زۆر لێیان ڕازی بوو... بۆیە بڕیارمان دابوو هەر مامۆستایە (ترفیع) بکات، ئەو پارە زیادەی یەکەم مووچە دەبێ خەرج بکات بۆ دەستەی مامۆستا و دەعوەتێکی خواردنی نیوەڕۆمان بکات هەر لە قوتابخانە یا ئەگەر دەرەوە خۆش بوو، ئەوا دەچینە دەرەوە دەیکەینە سەیران. جا یەک دوو نموونە دەهێنمەوە- لە مانگی کانوونی دووەم هەردوو مامۆستای کۆمەلایەتی (تاریخ)- مامۆستا زوبێر بیلال و مامۆستا وەلی حەسەن ڕەزا تەرفیعیان هات و خواردنێکی زۆر و خۆشیان بۆ کردین، دوای دەوام نۆشی گیانمان کرد- سوپاس! هەروەها لە ١/٢٢، مامۆستا سامی ئەسعەد، مامۆستای وەرزش تەرفیع کرا. ئەوە بوو ڕای سپارد، تەشریبێکی گۆشتی زۆر نایاب بۆمان لێ نرا و... هەر لە ژووری مامۆستایان، دوای دەوام و ڕۆیشتنی قوتابیان، لەسەر سفرە لێی دانیشتین و قۆلمان لێ هەلکرد و خۆشترین تەشریبمان خوارد لەگەل خۆشترین نوکتە و پێکەنین. سوپاس کاک سامی ئەسعەد!

لە ١/٢٨ ئەمسال دیسان، نۆرە هاتە سەر من.. مامۆستاکان حەزیان لە (کباب کوبسنجق) بوو. گوتیان ئەوە دۆستی تۆیە و (کۆیباتی و خۆیباتی) کەبابی باشت بۆ دەبرژێنێ! بووە پێکەنین... جا ناردم یەک سینی کەبابی کۆیەمان بۆ هات لە لای کاک عەبدوللای حەمەدەمین کەبابچی بەناوبانگ... و کەوتینە سەر سینییەکە، بێ ئێوە... خۆش، وەللا نۆشمان کرد و هەر قرپە بوو دەهاتەوە... چونکە تووری زۆر و پیازی زۆری لەگەل کەبابەکە دانابوو! خواتان لێ خۆش بێ وەستا حەمەدەمینی وەستای کەباب و قسەی خۆش و کوڕەکەت کاک عەبدوللا.

لە ١ی شوباتی ئەمسال، دەنگخۆش و قسەخۆش و هونەرمەندی میللی ناسراوی هەولێری، کاک حەیدەر عەبدولڕەحمان، ناسراو بە حەیدەر بەقال... و حەیدەرە کەچەل... دەعوەتێکی گەورەی نایابی لە مالی خۆی کردین، کە لە بەرامبەر (بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی بوو- ئێستا خانووەکەی بوویتە دوکانی کۆپیکردنی و فرۆشتنی ئامێری مۆسیقا و شتی تر) لەسەر شەرەفی دۆستی هەمووان، بەڕێوەبەری پۆلیس و مەرد و بەجەرگ، کاک حوسێن شێروانی و ژمارەیەک لە برادەر و هونەردۆست و لێپرسراوانی حکوومەت و میوانە دۆستە هەمیشەییەکانی وەک دکتۆر عەبدولڕەزاق شەهاب و ئاگۆبی ئەرمەنی و... هەروەها نائیبی موتەسەریفی هەولێر، بەڕێز (السید المفتي- أبو شهاب)... من و تایەر تۆفیق و عوودەکەشم... ئامادە بووین. جا کاک حوسێن شێروانی، میوانی (فەخری)مان، درەنگ

وەستا حەمەدەمین شێخ ساڵحی کەبابچی، وەستایەکی بەناوبانگی کەباب برژاندن بوو، لە ناو بازاڕی سەرەکی کۆیە لە ساڵی ١٩٠٧ لە کۆیە هاتبـــــووە دنیاوە لە ١٩٧٣/٩/١٠ لە هەولێر کۆچی دوایی کرد، خوا لێی خۆش بێ. جا کوڕەکەی (کاک عەبدوڵڵا لە هەولێر وەستایانە- وەک باوکی- دوکانی کەبابی کۆیسنجقی بەڕێوە دەبرد- هەزار سڵاو لە گیانی پاکیان بێت

هات و هەر لە دەرگــاوە بەپێکەنین هاتە ژوورەوە و دوای ســڵاو وتی: «کــاک حــەیدەر و ئازیزان بمبوورن... کـەمـێـک دواکـەوتین لە مـەوعـیـد». حـەیدەر و جـەمـاعـەت پرسـیـیـان: خێربوو؟ کاک حوسێن دیسان پێکەنی و وتی: کوڕە بڵێم چی! هەندێ خێڕوو و هەتیوچەی کۆڵانان، تەقەیان لێمان کرد و هەڵاتین ڕاومان نان بەڵام زۆر بەدوایان نەکەوتین. خۆیان لە کونان شاردەوە دنیا شەوە نامەوێ ماڵ و منداڵ و خێزانان، بەو شەوە تووشی نارەحەتی بن! ئیتر دانیشتنەکەمان بەردەوام بوو... حەیدەریش دەنگی بەرزتر دەکردەوە و قۆریات و گۆرانییە خۆشەکانی بۆ دەگوتین، خاڵە تایەریش هەروا خوایان لێ خۆش بێ هەموویان لەگەڵ شەهید کاک حوسێن شێروانی، کە بەفێڵ و بەدرۆی ڕووڕەشەکانی سەدام حوسێنی سورگومی دنیا و ڕەزیلی قیامەت، دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر لە بەغدا، شەهید کرا.

حکوومەتی بەعسی بۆگەن و شاربەدەری عێراق و جەندرمە بیژۆکەکانی پەروەردەی بەعسی وەحشی، ٩ کەسیان لە جوولەکەی بێ دەخل و هەژاری عێراقی کە لە بەعسییەکان زۆر شەریفتر و بەئەسڵتر بوون، بەتۆمەتی جاسووسیکردنیان بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل لە مەحکەمەیەکی وەحشییانە بەناوی (محكمة الثورة)، حوکمی ئیعدامیان درایێ و لەو مانگە ئیعدام کران. ناوی هەندێک لەو جوولەکە بێ تاوانانە ئەوانە بوون، شەوانە لە تەلەڤزیۆن موحاکەمایان نیشان دەدا: زەلخە، سادق جەعفەر ئەلحاوی، و پارێزەر عەبدولهادی ئەلبچاری... ئیسرائیلیش نەیکردە نامەردی بۆ تۆڵەسەندنەوەی، هەموو ڕۆژێ فڕۆکە جەنگییەکانیان، هێزی سوپای عێراق کە لە ئوردن بوو بۆردومانیان دەکردن و زۆربەیان لە ئەفسەری عێراق و جەندرمەکانی کوژران... بەتایبەتی لە ڕۆژانی ١/٣٠ و٣/

شوبات. له ١٩ی شوبات، دیسان له مەحکەمەی بەناو شۆڕش! وەجبەیەکی تر حوکمی ئیعدام دران بە هەمان تاوان- تۆمەتی جاسووسی بۆ ئیسرائیل- لەم وەجبەیە دوو کەسیان کورد بوون، خەڵکی هەولێر بوون. دڕندایەتی بەعس لەوەدا بوو، لەبەر ترسی خۆیان له گەل و له هەموو عێراقییەکان، خەڵکیان بەکوشتنی ئاشکرا، گوایا، دەترساند. ئەوانەی حوکمی ئیعدامیان درا، بۆ بەیانی هەموویان له گۆڕەپانی (ساحة تحرير) له (باب الشرجي) دوای ئیعدامکردنیان و، لەو گۆڕەپانە هەڵواسرابوون... و پۆلیس و ئەمن و موخابەراتی ڕژێمیش بەجلی سیڤل دەورەیان دابوون و هەلهەله و چەپڵەیان لێ دەدا و سروودی شرۆتر بۆ بەعسیان دەچڕی، ئەو مەلعوون و بێ حەیایانە.

## چاوپێکەوتنمان لەگەڵ هونەرمەند ئەنوەر قەرەداغی، بۆ یەکەم جار

٢٨ی شوبات، ئەمساڵەی ١٩٦٩ ڕێک کەوت کە لە سلێمانی بم بۆ سەردانی ولیەم و فیلیپی برام. ولیەم سەرپەرشتیی تیپێکی مۆسیقای دەکرد کە قوتابی بوون و ئاهەنگیان ڕێکخستبوو. جا ولیەم ناردی بەشوێنمدا، بچم بۆ ئاهەنگەکە. هەڵبەتە من لە ماڵی ولیەم بووم. ئیتر لەگەڵ ئەو گەنجە چوومە هۆڵەکە، زۆر قەرەباڵغ بوو. دوای پرۆڤەیەکی خێرا، لەگەڵ ئەو مۆسیقاژەنە گەنجانە لە پشت پەردەوە و بەیارمەتی ولیەم، زۆر خێرا و چالاکانە ئەو دوو گۆرانییەی ئامادەم کردبوون، فێریان بوون- یەکێک لەو کوڕانە ناوی ئەنوەر قەرەداغی بوو سەرنجی ڕاکێشام و زۆر جوان کەمەنچەی دەژەنی، قەوسەکەی بەشێوەیەکی جوان و هونەرمەندانە، دەهێنا و دەبرد بەسەر ژێیەکانی کەمانەکەی، قادر دیلانی نەمری هێنایەوە یادم. ئیتر پەردە کرایەوە و یەک دوو لە گۆرانییەکانی خۆمم پێشکێش کرد و چەپڵەیەکی زۆرم بۆ لێ درا- ئینجا دەستی گەنجە هونەرمەندە قەرەداغییەکەم گوشی و سوپاسی هەموویانم کرد و گەڕامەوە ماڵی ولیەم. ئاهەنگ بەردەوام بوو.

جەژنی نەورۆز ئەمساڵە زۆر خۆش بوو- دوکان و شەقام، و لێرە و لەوێ جەژنە پیرۆزانەی نەورۆز بۆ گەلی کورد هەڵواسرابوون. شیعارات و بەیتە شیعری نایاب بۆ جەژنی کورد نەورۆز نووسرابوون بۆ شەوی جەژنی نەورۆز- لە سینەمای سیروان ئاهەنگی زۆر گەورە ساز درا، هەزارەها کەس لە ژوورەوە و لە دەرەوە وەستابوون و بەچەپڵە و سروودی نەورۆز جەژنە پیرۆزانە و سەرفرازی بۆ کورد و وڵاتی کوردستان دەخواست. منیش سروودی:

(نەورۆزە مەستم بەنەشئەی بولبول)م پێشکێش بە جەماوەر کرد و تا کۆتاییی سروودەکە، لەگەڵمدا، لەسەر ئیقاعەکە، بەچەپڵە لێدان، ئاوازەکە خۆش دەڕۆیشت هەڵبەستەکە ئی شاعیری کۆییی ناسراو، مامۆستا کەریم مستەفا شارەزایە. ئاوازی خۆمە.

جەنرال ئایزنهاوەر، سەرۆکی ئەمەریکا لە پەنجاکاندا، ئەم مانگەی مارت- ئادار، لە ۲۹ی دابوو، کۆچی دوایی کرد.

هەروەها لە بەغداوە، لێژنەی نەورۆز خەبەریان بۆ ناردم کە بۆ ئاهەنگی نەورۆز کە لە هۆڵی (خولد) دەکرێ، لە ۳ی نیسان- دەعوەت کراوم بۆ بەشداریکردن. ئیتر بۆ نەورۆز خۆم گەیاندە بەغدا و شەوی ۳ی نیسان لە هۆڵی خولد، وەکو دەڵێن، شوێنی دەرزییەکیش نەمابوو لەبەر میوان و کوردەکانی بەغدا پیاو و ژن بەجلی کوردی جوان و ڕەنگین هۆڵەکەیان ڕازاندبووەوە- و دەیەها لێپرسراوی حکوومەت و وەزیرەکان و سەفیرەکانی دەوڵەتەکانی تر و ژمارەیەکی زۆر لە گۆرانیبێژی ئافرەت و پیاوی عێراق و عەرەبی بەشداربیان کرد- تیپی مۆسیقای ئێزگەی ڕادیۆی کوردی و، تیپی ئێزگەی ڕادیۆی عێراق و تەلەڤزیۆنی ڕادیۆی کوردی و، تیپی ئێزگەی ڕادیۆی عێراق و تەلەڤزیۆنی بەغدا و لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی کاک ئەنوەر و کاک ولیەم و زۆر و زۆری تر...

تیپی هەڵپەڕکێی ئاشووری سەر بە (یانەی ڕۆشنبیریی ئاسووری بەغدا)، تایەر تۆفیق، فوئاد ئەحمەد، ڕەسووڵ گەردی، عەلی مەردان... لە باخچەکە پێکەوە چاوەڕێی سرەمان دەکرد بانگمان بکەن- فوئاد ئەحمەد و من لە دوا گۆرانیبێژەکان بانگ کراین دوای سەعات ۲ی نیوەشەو بوو- چونکە گۆرانیبێژە عەرەبەکان و عێراقییەکان لە بەشی یەکەمدا بوون.

لە ۱۳ی نیسانەوە، کارەبای شار زۆر دەکوژایەوە. ئیشاعات هەبوو دەیانگوت عەمموودەکان، لە نزیک قوشتەپە تەقێندراون و (نسف) کراون. جا کە کارەبا نەبێ، بەنزینخانەش بێکار بوو و بەنزین کەم بەدەست دەکەوت و گرانبوو! کەواتە، چاک بزانە- خوێنەرە ئازیزەکەم، بەخوا ئاویشمان نەبوو! (ئێوە ئەمڕۆ کە ناوەڕاستی ساڵی ۲۰۰٦)ە، هەمان شت وەک ئەوسایە واتا وەک پێش ۳۷ ساڵ! کەواتە خەم مەخۆن و حەسوودیان پێ

مەبەن. بەخوا ئەمە حاڵمان بووە و هەر واش دەبێ! ئەو حکوومەتانەی یەک لە دوای یەک دێن و دەڕۆن، بۆ پارە کۆکردنەوە بۆ خۆیان و ژیانێکی تەواو بەسەر بەرن تا ئینقیلابێک ڕوو دەدات و ئەوانی پێش خۆیان لادەبەن و دەیانکوژن و یان هەڵدێن، ئینجا نۆرەی ئەو برادەرە- دوژمنانە نوێیانە دەست پێ دەکات: ئاو- کارەبا- بانزین- نەوت... هەموو نامێنێ و دەگمەن دەبێ! بۆ خۆیان... بۆ وەزیر و لێپرسراوەکان و عەسکەرەکان و ئەفسەرەکان ئەوانەی ئینقلابەکان دەکەن... بۆ ئەوان هەموو شت هەیە! بەڵام بۆ هاوولاتی سادە و خەڵکی شاری هەژار و ڕەش و ڕووتی وەک ئێمە... چش! جا ئەوە حاڵمانە هەر لە ساڵی ١٩٦٣ بەولاوە تاکو ئەمڕۆ! مەسیرە دەکرا... خۆپێشاندان... سوودیان نەبوو بە دوو قسان قەناعەتیان دەهێنا و وازیان لە هەرایەکە دەهێنا! کەچی حاڵ وەکو خۆی دەمایەوە!

جا سەیرەکەش، لە ناوچەی کوردستان، ئەو کێشە و گرفتانە و ژیانی ڕۆژانەی ناخۆش، زیاتر پەرەی سەند بوو... و دەیسەند! بتپرسیبا: یەک دەیگوت ئەوە (جەلالییەکانن هۆی ئەو تێکدانە! یەکی تر دەیگوت: نا... نەخێر! ئەوە (پارتی) لە ڕقی (جەلالی) وا ئەو کارە دەکەن: چونکە ئەوسا، واتا لە ١٩٦٧ و ٦٨ و ٦٩ و تاکو بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠... ڕاستە (یەکێتی) لێرە بوون! جا ئەو قسە و قسەڵۆکانە دەکران! بەڵام کێ باوەڕی دەکرد؟ چونکە حکوومەت بۆ خۆی دڕندە بوو! جەندرمەکانی بێ حەیا و ڕەوشت پیس بوون! ئەوان هەموو شتێکیان لە دەست دەهات بیکەن، تاکو هاوولاتی لە شار ناڕەحەت بن و دووبەرەکی لە نێو کورد پەیدا بێ، کە بەرژەوەندی بەعسی تێدا دەبوو! بەڵام ژیان هەر بەردەوام بوو. چالاکیی هونەری و وەرزشی و سەیران... دەکرا!

ئیستعرازێکی وەرزشی ساڵی ١٩٦٩ لە ڕاستەوە: فاروق سەید حەسەن، بەڕێوەبەری پۆلیس، موتەسەریف، حەمەدەمین فەرەج و مامۆستا عەزیز مەولوود- ڕابەری بزووتنەوەی وەرزش

لە لایەکی ترەوە، من خێزان و ماڵ و منداڵم، کرێچیاتی موشکیلەی گەورەم بوو- لەو خانووەی تێدا بووم کرێی مانگانەی ١٦ دینار بوو- لەگەڵ ئەوەش قانع بووین... بەڵام ئەو جارە سێ چوار مانگ یا شەش مانگ... خاوەن خانووەکان، بەبیانووی جیا جیا داوایان لێ دەکردم کە خانووەکەیان چۆڵ بکەم! جا وەرە! خۆ زەحمەتترین شتیش گواستنەوەی ماڵ و کەلوپەل و... وەرە لۆری بگرە بەکرێ و چەند حەماڵێک و عەمەلە بگرە تاکو ئەو کەلوپەلانە

لە لۆری بارکەن و بیانگوازنەوە خانووی نوێ. جا باوەڕ بکەن، هەر جارەی چەندەها کەلوپەل دەشکان... و ون دەبوون لەو گوازتنەوانە بۆیە هەڵسام وتم «بڕیارم دا خانوو دروست کەم» ئەم پارچە عەردەشم هەبوو کە ئێستاش لەسەر ئەو عەردە ئەو خانووەم کردووە! وەستایەکی بەننا هەبوو ناوی وەستا ڕەئووف بوو... ڕێککەوتم لەگەڵیدا کە ئەو دەست بکات بە هەڵکەندنی بناغەکان و منیش موعامەلەی بانکی عەقاریم کردبوو... کە ۱۲۵۰ دیناریان وەک سولفە دەدایە هەر کەسێ کە نیازی هەبووایە خانوو بکات- سوپاس بۆ خوا خانووەکەم لە ساڵی ۱۹۷۰ تەواو بوو چوومە ناویەوە و ئەوەتا ئەمرۆ ساڵی ۲۰۰٦ە-واتا ئەوە ۳٦ ساڵە من لەو خانووەم و ئیسراحەتم کردووە.

بۆ بەختی چاکم، ئەوانەی لەگەڵمدا و پاشی من عەردەکانی دەوروپشتی ئێمەیان کردە خانوو، زۆر دراوسێی باش و دڵسۆز و دڵپاک بوون، وەک خوالێخۆشبوو مامۆستا محەمەد عەلی ڕەواندزی دراوسێی لای چەپمان و وەستا عەبدوڵڵای فیتەری پاسی کۆمپانیای سەفینی هاتوچۆ و شاکر فەرەجی کارمەندی وەزارەتی (شؤون الشمال)، کە خانووەکانیان وەک ئی خۆم بوون بە گوێرەی مەرجی شارەوانی دەبوایە نەخشەیان نیشان بدەین ئینجا مۆڵەتی خانوو دروستکردنمان دەدرایە... بەو مەرجانە خانووەکانمان دروست کردبوو: یەک لەو مەرجانە زۆر گرینگ بوو- بەداخەوە ئێستا کەس بەو مەرجە خانووەکەی ناکات و حکوومەت و بەلەدییە و کەسیش ناپرسێ و ئاگایان لێ نییە و بەرەڵڵاییە و هۆبە هۆبە... و هەر کەسێ لۆ خۆیە!

مەرجەکە ئەوە بوو کە دەبوایە لە هەر چواردەورەی خانووەکەت دوو مەتر... یا زیاتر، قەی ناکات، بەڵام کەمتر لە دوو مەتر نابێ- دەبوایە لە مابەین سیاجی خانوو و بینایەی خانووەکەت بە بەتاڵی بەجێ بهێڵی. جا دەیکەی بە باخچە قەی ناکات. بەڵام دەبێ هیچ ژوور یا کۆلیت یا دیوار لەو مەسافەی دوو مەترە نەبێ- هەروەها نابێ پەنجەرەکانی قاتی دووەم- ئەگەر دروستت کرد- بڕواننە لای خانووەکانی دراوسێی دەوروپشتی خانووەکەت- دیواری سیاجەکەش دەبوایە مەتر و نیوێک زیاتر بەرز نەبوایە- ئاخر ئەوە زۆر پێویستە تاکو هەتاو و هەوای دەرەوە پاک بچێتە ژوورەوە ... ئەمڕۆ- بەداخەوە هەر سێ دراوسێم: لە پشتەوە و لە لای ڕاست و لای چەپم، چونکە خەڵکی نوێ خانووە کۆنەکانیان کڕی: پارەیان هەیە باوکم... بە دۆلار ئەمڕۆ قسە دەکا- جا ئەوانە خانووە کۆنەکانیان کە کڕی یەکسەر شۆفڵ و بلدۆزەر و جۆرەها گرێدەر... هێنایان و خانووەکانیان لە بناغەوە هەڵکەند و تێکدا و خانووی نوێ و بە گوێرەی خەریتە و نەخشەی نوێ و پارەیەکی زۆر... خانوویان

له هەر سێ تەنیشتەکانم دروست کرد... جا ئێستا- دراوسێکان خۆش بن- هەوای ساف... تیشکی ڕۆژ- ئاسمان هەور- تەنانەت ئاسمانیش نابینین تاکو لێی بپارێینەوە جاروبار کە تووشی تەنگ و چەڵەمەی ئەو ژیانە نەبین! ئاخر... بەخوا ئەمە تاوانە! هەڵەیە! هەڵەی لێپرسراوانی بەلەدییە و تەختیت و خانوو و عیمارە دروستکردنە! ئەمە کارێکی خراپە: چ لە لایەن دەروونییەوە بۆ هاووڵاتییان و چ لە لایەن تەندروستییەوە! من نیوەی باخچەکەم و درەختەکانم وشک بوون چونکە هەتاویان نەدیت چەند ساڵە- دەمەوێ بەهاران گوڵ بچێنم ناتوانم- چونکە هەتاو نییە هەوا نییە دەڵێی چی کاکە گیان! بەخوا ئەمە زۆر نامرۆڤانەیە. ئێ بەکێ دەڵێی! کاکم دەڵێ: من پارەم زۆرە- دۆلارم زۆرە- بۆچی خانووێکی بەدڵی خۆم نەکەم! من چ بکەم تۆ کاتی خۆی خانووەکەت نوی دروست کردووە! دەفەرموو! ڕاست دەکات! من هیچ هەقم نییە... (نەخێر هەقم هەیە گلەیی بکەم) بەڵام لە کێ؟ و لە لای کێ شکایەت بکەم!

سەبا و شۆبانی کوڕەکانم هیوایەتی وێنەگرتنیان هەیە. هەریەکە و کامێرای خۆی هەیە. جا بە موناسەبە و بێ موناسەبە: وێنەمان دەگرن... لە ماڵەوە یا لە دەرەوە لە دەشت... لە عەنکاوە... بەتایبەتی بەهار لە ناو گیا و گوڵ لە دەوروپشتی عەنکاوە زۆر خۆشە... زیاترین سەیرانمان بۆ ئەوێیە... چونکە نزیکە.

بەڵێ، کە ناوی ئەم بیرەوەریانەم لێناوە (تەمەنێک گۆرانی، ئاواز و خۆشخوانی)

باوکم و سەبای کوڕم لە حەوشەی خانووەکەمان جارێ بێ دار و درەختە ساڵی ١٩٧٠

سەیرانێکمان بۆ گوندی یان شارۆچکەی عەنکاوە من لەسەر زک ڕاکشاوم کامێرای سینەماییی ٨ ملمم لە دەستە و وێنە دەگرم. سوهام لە پێشەوە دانیشتووە و لە تەنیشتەوە لای دەستە ڕاستی: سەماوەر و وەردییەی خوشکم وادانیشتووە لەگەڵ سەبا- لە دواوەش شۆبان وەستاوە-- ئەو خانووەی لە پشتەوەمان دیارە خانووی شمۆئیلی کوڕی خوالێخۆشبوو مام گەوریلی پۆلیسە. شمۆئێل مامۆستایە... و ئەم شوێنە ئێستا (ساڵی ٢٠٠٥) شەقامی سەرەکی و نزیک ماڵی کاک فەهمی بەڕێوەبەری ناحیەیە. بەرامبەر ئەم خانووە... ئێستا بازاڕ و دوکانی جوان و پڕ ڕزق و خواردن و خواردنەوەنە. ٣٠ی ئازار ١٩٦٩

مامۆستا مەتیی ئامۆزام و سوهامی هاوسەری و سەبای کوڕم و لوئەی کوڕی کاک مەتی، لە هەمان شوێن، لە عەنکاوە لە سەیرانێک لە نیسانی ١٩٦٩ دا

سەبا و شۆیان و برادەریان
غەدیر ئەفرام کە لە قادسیەی
ناپیرۆزی سەدام شەهید بوو

هەوڵ دەدەن وەک من لاسایی
ئەکتەرەکانی سینەمای
ئەمەریکی دەکەنەوە

ساڵانی ١٩٦٩ و ١٩٧٠ لە
خانووەکەی خۆمان کە جارێ
درەخت نەچێندراوە

بەبۆنەی جەژنی لە دایکبوونی منداڵەکانم- ماڵمان ڕۆژی ١٩٦٩/٥/٤- لە ڕاستەوە: سوهام عەسکەر خێزانی ئامۆزام مامۆستا متی درمن، جا سوهام حەننا خێزانی من، ئینجا یووسف باکووری برام و دواییش، وەردییەی خوشکمان

لە ڕاستەوە: منداڵەکە لوئەی کوڕی گەورەی مامۆستا مەتییە ئینجا مامۆستا مەتی، ئینجا خێزانی مەتی و نۆفەلی کوڕیانی لە باوەشە، کە ئەم ئاهەنگەش بەبۆنەی هاتنی ئەوە بۆ ئەم دنیایە! ئینجا خێزانی من سوهام نومرە یەک، چونکە سوهام مەتی دووەمە... ئەوان دوای ئێمە بوون بە هاوسەری یەک، بۆیە نومرە دووە! ئینجا سەبای کوڕم و من لە دواوەی دانیشتووم، باش دیارنیم، لە تەنیشتەکەی دیکەم، وەردییەیە، خوشکمە، ئینجا دواکەیش شۆبانی کوڕمە

لەبەرئەوەیە کە ئەو تەمەنەم هەر هەمووی لە لام خۆشە! بە ناخۆشییەکانیشەوە! بۆ؟ چونکە... ئەگەر لە سیاسەت تێ نەگەم و لێی دوور بم، و لە خەڵک نزیکتر بم لەوانەی بە جۆرێکی یا جۆرێک تر، ئەزیەتی ئەو خەڵکە دەدەن، تووشی نەهامەتی و ناخۆشی دەکەن...، بەڵێ لە خەڵک... زۆربەی خەڵک نزیکتر بووم... و خۆشم دەویستن و ئەوانیش منیان خۆش دەویست و گۆرانیم بۆ دەگوتن! هەروەها بۆ خزم و دۆست و تەنانەت ماڵ و منداڵ و خێزانی خۆشم، هەر هەوڵم داوە لە خۆشیدا بن... و بوویم بە مۆسیقاژەن و گۆرانیم بۆ گوتوون... ئیتر ئەمەش... ئەم جۆرە ژیانە دەبێ ناوی لێ بنرێ ژیانی خۆشخوانی! تەمەنێک بۆ مۆسیقا و گۆرانی!

سەبای کورم ئەو وێنەی بۆ گرتین، لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٦٩: من و تیمەی برام و وەردییەی خوشکمان وەستاوین، دایکم و شۆیان لە پێشماندا وەستاون- بۆ ئەو ڕۆژانەی ڕابردوو، ئەو کامێرانە باو بوون و ئەوانی حەزیان لە وێنەگری دەکرد، دەیانکرین بەنرخێکی هەرزان بۆ فێربوون- چونکە بەکارهێنانیشیان ئاسان بوو

لە قوتابخانەکەشمان، ناوەندی جمهووری کوڕان هەر بەردەوام بووین لەسەر بڕیاری پرۆژەکەی دەعوەتکردنی (ئەو مامۆستایەی تەرفیع دەکات) بۆ مامۆستایەکانی تر بۆ ناخواردنێکی تەواو بە هەموو شتەوە، جا یان هەر لە قوتابخانە دوای دەوام و بەتاڵ بوونی مەکتەب، لە ژووری مامۆستایان، یاخود دەچووینە سەیرانگایەک، لە دەرەوەی شار.

جا ڕێک کەوت، مامۆستا حوسێن ڕەشوانی مامۆستای وانەی عەرەبیمان بوو، تەرفیعی کرد بۆ ١٠٠ دینار. بەم بۆنەوە دوو بەرخی بەڕادان دا بکرێت بە قۆزی و لە ڕێکەوتی (هەینی ٢٥/نیسان)، دوو سێ ترومبێل چووینە ناو دارستان و باخچەکانی شارۆچکەی (کەلەک) و لە ڕۆژێکی هەتاو و خۆشی ئەو بەهارە... خواردمانن (بێ ئێوە نا... خۆش) و ڕۆژێکمان بەسەر برد بە یاریی کۆنکان و گۆرانی و عوودی من و قسەکانی مامۆستا ڕەشوانی تا ئێوارە: دوور لە هەرا و هۆریای ناو شار و دیعایە و دەنگە دەنگی تەقە و... هەواڵی کوشتن و ناخۆشی مامۆستا ئەکرەم عەلاف، مامۆستای، ڕەسم بوو لەم ڕۆژانە موسەجیلەییەکی گرۆندیکی

سەیرانەکەمان بۆ شارۆچکەی کەلەک، ڕۆژی هەینی ١٩٦٩/٤/٢٥، ئەوا تاوێک لەبەر
سێبەری ترومبێلەکەم، دانی نیوەڕۆ، دانیشتووین ئەو دوو مامۆستایەی ڕاوەستاون: ئەو
بەقاتی ڕەشە وەلی حەسەن ڕەزایە و ئەوی تر بێ چاکەت، مامۆستا محەمەد قەساب...
دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو و گۆرانی باشی دەزانی، بەتایبەتی عەرەبییەکان...
دانیشتووەکانی نزیک ترومبێلەکە: یەکەم کەس خۆمم (باکووری) بە کراسی سپی و
ئەوی تەنیشتم هەر بە کراسی سپی: مامۆستا مونیبە... لە دووریشەوە ئەوەی کراس و
یەلەگی لەبەرە: خاوەن دەعوەتەکەیە: مامۆستا حوسێن ڕەشوانی

بچووکی TK. 14 کڕی- بەڵام بەدڵی نەبوو. فرۆشتییە من بە ٣٠ی دینار. ئەو، واتا خاوەنەکەی- مامۆستا ئەکرەم، چەند ساڵێک پێش ئەمڕۆ (ئەیلوولی ٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە، بەڵام موسەجیلەکەی لە لام ماوە و سوودی زۆر و تامی زۆر لێ وەردەگرم و ڕەحمەت بۆ کاک ئەکرەمی هاوڕێمان دەنێرم خوا عەفووی بکات. هونەرمەندێکی زۆر باش بوو.

لەگەڵ موسەجیلەکە، لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆن بەکارم هێناوە

منداڵەکانم، مانگێک پێش هاتنی ڕۆژی جەژنی لە دایکبوونیان، کە لە ٥/٣ی هەموو ساڵ، ئاگاداریان دەکردمەوە و شتیان لێم داوا

میوانەکان و خۆمان لە ڕاستەوە: یووسف باکووری بەجلی کوردی، وەردییەی خوشکمان سوهام NO.2- خێزانی مەتی، لوئەی کوڕی مەتی لە باوەشی باوکی، سەبا و شۆبان، من- ئینجا سوهام NO.1- و مادلین، هاوسەری تیمەی برامان ١٩٦٩/٥/٤

یادی هەشتەمینساڵیانە لە ١٩٦٩/٥/٣

دەکرد و کێ و کێ دەبێ دەعوەت بکرێت و... لەم بەزمە! زۆرجار خۆم گێل دەکرد و دەمپرسی لێیان: بۆچی جەژنتان کەی ڕێک دەکەوێ! ئوو... زۆری ماوە!

لەم ڕۆژانە دەبینین فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق، ڕۆژانە، بەسەر هەولێر و بەگرمە گرم و دەنگی نشازی مەترسیدار بۆ ترساندنی هاووڵاتیان، بەرەو ناوچە چیایی و شاخاوییەکانی کوردستان، زۆر خێرا ئاسمان دەبڕن!... جا دەنگوباسیش باسی ئەوە دەکرێ کەوا هەموو ڕۆژێ ئەو تاوانبارانە، دەچنە سەر دێهات و گوند و ئەشکەوتەکانی کوردستان بۆردومان دەکەن، بەبیانووی ئەوەی کە پێشمەرگەیان تێدایە و دژی سوپای حکوومەت تەقە دەکەن و (تخریبات) دەکەن! بۆیە لە هەواڵەکانی خۆیان، لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان، ناوی پێشمەرگە ناهێنن بەڵکو بە (مخربین) ناویان دەهێننەوە. ئەمەیە دەستوور و هەڵسوکەوتی وڵاتانی دواکەتوو لەو ناوچەیەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. حکوومەت بە چەک و تۆقاندن موعامەی هاووڵاتیانی دەکات. ئەگاداری پێشکەوتنی وڵاتانی دنیا نین...، زانست و هونەر و خوێندن و پێشکەوتن و بەرەو پێشچوون لەم مەیدانانە لە نەخشە و بیر و بەرنامەیاندا نییە! تەنیا ئەوەیە، هەر حکوومەتەی دروست دەبێ، یەکەم ئەمانجی ئەوەیە: دەنگی دژی سیاسەتی خۆیان (کپ) کەنەوە و نەیارانیان لەناو بەرن و هەرچی بلێ (لەل) زمانی ببڕن!

ئەدی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان چی ڕوو دەدا؟ فەرموو لەگەڵ ئەو هەوڵە زانستییە گەورە

و بەسوودە بۆ هەموو دانیشتوانی سەر ئەم زەوییە. هەواکەش خەیاڵ نییە و بەچاومان لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆنەکان دەیانبینین: لە ١٨ی مانگی تەمموز، لە تەلەڤزیۆنەکان بینیمان چۆن ئەمەریکا و زانایانی ئەمەریکا، کەشتییەکی ئاسمانییان فڕێ دایە بۆشاییی ئاسمان بەرەو مانگ- لە هەواڵەکەدا وتی کەوا ئەم کەشتییە، سێ کەشتییەوانی بۆشایی (رواد الفناء)ی تێدایە... و ئامانجیان دابەزینە لەسەر ڕووی مانگ! پەکوو! کوڕە چ عەجایباتی دەبینین و دەبیسین! ئەوە ڕاستە؟ کێ باوەڕ بەو هەواڵە دەکات؟ خەڵک هەبوو بە(کفر)یان لە قەڵەم دەدا! ئاخر ئەمە دژی دین و کتێبە ئاینییەکانە!

سێ کەسەکەش ئەوانە بوون: نیل ئارمسترۆنگ، مایک کۆلینز و ئۆدن ئەلدرین...

من و کاک عەبدوڵلای دراوسێم، باوکی ئەحمەد، فیتەری کۆمپانیای هاتوچۆی سەفین، لە ماڵیان دانیشتبووم ئەم هەواڵەمان دیت و بیست. جا بۆ دایکی وەستا عەبدوڵلامان تەرجە مەکرد! زۆر بەساردی و هەر لە جێوە، لەسەر بەڕێک دانیشتبوو بەرامبەرمان خەریکی چای تێکردن بوو: جا کە کاک عەبدوڵلا ئەوەی بۆ دایکی گێڕایەوە، ئەو وەک وتم زۆر بەساردی و لەسەرەخۆ، وتی کوڕە دەبابڕۆین دەفن بن، ئەو قوون بەگووانە!! کوو دەچنە سەر مانگ. چما مانگ عاردە؟ ئەوەند گەورەیە؟ ئێمە پێکەنین و موناقەشەمان نەکرد. جا، بۆ ١٩ی هەر ئەم مانگ بە (تەمموز)، لە بەغدا بووین خۆم منداڵەکان چووین بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی (خواستن و خەنە دانانی) خوشکی بچووکی سوهامی خێزانم، ناوی (موونتەها)یە و لە بەغدا دەژی لەگەڵ ماڵی برا و خوشکەکانی دیکەی- لەو ماوەیە، خزمێکی خۆیان، (خضر بهنام)، خوازبێنی کرد و ناردیان بەشوێنمان و لە ماڵیان کۆ بووینەوە ئەو شەوە هەرایەکی چەپڵە و گۆرانی خۆش بوو و (موونتەها)ش مێردی کرد! دوایی ئێمە- من و منداڵ و خێزانم- چووینە ماڵی باوکم کەوا ئەوسا لە بەغدا بوون، لە ناوچەی دۆرە خانووێکیان بەکرێ گرتبوو و باوکم، لە ماڵی کۆنە وەزیری زەمانی پاشایەتی، ناوی (مەکی جەمیل) کاری تەباخی دەکرد... چێشتی بۆ لێ دەنان... چێشتی زۆر جوانی لێ دەنا، مودێرنانە بوو! جۆرەها خواردنی بۆ دەکردن. زۆریان خۆش دەویست.

جا بۆ شەوی ٢٠ی تەمموز، لە تەلەڤزیۆنەکەی ماڵی باوکم، لە سەعات یازدە و چارەگێک بەکاتی خۆمانە- بەغدا) بینیمان چۆن کەشتی ئاسمانی، (ئەپۆلۆ ١١)، بەئەسپایی و هێواشی، لەسەر ڕووی مانگ دابەزی و لە کاتی نیشتنی کەمێک تەپوتۆزی کرد. دوای وەستانی تەواوی کەشتییەکە دەرگەیەک کرایەوە و کابرایەک، بە جلی

کەشتییەوانی بۆشاییی ئاسمانی، بە بازدانێکی بچووک و سەیر لە دوا پیپلکانەکەدا، خۆی فڕێ دایە ناو خۆڵ و بەردەڵانەکەی سەر ڕووی مانگ ئەمە بوو یەکەم ئادەمیزادی سەر گۆی زەوی (الكرة ألارضية)، کە لە دوای گەشتێکی چەند ڕۆژێک -(لە ١٦ی تەمووزەوە تا ٢٠ی مانگ)- واتا بە سەفەرێکی چوار پێنج ڕۆژ، لەسەر زەویی مانگ دابەزی ئەم هەواڵە تا چەند ڕۆژێک لە هەموو دنیا، وێنە و نووسین و هەواڵ و ڕاپۆرت بڵاو دەکراوە! لە بەغدا تەقەی سەری ڕادیۆی بەغدا دەهات- وەک ئەوەی لە عالەمێکی تر بێ. قەت بەلای ئەو ڕووداوە گەورەیەدا نەچوون و باسیان نەکرد. ئەوان هەر لەگەڵ (هەواڵی شەڕە کورد) دەژین و لە ترسی کورد کەوا زراویانی بردبوو!

بەهۆی ئەم هەواڵەیش، خوشکی سوهام، موونتەها، ڕۆژی بە بووکگواستنەوەی خۆی لە بیر ناکات! هەرچی لێی بپرسێت! کەی شووت بە کاک (خضر) کرد؟ لە وەڵاما دەڵێ «ئەو شەوەی ئادەمیزاد لەسەر مانگ دابەزی- شەوی ٢٠ی تەمووز ١٩٦٩».

شەوی مارەکردنیان خضر بهنام و موونتەها حەننا لە کەنیسە، پێش ئەوەی بڵاوەی لێ بکەین و هەر یەک بچێتەماڵەوەی و بووک زاوا (واز لێ بێنین) لە حەوشی کەنیسە ئەم وێنەیەمان گرت لە ڕاستەوە: سوهام، عادل برای (خضر)ی زاوا، ئینجا زاوا و بووک، ئینجا ڕەمزیە- خوشکی گەورەی بووک، پاشان من و یووسفی برام--٢٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٩

ئەپۆلۆ (١١)- نیل ئارمسترۆنگ
لێی دادەبەزێ بۆ سەر مانگ لە
١٩٦٩/٧/٢٠

خۆڵ و بەردی سەر ڕووی مانگ کۆ دەکاتەوە
و ئاڵای ئەمەریکاشی چەقاند

یەکەم ئادەمیزاد کە لەسەر
عەردی مانگ دابەزی لە ٢٠
تەمووزی ١٩٦٩

زەویی خۆمان (الارض) ئاوادیار دەبێ ئەگەر
لەسەر مانگەوە سەیری بکەیت

لە ٢٤ی تەمووز، هەر دوو کەشتییەوانانی ئاسمانی و بۆشاییی، بە خۆ و بەکەشتییە مێژووییەکەیانەوە، بەسەلامەتی و بە گوێرەی ئەو پلان و نەخشە زانستییانەی کە بۆیان دیاری کرابوو- ئەمڕۆ لەسەر عەردی خۆیان لە ئەمەریکا- دابەزین و بە گەرمی پێشوازیان لێ کرا! خۆزگەم بەخۆیان! ئەرێ تۆبڵێیی، ڕۆژێ بێت کوردێک، یان نەوەیەکی من بە کەشتییەکی ئاسمانی و بەدەست و پلی زانایانی خۆمان دروست کرابێت بچنە سەر مانگ؟

لە ٢٥ی تەمووز، لەگەڵ برادەری خۆشەویستمان کاک قادر جێمسی کە لە بەغدا تووشی یەکتر بووین و ڕێک کەوتین کە لەگەڵ جەنابی، بگەڕێینەوە هەولێر، جا ئەمڕۆ بە ترومبێلی خۆی، من و خێزان و منداڵەکان، هاتینەوە شارەکەمان بەڵام دیسان، لە پاش چەند ڕۆژێک، لە ٤ی ئاب، بەرێ کەوتمەوە- بۆ بەغدا، لەسەر خواستی بەڕێوەبەرایەتیی تەلەڤزیۆنی بەغدا کە داومان لێ کرا، من و چەند گۆرانیبێژێکی تر: کاک تایەر تۆفیق، فوئاد ئەحمەد، لە هەولێرەوە چووین و لەوێش: عەلی مەردانی مامۆستا و حەسەن جەزراوی و ڕەسووڵ گەردی و بەشار زاخولی، بەشداری ئاهەنگێکی تایبەتی تەلەڤزیۆنمان کرد و لە ستۆدیۆ گەورەکە، لەگەڵ تیپی مۆسیقای ڕادیۆی کوردی بەغدا، و هەریەکەمان چەند گۆرانییەکمان بۆ (تصویر) کرا.

حەسەن جەزراوی - ڕەسووڵ گەردی

باکووری، تایەر تۆفیق، فوئاد ئەحمەد

عیسا بەرواری، عەلی مەردان، بەشار
زاخۆلی

## گوندی کوورانی عەنکاوە و چۆنیەتی و مێژووی دامەزراندنی

لە نزیک ئەو بەستەی سەر ڕێگەی عەنکاوە- هەولێر مەبەستم لە (بەست) لێرەدا، جۆگە ئاوێکی گەورەیە کە زستانان و بەهاران وەک نیمچە ڕووبارێکی لێ دەهات و ئاوەکەی لە زوورگەکانی لای ڕۆژهەلات و باکوری ڕۆژهەلات، دەڕژا و دەهاتە سەر ڕێگەی نێوان عەنکاوە و هەولێر، و ڕێگەکە دەبووە قوڕ و ئاو، زۆر جاری وا هەبوو خەڵک و ئاژەڵ و کاروانی گوندەکانی دەوروپشتی عەنکاوەش کە بەرەو هەولێر دەچوون، لەسەر ڕۆخی بەستەکە دەوەستان و دەبووە تەگەرە لە پەڕینەوە بۆ لایەکەی تر. جا ئا لێرە... لە نزیک ئەو بەستە، کاتی خۆی، لە دوا سالآنی چلەکاندا، ١٩٤٨و ١٩٤٩ و ١٩٥٠، وەستا عەبدۆکی بەرگدرووی هەولێری، کوورەیەکی بەدروستکردن دا بۆ بەرهەمهێنانی کەرپووچی خانووبەرە دروستکردن- بۆیە پاش ئەوە، ئەو مەنتیقەیە ناوی لێنرا (کوورانی عەنکاوە)- کە خۆی هەر یەک (کوورە) بوو، زۆریشی نەخایاند، ساڵێک و دووان... دیاربوو وەستا عەبدۆک زەرەری کرد. ئەوەبوو کوورەکەی بەجێ هێشت... بەرە بەرە، بەهۆی باران و باو بەفر و... گۆڕانکاریی کەشوهەوا... تێک چوو! جا ئەو زەوییانە، پێم وایە زەوی (شێخ محیەدین) بوون و لەم یەک دوو ساڵەدا، واتا ١٩٦٨ و ١٩٦٩... تاد دەستی کرد بەفرۆشتنی عەردەکە. کردیە پارچە پارچە. هەر پارچەی دووسەد مەتر مورەبەع بوون- خەڵکانی زۆر لە مامۆستا و مووەزەف بەتایبەتی هەریەکە و چەند پارچەیەکی کڕی بۆ دواڕۆژ- نرخیان هەرزان بوو و بەقیستیش دەفرۆشران- جا ئێمەش، بەناوی سوهامی خێزانم، سێ پارچەمان کڕی، واتا ٦٠٠ مەتر.

«تێبینی: ئەم ناوچەیە، لە دوای حەفتاکان... خەڵکی زۆری گوندان هاتن و هەریەک، یەک دوو پارچەی لە خاوەنە تازەکان واتا مووەزەفەکانی کە لە خاوەنی سەرەکییان کڕیبوو- جا لەوانە ئێمەش ئەو پارچانەی کڕیبوومان، فرۆشتمانەوە بەو خەڵکانەی گوندانی تر... ئەوانیش کردیانە خانوو و لێی نیشتەجێ بوون و ناویان لێنا (گوندی کوورانی عەنکاوە) و مزگەوتێکیشی لێ کرا. ئەمڕۆ، دوای ڕاپەڕین و ئێستا ساڵی ٢٠٠٤ و٢٠٠٥، بوویتە شارۆچکەیەک و خەریکە لەگەڵ بەشی خوارووی عەنکاوە تێکەڵ بێ و ببێ بە یەک شار) ئەمە بەکورتی مێژووی گوندی کوورانی عەنکاوەیە، وەک خۆم

من و بنیامینی ئامۆزام لەسەر کوورەکەی
وەستا عەبدۆکی خەیات

ئاگاداری پەیدا بوونیمە هەر لەوکاتەی کە بەستێکی پان و بەرین بوو... عەردەکەی دەوروپشتی ئی عەنکاوەییەکان بوو پێشتر دەغڵ و دان و بێستانیان لێ دەچاند.

من و ئامۆزام، خوالێخۆشبوو، لە عەنکاوەوە بۆ هەولێر دەچووین، بۆ سینەما و هەڵبەتە بە پێیان دەڕۆیشتین، ڕۆژێکی پایزی ساڵی ١٩٤٩ بوو. کە گەیشتینە ئەم شوێنە، وتی بابچینە سەرێ و ڕەسمێک بگرین- بنیامین هەمیشە کامێرایەکی هەڵدەگرت لە سەفەر و سەیران- ئەمەش یادگارێک و بەڵگەیە بۆ ناولێنانی ئەو جێیە (کوورانی عەنکاوە) گەرچی هەریەک کوورە بوو.

***

لە ٧ی ئاب ئەمساڵ (١٩٦٩) ماری خوشکم شووی کرد بەگەنجێکی دراوسێی خۆیان، لە دۆرە لە بەغدا و ئاهەنگی گواستنەوەی بووک بۆ زاواکەمان، ناوی (عەزیز بەرخۆ)یە و مامۆستا بوو لە قوتابخانەی سەرەتایی- ئاهەنگەکەش خۆش بوو، ئێمە و خزمان ئامادە بووین لە (یانەی وەرزشی دۆرە) ئاهەنگەکە بەڕێوە چوو.

ڕۆژی پاشتر، لە ٨ی ئاب، بەیانییەکەی، هەردوو کوڕەکانم بردنە تەلەڤزیۆنی بەغدا و بەشدارییان کرد لە بەرنامەیەکی منداڵان کە هەفتانە بوو، ڕۆژانی هەینی پەخش دەکرا و بەرنامەکەش، هونەرمەندی دێرین (عمو زەکی) بەڕێوەی دەبرد و ئامادە و پێشکێشی دەکرد. سەبا و شۆبان، بەدووقۆڵی، ئامادەکاری بەرنامەکە، عەمۆ زەکی، پێشکێشیکردن و وتی: و من مدینة أربیل التاریخیة، یشارکنا الطفلان صبا و شوبان باکووري، بمناسبة مرور... سنة علي البرنامج. فشکرا لهما) ئینجا لێی پرسین بە عەرەبی (شراح تقدمون لأصدقائنا الاطفال بهذة المناسبة؟) ئەوانیش وەڵامیان دایەوە کەوا گۆرانییەکیان ئامادە کردووە... گۆرانییەکەیان پێکەوە وت و منداڵەکانی لە ستۆدیۆکەش بوون، چەپڵەیان بۆ لێدان»

سەبا و شۆیان و عەمۆ زەکی و بەرنامەی منداڵان

لە ماڵی باوکم (ماڵی بووک-) لە دۆرە گیراوە ٢ سەعات پێش گواستنەوەی بووک چاوەڕێین بچین بۆ (نادی ڕیازی دۆرە) کە ئاهەنگەکە لەوێ دەبێ زاوا عەزیز بەرخۆ دووەم گەنجە لە چەپەوە. من و سوهام لە ناوەڕاستیان دانیشتووین. ١٩٦٩/٨/٧ طیمەی برام لە تەنیشتی دەستی ڕاستەم، لە بەینی من و زاوا (عەزیز بەرخۆ)دانیشتووە- لە تەنیشت سوهامیش عەینەک بەچاوەکە ئامۆزایەکی باوکمە، ناوی هنەرە و باوکی عودیشۆی برادەرمە. دواکەسیش لە ڕاستەوە، کاک جان تۆماسی کوڕی ئامۆزام ڕۆمێیە

له ڕۆژی ١ ی ئەیلوولی ئەمساڵ (١٩٦٩) له وڵاتی لیبیا، له باکووری قارەی ئەفریقیا لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست، کاتێ که مەلیکی ئەو وڵاته، که ناوی (محمد إدريس النوسی) بوو و تەمەنی ٧٩ ساڵ بوو، له تورکیا بوو بەسەردان بۆ ڕابواردنی بەشێکی هاوین لەوێ؛ کەچی سوپای لیبیا ئینقیلابیان لەسەر ڕژێمەکەی (سنووسی) کرد و واریسی شەرعیش، که (ولی العهد) بوو، ئیقناعیان کرد، واز له (عەرش) بێنێ و له هەموو مافی خۆی و خێزانی خۆش بێ و بڕواته دەردوه... ئەگینا...؟

ئەوه بوو وەلی عەهد به ماڵ و خێزانەوه چی هەبوو بەجێی هێشت و ڕۆیشتن و هەر ئەو ڕۆیشتنه بوو. مەلیکیش هەر نەگەڕایەوه و، ڕژێمی تازەی کۆماری له لیبیا دامەزرا- ئەفسەرێکی پلەی عەقید بووه قائیدی ئینقیلابەکه و هەڵبژێردرا وەک سەرۆکی کۆمار بەناوی (العقيد معمر القذافي).

موعەمەر قەزافی سەرۆکی کۆماری لیبیا، دوای ڕژێمی پاشایەتی ١٩٦٩

# بەڕێز مەلا مستەفای بارزانی

لە ڕۆژی ١٧ی ئەیلوول- ١٩٦٩ لە ڕادیۆی دەنگی کوردستان، بەیانێک بڵاو کرایەوە، ئاراستەی وڵاتانی جیهانی کرابوو وەک بانگەوازێک بوو کە سوپای عێراق بە جۆرەها چەک کوردستان دەدەنە بەر تۆپ و، فڕۆکە جەنگییەکانیان، ناوچەکان کاول دەکەن... بەیانەکەی (بارزانی باوک) باسی سووتاندنی ٦٧ کەس دەکات، کە لە ئەشکەوتێکی دەڤەری دهۆک خۆیان، لە ترسی هێرش و بۆردومانی فڕۆکە، لەو شوێنە حەشار دابوو... بەڵام ئاگریان تێ بەردا و هەموو ئەوانەی لە ئەشکەوتەکەدا بوون، بوون بەڕەژوو (خەڵووز)!

لە شارەکانیش کرابووە عادەت، هەموو ساڵ، لە پایزدا، پێش هاتنی سەرما و بارانی زستان، موتەسەریفەکان ئەمریان دەکرد کە شارەوانییەکان، ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقا بگێڕن بۆ پارە کۆکردنەوە بۆ فەقیر و هەژارەکانی شارەکان... و جلوبەرگی کۆنەشیان لە مالان کۆ دەکردەوە بۆیان. ئەو ئاهەنگانە ناویان لێنابوون (حفلة معونة الشتاء) واتا (ئاهەنگی یارمەتیی زستان)-تەنانەت هەندێ جاریش بەناوی (مکافحة الامیة)- واتا (بۆ لەناوبردن یان نەهێشتنی نەخوێندەواری) ئەو

ئاهەنگێک لە هۆڵی گەل لە هەولێر، بۆ (مکافحة الامیة) لە ١٩٦٩/٩/٩ ساز درا. لە ڕاستەوە: سەری سەردار ئەحمەد دیارە، ئینجا من بە عوود، مونعیم مەزهەر و جان تۆماس و یووسف باکووری (کەمان)- چەتۆ ئەکوردیۆن

جۆرە ئاهەنگانە دەکران- ئێمەی هونەرمەندان، گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەنەکان، دەعوەت دەکراین بۆ سازدانی ئاهەنگەکان، بەڵام نازانین پارەکە دەچووە گیرفانی فەقیر و هەژاران، یان گیرفانی خۆیان!

لە ٥ی تشرینی دووەم لە تەلەڤزیۆنەوە- تەلەڤزیۆنی بەغدا- دیسان داوایان کرد کە بچین بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگێک کە بۆ قوتابیانی بێ دەرامەت و هەتیو و فەقیر بکرێ بەمەبەستی کۆکردنەوەی پارە بۆیان- ئەوە بوو لەگەڵ سوهامی خێزانم سەفەرمان کرد- جا لە ٨ی مانگ جارێ بە تەنیا چووم بۆ تەلەڤزیۆن و گۆرانی (بەستۆرە)م بۆ وێنە گیرا. ئینجا لە شەوی پاشتر، ١١/٩ لە هۆڵی خولد، حەشامەتێکی گەورە کۆ بوونەوە و شوێنی دەرزی نەما بوو... کوردە نیشتەجێی بەغداییش بەجلی کوردی، پیاو و ژن هۆڵەکەیان ڕازندبووەوە. ئێمەی هونەرمەندە کوردەکانیش، لەگەڵ گۆرانیبێژە عەرەبەکانی عێراق: عەفیفە ئەسکەندەر- مائیدە نەزهەت- لەمیعە تۆفیق، یاس خضر... تاد- تا درەنگی دوای نیوەشەو، شانۆی هۆڵ گیڤەی دەهات.

حەسەن جەزراوی

فوئاد ئەحمد - مائدە نەزهەت - ڕەسووڵ گەردی

عەفیفە ئەسکەندەر

نەسرین شێروان

له دوا هەواڵەکانی بیرەوەرییەکانم، له دوا مانگی ساڵی ١٩٦٩ چەند هەواڵێک بەکورتی دەگێڕمەوە... تاکو بچین بۆ ساڵی ١٩٧٠.

١- له ١٨ی دوا مانگی ساڵ (کانوونی یەکەم)- بەڕێز دکتۆر یان ددانسازی بەناوبانگی هەولێری ڕووخۆش و ڕۆح سووک و بەژن قشتیلەی خڕیلەی ئێسک سووک (کاک ڕەئووف دیشچی) بۆ ئەمشەوە دەعوەتێکی گەورەی له ماڵی خۆیان کرد کە له کۆڵانەکەی خۆیان بەرامبەر باڵەخانەی پەروەردەیە، هەموو دختۆرە ناسراوەکانی ئەوسا، وەکو: دختۆران «عەبدولڕەزاق دەباغ، ئاگۆب نیشانی ئەرمەنی، ئیحسان میرزای مووسڵاوی، محەمەد شێخۆی هەولێری و ئەوانی تر ... و هەروەها بەڕێز کاک حوسێن شێروانی - بەڕێوەبەری پۆلیسی لیوای هەولێر و چەند برادەرانی خۆی وەک درواسێی نزیکی! مقاول سەعید یوونس و براکەی و فەتاح جەباری ڕۆح سووک... زۆری تر، له هونەرمەندانیش وەک عادەتی: کاک حەیدەر و کاک تاهیر و من... ئاهەنگێکی زۆر خۆش و سەرکەوتوو بوو بەهۆی خۆشەویستی نێوان خاوەن ماڵ و ئەو هەموو میوانە ئازیزانەی و بەهۆی جۆری خواردن و خواردنەوەی زۆر و نایاب و تێر و پڕ و بەهۆی چریکە نازدارەکانی حەیدەر و قۆریاتە دڵگیر و بەسۆزەکانی و چریکەی بولبولانەی خاڵە تایەر له مەقامە ڕەسەنەکانی کوردی... و مەدحی خۆشم ناکەم!

ئەوانەی له پێشەوە دانیشتوون بە ئەڵقە له ڕاستەوە: ١- دکتۆر تەحسین نوورەدین (دختۆری نەخۆشخانەی سەربازی هەولێر بوو)٢-..........!؟. ٣- بەقاتی ڕەشەوەیە، دکتۆر عەبدولڕەزاق دەباغە. ٤- ..........!؟ ٥- دکتۆر خورشید دزەیی- پسپۆڕی نەخۆشی منداڵان. ٦- ددانسازی هەولێری کاک ڕەئووف ئیبراهیم دیشچی. وێنەکەش له نادی عەسکەری له هەولێر، له ساڵانی شەستەکاندا گیراوە

٢- مامۆستا (فایق جمیل العلي)- هاوڕێی ساڵانی قوتابیاتی و مامۆستایەتیمان له هەولێر پێکەوە... ئەو کۆییە ئەمری له وەزارەتی (معارف) دەرچوو بۆ وەزیفەی بەڕێوەبەری معارف- پەروەردە- زۆر کەیفخۆش بووم... بۆیە له ٢٠ی مانگ چوومە لای، له دائیرەی

مەعاریف کە لە تەنیشت سینەمای سەلاحەدین بوو بۆ پیرۆزبایی ئەو خانووە هەر ماوە و ئێستا دەزگای (رامان)ی تێدایە کە گۆڤاری ناسراوی (ڕامان)ی لێ دەردەچێ و کاک ئازاد عەبدولواحید، بەڕێوەبەری دەزگاکەیە و ئەویش هەر کۆییە و لە هەمان ژوورەکەی بەڕێوەبەری (معارف و پەروەردە) دادەنیشێ!!

٣- بۆ شەوی جەژنی کریسمسی (عید میلاد المسیح) کە هەمیشە لە شەوی (٢٥ی کانوونی یەکەمدایە)، لە ماڵی (دکتۆر ئیحسان میرزا)ی هاوڕێمان، کە دختۆرێکی پسپۆڕی سینگ و سییەکان، و هەناسە بوو. لە ماڵی خۆی کە لە خانووەکەی رەحمەتی شەریف جامباز بوو- هێشتا خانووەکە ماوە و نزیک بورجی مایکرۆیڤی تەلەڤزیۆنی بەغدای جارانە، ئاهەنگەکە خێزانی بوو- ئێمە و ماڵی مەتی ئامۆزام و ماڵی دکتۆر ئاگۆبی ئەرمەنی و زۆر برادەری تر- دیسان هەر من، خۆم، بە تەنیا مۆسیقاژەن و خۆشخوانی ئاهەنگەکە بووم.

دانیشتنێکی خۆش و بەتام لەگەڵ ماڵی دکتۆر ئیحسان میرزا و دۆستانی تر: دکتۆر ئیحسان خەریکی خواردنەوە و کورەکەی: زیادیش هەروەتر، ئینجا سوهامی خێزانم و شۆبانی کورم

(٤) دوا ئاهەنگی ئەمساڵمان، لە مووسڵ، لە ماڵە خزمان... ماشەڵڵا خزممان زۆرن، لەوێ ڕامان بوارد- بەم جۆرە ساڵی ١٩٦٩مان بەرێ کرد، چ بەخۆشی و یان بەناخۆشی!! ئەوەیە ژیان لەسەر ئەم عەردە و لەم وڵاتانەی ڕۆژهەڵاتی کە بەجۆرێک دواکەوتوون، نرخی ژیان نازانین پێی ناوێ من بڵێم! ئێوە لە من چاکتر دەزانن! جا، دەبێ خۆمان ڕێگەی وا بدۆزینەوە بەگفتوگۆ یاخود... بەئاهەنگ، بەپێوەندی جوان... بەڕەوشتی پاک و دڵسۆزانە... ژیانمان بەسەر بەرین و کاتی ناخۆشیش دەبێ بەهێمنی... بەتێگەیشتن لە گیروگرفت و ناخۆشییەکان و دۆزینەوەی چاکترین ڕێگە بۆ زاڵبوون بەسەر تەگەرەکان... و ژیانەکە کورتە بۆیە، پێم وایە! بەهۆی مۆسیقا و گۆرانی ڕەسەن و قورگ و دەنگی خۆشخوانان، خۆشتر و باشتر دەبێ و گەلەک ئازار و تەگەرە و موشکیلەی بە گرێ کوێرە...، بەهۆیانەوە... واتا

بەپەنابردنە بەر مۆسیقا و گۆرانی و... شتە جوانەکانی تر... ئەو گرێ کوێرانە و گرفتانە، سەیر دەکەی زۆر بە ئاسانی، شی بوونەوە و... لاچوون لەسەر ڕێگەی ژیاندا! هەر هەورازێکیش، نشێوێکی لە دوایە و بەپێچەوانەشەوە!

کە گەیشتمە ئێرە لە نووسینی ئەو بیرەوەرییانەم، (مریەم)ی کچی دختۆر سەبا کە بچووکترین نەوەمە- لە پۆلی چواری سەرەتاییە، هاتە لام لە باخچەکەمان و لە لام دانیشت تاوێ بەبێ دەنگی. من ئاورم لێی نەدا... بەردەوام بووم لە نووسین! جا ئەو قیت بووەوە و بە عەرەبی وتی: «جدۆ؟» یانی باپیرە! وتم: ها بەڵێ، وتی: «ئەوە پشتت، چاوت دەستت... ماندوو نابن، ئەوەندە دەنووسی و دەخوێنی؟» وتم: «نەخێر. بەڵام ئەگەر بێ نووسین و بێ خوێندن دانیشم، ئەوە ماندی دەبم...» جا بەخوا هەر واشە!

# ساڵی ١٩٧٠

ئەم ساڵە شتی زۆری لە هەگبەدایە! هەر لە ڕووداوی سیاسی گرینگ و ڕووداوی دڵتەزێن: سروشتی یان کۆمەڵایەتی و دڕندایەتی هەندێ سەرکردەی وڵاتان... هەروەها باری تەندروستی... و دۆزینەوەی چارەسەری و دەرمان بۆ هەندێ نەخۆشی کۆن و نوێ...! واتا ساڵانی حەفتاکان وەرچەرخانێک بوو... یان گۆڕانکارییەک بوو لە سەدەی بیستەم کە بووە هۆی گۆڕانی زۆر شت و بارودۆخی پێش حەفتاکان و دەرکەوتنی شتی لە دوای حەفتاکان لەبەرئەوەی زۆر ماندوو بووم بەنووسینی ئەم بەشی دووەمەی بیرەوەرییەکانم لەم کتێبەدا کە ناوی (تەمەنێک... گۆرانی... ئاواز... مۆسیقا و خۆشخوانی)یە... و کاتێکی زۆر زۆری پێوە خەریک بووم... خۆم لە زۆر شت مەحرووم دەکرد، تاکو چەند لاپەڕەیەک بنووسم و لە ژوورەکەمدا خۆم حەپس بکەم! بۆیە تەنیا شتی زۆر گرینگ و وێنەی زۆر سەرنج ڕاکێشەر دەنووسم و وێنەکان لەگەڵیاندا دادەنێم... یا هەر بەکورتی، هەر وێنەیەک بەدوو سێ وشە یا ڕستەیەک پێناسە دەکەم و بەجێی دەهێڵم! ئەگینا کتێبەکەش زۆر گەورە دەبێ و زۆر لە خوێنەواران وازی لێ دێنن و مێشکی خۆیان پێوە ماندوو ناکەن.

بۆ ئاهەنگەکانی سەری ساڵی تازە، هاتبووینە مووسڵ بۆ بەسەربردنی سەری ساڵ- بۆ ڕۆژی دوایی... هەر لە مووسڵ بیستمان (مفاوضات) بەردەوامە لە لایەن حکوومەتەوە، لەگەڵ بەڕێز مەلا مستەفا بارزانی، هەنگاوی باش نراوە بۆ تێگەیشتن و پێک گەیشتنی هەردوو لا. کە گەڕاینەوە هەولێر، دوای دوو ڕۆژ. هەواڵی خۆش بڵاو بووبووەوە، و پێشبینی دەکرا کە هەردوو لا: کورد و حکوومەتی بەغدا لەسەر هەموو خاڵەکان ڕێک کەوتوون: لە ڕۆژنامەی (الثورة)ش وتاری گرینگ لە لایەن نووسەرانی بەناوبانگ، وەک: حەمید عوسمان، عەزیز ئەلحاج و عەبدولسەمەد خانەقا... لە ژێر عینوانی (حل المسألة الكردية)یان دەنووسی. خەڵکیش بە تامەزرۆوە دەیانخوێندنەوە و جەستە و مێشک ڕەحەت دەبوون!

لە ١٣ی مانگ، ماڵی ئێمە و ماڵی مامۆستا مونیب کە خۆی مووسڵاوییە، بەڵام خێزانەکەی (ست نورالهدی) خەڵکی زاخۆیە، هەموومان لە ماڵی مامۆستا مەجید ئەحمەد

له ڕاستەوە: مامۆستا نەجیب- باکووری- مەجید ئاسنگەر. لە مەسیف سەڵاحەدین

مامۆستا مونیب محەمەد عەلی ١٩٧٠

ئاسنگەر بووین... و چەند ساتێکی ژیانمان بەسەر دەبرد، دوور لە قاڵ و فێڵ! جا لە نێوان قسەکان و بەتایبەتی مامۆستا مەجید زیاتر ئاگاداریی وەزع بوو... کاک مونیبیش هەروەتر... هەردووکیشیان لەگەڵمدا پێکەوە مامۆستا بوون لە ناوەندی جمهووری و ژنەکانیشمان، هەرسێکیان لە قوتابخانەی سەرەتاییی (قەڵا) بوون ... بۆیە هەموویان وتیان کەوا تاقیکردنەوەکانی نیوەی ساڵ دواخراون بۆ مێژووی ٣٠ی ئادار، چونکە خەبەری خۆش لەو ڕۆژانە هەیە. ئەلحەمدولیللا یا ڕەبی.

بەڵام، لە لایەکی تر، لە ٢١ی هەمان ئەم مانگە (کانوونی دووەم) لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن هەواڵی (مؤامرة)یەک ڕاگەیەنرا و چەند جارێ بڵاو کرایەوە کە گوایە تاقمێک بەتەما بوون گۆڕانێک وەک ئینقیلاب بەرپا بکەن بۆ داگیرکردنی دەسەڵات و لابردنی ئەو حکوومەتەی ئەحمەد حەسەن بەکر. ناوی هەندێ لەو کەسانەشیان ئاشکرا کرد کە ئەفسەری خانەنشینکراو بوون لەگەڵ دوو ئافرەتیش: ١- دکتۆرە فاتیمە ئەلخراسان ٢- سەعدییە ساڵح جەبر. گوایە ئێران دەستی لەو هەڵلایە هەیە و چێشتەکە لە مەتبەخی ئەوان لێنراوە!

بەڵام گوتیان کەوا حکوومەت پەردەی لەسەر داماڵین و کەشف کران و هەموویان گیراون. هەر زوو زووش ڕاگەیەندرا کەوا مەحکەمەیەک بەناوی (مەحکەمەی شۆڕش) تەشکیل کرا، بە سەرۆکایەتیی تەها ئەلجزراوی و ئاژاوەچییەکان مەحکەمە کران و حوکمی ئیعدامی چەندانێک دەرچوو بەڵام دوو ئافرەتەکە بەحوکمی ئەبەدی حوکم دران.

لە لای خۆشمان، لە هەولێر، خۆپیشاندان کرا و خەڵک هاواریان دەکرد: «کێتان دەوێ لە کوردان» ئەوانی تر وەڵامیان دەدانەوە: «مەلا مستەفای بارزان» دیسان (کێ گەورەیە بۆ کوردان (یان لە کوردان) وەڵام: مەلا مستەفای بارزان.

لە ٢٢ی شوبات، وا بڵاو بووەوە لە ناو خەڵک، لە هەولێر کە دەیانگوت: پارێزگاری

دوو ئافرەتەکە کە ناویان لە ناو ناوی (موتەئامیرەکان) بوو لە لای ڕاست: سەعدییە ساڵح جەبر. لە لای چەپ: دکتۆرە فاتیمە ئەلخراسان

دوو وێنەی سەری موئامەرەکە، ناوی عەبدولغەنی ئەلراوی بوو...

ئەندامانی سەرکردایەتیی شۆڕش! و سەرۆک کۆمار و دارودەستەی حکوومەت، دوای لەناوبردنی ئاژاوەچییە دوژمنەکانیان، هاتنە ناو شرفە واتا پاڵکۆنی کۆشکی کۆماری و پێشوازییان لە خۆپیشاندەران و چڵکاوخۆرەکانیان کرد... وەک موئەییدی بزووتنەوەکە بوون. سەرۆک کۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر و ئائیبی سەرۆک سەدام حوسێن دیارن. کانوونی دووەم ١٩٧٠ بەغدا

سەلمان داود

هەولێر، محەمەد ئەمین فەرەج دەست بەسەریدا گیراوە و موحافیزێکی نوێ هات لە شوێنی ئەو، ناوی خالید عەبدولحەلیم بوو. وەزعی شاریش خۆشتر بوو... ڕووی گرژ و مۆن و دڵی بەخەم و خەفەت کەمتر لەسەر جادەکان دەبینران. لە پشووی نیوەی ساڵ بەخێزانەوە چووینە بەغدا و من سەرم لە ئێزگە دا و بێژەری ئەوسا، عەزیز کافرۆشی چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژی هونەرییانەی لەگەڵمدا کرد و تۆمار کرا لە ئێزگەی کوردی بەغدا هەروەها لەگەڵ سەبا و شۆبانیش گفتوگۆی کرد و سروودی (جەژن و بەهار)یان گوت و تۆمار کرا.

لە ڕۆژی ١٢ی شوبات، بە تەنیا پیاسەم دەکرد، لە پڕ ترومبێلێکی فۆلکس واگۆن لە تەنیشتمەوە وەستا و یەکێک بانگی کردم: مامۆستا بۆ کوێ دەچی وا بەتەنیا؟ سەیرم کرد برادەری خۆشەویستم کاک جەوادی شەفیق ئاغا بوو- دەرگای بۆ کردمەوە و وتی: برادەرێکمان ئەمشەو لەیانەی (الفقیر) ئاهەنگی بووک گواستنەوەیەتی و ئێمەش دەعوەت کراوین... منیش تۆ دەعوەت دەکەم چونکە لە خۆتانە!! مەسیحیی کۆیەیە... برای کاک فەرەنسی برادەرتە! ئیتر فایدەی نەبوو، چووینە نادیەکە- لەوێش چاوم بەقوتابیی زیرەک و عاقل و بەڕێز، کاک فریادی برای کاک جەواد- کوڕی شەفیق ئاغای تۆبزاوای کۆیە کەوت. ئەو کوڕەی قوتابیم بوو لە (متوسطە)ی کۆیە، زۆرم خۆش دەویست... لە یەکەمەکانی قوتابخانە بوو... زیرەک و هێمن و خوو و ڕەوشتی پاک و جوان!! هۆڵەکەش پڕ بوو لە خێزانە کۆییەکان... و بەم بۆنەشەوە چەند گۆرانییەکم پێشکێش کرد لەسەر داوای کاک جەواد و زاوا و خێزانەکانی تر.

ئەمە وێنەی ئاهەنگەکەی (نادی الفقیر) کە لە بەغدا بۆمان گیرا. جا دکتۆر فریاد پاش ماوەیەک دایمێ... یادکارییەکی خۆشە و بە نرخە لە لام

کە گەڕاینەوە هەولێر، بیستمان کە موحافیزی هەولێر چووە بۆ ڕێزگرتن لە مەلا مستەفا و هەنگاوەکانی دوای موفاوەزات تەواو بکەن... چەند وێنەیەکیش کەوتنە بازاڕ وەک ئەوانەی لە ئەرشیفی خۆمدا هەڵم گرتوون.

ئەمەی دواییش دەقی ئەو هەواڵەیە کە دەڵێ: «سەرچاوەیەکی بەرپرسی لەو گفتوگۆیەی ئێستا بەرپایە لە نێوان حزبی بەعس و حکوومەتی عێراق لە لایەک و مەلا مستەفای بارزانی، بۆ دۆزینەوەی دارشتنێکی (صیغە)یەکی برایەتی هەردوو نەتەوەی عەرەبی و

سەرۆک مەلا مستەفا بارزانیی نەمر و خالید عەبدولحەلیم پارێزگاری هەولێر و حوسێن شێروانی بەڕێوەبەری پۆلیس. ئاداری ١٩٧٠- کوردستان

هەمان ئەو بەڕێزانە لە کوردستان- مانگی ئادار ١٩٧٠.

صدر مسؤول في الحوار مع البرزاني يعلن:

اتفاق حول أهم النقاط ...

صدر مسؤول في الحوار القائم الان بين حزب البعث العربي الاشتراكي العراقية من جهة وبين الملا مصطفى البرزاني لايجاد صيغة لتآخي القوميتين الكردية وتحقيق السلام والوئام في ربوع الوطن ان كثيرا من النقاط المهمة قد تم الاتفاق عليها ..

علمت «الف باء» ان بيانا بمجمل الاتفاق من المنتظر اذاعته خلال الاسبوع

مجلة (ألف باء) - العدد (٨٢)

کوردی و بۆ وەدەستهێنانی ئاشتی و تەبایی لە خاکی نیشتمان و وڵات... گەلێک لە خاڵە (بڕگە) سەرەکییەکانیش، وەک دەڵێن جەوهەرییەکان و گرینگەکان پەسند کراون و لەسەریان ڕێک کەوتوون...»

جا ئەوەی هەموومان، ئێمەی بەتەمەنەکان، لە بیرمانە و وەک دوێنێ بێ، دێتە بیرم کە چۆن سەدام حوسێن، سەرۆکی ئەو وەفدە بوو کە چووە لای جەنابی مەلا مستەفا بارزانی و سەرکردایەتیی پارتی... ئەوانیش وەک کورد کە هەمیشە دڵی پاکە و بەسەبر و تەحەمولە و ئەگەر دوژمنی یەک هەنگاو بنێ بۆ پێشەوە، کورد دوو هەنگاو دەنێ، تاکو زووتر ڕێگەی ئاشتی ببڕدرێ و کورت بکرێت و گیانی هاووڵاتیان زووتر بپارێزرێ و خوێن کەمتر بڕێژرێ و ئاشتی زووتر سەقامگیر بێ. بۆیە لە گەلالە و لە چۆمان و ناوچەکە، لەگەڵ پێشمەرگە بەجورئەتەکان و بەڕابەرایەتیی مەلا مستەفای نەمر، پێشوازییان لە وەفدی حکوومەت و سەدام حوسێن بەگەرمی دەکرد و نیشانیان دەدان، کە کورد چ تەگەرە و گرفت ناخاتە ناو گفتوگۆیەکان و بەمتمانە و باوەڕکرن بە حکوومەت هەنگاو دەنێ بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو کۆسپ و خاڵی ناکۆکی نێوان هەردوو لا. هەندێ وێنەش سەبارەت بەسەردانەکەی سەدام بۆ کوردستان و کۆبوونەوەی لەگەڵ مەلا مستەفا و پێشوازیی خەڵکی بەشەرەفی کوردستان لێیان، لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو زەمانە بلاو دەکرانەوە لەگەڵ وتاری جوان و بەقەڵەمی مرۆڤی وەفادار و موخلیس بۆ مەسەلەی کورد... حەز دەکەم ئەوانەی دەستم کەوتوون هەندێکیان لێرە نیشان بدەم بۆ مێژووی ئەو سەردەمە و موقارەنەکردن لە نێوان وەفای کورد بۆ بریارەکان، و پاشگەزبوونەوەی بەعسییەکان و جووڵانەوەی درندەتر دژی کوردی بێ تاوان.

سەدام حوسێن لەگەڵ سەرکردە و قارەمان مەلا مستەفای بارزانی، لە ناوەڕاستی هەزارەها پێشمەرگەی خەڵکی کوردستان کە بەچەپڵە پێشوازییان لێیان دەکرد شوباتی ١٩٧٠ لە کوردستان

چەند وێنەیەکی تر کە لەو ماوەیەدا بڵاو دەکرانەوە، هەندێکیانم کۆ کردینەوە بۆ مێژوو، بۆ ڕۆژێکی کە خەڵکی کوردستان ئەوەندە ڕێزیان لە حکوومەت و وەفدی حکوومەت دەگرت و بەهەموو جۆرێ لەگەڵیان دەهاتن بەرێوە، تەنیا بۆ ئەوەی کوردستان و هەموو عێراق، ئیتر لە ناخۆشی و شەڕوشۆڕ ڕزگار بن و بکەونە هەوڵ و تەقەلای ڕاستگۆیانە، بۆ ئاشتی! کەچی ئەو بەعسییە بێ ڕەوشتانە و بێ مەعریفەتانە، وەک دەرکەوت کوردیان

دانیشتنی تایبەتی نێوان بارزانیی نەمر و سەدام حوسێن نیشان دەدات
گفتوگۆ بەردەوامە لەسەر ئۆتۆنۆمی بۆ کورد

دەخافڵاند و لە ژێرەوە، تەنگ و چەڵەمە و داویان بۆ دەهۆنییەوە... نەدەهاتە خەیاڵیان کە ڕۆژێک دێ ئەوان لەناو دەچن و حزبە فاشییەکەیان ڕیسوا دەبێ و هەموو دەوڵەتانی جیهاد و نەتەوەکانی دنیا نەعلەتیان لێ دەکەن، بەڵام کورد هەر دەمێنێ هەتا ژیان لەسەر ئەم زەوییە هەبێ.

لە ئەنجامی ئەو کۆبوونەوانە و هاتوچۆی وەفدی حکوومەت بۆ کوردستان و ڕێککەوتنی تەواو لە نێوانیاندا، شەوی ١١ی مانگی ئادار- سەعات هەشت و نیو، لە ڕادیۆی بەغدای عەرەبی و کوردی و تەلڤزیۆنی بەغداش، لە یەک کات، سەرۆکی کۆماری عێراق

ئەو سێ وێنەیە دوای ڕێککەوتنی وەفدی هەردوو لا بەتەواوی
لەسەر ئۆتۆنۆمی (حوکمی زاتی) بلاو کرانەوە لە زۆربەی گۆڤار و
ڕۆژنامەکانی ئاداری ١٩٧٠

جا نەک هەر لە شارە کوردییەکان، لە ناوەڕاست و لە باشووری عێراقیش هەر هەمان جەژن و خۆشی و سەیران و هەڵپەڕکێ بوو...

بەیانی یازدەی ئاداری خوێندەوە و ڕای گەیاند کە حکوومەتەکەی بڕیاری دا کەوا حوکمی زاتی -- ئۆتۆنۆمی- ببەخشێ بە کورد لە ناوچە کوردییەکانی کە ناوچەی کوردنشینە و دواتر خاڵەکان و ناوچەکان زیاتر ڕوون دەکرێنەوە- هەر کە خوێندنی بەیانەکە تەواو بوو، تەقەی خۆشی لە هەموو لایەکەوە، لە شار دەستی پێ کرد و خەڵک بەو شەوە ساردە ڕژانە ناو کووچە و کۆڵانەکان و سەر جادان و بەدروشمی جوان و ڕێک و ئازادانە هاواریان دەکرد و ناوی مەلا مستەفا، سەرۆکی پارتی و کورد لەسەر هەموو زارێک بوو. بۆیەکەش، ئیعلان کرا کە سبەی واتا ١٢ی ئاداریش دەبێتە پشوو- وێنەی بارزانیش لە هەموو دیوار و ناو دوکان و دائیرە و قوتابخانەکان لێدرا و هەڵواسران. ترومبێلەکان، هەموویان، لە ناو شەقامەکان

دەگەڕان و دەسووڕان و سروودی کوردییان دەچڕی.

ئینجـــا کـــە وەزارەتی نوێ دامـــەزرا و چەند وەزیرێکی کـوردیان تێـدابوو، ڕۆژنامـەکـان، پەیتـا پەیتـا دەچوونە لای وەزیرە کـــوردەکـــان و دیمانە و چاوپێکەوتنیان لەگەڵیان دەکرد. بۆ نموونە گۆڤاری هەفتانەی (الراصد)ی مانگی نیسان دیمانەی لەگەڵ هەردوو بەڕێز: نـافـیز جەلال- وەزیری کشـتـوکـاڵ و نووری شاوێس- وەزیری ئەشغـال و ئیسکان کرد، کە هەندێ شتی نەزانراویان باس کـرد، وەک ناوی ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی... و هەندێ خاڵی تری کە باس کراون بۆ خزمـەت گەیاندن بـەتێکڕای دانیشوانی عێراق.

بۆ جـەژنی نەورۆزی ئەو ساڵەی (١٩٧٠) لیژنەی تایـبـەت و پسـپـۆڕ دامـەزێنرابوو بۆ ئامادەکردنی بەرنامە و شوێن و دەعوەتکردنی مرۆڤی دڵپاک و دڵسۆز بۆ کورد و مەسەلەی کـورد، لە دەرەوەی عـێـراق و لە ناوەوە و سـەفـیـری دەوڵەتە بیـانـیـیـەکـان لە بەغـدا و ڕۆژنامەنووسانی بیـانی و عـێراقی و تیمی ڕادیۆی کوردی و عەرەبی بەغدا و تەلەڤزیۆنی بەغدا. هەروەها دەعـوەتکردنی هەندێ هونەرمـەندی ناسراوی عەرەب لە مـیـسر و لبنان و وڵاتانی ترکە بێن و بەشداری لە ئاهەنگەکانی جەژنی کورد- جەژنی نەورۆز بکەن-

الاستاذ اندريوس باكوري المحترم

بۆ ئێـــمـــە، هونەرمـــەندانی لە کـوردســتـــانێن، لە ڕادیۆی کـوردی نامــەی تایبـەتمان بۆ هات، هەریەک بەجیا، بۆ ئەو مەبەستە.

دیـاریش بـوو، ئەو دەزگـــــایـە- مــەبەســتم بەڕێوەبەرایەتیی ڕادیۆی کـوردی بەغـدا- پێـوەندییـان لەگـەڵ پارێزگـای هەولێـر کـردبوو کـە ئێـمـە (ئیـفـاد) بکـرێین بۆ بەغـدا، بۆ چەند ڕۆژێ بۆ بەشـداریکردنمان لە جـەژنی

نــــەورۆزی ١٩٧٠/٣/٢١ وەک لـــەو کـــتـــابە ڕەســمـــیــیــەی بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە و فێرکردن (مدیرية التربية و التعليم- محافظة أربيل) دا هاتووە: «ئیــفــادکــردنی ئەو هونەرمــەندانە بۆ بەغــدا، بۆ مــاوەی ٧ حــەفت ڕۆژ... لە ١٩٧٠/٣/١٦ وە...» ١- فـــــوئـاد ئەحـــمـــەد ٢- تەحــسین تەها ٣- من (باکـــووری) ٤- عــەباس محــەمــەد ئەمین.

عەبدولئیلاه حاجی موسا بەڕێوەبەری ئێزگەی ڕادیۆی کوردی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠ بەملاوە

ئەوە بوو، ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی ٣/١٧ لەگـــەڵ بەڕێز کـــاک فـــوئـاد ئەحـمـەد، هونەرمـەندی هاوڕێم، ڕێک کەوتبووین کە پێکەوە سەفەرەکە بکەین بۆ بەغـدا، بە ترومـبـێلەکـەی خۆی کە ترومــــبــــێلێکی سکۆدای ڕەنگ زەردی ڕووسی بوو! لە بەغـــداش پێکەوە لە ژوورێکی ئوتێلی کـاک کــەیفی دابەزین- دوای ئیسراحەت، چووینە شوێنی پرۆڤەکردن، لە بارەگای (الفرقة القومية) بوو، لە نزیک ئیزاعە! لەوێ تیپی مۆسیقای سلێمانی ئامادە بوون بەسەرۆکایەتیی هونەرمەند کاک ئەنوەر قەرەداغی و کاک ولیەمیشیان لەگەڵدا بوو- هونەرمەندانی دیکەش هاتن: عومەر دزەیی و عەدنان جەماڵ و ڕەسووڵ گەردی و تەحسین تەها... ئیتر تا درەنگ خەریکی پرۆڤەکان بووین.

شەوی پێنجشەممە ١٩ی مارت- سەردانی ماڵی هاوڕێی ئازیزم کاک وەحید بامەڕنیم کرد و لەگەڵ گۆرانی و عوود و قسە خۆشەکانی کاک فەخری برا گەورەی کاک وەحید، تا درەنگ ڕامان بوارد و من و کاک فەخری، لە ژوورەکەی خۆی نوستین...بەڵام ئاهەنگی گۆرانی ئوم کەلسووم هەبوو لە قاهیرە، بۆیە یەکەم گۆرانیمان گوێ لێ ڕاگرت کە گۆرانی (ذکريات) بوو! مەپرسە من و فەخری- کە ئەویش بەهرەی هونەری و دەنگخۆشی هەبوو... کە چەند خۆش بوو شەوەکە. ئینجا بۆ بەیانیش هەموویانم دەعوەت کرد. بۆ شەوەکە... واتا

بۆ یەکەم شەوی ئاهەنگی نەورۆز، کە ڕۆژی ٢٠ی مانگ بوو بۆ (عام) و لە هۆڵی (سینەمای سەمیرئەمیس) بەڕێوە چوو. جا من ڕۆیشتم و ئەوان بەشەو هەموو هاتبوون بۆ ئاهەنگەکە و تا کۆتایی مانەوە و دیسان منیان لەگەڵ خۆیان بردەوەماڵیان و هەمدیس باقی شەوەکەمان بەبەزم و عوود و خۆشی بەسەر برد. جا بۆ شەوی ٢١ی نەورۆز، شەممە بوو، لە هۆڵی خولد بەڕێوە دەچوو. لێپرسراوە هەرە گەورەکانی حکوومەت و نوێنەرانی کورد... و هەموو کوردەکانی بەغدا و ئاشوورییەکان و تیپە جۆراوجۆرەکانی موزیکی کورد و عەرەب و دەستەی هەڵپەرکێی کورد و ئاشووری، کۆرسەکانی ئێزگەی کوردی... هۆڵەکە لێی دەڕژا...

لە بەشی یەکەمی ئاهەنگەکە زیاتر بەرهەمەکانی هونەرمەندە کوردەکانن پێشکێش کران: ئەوانی عێراقی و ئینجا ئەوانەی لە وڵاتە عەرەبەکانەوە هاتبوون: سەمیرە تۆفیق، سەماکەر نەجوا فوئاد، سەماکەری لبنانی نادییە جەمال و مامۆستا عەلی مەردان مەقامێکی عەرەبی و ئی کوردی گوت. عومەر دزەیی (گوڵی خوێناوی) گوت- عەدنان جەمال سروودی (یازدەی ئادار)ی گوت- جەعفەر حەسەن سروودێکی بۆ پێشمەرگەی گوت- من گۆرانی (نەورۆزە مەستم) و گۆرانییەکی ئاسووریم گوت...

سەماکەری لبنانی نادییە جەمال

ئیتر ئابەم جۆرە، بەگوێرەی برگەکانی کە لە بەرنامەکەدا بوون کە لێرەش دامناوە وەک مێژوویێکی خۆشی ئەو دەمە، ئاهەنگەکە تا سەعات ٢ی بەیانی ڕۆژی پاشتری خایاند

لە پاشان کە هەموو گەڕاینەوە... هەریەک بۆ شار و ماڵی خۆی، جارێکی تر، لە ١٤ی

باکووری و گۆرانی نەورۆز هۆڵی
خولد- بەغدا ١٩٧٠/٣/٢١

گۆرانیبێژی عێراقی ئەحلام وەهبی لەگەڵ تیپی
مۆسیقای ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنی بەغدا- هۆڵی خولد
١٩٧٠/٣/٢١

نیسان داوا کراین کە بچینە کەرکووک و لە ئوتێلی کەرکووک شوێنمان بۆ ئامادە کرابوو!!
کە گەیشتینە ئەوێ، (عبدالإله حاج موسی) پێشوازی لێ کردین و ڕای گەیاند کە ١٢ڕۆژ
ئیفادی داوا کردووە بۆمان، بۆ بەشداریکردنمان لە چەندین ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی لە
شارەکانی کوردستان. هەر شوێنێ دوو یان سێ شەو ئاهەنگی تێدا دەکرێ. نەک هەر
هونەرمەندە کوردەکان، بەڵکو زۆربەی هونەرمەندە عەرەبە عێراقییەکانیشمان لەگەڵدا
بوون و ئەوان پێش ئێمە هاتبوون- ئەم میهرەجانەش دەزگای ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی عێراق
پێی هەڵسا. جا لێپرسراوی هەموو ئەو هونەرمەندانەش و بەڕێوەبردنی کارەکان، گەنجێکی
بەعسی بوو... ناوی (صفوت محمد فرید النحاس) بوو، وەزیفەکەی (مدیر البرامج
الموجهة و المحلية) بوو، لە دەزگای ڕاگەیاندنی بەغدا، تەعین کرابوو! جا ئەوەش بۆمان
دەرکەوت شەلاتییەکی بێ ئەخلاق بوو. جارێ قەت نەماندەدیت و قسەی لەگەڵماندا
نەدەکرد. دوو سەماکەری قەحپەشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بەدرێژایی ئەو گەشتەی کە
کردمان، لە کەرکووک و سلێمانی و هەولێر، شەو و ڕۆژ، خۆی و ئەو دوو ئافرەتە زۆر
بەناموسانە! لە ژوورێک لە ئوتێل. دەرنەدەچوون و بۆیەکانی ئوتێلەکان لە کەرکووک یا
سلێمانی... تاد، هەر پێ دەوەستان سینی پڕ لە وێسکی و پەرداخ و مەزە بەرن بۆ ژووری
ئەو کابرایە بەشەرەفە! وەک شەرەفی ئەوانەی کە نموونەی ئاوایان ناردبوو بۆ سەرپەرشتیی
ئاهەنگەکانی نەورۆز بکات! دوو شەوی یەکەم هەر لە کەرکووک، شەوی یەکەم لە

سینەمای ئەتلەس و شەوی دووەم لە مەلعەبی شاری وەرزش، ئاهەنگەکان کران- عالەمێکی زۆر هاتبوون، بەتایبەتی شەوی دووەم لە مەلعەب، کە ئەوەندە قەرەباڵغ بوو... ئاهەنگەکە لە ڕێکوپێکی و تەرتیب دەرچوو! وای لێ هات زۆر بێ سەروبەر بوو!

ڕۆژی ١٧ی نیسان، بەڕێ کەوتین، بەدوو ترومبێلی پاسی گواستنەوەی گشتی لە جۆری نیسان، بەرەو شاری سلێمانی، وردە بارانێکیش دەباری و دەوروبەری ڕێگەش هەر سەوزایی و گوڵی نیسان بوو- هەر کە گەیشتینە بازیان لەوێوە منداڵی ١٠، ١٢، ١٣ ساڵان، گوڵی نێرگیزی کوردستانیان لەسەر ترومبێلەکانمان دەباراند! و لە پەنجەرەکانەوە بەڕوومەت و سەریاندا فڕێ دەداین و یان بەدەستە بەغاردان لەگەڵ ترومبێلەکە و ئێمە دەستمان بۆیان درێژ دەکرد و ئەوان دەیاندانە دەستمان! ئۆف چەند خۆش بوو شتەکە... ڕووداوەکە بەگشتی خۆش بوو بۆنی ئاشتی و کامەرانی گەل و وڵاتی لێوە دەهات. کەشوهەوا باراناوییەکە- ئەوانەی لە بەغداوە هاتبوون دەیانگوت ئێمە لە بەغدا سووتاین لە گەرمای هەتاو وەک هاوینە لە لامان! کەچی لەو ڕێگەیە خۆشە، ئەو هەوایە فێنکە و پڕیشکی باران کە لە دەموچاومانی دەدا و گوڵەنێرگزەکان بەدەستی منداڵە جوانەکانی دەموچاو سوور و سپی و قژ زەرد لەم چۆڵە، لە ناو ئەو بەهەشتە سەوزە پڕ گوڵی سوور و زەرد و شین... لە هەموو ڕەنگێ... لەگەڵ گۆرانییەکانمان کە لە ناو ترومبێلەکان دەمان گوتن بەکوردی و عەرەبی... ئای ئەگەر بەردەوام بوایە تا ئەمڕۆ (کە سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەمە)... ئەو شێت و بەعسی بێ تێفکرین و بێ مەبدەئە، لێمانیان تێک نەدابایە، هیچ پێویستی بەو دڕندایەتییە نەدەبوو کە ئەمڕۆ لە عێراق دەکرێ، کورد لە شارەکان و وڵاتی خۆیان دەژین بەئاسوودەیی و پێوەندییان زۆر ڕێک و باش و خۆش بوو لەگەڵ سەرتاپای شارەکانی تری عێراق!

لە سلێمانی، گەنجە هونەرمەندەکان و لیژنەی پێشوازیکردنمان کە لە پارێزگای سلێمانییەوە دانرابوو، هاتن بەپیرمانەوە و خەڵکی سلێمانی دەوریان لە ترومبێلە پاسەکان دا و هەر گۆرانیبێژێک کە لە دەرگای پاسەکە دادەبەزی، هاواریان دەکرد و ناویان دەهێنا و چەپڵەیان بۆ لێ دەداین و گوڵیان پێشکێش دەکردین. لە یانەی مووەزەفانی سلێمانیش، شانۆیەکی باش و ڕازاوەیان دروست کردبوو. ئیتر ئەو شەوە یەکەم ئاهەنگ دەستی پێ کرد- گۆرانیبێژە عەرەبە عێراقییەکان زۆر شاد بوون بەو پێشوازییە و بەهەموو دڵەوە و بەهەستێکی جوانی پاکی ڕاستەقینە گۆرانییان دەگوت.

تیپەکەی لەگەڵ گۆرانیبێژە کوردییەکان، من سەرپەرشتیم دەکرد و لە نۆرەی خۆم،

باکووری لە ئاهەنگی ئاشتی (حفلات السلام) لە شاری سلێمانی، شەوی ١٧ی نیسانی ١٩٧٠ کە هەر بەردەوامی ئاهەنگەکانی نەورۆز بوو کە لە ١٩٧٠/٣/٢١ لە بەغدا کران بەبۆنەی بەرقەراربوونی ئاشتی لە نێوان کورد و عەرەب، کە لە بەیانەکەی ١١ی ئاداردا ڕاگەیێنرا. لە لای چەپەوە: مونەرمەند شەوکەت ڕەشید- کلارنێت، ئینجا کاک نەشئەت حەمید- نای (شمشاڵ)، من (باکووری) بەعوودەوە گۆرانی دەڵێم، یونس لە برا عەرەبەکانی ئێزگەی کوردی ئەوکوردیۆن دەژەنێ و هاتووە لەگەڵ وەفدی بەغدا و ئەوەکەی ئیقاعیش لێ دەدا، ناوەکەیم لە بیر نەماوە

ڕەسووڵ گەردی لە هەمان ئاهەنگەکەی نەورۆز- لە سلێمانی بەحەیرانە نایابەکانی خەڵکەکەی هێنابووە جۆش و خرۆش ١٩٧٠/٤/١٧

گۆرانیشم دەگوت... زۆریان گۆرانی لێمان داوا دەکرد... ئەگەر تا بەیانی، نەمانبڕیبایەوە، ئەوان دادەنیشتن.

بەداخەوە، ڕۆژی دواتر بیستمان کەوا بۆمبایەک فڕێدراوەتە قوتابخانەیەکی کچانی سلێمانی و زیانی گەیاندووە... وتیان ئەوەی بۆمبایەکەی هاویشتووە دەستگیر کراوە، کە دەرچوو ناوی جەمال کۆچەر بوو کە برای هونەرمەندی ئێزگەی کوردی جەلال کۆچەرە- بۆیە ڕۆژی ١٨ی مانگ، شاری سلێمانی بارودۆخەکەی تەواو نەبوو، لێپرسراوی ئاهەنگەکان (صفوت الغاس) بڕیاری دا ئاهەنگ نەکرێ- جا عەبدولئیلاه حاجی مووسای بەڕێوەبەری ئێزگەکەی کوردی کە وەک باسم کرد، ئەو لێپرسراوی ئێمە بوو وتی: وەرن من ئەو شەو دەعوەتتان دەکەم لە سەرچنار- ئەوەبوو: کاک عەبدولئیلاه و من و فوئاد ئەحمەد و یووسفی برام و نەشئەت حەمید- بەترومبێلێک چووینە یەک لە بارەکانی سەرچنار و شەوەکەمان بەخواردن و قسەی خۆش و باس و خواسی دنیا بەسەر برد. ١٩ی نیسان، بڕیار درا کە ئەمشەو ئاهەنگی نەورۆز بکرێ. ئاهەنگەکەش لە سینەمای ڕەشید کرا و زۆر قەرەباڵغ بوو، چونکە بارانیش بوو!

ڕۆژی ٢٠ی نیسان بەرەو هەولێر سەفەرمان کرد و ڕێگەکەمان هەر بەگۆرانی و چەپڵە و نوکتەی برا عەرەبەکان و کوردەکان... نزیکی ٣ سەعاتمان بڕی! لە هەولێر چوومەماڵەوە و دوای ئیسراحەت، منداڵ و خاوخێزانم برد لەگەڵ خۆمدا بۆ هۆڵی گەل... چونکە ئاهەنگی نەورۆز لەوێ کرا- هونەرمەندەکانی شارەکانی تر لە ئوتێلی ئەربیل شوێنیان بۆ ئامادە کرابوو- پێشتر (دار الضباط)بوو کە بەرامبەر سانەوی کوڕان بوو لەسەر ڕێگەی مووسڵ- پاشان لە زەمانی سەدام کرایە (ئەمن) و تا ڕاپەڕین هەر دائیرەی ئەمنی بەعسی بوو.

جا بەڕۆژ زۆرێک لە هاووڵاتیان سەریان لەو شوێنە دەدا بۆ دیتنی هونەرمەندەکانی کەوا موعجەب بوون پێیان... مائدە نەزهەت، عەفیفە ئەسکەندەر، لەمیعە تۆفیق، ئەحمەد خەلیل، یاس خضر، حوسێن نیعمە، عەلی مەردان، حەسەن جەزراوی، محەمەد عارف جەزراوی، عیسا بەرواری، داود ئەلقەیسی، جگە لە ئێمە کە لە هەولێر نیشتەجێ بووین- هونەرمەندی وێنەکێشی فۆتۆگرافی ئەبو سەباح پێ ڕانەدەگەیشت وێنەی فۆتۆگرافیان بۆ بگرێ.

لێرەدا پێم خۆشە هەندێ وێنەی ئەو ئاهەنگانە و هونەرمەندەکانی کورد و عەرەب لەگەڵ ئەم قسانەم بڵاو بکەمەوە- هەمووشیان وێنەگری ئەوسای ناسراو ئەبو سەباح گرتوونی!

له دوا شەوی پێشکێشکردنی ئاهەنگەکانی نەورۆز، ل، هۆڵی گەل، لە هەولێر- مام ڕەسووڵ گەردی بەعەرەبی و بەکوردی قسەی کرد و ڕووی لە هەموو هونەرمەندەکان کرد،

لە چەپەوە: ١- بەشار زاخۆلی قاتی سپی لەبەرە ٢- مامۆستای گەورە عەلی مەردان ٣- عیسا بەرواری ٤- یاس خضر ٥- محەمەد عارف جەزیری ٦- حوسێن نیعمە ٧- حەسەن جەزراوی ٨- تایەر تۆفیق ٩- باکووری ل، (فندق أربیل) جەژنەکانی نەورۆز- نیسانی ١٩٧٠ لە گەشتێکی هونەری لە شارەکانی کوردستان. هەولێر

لە فندق ئەربیل بەکامێرای ئەبو سەباحی هونەرمەند گیراوە:- لە چەپەوە: ١- مامۆستا عەلی مەردان ٢- وێنەگر ئەبو سەباح ٣- عەبدولئیلاه حاجی موسا- بەڕێوەبەری ئێزگەی ڕادیۆی کوردی بەغدا، لە حەفتاکان ٤- باکووری ٥- عیسا بەرواری ٦- تایەر تۆفیق.

له ڕاستەوە:١- عەبدوڵڵا عەباس ٢- هاشم جەباری ٣- عەلی مەردان ٤- باکووری ٥- بەشار زاخۆلی- هۆڵی (فندق أربيل) هەولێر- نیسانی ١٩٧٠

یەک لەو دوو ئافرەتە سەماکەرانەی لەو گەشتە نەورۆزییە هونەرییە لەگەڵماندا بوون بەدرێژاییی گەشتەکەمان، ئەمەیان ناوی نادییە بوو من و هەردوو کوڕەکانم لە پشتەوەی شانۆ، لە (کەوالیس) دانیشتبووین نادییە هات و سەلامی کرد چونکە منی دەناسی، هەموو شەو پێکەوە لەسەر شانۆ یەکترمان دەبینی. جا ئەو شەوەی لە هەولێر، کە هاتە لامان کوڕەکانمی دیت و حەزی کرد وێنەیان لەگەڵ بگرێ. ئەبو سەباح ئامادەبوو ئەو وێنەی بۆ گرتن. شەوی ٢١ی نسان ١٩٧٠ نازانم.. ئایا جەنابی (مدير البرامج الموجهة و المحلية) ئاگای لەو وێنەیە بوو؟ ئەگەر بیدیتبایە.. ڕەنگە کارەساتێکی بۆ ئەو ژنە هونەرمەندە دەخولقاند... چونکە بەبێ ڕەزامەندی جەنابی سەفوەت نەحاس وێنەکەی گرت!

کە کۆ بووبووینەوە و خەریکی ڕۆیشتن بووین فەرمووی: «أخوانی باچر کولکوم، الزُهز (واتا الظُهر- نیوەڕۆ) تتفدون عندي... آني مسوي أكل!»- یەعنی برایان سبەی بۆ نیوەڕۆ، هەمووتان لە لای من نانی نیوەڕۆ دەخۆن و خواردنم ئامادە کردووە. جا هەموومان ڕازی نەبووین و هەوڵمان دا مام ڕەسووڵ ئیقناع بکەین کە خواردنەکە نەکات... ئاخر ئێمە لێکمان دەدایەوە یەکەم مەسرەفێکی زۆری دەوێ... چونکە ٣٠ کەس دەبووین. دووەم خانووەکەی کاک ڕەسووڵ: هەیوانێکی بچووکە دوو ژووری زۆر بچووک و حەوشەکەی هەر سێ مەتر دەبوو- خانووێکی بەقوڕ و خشت دروستکراوی، کۆنی بەلەدییە بوو- دوو سێ منداڵی کیژ و کوڕی گەنجی هەبوو! کەچی گەردی هەزار سوێندی خوارد کە دەبێ هەموومان بچین ئەگینا لێمان تووڕە دەبێ! نیوەڕۆ ئەو ئاپۆرە هونەرمەندانە هەموومان خۆشترین برنج و فاسۆلیای وشکمان خوارد بە مەرەگە! ئینجا چای هات- لەبەرئەوە لە ژوورەوە جێ نەبوو، هەموومان لە دەرەوە لەبەر دەرگای خانووەکەی وەستابووین... لەگەڵ خواردن و چایەکەش، بەڕێز لەسەرمان دەگەڕا و نوکتەیەک لێرە و قسەیەکی خۆش لەوێ بەڕاستی بیرەوەرییەکە تا چەندەها ساڵ کە دەچوومە بەغدا و هەر هونەرمەندێکی تووشی بام،

لە بەردەم دەرگای خانووە (کۆلیتە)کەی ڕەسوڵ گەردی گیراوە لە مانگی نیسانی ١٩٧٠- ئەو هونەرمەندانە ناسراون: دانیشتووەکان لە ڕاستەوە: سامی عەبدولئەحەد نەشئەت حەمید- داود قەیسی- یووسف باکووری. وەستاوەکان: لە ڕاستەوە ١ ..... ٢- تەحسین تەها ٣- هاشم جەباری ٤- ڕەسووڵ گەردی ٥ بەشار زاخۆلی ٦ سەفین ڕەسووڵ گەردی

چەند هونەرمەندێک لە بەشداربووانی ئاهەنگەکانی نەورۆز کە لە شارەکانی کوردستان کرا، لە گەشتێکی هونەری بەناوی (قافلة السلام) بەبۆنەی بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، کە لە مانگی نیسان کرا– جا لە ژێر دیواری خانووە سادە بچووک، و لە خشت و قوڕ دروستکراوی بەلەدییە بوو، درابووە مام ڕەسووڵ بەکرێ– ئێمەی دەعوەت کردە ماڵی خۆی بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ– کەوا ٣٠ی کەس دەبووین. لە ڕاستەوە: من وا چای دەخۆمەوە، ئینجا عەبدوڵڵا عەباسی بێژەری ئێزگەی کوردی بەغدا، ئینجا هونەرمەند ئەحمەد خەلیل ئیستیکانی چای بەدەستەوەیە– ئینجا داود قەیسی– دوواکەیش لە لای چەپ– یەک لە مۆسیقاژەنەکانە کەمانچەی لێ دەدا.
هەولێر نیسانی ساڵی ١٩٧٠

خۆم و هەردوو کوڕەکانم– لە هۆڵی گەل لەگەڵ گۆرانیبێژی عەرەبی حوسێن نیعمە.
هەولێر ١٩٧٠/٤/٢٠

من و هەردوو لاوکبێژی دەنگخۆشی دەڤەری بادینان: عیسا بەرواری لە لای ڕاست و محەمەد عارفی جزیری لە لای چەپ - منداڵەکەش شۆبانی کورمە- لە هۆڵی گەل- بەبۆنەی جەژنەکانی ئادار و نەورۆز - ٢٠ی نیسانی ساڵی ١٩٧٠

یادەکە و بیرەوەری دەعوەتەکەی خاڵە ڕەسووڵ گەردی و سەخاوەتەکەیان باس دەکرد.

ساڵی ١٩٧٠ بۆ کورد و بۆ عێراقییەکان بەگشتی، ساڵێکی جیاواز بوو! خەڵک ئاسوودە دەژیان... کارەکان جوان و ڕێک ئەنجام دەدران: لە قوتابخانە، لە کارگە، لە گوندان و کێڵگەکان... لە بازاڕ...! هاتوچۆی نێوان شارەکان تێکڕا ئاسایی بوو! شارە کوردستانییەکان لە بەهار و هاویندا، جمەیان دەهات لە سەیرانکەران و هەوادارانی گەشتوگوزار... شەقڵاوە، بۆ نموونە... نە کەپر مابوو، نە ژووری بەتاڵ لە ئوتێلەکان، خەڵک لەسەر ڕەسیف و جادەکان پاڵیان دەدایەوە و دەنوستن... بەڵکو هەندێک تاکو بەیانیش هەر بەگۆرانی چڕین و چەپڵە و سەما، شەوەکەیان ڕۆژ دەکردەوە!

کەواتە هەمیشە مۆسیقا و گۆرانی ئەگەر بایەخی پێ درا و سەیران زۆر بوو گەشت و سیاحەت بەرپا بوو، ئەوە نیشانەی خۆشگوزەرانی و کامەرانییە... واتا خەڵک لە وەزع و لە سیاسەتی سەرکردەکانیان ڕازین.. ماوەشیان هەیە بۆ ڕابواردن! چونکە هەوادارانی سیاسەت، هەردەم کەمترن لە ناو دانیشتوانی شار، ئەگەرچی بەهۆی هەوڵ و خەباتی ئەوان میللەتەکەیان ئاسوودە و سەرفراز دەبێ!!

چەند وێنەیەکی تر لەگەڵ ئەم قسانەم بڵاو دەکەمەوە بۆ ئەوەی کۆتاییی بێنمەوە بەرووداوەکانی ئەم ساڵە (١٩٧٠).

مامۆستایانی ناوەندی جمهووری کوڕان زوو زوو، لە ڕۆژانی هەینی یان جەژندا، سەیرانمان ڕێک دەخست بۆ ناو ئەو دیمەنە دڵگیرانەی ئەو وڵاتە شیرینە: کوردستان! وێنەکە لە نێوان دار و درەختەکانی دارستانە بەهەشتەکەی شارۆچکەی کەلەکی یاسین ئاغا– نێوان هەولێر و مووسڵ. لە چەپەوە: مامۆستا قەرەنی ئەسوەد، مامۆستا عەبدوڵڵا فەقێ موراد، مامۆستا سامی ئەسعەد، مامۆستا جەمال محەمەد ئەمین، منی خۆشخوانی سەیران بە جومبووشەوە، مامۆستا ئیسماعیل عومەر سنجاری، مامۆستا مونیب مەحموود، مامۆستا عیرفان سەعید. ٢ نیسانی ١٩٧٠

لە ڕاستەوە: جان تۆماس– باکووری– تەحسین تەها– سابیر عەبدولڕەحمان– سەباح عەبدولڕەحمان– بەشداریمان لە جەژنی نەورۆزی شاری پاشای گەورە کرد... ڕەواندزی هەردەم قارەمان. بەکامێرای عەدنان شاکر عوزێری. ٣/٢٤ ڕواندز

تیپی مۆسیقای باواجی شاری کۆیەی سەرچاوەی ڕەسەنایەتی شیعر، ئەدەب، مەقام و گۆرانی...، ئەویش خۆشی خۆی دەربڕی لە ئاهەنگێکی قەشەنگی سەرەتای ئەو هاوینە، لە باخچەی یانەی فەرمانبەرانی کۆیە.

شاری کۆیەی سالانی بیستەکانی سەدەم بیستەم کە بەقەد کوندێکی گەورە بوو- بەڵام گەورە و بەرز بوو لەو بوارە ڕۆشنبیرییانەی لەسەرەوە باسمکردن و هەر بوارەش کەسایەتیی ناسراوی خۆی هەبوو: ئەختەر- حەنیل- سێوە- مەلا ئەسعەد- تاهیر تۆفیق (هونەر)، حاجی قادر- مەلای گەورە- جۆبار- دلزار- دلدار- عەونی (شیعر)- مەسعوود محەمەد- تاهیر حەوێزی- کەریم شارەزا (ئەدەب و نووسەر)... تاد.

دەنگخۆشی مەقامزانی هەولێر شاری قارەمانان و پایەتەختی کوردستان، مامۆستا شێخ فەتاح ئال موفتی لە هەموو بۆنە و موناسەباتی خۆشی، لە لای دۆست و ئەحبابانی و لە دەشت و سەیران بەدەنگە زوڵاڵە نەرم و سیحرییەکەی دەمانهێنێتە جۆش.

یووسف باکووریش، بەتیپە ڕۆژئاواییە بەناوبانگەکەی کە شانۆ و گازینۆکانی، بەغدای هێنابووە دنیایەکی دیکەی مۆسیقا و بەئاوازە بیانییەکان و بەستە سووکەڵەکانی کوردی، گەشتیاری و میوانانی ئەو شوێنانەی سەرسام کردبوون.

هونەردۆست خۆشخوان شێخ فەتاحی موفتیزادەی هەولێر، گوێمان دەزرینگێنێتەوە بەئاوازی مەقامی ڕەسەنی بەتام و ئەو ڕۆژە پاییزییەی لێمان کردە بەهار سەرلەنوێ.
مەسیف سەلاحەدین

تیپە ڕۆژئاواییەکەی یووسف باکووری، لە شەوێکی بەغدای- شاری هەزار و یەکشەو- (ألف ليلة وليلة) میوانەکانی بەمۆسیقاکەی مەست و مەجنوون کردوون!!

# خوێنەرانی خۆشتقی

لەو بڕوایەدام کە بە خوێندنەوەی لاپەڕەکانی ئەم گەشتەی ژیانم- کە بەشی دووەمە لە کتێبی (تەمەنێک گۆرانی... ئاواز... مۆسیقا و خۆشخوانی) ماندوو نەبووبن وەک من کە چەند ماندوو بووم بەئامادەکردن و نووسینی بۆ جاری دووەم و سێیەم... تا بەو شێوەیە هاتە بەردەستتان. هیوادارم تام و چێژی خۆشتان چێژتبێ لە خوێندنەوەی ڕووداوەکان...

منی ماندووش، قەڵەمەکەم دادەنێم و هەناسەیەک وەردەگرم... ئینجا لە سبەینێوە دەگەڕێم بزانم کێ...؟ کام دەزگا؟ کام چاپخانە بۆم لە چاپ و بڵاو دەکەنەوە... ئینجا خۆم ئامادە دەکەم بۆ نووسینی بەشی سێیەم جا نازانم پێ ڕادەگەم ئەویش تەواو بکەم؟ ئەم بەشە، وەک دەبینن، لە ساڵی ١٩٥٧ەوەیە تاکو ساڵی ١٩٧٠ جا پەنا بەخوا و ئەگەر تەمەنم تێیدا مابێ، وابزانم بەشی سێیەم زۆر گرینگتر و تێر و تەسەلتر دەبێ. کەواتە ئێستا کاتی ئەوەیە بڵێم: خۆشەویستیم و ڕێزم بۆ هەمووتانە... بۆ هەموو خوێنەران، لە هەرکوێیەک بن... خوا تەمەنێکی درێژی پڕ کامەرانی و تەندروستییەکی زۆر باشتان بە نسیب بکات- خواتان لەگەڵ

دڵسۆزتان باکووری

٢٠٠٦/هەولێر

تێبینی: لە ماوەی ئەم چەند مانگەی تێپەڕین و لە دوای چاپ و بڵاوکردنەوەی (بەشی یەکەم) لەم کتێبەم بەناوی (تەمەنێک گۆرانی، ئاواز، مۆسیقا و خۆشخوانی)، لە لایەن (دەزگای چاپەمەنی ئاراس)ی بەڕێز و دڵسۆز، خوێنەرانی بەڕێز و برادەرانم، بەتایبەتیش ئەوانی ئاگاداری لایەنێکی یا زیاترن لەو باسانەی کە وەک بیرەوەری (تەمەنێک)م گێڕاونەتەوە، پێوەندییان پێمەوە دەکرد، جا چ بە تەلەفۆن، یان هەر لە نزیکەوە و بەرەو ڕوو، کاتێ یەکترمان دەبینی، هەر یەکە و ڕووداوێکی دەهێنامەوە بیر، یاخود ناوی قوتابییەک یان مامۆستایەک یا هەر کەسێکی تریان دەهێنا و کە دەبوایە لە شوێنی خۆی ئەم شتانەم باس کردبایە. جا ڕاست دەکەن و زۆر سوپاسی هەموویان دەکەم و دەشڵێم (چانییە ئەوانی باس کراون، ئەوانیشم لە بیر ماون؟ هەر نەبێ یادیان بەخێر، یادم کردینەوە. بەنیادەمیش کۆمپیوتەر نییە!؟).

لەوەش زیاتر، برایانی خۆشەویستم، هاوڕێی ئەو ڕێگەیەی تەمەنم هەر لە منالێییەوە و لە شارەکانی کۆیە و قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی و هەولێر و دواناوەندی (سانەوی)و بەغدا و کۆلێژ و ئێزگەی ڕادیۆی کوردی بە نوۆسین چ لە گۆڤار و ڕۆژنامە یان هەر بە (نامە) هەر یەکە و چەند تێبینی و ڕوونکردنەوە و شتی تریان نووسیوە... و بۆیان ناردووم، وەک ئازیزانم: مامۆستا مەجید ئەحمەد ئاسنگەر و مامۆستا کەریم مستەفا شارەزا و کاک ئازاد عەبدولواحید و کاک ستاری کوڕی کاک ئەمەری خوالێخۆشبوو... بۆیە بەچاکم زانی ئەو تێبینییانە و ڕوونکردنەوانەیان، وەک (پاشکۆ)یەکی بچووک لە دوا لاپەڕەی ئەم بەشە... کە بەشی دووەمی بیرەوەرییەکانمە... بنووسمەوە، چونکە پێم وایە و بۆم دەرکەوت کە ئەوانە گرینگترین ئەو ڕاستکردنەوە و ڕوونکردنەوانەن لە (بەشی یەکەم)دا.

جا سوپاسی هەموویان دەکەم دووبارە و، لە خوێنەرە بەڕێزەکانیش داوا دەکەم، ئەوانەی

بەشی یەکەمیان هەیە و دەستیان کەوتووە، ئەو خاڵانەی لەو پاشکۆیەدا هەنە، لە لای خۆیان و لە لاپەڕەی نیشانکراو زیاد (ئیزافە) بکەن یان ئەگەر ڕاستکردنەوەی ناوێک یا وشەیەک بێ، چاکی بکەنەوە، لەگەڵ خۆشەویستیمدا...

بەو موناسەبەتەش، دووبارە سوپاسی دەزگای (ئاراس بۆ چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە) دەکەم و ماندووبوونیان و خزمەتیان قەت لە بیرمان ناچێ... خوای گەورە پاداشتیان بەخێر و خۆشی و تەندروستی باشی بەردەوام، بداتەوە...

## تەمەنێک گۆرانی، ئاواز، مۆسیقا و خۆشخوانی و چەپکێک سەرنج و تێبینی

کەریم شارەزا

تەمەنێک گۆرانی، ئاواز، مۆسیقا و خۆشخوانی، ناوونیشانی بەشی یەکەمی ژیاننامە و بیرەوەرییە هونەرییەکانی مامۆستای هونەرمەند (ئەندریۆس ئیسرائیل خەممۆ)ی ناسراو بە (باکووری)یە و دەکەوێتە کتێبێکی ٣٤٩ لاپەڕەیی قەبارە گەورە و لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس لە شاری هەولێری پایەتەختی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٦دا دەرچووە.

کتێبەکە بریتییە لە پێشەکییەکی پوخت و شازدە بەشی خۆش و بەتام و چێژی ژیاننامە و بیرەوەرییە هونەری و کۆمەڵایەتییەکانی و بەزمانێکی سووک و سادەی کوردی تۆمار کراون و ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی شێوەی نووسینی ئەم نووسەرە کە خۆی زۆر لە شێوازی هونەری ڕۆماننووسی نزیک دەکاتەوە.

نووسەر بابەتەکانی بەوێنەی هەمەجۆری چالاکییەکانی خۆی و هاوەڵانی ڕازاندووەتەوە و بوونەتە بەڵگەی باوەڕپێکراوی گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ژیانی هونەری و کۆمەڵایەتی و لە ڕووی شێوازی نووسینەکانیشییەوە، بەزمانێکی ساف و بێ گرێ نهێنییەکانی ژیانی تایبەتی خۆی دەربڕیوە و چۆنی بەسەر هاتووە، ئاوای خستۆتە ڕوو، کەم کەس وا بەوردی و ڕاستگۆیانە نهێنییەکانی ژیانی تایبەتی خۆی دەردەبڕێ.

زۆربەی بیرەوەرییەکانی لەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی وەرگرتوون کە ڕۆژ بەڕۆژ لە ڕۆژژمێرەکانی گیرفانی ساڵانە تۆماری دەکردن و بەشێکی زۆریشی بۆ بیرەوەرییەکانی ژیانی منداڵی لە قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی کۆیە تەرخان کردووە و هەندێ جاریش ڕووداوەکانی ژیانی لە گوندی گۆمەسپان کە باوکی لەوێ پۆلیس بووە یان لە عەنکاوە و هاوینەهەواری پیرمام بەجوانی دەنووسێ و پێشکێش بەخوێنەرانی کتێبەکەی دەکات و لایەکی تەواویشی لە بیرەوەرییەکانی بۆ ژیانی لە کەرکوک و کۆمپانیای نەوتی عێراق I. P. C کردووەتەوە، ئینجا بیرەوەرییەکانی لە ساڵانی خوێندنی لە کۆلێژی (دار المعلمین

العالية) واته خانەی باڵای مامۆستایان بەجوانترین شێوە خستووەتە ڕوو و چالاكییە هونەرییەكانیشی لە ئێستگەی ڕادیۆی عێراق - بەشی كوردی لە بیر نەكردووە كە بەشێكی تەواوی لە ژیانی هونەری و داهێنانی لە بواری ئاواز و گۆرانی گرتووەتەوە. باكووری نووسەرێكی خامە ڕەنگینە بەهەردوو زمانی كوردی و عەرەبی، چەندە هونەرمەندە ئەوەندەش نووسەرێكی لێهاتووی سەرنج تیژ و هۆشیارە. لە وەسفكردنی دیمەنە جوانەكانی نیشتمانەكەی زۆر بەتوانایە، بەتایبەتی لە وەسفكردنی سروشتی كوردستان، هەروەك لە وەسفی دیمەنە جوان و دڵڕفێنەكانی گەشتەكەی بۆ (كانی ماسی)، زۆر بەوردی و بەجۆرێكی سەرنجڕاكێش وەسفی دیمەنەكانی سەر ڕێگەی ئەو گەشتەی وەك هاوینەهەوارەكانی سوارەتووكە و سەرسەنگ و ئامێدی و تاكو گەیشتنی بە كانی ماسی كردووە. بەكورتی گەر مامۆستا باكووری ڕۆماننووس بوایە ئەم وەسف و بیرەوەرییانەی دەكردە هەوێنی نووسینی باشترین ڕۆمانی سەركەوتوو.

مامۆستا باكووری هونەرمەندێكی داهێنەرە، هەر مۆسیقازان و مۆسیقاژەنێكی ئاسایی نییە، بەڵكو لە هەمان كاتیشدا ئاوازدانەرێكی سەركەوتوو و گۆرانیبێژێكی دەنگ زوڵاڵیشە و ئاوازی بۆ گەلێك هۆنراوەی شاعیران و سروودی نیشتمانی داناوە و سەركەوتنێكی باشی وەدەست هێناوە.

بەهرەی هونەریی ئەم هونەرمەندە هەر لە بواری ئاواز و مۆسیقا و گۆرانی نەگەشاوەتەوە، بەڵكو پەڕیوەتەوە بۆ هونەری شانۆ و ئەكتەرێكی لێهاتووی شانۆگەریی درامی بووە و چالاكییەكی زۆری لەو بوارەوە لە كەركووك و شاری كۆیەدا نواندووە و توانای دەرهێنانی شانۆگەریشی بووە.

مامۆستا باكووری خۆشەویستی خۆی بۆ كچێكی دڵداری ئازیزی (ئەمیرە) ناو بەجوانترین شێوە دەربڕیوە و نهێنی ئەو خۆشەویستییەی بۆ مامۆستا (مەجید ئاسنگەر) دركاندووە تاكو سۆزی ئەو عەشقەی بۆ ئەمیرە بكات بە هۆنراوەیەكی ناسك و لە ئەنجامدا وەك باكووری دەڵێ مامۆستا مەجید ئەم بابەتەی كردە سەرچاوەی ئیلهامی هۆنراوەیەكی پڕ سۆزی بەناوی (ئەمیرەكەم) كە سەرەتاكەی بەم جۆرە دەست پێ دەكات:

**ئەمیرەكەم، دڵگیرەكەم بەهارت لێ شەرمەزارە**

كاتێك كە لە بارەی ئەم هۆنراوەوە لە مامۆستا مەجیدم پرسی لە وەڵامدا گوتی: ڕاستە باكووری ئەم بابەتەی بۆ باس كردم و كاری تێ كردم، بەڵام من ناوی (ئەمیرەكەم) كردە

ڕەمزی (کوردستان) و بەو سۆز و خرۆشەوە شیعرەکەم هۆنییەوە.

باکووری بەرامبەر بەئافرەت گەلێک هەست ناسک بووە و هەر ئافرەتێکی جوانی دیبێ، بەتایبەتی کیژۆڵەی ناسک و نازدار، هەڵوەستەیەکی کردووە و تێی ڕاماوە، بۆنموونە: لە گوندی (تۆپزاوا)ی نزیک شاری کۆیە و لە سەیرانێکدا چاوی بەکیژۆڵەیەکی دە دوازدە ساڵی قژ زەردی چاو شین کەوتووە، شوانی بەرخۆڵان بووە و لێی پرسیوە ناوت چییە؟ ئەویش بەشەرمەوە گوتوویەتی: «زێڕین» جا مۆسیقازانی ئەدیبمان هۆنراوەیەکی سووک و سادەی لە وەسفیدا داناوە و سوودی لە شیعری فۆلکلۆری وەرگرتووە و بەئاوازێکی خۆش گوتوویەتی و لە ئێستگەی ڕادیۆش تۆماری کردووە کە سەرەتای بەم جۆرەیە:

**هەی زێڕینێ زێڕینێ**

**کۆیە خۆشە بابچینێ**

باکووری شیعری گەلێک لە شاعیرانی کوردی کردووە بەگۆرانی یان سروود و ئاوازی خۆشی بۆ داناون، لەوانە شەش هۆنراوەی منی کردووە بەگۆرانی و سروود و چەند هۆنراوەیەکی غەزەلی ئەمین ئاغای حەویزی ناودار بە (ئەختەر) و حەوت هۆنراوەی پڕ سۆزی مامۆستا مەجید ئاسنگەر و چەند هۆنراوەیەکی کاک (جەلال جۆبار)یشی کردووە بەگۆرانی ڕەسەنی پڕ سۆز و خرۆش.

هەرچەندە ئەم کتێبەی مامۆستا باکووری بەشێوەیەکی گشتی لە ڕووی نووسین و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و هونەریی خۆیەوە سەرکەوتووە، بەڵام چونکە لەگەڵ من وەک یەکێک لە برادەرە هاوپۆلەکان و هاوتەمەنەکانی، کە پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی و یەکەم و دووەم و سێیەمی ناوەندیمان لە کۆیە بەیەکەوە خوێندووە و ئاگاداری ڕووداوەکانی ئەو ساڵانەی خوێندن بووین و منیش لە تۆماری بیرەوەرییەکانی گەشتی ژیانمدا تۆمارم کردوون، بۆیە هەست دەکەم لە هەندێ جێ تێکەڵی و ناتەواوی دروست بوون وەک لەم هەواڵ و ڕووداوانەی خوارەوەدا بەدی دەکرێن:

(١) مامۆستا باکووری لە لاپەڕە ٤٣ی کتێبەکەیدا نووسیویەتی: «کە لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم ئەم قوتابییانەی لەگەڵمدا بوون، ناوی هەندێکیانم لە بیرە لەوانەی (بابە شێخ عیزوڵڵا) بوو، سەروچاوی سپی و سوورە بوو و چاوی کز بوو.» لە ڕاستیدا وەک ئاگادارم ئەو کەسە (بابە شێخ عیزوڵڵا) نەبووە، چونکە لە لایەک تەمەنی چوار ساڵێک لە باکووری کەمتر بووە و وەک ئاگادارم لە پایزی ١٩٣٩دا لە

پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە قوتابخانەی دووەمی کۆیە قەید کراوە، ئەوساکە باکووری پۆلی چوارەم بووە و بەپێی وەسفی سپی و سووری و چاوکزی ئەو قوتابییەش دڵنیام ئەو کەسە (بابە شێخ کاکە)بووە کە کوڕی (کاکە شێخ ساڵح) بوو و ئێستا هەردووکیان کۆچی دواییان کردووە.

(٢) لە لاپەڕە ٥٢دا نووسەر باسی (ڕەجەب عەبدوڵڵا)ی هاوپۆل و دۆستی خۆشەویستی دەکات و هەندێ هەڵەی تێدا کردووە، بەڵام خۆشبەختانە هەندێک لە ڕوونکردنەوەیەکیدا کە لە ژمارە ٢٢٢٤ی ڕۆژی ٢٠٠٦/٨/٣ی ڕۆژنامەی (خەبات)دا بڵاوی کردەوە و بەچاکی ڕوونی کردووەتەوە کە ڕەجەب کوڕی (عەبدوڵڵا)یە و سەید ئامینەی دایکی مێردی بەکابرایەکی کۆیی کردووەتەوە» بەڵام نەینووسیوە ئەو کەسە کێ بوو؟ من وەک لە نزیکەوە ئاگادارم بەدڵنیاییەوە ئەم زانیارییانەی خوارەوەی دەخەمە پاڵ: (سەید ئامینە) مێردی بە (حاجی ئەمین چەکمەڕەق) کردووەتەوە کە پیاوێکی ناسراوی کۆیە بووە، کوڕێکی ناو (مەغدید) و کچێکی ناو (جەمیلە)ی لێ بووە. مەغدید زوو مردووە، بەڵام جەمیلەخان گەورە بووە و بووەتە هاوسەری وەستا مستەفای ناڵبەند کە پیاوێکی ڕۆح سووک و ناسراوی کۆیە بوو.

(٣) لە لاپەڕە ٧٤دا باسی مامۆستا (دنحا یەڵدا)ی شەقڵاوەیی مامۆستای دەکات کە لە ساڵی ١٩٤٠- ١٩٤١دا وانەی عەرەبی پێ دەگوتین و منیش لە هەمان پۆل بووم و دەڵێ: «ئەم مامۆستایە کوڕێک و کچێکی لە (کاترین)ی کچی خواجە ئەبرەها بوو، کوڕەکە (نەبیل)ی ناوناوە، کیژەکەش (باسمە)، کەچی لە ڕاستیدا بەپێی تەمەنیان کچێک و دوو کوڕی بوون کە ئەمانەن:

١- باسمە کچە نۆبەرەکەیەتی.
٢- نەبیل کە ئێستا دکتۆری پسپۆری تیشکە.
٣- نزار کە مامۆستایە و هەرسێکیان لە ژیاندا ماون.

(٤) لە لاپەڕە ٨٨دا ناوی ئەو قوتابییانەی نووسیوە کە لە ساڵی خوێندنی ١٩٤٠- ١٩٤١دا لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی قوتابخانەی دووەمی کۆیە لەگەڵیدا بوون من یەکێکم لەو قوتابییانەی هاوپۆلی، کەچی هەمان ئەو لیستەی ناوی ئەو قوتابییانەی لە لاپەڕە ٧٦یشدا دووبارە کردووەتەوە، بەڵام ئەمجاریان ناوەکانی پاش و پێش

خستووه و له زنجیرەی ژمارە ۱۰دا نووسیویه (عەبدە حاجی کەریم)، کەچی ڕاستییەکەی (عەبدەی سۆفی کەریم)بووه نەک (حاجی کەریم) چونکه حەجی نەکردووه و هەموو کەس هەر پێیان گوتووه (عەبدەی سۆفی کەریم) که کەسێکی قسەخۆش و نوکتەگۆ بووه و ئێستا له ژیاندا نەماوه.

(٥) مامۆستا باکووری له سالانی خوێندنی ١٩٤١- ١٩٤٢ و ١٩٤٢- ١٩٤٣دا قوتابیی پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووه له قوتابخانەی یەکەمی کۆیه، واته سالێک دەرنەچووه.

له هەر سالەی خوێندنی دەستەیەک قوتابیی لەگەلدا بووه، کەچی ئەو قوتابییانی هەردوو سالەکه بەیەکەوه ناو دەهێنێ هەروەک له لاپەڕە ۹۸دا کردوویەتی. دەبوایه له قوتابییانی سالی خوێندنی ١٩٤١- ١٩٤٢ تەنیا ناوی ئەو قوتابییانه بێنێ که ئەو ساله لەگەلیاندا خوێندوویەتی له کۆتاییی سال دەرچوون بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی وەک (عەبدولخالق فەتتاح و مەجید عومەر و واحید ڕەزا و ئەمجەد شێخ نوورەدین) و مەریێن ئەبرەها و حیسامەدین تەیب دەرنەچوون.

له سالی خوێندنی ١٩٤٢- ١٩٤٣دا که دووەم سالی بووه ناوی ئەو قوتابییانه بێنێ که لەگەلی بوون، یان گەیشتوونەته ئەو له خوێندندا، وەک (جەمال کەریم، کەریم مستەفا شارەزا، کەمال کەریم، واحید نەشئەت، تاهیر ئیسماعیل، واحید حەمەد، سەعیدی مەلا ئەحمەد، فاتیح ڕەسوول و کاکه فەرەنسی (جەرجیس فەرەنسی) نەک (دنحا فەرەنسی) برای که لەو بچووکتر بوو و له خوێندندا له دوای ئەو بووه.

(٦) له لاپەڕە ١٠١دا نووسەر دەلێ (ئێستگەی شەرق ئەلئەدنا) له سالی ١٩٤٢دا له دوورگەی قیبرس بووه. کەچی ئەو ئێستگەیه له سالانی جەنگی دووەمی جیهانی ١٩٣٩- ١٩٤٥ تاکو بڕانەوەی جەنگ له شاری (یافا)ی فەلەستین بووه و مامۆستا (گۆران)ی شاعیر و (ڕەفیق چالاک) و چەند کارمەندێکی دیکەی کورد له بەشه کوردییەکەیدا کاریان کردووه. کاتێک کاک (دلزار)ی شاعیر سەرباز بووه له فەلەستین له سالی ١٩٤٥دا سەردانی (گۆران)ی کردووه و چووەته ئێستگەکه له شاری یافا و شیعری تێدا خوێندووەتەوه، بەلام دوای بڕانەوەی جەنگ ئەو ئێستگەیه گواسترایەوه بۆ دوورگەی قوبرس.

(٧) مامۆستا باکووری له لاپەڕە ١١٢ی کتێبەکەیدا دەلێ له پۆلی یەکەمی ناوەندیی

کۆیە کە لە ساڵی خوێندنی١٩٤٣- ١٩٤٤ بووە، دوو مامۆستامان بۆ هاتن لە هەولێر یەکێکیان مامۆستا جەلال شەریف بوو، ئەوی دیکەیان مامۆستا مستەفا شێخ نیعمەتوڵلا بوو، مامۆستا عەلی موزەفەریش لەبەر بێ مامۆستایی هات دەرسی ئینگلیزی پێ دەگوتین و بەڕێوەبەرمان مامۆستا (شەوکەت محەمەد) بوو!!

ڕاستە لە ساڵی خوێندنی ١٩٤٣- ١٩٤٤دا مامۆستا عەلی موزەفەر لە قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی کۆیەوە تەنسیب کرابوو دەرسی ئینگلیزی پێ دەگوتین. بەڵام مامۆستا جەلال شەریف جارێ لە (دار المعلمين العالية) دەرنەچووبوو و نەبووبووە مامۆستا و نەهاتبووە کۆیە، بەڵام بۆ ساڵی دوایی واتە کە بووینە پۆلی دووەمی ناوەندی لە ساڵی خوێندنی ١٩٤٤- ١٩٤٥دا مامۆستا جەلال شەریف بۆ یەکەم جار کرا بە مامۆستا و ناردرا بۆ کۆیە و دەرسی ئینگلیزی و کۆمەڵایەتی پێ دەگوتین و مامۆستا عەلی موزەفەریش ناردراوە قوتابخانە سەرەتاییەکەی خۆی. بۆ ناوی ڕاستەقینەی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەشمان ئەو بەڕێوەبەرە ناوی تەواوی (شەوکەت عەبدوڕەحمان) بوو هەروەکو خۆی دوای چەند لاپەڕەیەک بەڕاستی لە لاپەڕەی ١٤٤دا نووسیویەتی.

(٨) مامۆستا باکووری لە هەمان لاپەڕەی ١٤٤ی کتێبەکەیدا نووسیویەتی: دەزگای ڕۆشنبیریی لە بەغدا کە مەبەستی لە دەزگای (ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردییە) لە حەفتاکان گۆڤاری (کاروان) و (ڕەنگین)ی دەردەچوواند.

کەچی لە ڕاستیدا ئەو دەزگایە گۆڤاری (بەیان) نەک (کاروان) لە تشرینی دووەمی ١٩٦٩ و ڕۆژنامەی (هاوکاری) لە ٩ی کانوونی دووەمی ١٩٧٠دا و گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)شی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٣دا دەرچوواند، بەڵام گۆڤاری (کاروان) لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٨٢دا یەکەم ژمارەی لە لایەن ئەمینداریەتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان لە هەولێر دەرچوو. دوای ڕاپەڕین و دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمی کوردستان تاکو ئێستا کە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە بەرێکوپێکی دەردەچێ و بۆ ساڵی ١٩٧٨یش گۆڤاری «ڕەنگین» لە لایەن دەزگای ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا دەرچوو. نەک لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا.

(٩) مامۆستا باکووری لە لاپەڕە ١٥٠دا چەند جارێک دەڵێ لە مەسیف سەڵاحەدین، لەسەر گردێک (بلاط الملكي) دروست کرابوو، کە مەبەستی لە کۆشکی تایبەتی مەلیکە بۆ ئەوەی هەر جارێک بۆ گەشتوگوزار لەو کۆشکە شاهانەیە دابەزن. لێرەدا

لەسەر ناوی (بلاط الملكي) لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە دەوەستێن و دەبێ بگوترێ (البلاط الملكي) و بۆ چەمک و ماناکەشی بەو جۆرە کۆشکانەی مەلیک لە دەرەوەی پایەتەخت ناگوترێ (بلاط)، بەڵکو تەنیا بەو دەربارە ڕەسمییە دەگوترێ کە مەلیک لە کاتی دەوامدا حوکمی وڵاتی تێدا دەگێڕێ و تەنیا لە بەغدا یەک دەرباری مەلیک واتە (بلاط) هەبوو، دەنا بە قەسرەکانی دیکەی وەک (قصر الزهور) و (قصر الرحاب) نەدەگوترا (بلاط).

خوێنەری بەڕێز ئەم سەرنج و تێبینییانەم هەر بۆ ڕوونکردنەوە و زیادەی زانیاری بوون و بەهیچ جۆرێک لە نرخی بەرهەمە خۆش و دڵگیرەکەی مامۆستا باکووری کەم ناکەنەوە و ڕێزم بۆ هونەرمەندی هاوتەمەن و هاوڕێی خۆشەویستم.

## تێبینییەکان لە بارەی کتێبەکەمەوە: «تەمەنێک...» دڵخۆشکەر بوون

باکووری

دوای ئەوەی بەشی یەکەم لە بیرەوەرییەکانم، لە کتێبێکدا بە ناوی (تەمەنێک گۆرانی، ئاواز، مۆسیقا و خۆشخوانی) لە لایەن (دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس) لە هەولێر لە چاپ درا و بڵاو کرایەوە، هەندێ نووسەر و هاورێی نزیک بەتەلەفۆن، یان بەنووسین دەستخۆشییان لێ کردم و کتێبەکەیان بەتام و چێژەوە خوێندبووەوە، ئەوانیش هانیان دام بەشی دووەمیش بخەمە بەردەستان و تێبینی خۆشیان بۆم ڕوون دەکردەوە، من لێرەدا سوپاسیان دەکەم.

لە گۆڤاری (ڕامان)ی نازدار کە ژمارەی ١١٢ بڵاو بووەوە، مامۆستای بەڕێز و خۆشەویست کەریم شارەزا، لە لاپەڕەی ٢٠٤ تا لاپەڕەی ٢٠٧ی گۆڤارەکەی بەوردی و بەنرخاندنێکی پڕ هەستی ئەدیبێکی ڕاستەقینە و وەک مرۆڤێکی شارەزا و پابەند بە خاڵی گرینگی بواری ئەدەبی و ڕەخنەگری لەسەر کتێبەکەم دواوە. لە پێشەوە زۆر سوپاسی مامۆستا دەکەم کە ڕاستگۆیانە هەست و نەستی خۆی بەرامبەر بەبەرهەمەکە و بە خۆشم دەربڕیوە، کە هاورێ و برادەرێکی هەموو ساڵانی تەمەنم بووە، هەر لە ژیانمان لە قوتابخانەی سەرەتایی و لە ناوەندی لە کۆیە تا ئەو کاتەی ئێمە بەماڵەوە چووینە هەولێر و من لە هەولێر سانەویم تەواو کرد و ئەویش چووە بەغدا بۆ خانەی مامۆستایان تا ساڵانی پەنجاکان، ئینجا دیسان من گەڕامەوە کۆیەی خۆشەویستم و دیسان لەگەڵ کاک کەریم بەیەک شاد بووینەوە لەگەڵ باقی برادەرە کۆنەکانم، مەبەستم ئەوانەی بەهۆی جۆراوجۆرەوە لە یەک دابڕابووین.

مامۆستا شارەزا لە تێبینییەکانی هەندێ ناو و ڕووداوی بۆم ڕاست کردووەتەوە کە زۆربەی دڵخۆشکەرن بۆ من و بەڕاستیش دەڵێم زۆرجار لە نووسینی بیرەوەرییەکانمدا لە هەندێ شوێن، لەسەر هەندێ ناو، یان شتی تردا لە نووسین دەوەستام و لە خۆمم دەپرسی: (وەڵڵاهی ئەو ناوە، یان ئەو سەربردەیە) بەچاکی لە لام ڕوون نییە! تۆ بڵێی ئەوها بێ

وەک نووسیومە یان وانییە؟

بەشێک لەو هەڵانەم کاک کەریم شارەزا ڕاستی کردووەتەوە و بەتەمام لە بەشی دووەمدا ئەو ڕاستییانەی ئەو و هەندێ تێبینی خۆشم ڕاست بکەمەوە، بۆیە دووبارە سوپاسی دەکەم و داوای تەمەن درێژی و لەش ساغی بۆ دەخوازم.

لەو شتانەی مامۆستا کەریم شارەزا، لەم لایەنەوە، یارمەتی ڕاستکردنەوەی داوم ئەوانەن:

(١) ڕاستکردنەوەی ناوی قوتابی (بابە شێخ) کە لە پۆلی سێی سەرەتایی لەگەڵمدا بوو، من ناوی بابی ئەو برادەرەم نووسیوە (عزالله)- واتا نووسیومە (بابە شێخ عزالله)- کە کاتی خۆی زۆر لەسەر ناوەکەی ڕامام، مامۆستا ڕاستی ناوەکەی بۆمان نووسیوە کە (بابە شێخ کاکە) بووە نەک (عزالله).

(٢) باسەکەی هاوڕێمان (ڕەجەب عەبدوڵلا)، زانیارییەکەی من کە هەڵەیە لە ناوەڕاستی لاپەڕە ٥٢ تا سەرەتا و پەرەگرافی یەکەمی لاپەڕە ٥٣ هەموویم بەقەڵەمی ڕەش - لەو نوسخانەی کە خۆم دابەشم کردن بەسەر برادەران و دۆستان ڕەش کردووەتەوە، هەندێ زانیاریی تریش لە بابەت هەندێ وێنە و ناوی دیکەوە خۆم ڕاستم کردنەوە، بەڵام- فایدەی چی- ئەی ئەوانەی لە بازاڕ فرۆشران؟ چۆن چارە دەکرێن؟

بۆیە ئەمە دەرفەتێکە بۆ من تا لەگەڵ تێبینییەکانی مامۆستا کەریم ئەوانی خۆشم دەخەمە پاڵیان و لێرە بڵاویان دەکەمەوە، بەشکم خوێنەرە بەڕێزەکان، خوا بکا بیانخوێننەوە و لە لای خۆیان ڕاستیان بکەنەوە.

(٣) ناوی قوتابی هاوپۆلمان (عەبدە)ی بۆی ڕاست کردوومەتەوە، لە لاپەڕە ٨٨ نووسیومە ناوی (عەبدە حاجی کەریم) کە ڕاستییەکەی وەک مامۆستا دەڵێ (عەبدە سۆفی کەریم)ە و بە ناوی (عەبدە کەریم)مان گاز دەکرد- کە پێشتر لە لاپەڕە ٧٥- نەک ٧٦ نووسیومە (عەبدە کەریم)- ئەم دووبارەکردنەوەی ناوی برادەر و قوتابیان و تەنانەت ناوی مامۆستایانمان بەبێ ئاگایی خۆم، چەند جارێ و لە زۆر شوێنی کتێبەکەمدا ڕووی داوە! خۆشم نازانم بۆچی؟

لەگەڵ ئەوەش کە لە دەزگای ئاراس دووجار ڕەشنووسەکەم خوێندووەتەوە و پێیدا چوومەوە، چونکە دەزگاکە بۆیان دەناردم و شتی پێویستم لێی ڕاست دەکردەوە و بۆم دەناردنەوە.

ڕەنگە لەبەر دڵنیاییی نەبوونی خۆم بووبێ کە وام زانیوە یەکەم جارە ئەو ناوانە دەنووسم و لە بیرم چووە کە پێشتر نووسیومن! بەهەرحاڵ لە نووسینی بابەتێکی دووردرێژ و بەتایبەتی بیرەوەری پێم وایە ئەوە ڕوودەدا، بەتایبەتیش ئەگەر نووسەر یەکەم جاری بێ لەو دەرگایەی دابێ! ئینشاڵڵا بۆ بەشەکانی تر لەو خاڵانە سوودمەند دەبم!

(٤) لە تێبینییەکەی لە بابەت ناونەهێنانی ئەو قوتابیانەی لە ساڵی ١٩٤٢/١٩٤١ لە پۆلی شەشەم لە قوتابخانەی (ئوولا- اولی)- ناسراو بە (مەکتەبی خواریێ)- مامۆستا ڕاست دەکا، بەداخەوە هەندێ ناوی زۆر گرینگم لە بیر چووە و نەم نووسیون، داوای لێبووردن دەکەم لەوانەی لە ژیاندا ماون و ئەوانی کۆچی دواییشیان کردووە، لە بەهەشتی بەرینی خوای گەورە دابن، بەڵام پێشم وایە ناوی زۆربەیانم هێنابێ کە نزیکی ١٥ قوتابی دەبن ڕەنگە هەر سێ چوار ناوم نەنووسیبێ کە یەکێکیان (ئەنوەر تاهیر بەکر) بوو- باوکی پۆلیس بوو- ماڵیشمان لە تەنیشت یەکتر بوو، لە سەرەتای جادەکەی سەرەکی کە بۆ ناو شار دەهات، ئەوان لە دووەم خانوودا بوون، لە پاش ماڵی کاک تەمەر، ئێمەش سێیەم خانوومان لە ماڵی دەروێش عەوڵا ناوێک بەکرێ گرتبوو، ئەو کاتە هەردووکمان لە پۆلی شەشەم بووین و ماینەوە- ساڵی دوایی ئەوان بەخێزانەوە چوونە هەولێر.

(٥) لە بابەت ئێزگەی ڕادیۆی کوردی کە لە یافا بوو- منیش ناوم هێناوە کە لە یافا شت تۆمار دەکران، بەڵام وەک زانیاریم، هەوایی و پێداویستی پەخشکردنی لە قوبرس بوو.

(٦) ناوی بەڕێوەبەری (متوسطە)کەمان کە نووسیومە (شەوکەت محەمەد) بوو هەڵەیە، قسەکەی کاک کەریم ڕاستە (شەوکەت عەبدولڕەحمان) بوو- کە لە شوێنێکی تر هاتووەتەوە بیرم و بەڕاستم نووسیوە.

(٧) لە بابەت (بلاط الملكي) واتە کۆشکە گەورەکەی لەسەر گردێکی بەرز دروست کرابوو بۆ مەلیک فەیسەڵی دووەم و خاوخێزانی- ئەم کۆشکە هەر بەو ناوەوە ناسرابوو لە مەسیف، تەنانەت عەمەلە- کرێکار و کەنناس و مووەزەفەکانی دائیرەی سکک کە ئەو مەسیف سەلاحەدینەی بەڕێوە دەبرد، هەر بە بیلاطی مەلیک ناوزەد دەکرا- بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەش، کە مامۆستا کەریم دەڵێ- (البلاط الملكي) بۆ شوێنی ڕاپەڕاندنی کاری ڕەسمی مەلیک بەکار دەهێنرێ، جا منیش دەڵێم: بەڵێ ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەم کۆشکە کە دەچوویتە ناوییەوە لە دەرگا سەرەکییەکە- دوو جەناحی نیشتەجێ و

ژووری تێدا بوو، له لای ڕاست و هەروەها ناوەڕاستی کۆشکەکە ژووری گەورە و هۆڵ و کەلوپەلی نایابی نووستن و دانیشتن و تەنانەت ژووری چێشت لێنان و میوان و هەموو شت، لەو بەشەی کۆشکەکە هەبوون، کە پێویستی ژیانی خێزانی بێ، کەچی دیوی دەستە چەپی دیار بوو ژووری کارکردنی ئیشوکاری ڕەسمی بوو، بۆیە مێز و کورسی و تەلەفۆن و ئامێری کارکردنی دائیرە و دۆلابی (سجل و ئەوراق) و ئەو شتانە پڕی ژوورەکان بوون، کەواتە ئەم کۆشکە هەردوو ئەرکی جێبەجێ دەکرد، بۆیە مەلیک و وەصی خاڵی و خێزان ئەگەر بهاتبان لەوێ دادەبەزین، بۆ ئەوەی ئەو ماوەی بیانەوێ لەو هاوینەهەوارە بژین شوێنی تریان نەبوو کاتی تێدا بەسەر بەرن، ئنجا وەک لە بەغدا ناوی کۆشک و قەسرەکانیان، کۆشکی زهوور و ڕیحاب بوون، لە مەسیف ناویان بۆ دانەندرابوو، بۆیە هەر بە (بیلاطی مەلیک) یان هەر (بلاط) ناوی دەبردرا.

دوای سوپاسێکی بێ پایانم بۆ کاک کەریم شارەزا بۆ ئەو ڕوونکردنەوانەی، حەز دەکەم ئەم دەرفەتەش بقۆزمەوە بۆ هەندێ ڕوونکردنەوە و ڕاستکردنەوەی خۆم لەو شوێنانەی کە بزانم گرینگە و دەبێ خوێنەر ئەو ڕاستییانە بزانێ، پێش خوێندنەوەی کتێبی (تەمەنێک گۆرانی......) و بەشی یەکەمی بیرەوەرییەکانم وەک لێرەدا باسیان دەکەم.

(١) بەرگی پێشەوەی کتێبەکە کە وێنەکەمی بەگەورەیی لەسەرە، حەزم دەکرد و پێم وایە جوانتر و سەرنجڕاکێشتریش دەبوو- ئەگەر ڕەنگی ڕانکوچۆغەکەم، ڕەنگی ئەسڵی خۆی بوایە کە ڕەنگێکی قاوەیی جوان و دڵگیرە، تاکو لەگەڵ ڕەنگی ڕەساسی بەرگەکە جوانتر دیار بوایە، ئەوسا دەبووە ڕەنگێکی سروشتی گونجاو لەگەڵ ئەو درەختەی لە (باکگراوند)ەکەدا هەیە.

(٢) هەندێ لە وێنەکان یەکجار بچووک کراونەتەوە کە لە هەندێکیاندا بەتایبەتی کە چەند کەسێک لە وێنەکاندا هەبن، زۆر بە وردی دەیانبینم هەر نایانناسمەوە، ئەمەش لەبەر بچووکی دەموچاویان تەنانەت خۆشم ناناسمەوە، هەروەها هەندێک لەو کۆپی کراوانەی ئەو نووسینانەی لە گۆڤار و ڕۆژنامەم کۆپی کردوون و لە دەستخەتەکەی خۆم دام ناون، لە کتێبەکەدا ئەوەندە بچووک چاپ کراون بە زەڕەبینیش نووسینەکە ناخوێندرێتەوە! کەواتە خوێنەر ئەو زانیاریانەی کە بەبەڵگە بۆیم داناوە سوودی چییە نەتوانێ بیانخوێنێتەوە؟

بۆ هەندێ نموونەی ئەم قسەیەم سەیری ئەو لاپەڕانە بکەن (ئەگەر زەحمەت نەبێ) لاپەڕە

(٧، ٨، ١٠، ١٠١، ١٢٣، ٢٠٤، ٢١٢، ٢١٨، ٢٧٥، ٣١٤، ٣١٥، ٣١٦، ٣١٨، ٣١٩، ٣٢٣، ٣٤٦).

(٣) له لاپەڕە ٧٤ و ٧٥ دوو وێنە هەن، ناوەکانیان کە لە ژێریانەوە نووسراون لەگەڵ زانیارییەکان بەهەڵە دانراون: وێنەکەی لاپەڕە ٧٤ وێنەی مامۆستا (شەفیق سابیر)ە بەعوودەودیە، کەچی ناوی مامۆستا (زەکی ئەحمەد)ی بەڕێوەبەری قوتابخانەی لە ژێرەوە نووسراوە، ئینجا وێنەکەی تر ئی لاپەڕە ٧٥ بەپێچەوانەیە- ئەمەیان وێنەی مامۆستا زەکی ئەحمەدە، کەچی ناوی (شەفیق سابیر)ی لە ژێرەوە نووسراوە.

(٤) هەندێ ناو و ڕووداو و شوێنم لە جێگەی جیاجیادا دووبارە و سێ بارە کردووەتەوە، ئەمە هەڵەی خۆمە، داوای لێبووردنیش لە خوێنەرە بەڕێزەکان و لە دەزگای چاپی ئاراسیش دەکەم.

(٥) لە تەنیشت وێنەکەی خێزانێکی باوک و دایک و منداڵەکانیان لاپەڕە لە ناو نووسینەکەدا مێژووی ١٥/ ٥/ ١٩٩٠ نووسراوە، ئەمەیان ساڵەکەی دەبێ ١٩٥٠ بێ، هەروەک لە ژێرەوەتر، واتە دوای سێ چوار دێڕ دووبارە کراوەتەوە کەواتە ١٥/ ٥/ ١٩٥٠ ڕاستە.

(٦) لە ژێر ئەو وێنەیەی لە لاپەڕە ٢٢٢ دایە سێ کەس هەن کە ئەوانەن: ڕەزا عەلی، ئەنوەر شێخلی (ئەمەیان بەهەڵە نووسراوە- شێخانی-) سێیەمیش هامان- ئەوە ڕاستە. کەواتە (شێخانی)یەکە دەبێ بکرێ بە (شێخلی).

(٧) لە لاپەڕە ٢٤٠ یەکەم وێنە، وێنەی (مەحموود وەندی)یە، بەڵام لە ژێری نووسراوە (محەمەد وەندی).

(٨) لە لاپەڕە ٢٥٨، پێنجەم دێڕ لە شەرحەکەدا ناوی ئەو گوندەی کە لەگەڵ برادەرەکان چووینە ئەوێ لەسەر سنووری عێراق- تورکیا ناوەکەی نووسراوە (بێرۆ)- هەروەها لە تەنیشت وێنەکەی دووەم لە دامێنی هەمان لاپەڕەدا لە وەسفەکەدا، هەمان هەڵە کراوە. ڕاستی ناوی گوندەکە (بێدۆ)یە- بەپیتی دال- نەک بێرۆ- بە پیتی ڕێ-!

(٩) لە لاپەڕە ٢٦٧دا، لە ژێر وێنەکەدا، ناوی ئەو برادەرەم کە لە لای چەپی من دانیشتووە بەهەڵە نووسراوە (کارنیل)، ڕاستییەکەی ناوی (کارنیک) بوو، واتا پیتی دوایی (ک)ە، نەک (ل).

(١٠) وێنەی یەکەمی سەرەوەی لاپەڕە ٢٨٨ کە بە گوێرەی نووسینەکەی تەنیشتی دەڵێ

(.. هونەرمەند- ڕەزا عەلی- بەعوودەکەی خۆی لە بەردەم مایکرۆفۆنەکە... گۆرانی دەڵێ) کەچی ئەمە هەر وێنەکەی لاپەڕەی پێشووە کەوا منم لەگەڵ تیپەکەمان، لە (دار المعلمین العالیة) گۆرانی دەڵێم، نەک ڕەزا عەلی، کەوا لە دەستخەتەکەم من وێنەی (ڕەزا عەلی)م داناوە.

# برای بەڕێز و خۆشەویستم، کاک (باکووری)ی هونەرمەند

برا و هاودەمت - مەجید ئاسنگەر
ڕاوێژکار لە پەرلەمانی کوردستان
شوباتی ٢٠٠٧

دوای ڕێز و سلاو

بەسوپاسەوە دیارییە نایابەکانتم (دوو کتێبەکان) وەرگرت و بە ئاسووقەوە خوێندمنەوە، چونکە، لە زۆر لاوە یادەوەریی (من)ی سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری و گەنجییەتیشمیان بەئاگا هێنایەوە و دیمەنی جوان و قەشەنگ و دلڕفێنی ئەو ڕۆژگارانە و، ڕووداوە تاڵ و شیرینەکانیشیان وەکو شریتی سینەما لەسەر شاشەی بیر و نەستمدا هێنایەوە بەر دیدەی خەیاڵ و چاوانەوە و، مایەی خۆشحاڵی و شانازیمانە!

ئەم دوو بەرهەمە بەنرخانە (چیرۆکی هەندێ گۆرانی ڕەسەن، کە ١٢ گۆرانی و لاوک و مەقام و سروود) لە خۆ دەگرێت بەڕاستی خزمەتێکی کەم وێنە بە هونەر و کەلەپووری کوردیمان دەگەیەنێت و ئەو هەموو بەرهەمە دانسقانە لە ونبوون و فەرامۆشکردن و فەوتان دەپارێزێت.

هەروەها لە (تەمەنێک گۆرانی و ئاواز و مۆسیقا و خۆشخوانی-بەشی یەکەم لە ژیاننامەی باکووری)دا، زۆر بەوردی و ڕاستگۆیانە-بەزیندرۆییشەوە (بۆ ڕۆژگاری ئیمرۆی کوردەواریمان)، هەگبەی بیرەوەرییەکانی خۆتت هەڵڕشتووە و، بەبێ هیچ پەردە و پێچ و پەنایەک باسی (ڕووداوەکان و ڕابواردن و کەسایەتییەکانت بە وێنە و بەڵگەوە) گێڕاونەتەوە. بەڕاستی، پیاو لە خوێندنەوەیدا تۆماری ڕاستەقینەی مێژووی پتر لە نیو سەدەی شار و ناوچەکانی (کۆیە، هەولێر، عەنکاوە، پیرمام و شەقلاوە، کانی ماسی و دەڤەری بادینان، کەرکووک، سلێمانی، بەغدا و بەتایبەتی کەشوهەوای دڵگیری کۆلێژی (دار المعلمین العالیة) کە مەکۆی زانست و پەروەردە و خوێندن و ڕابواردن بوو، لەگەڵ ئێزگەی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆندا بەڕوونی دێنەوە بەرچاوی و، وەک تۆمارێک زۆر لایەنی ژیان

و گوزەران و شێوەی بەڕێوەچوون و هەڵسوکەوت و مەینەتییەکانی خەڵکەکانت بەرچاو خستوون هەروەکو قۆناخەکانی خوێندن و مامۆستاکان و قوتابییە هاوپۆل و هاوڕێکانت وێنا کردوون و، ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووری و باسی هونەر و هونەرمەندانی کورد و تیپە هونەرییەکان - بەتایبەتی باواجی و ئاهەنگ و بۆنەکانت بەرجەستە کردوون: دەستخۆشیت لێ دەکەم و بەهیوای بەرهەمی بەپێزی دیکەتین.

لە کتێبی دووەمدا هەندێ وردە بۆشایی بەرچاو کەوتن، حەز دەکەم پڕیان بکەمەوە، وەک بەشدارییەکی بچووک.

١- لە لاپەڕە ١٩٢دا، لە ناوی قوتابییەکانی پۆلی چوارەمی وێژەیی ژمارە: ١٩-عەلی حەسەن ڕەزا، ژمارە ٢٠ عەبدولقادر داود یەعقووبی بوو. بۆ ناوی مامۆستاکانیش ١- خوالێخۆشبوو (حاجی عەبدولباقی ساڵح)ت لە بیر کردووە کە وانەی ماتماتیک (ریاضیات)ی پێ دەداین و، دوایی بۆ سلێمانی گوێزرایەوە و، ڕۆژی ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ ٨٣ ڕۆڵەی نیشتمانپەروەر و تێکۆشەری کورد بەفەرمانی تاوانبار زەعیم سدیق مستەفا لە لایەن بەعسییە فاشستەکانەوە بەکۆمەڵ گوللەباران کران و چوونە ڕیزی شەهیدە سەربەرز و نەمرەکانمانەوە.

٢- هەروەها مامۆستایەکی خەڵکی میسر بەناوی (حەسەن شەحاتە) ماوەیەک (پێش یان پاش ئەحمەد عەلی عورەیقات- فەلەستینی) ئینگلیزی پێ دەگوتین.

٣- لە لاپەڕە ٨٨دا لە قوتابیانی پۆلی پێنجەمی سەرەتایی کە لەگەڵتدا بوون نووسراوە (١٠- عەبدە حاجی کەریم) باوکی (عەبدە) ناوی (سۆفی کەریم) نەک (حاجی کەریم)بووە.

٤- لە لاپەڕە ١٨٢دا نووسیوتە "لە قوتابییەکانی فەرعی ئەدەبی ئەو ناوانەم لە بیر ماون: ٥- ئەحمەد شێخ عەبدولکەریم ٦- فاتیح شێخ محەمەد ٧- زەکەریا ئەمین" ڕاستییەکەی نازناوی باوکی هیچ کام لە (ئەحمەد و فاتیح) شێخ نەبوو، (زەکەریا ئەمین)یش لەگەڵ ئێمەدا نەبوو. وا لێرەدا ناوی قوتابییەکانی ترت بیر دەهێنمەوە کە لەگەڵماندا بوون. ١٦- جەلال زێوەر ١٧- بەشیر عەبدولڕەحمان ئەتروشی ١٨- عەبدولقادر داود یەعقووبی ١٩- خۆت (ئەندریوس ئیسرائیل خەمۆ) ٢٠- خوالێخۆشبووان-خەلیل عەبدوڵلا ٢١- عبدولڕەحمان نووری قەساب ٢٢- ڕەشاد عەلی ئەمین ٢٣- فەیسەڵ حەمدی ٢٤- جەمال عەتەڵلا ئاغا.

٥- لە لاپەڕە ١٩٣دا لە باسی مردنەکەی (دڵدار)ی شاعیری جوانەمەرگدا نووسیوتە: "بە شەو لە یانەی مووەزەفان لەگەڵ برادەرێکی نان دەخۆن و ئینجا دەچنە سینەمای حەمرا و... تاد". بۆ زانین دەڵێم-ئەو برادەرەی ناوی (عومەر حەبیب عەبدوڵلا-برای شاعیری نیشتیمانپەروەری ناسراو (عوسمان عەونی) بوو. ئەو برادەرە لەو سەردەمەدا پارێزەر بووە و دواتر بووە بە دادوەر و لە نێو خەڵکیدا بە (حاکم عومەرە سوور) ناسراو بوو ساڵی ١٩٧٦ لە تەمەنی ٥٣ ساڵیدا بەوەستانی دڵ هەر لە هەولێر کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی بردرایەوە کۆیە.

٦- هەروەها لە هەمان لاپەڕەدا نووسیوتە: "هەرسێ قوتابییە کۆییەکانیان بردن" (واتە بۆ زیندان-مەجید). بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم خاڵە دەڵێم، من (مەجید) یەکێکی ئەو سێ قوتابییانە نەبووم. ئەوان بەڕێزان (فاتیح ڕەسووڵ کەبابچی، بورهان نەجمەدین بەرزنجی و خوالێخۆشبوو، ڕەشاد عەلی ئەمین) بوون کە لە ئەنجامی خۆپێشاندانێکی حزبی شیوعیی عێراقی لە هەولێر دەستگیر کران و لە قوتابخانە دوور خرانەوە. کەچی (بەندە) دەوامی خۆمم بەئاسایی کرد و ساڵی دواتریش بەیەکەمی پۆلی پێنجەمی وێژەیی لە پارێزگای هەولێر دەرچووم.

ئەمانە چەند وردە تێبینی و ڕوونکردنەوەیەک بوون هیوادارم سوودبەخش بن و، دووبارە پیرۆزباییی گەرم و دەستخۆشیت لێ دەکەم.

هەر بژیت

# پێڕست